

ناوی کتێب: سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون
نووسینی: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی
وەرگێڕانی: تارق نەجیب رەشید
ژمارەی سپاردن: (2105) ساڵی 2008
شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا
نۆرەی چاپ: دووەم
ساڵی چاپ: 2008
نەخشەسازی بەرگ: شێرکۆ خانزادی
نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی
لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (37)
ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com
ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی چاپی دووەم

لە ماوەی هەشت ساڵی ڕابردوودا زۆرگۆڕانکاری گەورە لە دنیادا ڕویدا، دیارترینیان کارەساتەکەی یانزەی سێبتێمبەر بوو کە بەشێوەیەکی خراپ کاریگەری لەسەر ڕەوتی کاری ئیسلامی لە جیهاندا بەجێهێشت و، دەیەها پرسیاری گوماناوی لە سەر موسڵمان بە گشتی و بزاوت و جموجوڵە ئیسلامیەکان بە تایبەتی و ئیسلام بە تایبەتیتر دروستکرد. دەیەها ڕێکخراوی خێرخوازی و دەزگای فریاکەوتن و کەسایەتی بانگخواز کەوتنە بەر هێرشی تۆمەتبارکردن و دژایەتیکردن و ناوزڕاندن، دوژمنانی ئیسلام و مسوڵمانان لە سەرتاسەری دنیادا ئەم کارەساتە نەگریسەیان بە هەلزانی بۆ بەرپاکردنی جەنگێکی ئیعلامی بەرامبەر ئیسلام و مسوڵمانان بە گشتی و، بەرامبەر ئەو کەسایەتی و ڕێکخراوو لایەنانە کە ڕۆڵیان هەبوو لە بوژاندنەوەی حاڵەتە ئیسلامیەکەدا بە تایبەتی. لەم جەنگە نا ئەخلاقیەدا زۆرێك لە کەسایەتیە ئیسلامیە گرنگەکان دەستنیشانکران تاکو بە شێوەیەکی چڕوپڕ لێیان بدرێت و کەسایەتی و فیکرو کارەکانیان لەبەرچاوی خەڵکیدا ناشیرن وقیزەون بکرێت و، بە سەرچاوەی ئیرهاب و خراپەکاری ناوزەد بکرێن.

شەهید سەید قوتب(بەڕەحمەت بێت) لە پێشەوەی ئەو کەسایەتیانە بوو کە کەوتە بەر شاڵاوی ئەم هێرشە-لە کاتێکداکەئەولەدنیادانەمابوو-، لەم جەنگەدا ناحەزانی ئیسلام و نەیارانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخ و دوژمنانی سەیدو فیکرە میانەڕەوەکەی کەوتنە شیکارکردن و لێکدانەوەیەکی زۆری نابابەتیانەو ناڕاستگۆیانە بۆ نوسراوو بیرو بۆچون کتێبەکانی سەید قوتب، دەیەها درۆو هەڵبەستراوو لێکدانەوەی ئاوەژویان بۆ فیکری سەید کرد تاکو پاش نزیکەی چل ساڵ لە شەهیدکردنی جارێکی تر بیرو بۆچون و کەسایەتیە نەمرەکەی تیرۆربکەنەوە. . . .

کوردستانی عێراقیش لەماوەی نۆساڵی ڕابردودا وێنەیەکی بچوککراوەی ئەو جەنگە نا ئەخلاقیەی بەخۆوە بینی و، خەڵکانێك بەهەر مەبەست و بیانویەك بێت کەوتنە هێرشکردنە سەر ئیسلام وەك ئاین و تۆمەتبارکردنی بەوەی کە بوەتە هۆی دواکەوتنی گەلی کورد و، ئیدیعاکردنی ئەوەی کە ئەگەر کورد موسڵمان نەبوایە قەوارەو دەسەلاتی سەربەخۆی خۆی دەبوو، وە تۆمەتبارکردنی ئیسلام بەوەی کە ئاینی نەگبەتیە بۆ گەلی کوردو، پاشان هەوڵدان بۆ دروستکردنی وێنەیەکی ناشیرین و بێزراو بۆ موسڵمانان کە گوایە ئەمانە بەردەوام کەسی دواکەوتوو گێرە شێوێن و ئیرهابی و دژە شارستانیەتن !! وە ناوزڕاندنی ئیسلامیەکان بەوەی کە سەرچاوەی نا ئارامی و توندوتیژین لە کوردستاندا، لە کاتێکدا بارودۆخ و ڕوداوو واقعی حاڵ پێچەوانەی ئەمەی دەسەلماند.

جگە لەم جەنگە گشتیە جەنگێکی تر بەڕێوە دەچوو کە وردترو ئامانجدارترو ئاراستەکراو تربوو، ئەویش جەنگی هێرشکردنە سەرکەسایەتیە گەورەئیسلامیە جیهانیەکان بوو، ئەمەش بە دەیەها ئامانج کە دیارترینیان **لێدانی عەقڵی ئیسلامی** و، **لێدانی فیکری ئیسلامی** و، **لێدانی سومبول و پێشەنگەکان** بوو، ئەمەش بە مەبەستی نەهێشتنی متمانەی جەماوەری ئیسلامپەروەر بەو کەسایەتیانەو بە بانگەوازو فیکرەکەیان، هەروەها هەوڵێك بوو بۆ بەرگرتن لەو هەڵکشان و بوژانەوە میللیە ئیسلامیەی کە لە کوردستاندا هاتبوە دی لە بەرەنجامی شکستی مەشروعی عیلمانیەت و متمانە پەیداکردنەوەی جەماوەر بە ئیسلامەکەی وەك ڕێبازێکی ڕزگارکەرو، گەڕانەوەی خەڵکی بۆ ئیسلام وەك مەنزومەیەکی کۆمەڵایەتی ئەخلاقی کە تاکە دەرفەتێکە بۆ ڕزگارکردنی باری داتەپیوی کۆمەڵایەتی خەڵکانی کوردستان کە بە هۆی بیرو بۆچونە عیلمانیەکان و پرۆژە کۆمەڵایەتیە فاشیلەکانیانەوە هاتبووە ئاراوە.

زۆر کەسایەتی و ڕێکخراوو لایەن ودامودەزگای خێرخوازی کەوتنە بەر شاڵاوی ئەم هێرشە شکستخواردووە کە جگە لە کڕبون و سەرنەویکردن هیچ دەسکەوتێکی تری بۆخاوەنەکانیان نەهێنایە دی.

لەم نێوەندەدا شەهیدی نەمر سەید قوتب پشکی شێری بەرکەوت لە ناوزڕاندن و تۆمەتبارکردن و جنێو پێدان و گرتنی وێنەی هەڵگەڕاوەو درۆینە لێی، چەندین قەڵەم دەیەها بابەت و لێکۆڵینەوەیان بە ئارەزوی خۆیان لە سەر ئەم پیاوە مەزنەو فیکرەکانی نوسی و، لە گۆڤارو ڕۆژنامەوکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاویان کردەوە. ئامانجیان بوو کە شوێنیك بۆ سەیدو،

بوارێك بۆ بیروبۆچونەكانی و، جێگەیەك بۆ كاریگەریەكانی لەسەر هۆشیاری ئیسلامی كوردستان نەهێڵنەوە. لەم پێناوەدا زۆر شت درایە پاڵ سەید كە ئەو لێی بەدووره، زۆر وێنەی بۆ دروستكرا كە دورو نزیك لە وێنە جوانەكانی ئەو نەدەچوون، زۆر لێكدانەوەی هەڵە بۆ نوسینەكانی كرا كە ئەو مەبەستی لە نوسینەكانیدا ئەو لێكدانەوانە نەبووە. . . بە كورتی زۆر بێویژدانانە مامەڵە لەگەڵ سەیدو، فیكری سەید و، بەرهەمەكانی سەیدو، كاریگەری سەید لەسەر بوژانەوەی ئیسلامی هاوچەرخ كرا.

بە داخەوە قەڵەمە ئیسلامیەكانیش بێدەنگیان هەڵبژارد، یاخود بێدەنگبون بەرامبەر بەم حاڵەتە، یان ڕاستروایە بڵێم بەرامبەر بەو هەموو هێرش و ناوزڕاندنانەی بەرامبەر سەید ئەنجامدەدرا، لە پێشەوەی هەموو ئەو كەمتەرخەم و قەڵەم سستانەوە خۆم بووم كە بە تەنها بابەتێكیش هەوڵی بەرپەرچدانەوەی تۆمەتێك و ڕاستكردنەوەی هەڵەیەك و ڕونكردنەوەی ڕاستیەكم نەدا. هەر لەبەر ئەوەو بەمەبەستی كەفارەتدانی ئەو بیدەنگی و تاوانەم بە پێویستم زانی جارێكی تر ئەم كتێبە بە چاپ بگەیەنمەوە كە وادەبینم وەڵامی تەواوی هەموو ئەوهێرشە بێمانایانەی تێدابێت كە كراونەتە سەرسەیدو، واشدەبینم باشترین بەرپەرچدەرەوە بێت بۆ تەواوی ئەو ڕەفتارە نەشیاوانەی لە بەرامبەر ئەم زاناو بانگخوازو بیریارە مەزنەدا ئەنجامدرا.

بۆ ئەم مەبەستە ئەرك و مافی چاپی دووەمی ئەم كتێبەم بەخشیە پرۆژەی تیشك، ئەوانیش لە ئەستۆیان گرت و هەستان بە چاپ و بلاوكردنەوەی. من لە لایەنی خۆمەوە سوپاسی ئەو بەرێزانە دەكەم و داواكارم لە پەروەردگار باشترین پاداشتیان بداتەوە لە سەر كارە جوانەكانیان.

وە داواكاریشم لە خوای گەورە ئەم كارەم لێوەربگرێت و چاوپۆشی لە كەم و كوڕی و كەمتەرخەمیەكانم بكات بەرامبەر یەكێك لە شەهیدانی ڕێگەكەی كە ئەویش مامۆستا سەید قوتبە.

نە كتێبەكەی دكتۆر سەلاح و نەوەرگێران و بەرگریكردنەكانی من لە سەیدو، نە بەرگریكردنی هیچ قوتابی و دۆستێكی سەید لەسەید ئەوە ناگەیەنێت كە سەیدو فیكری سەید دوور لە هەڵەو ناتەواوی بێت و، بەرهەمەكانی دوور لە كەموكوڕی بێت و، بیرو بۆچونەكانی جێگەی مشتومڕو بەرپەرچدانەوە نەبێت، بەڵكو كێشەی ئێمە كێشەی ستەمكردن و وێنە گرتنێكی ناحەزانەیە، كێشەی ئاوەژوكردنی ڕاستیەكان و چەواشەكردنی خوێنەرو هێرشێكی بێمانایانەیە، كێشەی ئێمە كێشەی ئەوەیە كە هەندیك كەس دەڵێن (لەبەر ئەوەی ڕقم لێتە جوانیەكانیشت ناشیرینن). ئەگینا هەمومان ئەو ڕاستیە دەزانین كە جگە لە پێغەمبەران(درودی خوایان لەسەر بێت) هیچ یەكێك لە مرۆڤەكان بێهەڵەو كەموكورتی نین.

ئەوەش بە پێویست دەزانم ئاماژە بەوە بكەم كە چاپی یەكەمی ئەم كتێبە چ لە ڕوی وەرگێران و چ لە ڕوی داڕشتن و چ لە ڕوی هەڵەی چاپ و هونەریەوە لە ئاستی پێویستدا نەبوو، لە بەرئەوە بۆ ئەم چاپە نوێیە هەستامەوە بە پێداچونەوەیەكی وردی كتێبەكەو، هەوڵمداوە كەمو كوڕی و ناتەواوی و لاوازیەكانی نەهێڵم. تاكو وەك لە پێشەكی چاپی یەكەمدا نوسیبووم(وەرگێڕانەكەم شایستە بێت بەنوسینە مەزنەكەی دكتۆر سەلاح)، هیوادارم توانیبێتم ئەم چاپەم وەك پێویست پێشكەش كردبێت.

سەبارەت بە چاوەڕوانكردنی خوێنەران بۆ نوسین و چاپكردنی كتێبێك تایبەت بە ژیانی پێشەوای شەهید (حەسەن بەنا) كە لە پێشەكی چاپی یەكەمدا بەڵێنم بە خوێنەران دابوو، لەبەر هەندێك بارودۆخی تایبەتی خۆم -كە نازانم تا چەندە دەكرێت وەك بیانویەك وەربگیرێن- نەمتوانی تا ئێستە بەو كارە هەستم ئەگەرچی سەرچاوە پێویستەكانی ئەو كتێبەو، كۆی بیرۆكەی بابەتەكان و شتی زۆرم كۆكردۆتەوەو ئامادەم كردووە. . بەهەرحاڵ داوای لێبوردن دەكەم كە تا ئێستە نەمتوانیوە جێبەجێی بكەم بەو هیوایەی پشتیوان بە خوابتوانم لە داهاتودا كاری جدی بۆ بكەم و بەچاپی بگەیەنم.

**تارق نەجیب**
2008/4/23
**سلێمانی**

# پێشەکی چاپی یەکەم

زۆرکەمن ئەو کەسانەی دەبنە بیریاری پێشەنگو، بانگخوازی تێکۆشەرو، پێشەوای شەهید. سەرزەوی ناوبەناو لێرەو لەوێ ئەم کەسانە بەخۆوە دەبینێو دەبنە خێرو بەرەکەت بۆ سەردەمی خۆیانو ئەوانەی بە دوایاندا دێن، گیان دەکەنەوە بەبەر واتا ئیسلامییەکانداو،دەبنە وێنەیەکی زیندووی تەرجەمەی چەمکە ئیسلامییەکانو، باشترینو جوانترین رۆڵی بەندایەتیو بۆخوا ژیانو خزمەتکردن بە دینی خواو بە خەڵکی خوا پێشکەش دەکەن. . . دەژین تا خزمەت بە ئیسلامو موسڵمانان بکەن، هەرکاتێکیش پێویستی کرد گیانی پاکیان دەبەخشن لە پێناوی سەلماندنی ڕاستی بیروڕاو داواکارییەکانیاندا. لە نێوان ژیانو شەهیدبوون ـ یان مردندا ـ ئەوەی لە دەستیاندا بێت دریغی ناکەن لە بەخشینیدا بە بانگەوازەکەیان. . .

مرۆڤایەتی. . . بەڵێ مرۆڤایەتی هەر هەمووی قەرزارو منەتباری ئەم کەڵە پیاوە مەردانەیە، چونکە خوای گەورە دەیانکاتە دیاری خۆی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی. ئەم پیاوانە تەنها شانازی گەلو نەتەوەیەك نین جیا لە گەلو نەتەوەکانی تر، خوای گەورە موسڵمانانی کردووە بە یەك ئوممەتو لە سەری هەر سەدەیەکدا نوێکەرەوەیەك بۆ ئەم ئوممەتە دەنێرێت بە کوردو عەرەبو فارسو ئینگلیزو هتدەوە. . . سەید قوتب دیاری خوا بوو بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی بە گشتیو ئوممەتی ئیسلامی بەتایبەتی لە تاریکترین قۆناغەکانی ژیانداو، لە دوای رووخانی کۆتا هێمای دەسەڵاتی ئیسلامی لەسەر زەویدا کە دەوڵەتی عوسمانی بوو. لە ساتەوەختی گوڕوتینی هێرشی ڕۆشنبیری رۆژئاواییو، فیکری بێ باوەڕی رۆژهەڵاتدا بۆ سەر وڵاتانی جیهانی ئیسلامی.

سەید قوتب بوو بە خێر بۆ ئوممەتی پەرتەوازەو بێ شانو شەوکەتی ئەو کاتەی ئیسلام. بوویە لەمپەری بەردەم هێرشی ڕۆشنبیریو بێ باوەڕی رۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، بۆیە چقڵێكو چەقی بە چاوی دوژمنانی ئیسلامو موسڵماناندا.

لەو کاتەوەی کە خۆی دۆزیەوەو لە پەیوەندی کردنیەوە بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە (الاخوان المسلمین) ئیتر سەیدی شەهید هەموو ژیانی خستە خزمەتی بانگەوازو ڕێبازە بلندو شکۆدارەکەیەوەو، بەوەی کە لە توانای هیچ کەسێکدا نەبوو هەر لە هەژاریو کەمدەستیو دوورخستنەوە لە پیشەو دوورخستنەوە لە وڵاتو گرتنو ئەشکەنجەدانەوە تا چەندەها ناخۆشی جۆراوجۆری تر.

سەید وەك ڕەمزی شانازی ئوومەتی ئیسلامییە،بە هەمان شێوە ڕەمزی زیندوویەتیو نەمری بیری تێکۆشانو بەرخودانو ڕاپەڕینی ئیسلامییە بۆ سەرخستنی دینی خواو، چەسپاندنی دەسەڵاتی شەرعو، بەگژاچوونەوەی ستەمکارانو فێڵبازانو چەواشەکاران. سەید لە پێناوی دینی ئەم ئوممەتەدا هەموو ئەم ئوممەتەی قەرزاری منەتی خواو تێکۆشانی خۆی کرد.

منیش وەك کوردێکی موسڵمان کە گەلەکەم بە گەلێکی موسڵمانی ڕەسەن دەزانمو مێژوویەکی پڕ سەروەریو شکۆمەندی هەیە لە دۆستایەتی ئیسلامو خزمەتکردن بە ئیسلامدا، چەندین پیاوی مەزنی پێشکەشکردووە بە ئیسلامو ئوممەتی ئیسلامی بە گشتی. وەك ئیبن تەیمیەو ئیبن سەلاحی شارەزووریو ئیبن خەلەکانو. . . هتد. خۆمو گەلەکەمم بە قەرزاری ئەو پیاوە مەزنە زانیوە، بەتایبەتی لەو کاتەوەی کە بیرم کرایەوەو دەستم گەشتە کتێبو نوسراوەکانی ئەو شەهیدە مەزنەو لێیان بەهرەمەند بووم. هەستمکرد زۆربەی ئەو لاوە هۆشیارە مسوڵمانانەی کورد کە هەوڵی بووژاندنەوەی ئیسلام دەدەن لەم کوردستانەداو هەوڵیانداوە هەموویان یەکێك لە سەرچاوە سەرەکیەکانی بیرو بیرکردنەوەو، جموجوڵو بزاوتنو، خەباتو تێکۆشانیان کتێبو نووسراوەکانی سەیدە، کە لێوەی ئاشنای بیرو ڕێبازی کارکردن بوون. سەید خۆیشی بۆیان بووەتە نموونەی پێشەنگێکی چاکەکارو بانگخوازێکی تێکۆشەرو پێشەوایەکی شەهید. ئیتر لەو کاتەوە خۆشەویستیەکی زیاتری ئەو زاتە مەزنە چووە ناو دڵمەوەو هەر لەو کاتەوەی کە دەستم پێنووسی گرت بە ئاواتەوە بووم خزمەتێکی پێ بکەم بەڵام نەمدەزانی چۆن؟ئەوەم بە خزمەت دەزانی کە ببمە چەند دڵۆپە ئاوێك لە جۆگەی دەریای **(صدقة جارية)**کەی سەیدقوتب، ئەمەش بەپێی فەرموودەی **(وأجر من عمل بها بعده من غير أن ينقص من أجوره شئ)** خزمەتم پێبکردایە. ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەمە کارێکی گشتییەو شتێکی زیاتری تیا نییە لەوەی هاوبیروڕاکانم ئەنجامی دەدەن. تا ئەوەبوو خوای گەورە کردی بە هۆی برایەکەوە کتێبی **(سید**

قطب من الميلاد الى الاستشهاد)ی دکتۆر (صلاح عبدالفتاح الخالدي) کەوتە بەردەستمو جارێك خوێندمەوە. زۆر پێی سەرسام بوومو هۆگری بووم، ئەوجارە بەشێك لە کۆنووسی لێکۆڵینەوەکەی کە لەلایەن (فؤاد الدجوي)یەوە لەگەڵیدا ئەنجامدرابوو، زۆر جێگەی سەرنجم بوو، لای خۆم نووسیمەوە. بەڵام بەوەندە تینوێتیم لە ژیانی ئەو مەردە تێکۆشەرە نەشکاو داوام کردەوە لەو برایە کە ئەمجارەش کتێبەکەم بۆ بگێڕێتەوە تا بۆ جاری دووەم بیخوێنمەوە، ئەویش ـ خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە ـ بۆی دەستخستمەوە، کە خوێندمەوە، خوای گەورە ئەوەی خستە دڵم کە ئەمە باشترین هەلە بۆ هێنانەدی ئەو ئاواتەی کە هەمبوو، بە ڕاستی هەلێکی باشبوو، خوای گەروە خستیە دڵمەوە کە وەری بگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، بەم کارەم لەلایەکەوە ئاواتەکەم لە بەرامبەر سەید قوتبدا هاتەدی، لەلایەکی ترەوە بە خزمەتێکی گەورەم دەزانی بە گەلو نیشتمانە خۆشەویستەکەمو کتێبخانەی ئیسلامیی کوردی، ئەو دوو خاڵە پاڵنەرم بوون بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەمشێوەیەی لە بەردەستی تۆی بەرێزدایە. سوپاس بۆ خوا وا هەست دەکەم هەردوو ئاواتەکەم هاتوونەتە دی. . . سوپاس بۆ خوا. . .

داوای لێبوردن لە نووسەری کتێبەکە (صلاح عبدالفتاح الخالدي)و خوێنەری بەڕێزیش دەکەم کە لەبەر سەختی باری ئابووریو کەمدەستی خوێنەری کوردو نارەحەتی چاپکردن، نەمتوانی وەرگێڕدراوی هەموو کتێبەکە بە چاپ بگەیەنم، بەڵکو هاتووم کتێبەکەم کورت کردۆتەوە بەتایبەتی بەشەکانی سەرەتا کە زۆر بە درێژی دکتۆر سلاح باسی لێوەکردوونو بە شێوەیەکی زۆر وردو چڕوپڕ تیشکی خستۆتە سەر هەموو لایەنەکانی ژیانی سەید، هەر لە لەدایکبوونیەوە تا شەهیدکردنی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، پێم وابوو ئەگەر کورتەی ئەو باسە درێژانە دەربهێنمو پێشکەشی خوێنەری بکەم ئەوا لە هیچ بەشو لایەنێکی ژیانی بێبەشم نەکردووە، تەنها یەك سەرباسیش نیە لە کتێبەکەدا کە یان پوختەکەی یان بە تەواوی وەرم نەگێڕابێتو نەمخستبێتە چوارچێوەی کتێبەکەمەوە. کورتکردنەوەکانیش بەتایبەتی لە بەشی یەکەمدا بووە کە ژیانە ئەدەبیەکەی سەیدە، لەگەڵ بەشی سێیەم کە باس لە سیفاتو بەرهەمو پاشماوە ئەدەبیو فیکریەکانی دەکات.

بەڵام بەشی دووەم کە ڕێڕەوی ژیانە ئیسلامیەکەیەتی، ئەو بەشە ژیانەی کە سەیدی پێوە ناسراوە لە سەرتاسەری دونیادا، وەك بیریارو بانگخوازو تێکۆشەرێکی کارای ناو ڕیزەکانی برایانی موسڵمان، ئەوە ئەو بەشەم بە تەواوی وەرگێڕاوە، جگە لە چەند نموونەیەکی دووبارە یان چەند زانیاریەکی دووبارە، کە لابردنی زیان بە کرۆكو جەوهەری بابەتەکە ناگەیەنیو لەملاشەوە ڕۆڵی هەیە لە کەمکردنەوەی قەبارەی کتێبەکە بۆ ئاسانکردنی بە چاپگەیاندنو کەمکردنەوەی نرخەکەی تا ئاسانتر بتوانێت بگاتە دەستی هەموو خوێنەرێك، بەڵام زۆر بە کەمی توانیومە لەم بەشەدا کورتکردنەوە بکەم کە هەمووی ناگاتە چەند لاپەڕەیەك، چونکە هەموو بابەتەکانی گرنگو پێویستنو سەراپا بەڵگەی مێژوویيو دادگاییکردن و ڕووداوەگرنگەکانو لێکۆڵینەوەو دانپیانانەکانو. . . هتدە. کە ئەم بەشە (ژیانی ئیسلامیی سەید) زیاتر جێگەی گرنگی پێدانی خوێنەرە، وەك دکتۆر سلاح خۆیشی ئاماژەی پێدەکات. . . بەمشێوەیە هەستام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو داوای قبووڵبوونی لای خوای گەورەو خوێنەرانی بەڕێز دەکەم، هەروەها داوای لێبوردن دەکەم لە هەر کەمو کورتیەك، ئاشکراشە کاری مرۆڤ بێ کەموکوڕی نابێت. . . هیوادارم وەرگێڕانەکەم شایستە بێت بە نووسینە گەورەو مەزنەکەی دکتۆر سەلاح، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بە بەهەشتی بەرین.

پشت بەخوا لە داهاتوودا ژیانی پێشەوای شەهید (حسن البنا)ش دەکەمە دیاری خوێنەری بەڕێز، لە کۆتایدا سوپاسی بێ پایانم بۆ خوای گەورە، درودو سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویست دووپات دەکەمەوە.

**تاریق نەجیب**

1999/3/11

## پێشەكی نووسەر

سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگار، سوپاسی دەكەین‌و پشتی پێدەبەستین‌و داوای ڕێنومایی لێدەكەین، پەنادەگرین بە خوا لە خراپەی دەروونەكانمان وكردارە خراپەكانمان، هەركەس خوا ڕێنومایی بكات ئەوە گومڕا نابێت، هەركەسیش گومڕابكات ئەوە ڕێنومایی بۆ نییە، شاهیدی دەدەم كە جگە لە (اللّٰه) هیچ پەرستراوێكی تر نیە، تاك‌و تەنهایە‌و هاوەڵی نیە، شاهیدی دەدەم كە **محەممەد**(درودی خوای لەسەربێت) بەندە‌وفروستادەی خوایە.

پاشان. . . . .

بە ڕاستی سەید قوتب كەسایەتییكی سەرسووڕهێنەری بێ وێنەیە، سەید بیریارێكی پێشەنگ‌و بانگخوازێكی تێكۆشەر‌و پێشەوایەكی شەهیدە!

سەید ژیانێكی بەسەر برد كە پڕبوو لە بەخشین، نزیكەی شەست ساڵ ژیا، تیایدا لووتكەی ئەدەب‌و فیكری گرتبوو، ڕێگەی كاری ئیسلامی حەرەكی گرتبووەبەر، بوویە سەركردەیەك لە برایانی موسڵمان، سەركردایەتی ڕێكخستنی نوێی برایانی دەكرد .

ئەوەبو لەسەرەتای شەستەكان‌و لە ژیانە ئیسلامیە گورج‌و گۆڵەكەیدا برژێنرا بە ئاگری نارەحەتی، داستانێكی پاڵەوانی جوانی پێشكەشكرد لە كاركردن‌و بانگەوازدا، لە ئارامگرتن‌و دامەزراویدا، لە جیهادو ڕوبەڕوبوونەوەدا، لە بەرزی‌و سنگ دەرپەڕاندن بەرامبەر ستەمكاراندا.

خوای گەورە كۆتایی بە ژیانی هێنا بە كۆتاییەكی بەختەوەر، كە هەموو موسڵمانێكی ڕاستگۆی گورج‌و گۆڵ بە ئاواتەوەیە بۆی، ئەوەبوو لە زیندانەكەیدا شەهیدی بەرەوڕوی هات‌و، ئەمیش بەرەو پیری ئەو ڕۆیشت، ئەویش زەردەخەنەی بۆ كرد، زەردەخەنەی بەختەوەری‌و ڕەزامەندی، ئەو شەهیدە بەختیارە كە گەیشتەوە بە خوای خۆی هەڵگری بەرزترین مەدالیا بوو، مەدالیای شەهادەت لە پێناوی خوادا ـ إن شاء اللّٰه ـ.

لەپاش شەهیدكردنی گیانكرا بە بەر بیروڕا‌و بۆچوونەكانیدا، خەڵكی زیاتر پێی سەرسام بوون، زیاتر ڕویانكردە كتێب‌و دانراوەكانی، زیاتر لە هەڵوێستە بانگخوازی‌و جیهادییەكانیدا چاویان لێكرد، زۆربەی ئەو كەسە سەرسام‌و كاریگەر‌و لێكۆڵەرانە -جگە لە كەمێك نەبێت- شارەزانین لە ژیانی پێشەنگیی تێكۆشەر سەید قوتب، بەتایبەتی ژیانە ئەدەبیەكەی سەرەتای!

زۆربەی خەڵكی سەید قوتب ناناسن لە دوای ساڵی (1951)ەوە نەبێت، لەو كاتەوەی كە دەستیكرد بە هەنگاونان لە ڕێگەكەیدا بەرەو برایانی موسڵمان (الإخوان المسلمون)، كەلەو كاتەدا تەمەنی لە (45) ساڵ تێپەڕی كردبوو، ئەی چی دەزانن دەربارەی ژیانی دوورو درێژی پێش ئەم قۆناغەی؟

زۆربەی ئەوكەسانە سەید قوتب ناناسن لە میانەی دانراوو كتێبەكانیەوە نەبێت! بەڵام ئەی چی دەربارەی قۆناغی ژیانە ئەدەبیەكەی دەزانن؟ دەربارەی قۆناغەكانی ژیانە ئیسلامیەكەی؟ دەربارەی ڕێڕەوی ژیانی‌و دیمەنەكانی لەو قۆناغەداچی دەزانن جگە لە چەند وێنەیەكی جیاجیا‌و بەرتەوازەو، چەند هەواڵێكی پەرش‌وبلاو نەبێت كە هیچ پەیوەندیەكیان لە نێواندا نیە‌و هیچ شتێك كۆیان ناكاتەوە!!، هەندێكیشیان هەر ڕاست‌و دروست نین!!.

نووسین دەربارەی سەید قوتب‌و ژیان‌و بیروبۆچوونەكانی زۆر بووە ، ئەگەر بابەتین لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا، یان كتێب‌و دانراون.

لە گرنگترین ئەو كتێبانەی دەربارەی سەید نوسراون:

1- (العالم الرباني الشهيد سيد قطب): عشماوي احمد سليمان ـ بەڕەحمەت بێت.

2- (سيد قطب أو ثورة الفكر الاسلامي): محمد علي قطب.

3- (رائد الفكر الاسلامي المعاصر الشهيد سيد قطب): مامۆستا يوسف العظم.

4- (سيد قطب حياته و ادبه): مامۆستا عبدالباقي محمد حسين.

5- (سيد قطب الاديب الناقد): دكتۆر عبدالله الخباص.

6- (سيد قطب من القرية الى حبل المشنقة): عادل حمودة.

بەنرخترینو چاکترینی ئەم کتێبانەش، کتێبی هەردوو مامۆستا (**عبدالباقي محمد حسين**)و (**عبدالله الخباص**)ە!

ئەوەشم بیست کە مامۆستا (**سالم البهنساوي**) لەمساڵدا (1989) کتێبێکی داناوەو ناوی ناوە (**سيد قطب بين العاطفية والموضوعية**)، هەوڵمدا بەردەستم بکەوێت، بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوەدەستی بخەم، وە تاکو نەیبینم نە بڕیاری بۆ ئەدەمو نە بڕیاریشی لەسەر ئەدەم!!، بەڵام وادەردەکەوێت کە تیایدا دەربارەی ئەو بیروڕایانەی سەید قوتب دوابێت کە دەمەقاڵەو مشتومڕی لەسەر دروستبووە لە نێوان تێکۆشەرانی ڕێگای ئیسلامدا، کە بریتین لە بابەتەکانی فەرمانڕەوایی و نەفامیو بە کافرکردن ـ چونکە مامۆستا بەهنەساوی پێشتر لە هەردوو کتێبەکەیدا (**أضواء على معالم في الطريق**)و (**الحكم وقضية تكفير المسلم**)دا ئەمەی بلاوکردبوویەوەو خستبوویەڕوو. ڕۆژنامەنووس (**سامي جوهر**) ـ بەڕەحمەت بێت ـ کۆنووسی ئەو لێکۆڵینەوەی بلاوکردەوە کە لەگەڵ سەید قوتب لە زیندانی جەنگیدا بریکاری گشتی (**صلاح نصار**) ئەنجامیدابوو، هەروەها کۆنووسی دادگاییکردنەکەی سەید قوتب. کە لەلایەن ئەفسەر (**فؤاد الدجوي**)ئەنجامدرا بلاوکردەوە.

گۆڤاری (المسلمون) دانپیانانەکەی سەیدی بلاوکردەوە، کە بە دەستووخەتی خۆی لە زیندانی جەنگیدا لە کۆتایی ساڵی (1965)دا نوسیبووی، تیایدا دانی ناوە بە پەیوەندیە دوورودرێژەکەی لەگەڵ برایانی موسڵماندا، هەروەها کارکردنی لەگەڵ (ڕێکخستنی نوێی برایان)دا!، پاشان (**الدار الناشرة**) ئەم دانپیانانەی لە ژێر ناونیشانی (**لماذا أعدموني؟**)دا بلاوکردەوە، لە دانپیانانو لێکۆڵینەوەو دادگاییکردنەکەشدا زانیاریو ئاماژەو سوودی زۆر مۆڵی تێدایە!.

ئەم نووسینانە دەربارەی سەید قوتب هیچ نیە جگە لە سەرەتایەك نەبێت!، لەمەودوا لێکۆڵینەوەی زۆری بەدوادا دێت دەربارەی بیروڕاو بۆچوونەکانی شەهید. بە ڕاستی سەید قوتب کەسایەتیەکی بزواوی زیندوو کاریگەر بووە، بیروڕاو بۆچوونەکانی زۆرێك لە دەمەقاڵەو مشتومڕو، وەرگرتنو بەرپەرچدانەوەی بەدوای خۆیدا هێناوە. !

پێمخۆشبوو کۆمەڵێك زانیاریو هەواڵ دەربارەی ژیانی سەید قوتب بە لێکۆڵەرو خوێنەرو ئەوکەسانەی کە لە ژێر کاریگەری ئەودان پێشکەشبکەم، تا ببێتە سەرچاوەیەكو بۆی بگەڕێنەوە ـ ئەگەر خوا بیەوێ ـ ئەگەر ئامانجیان بووکە شارەزابن بەسەر ژیانی ئەم بیریارە پێشەنگوئەم بانگخوازە تێکۆشەرەدا!!.

سەرەتای ئەم کتێبە چیرۆکی هەیە، لەسەرخۆم بە پێویستی دەزانم بە کورتی ئەو چیرۆکە پێشکەش بە خوێنەران بکەم:

لە ساڵی (1987)ی زاینی کەبەرامبەرە لەگەڵ(1408)ی کۆچی، گەڕام بە دوای بابەتێکدا بۆ نامەی ماستەر لە تەفسیرو زانستەکانی قورئاندا، تا پێشکەشی بکەم بۆ (بەشی قورئانو سوننە) لە کۆلێژی (**اصول الدين**) لە زانکۆی (**الامام بن سعود الاسلامية**) لە **رياض**، خوای گەورە یارمەتیدام بۆ بابەتی (**سيد قطب والتصوير الفني في القرآن**) بە پرسو ڕای مامۆستای سەرپەرشتیارم دکتۆر (**احمد حسن فرحان**) خوای گەورە چاکترین پاداشتی بداتەوە. ئیتر دەستمکرد بە گەڕان بەناو گۆڤارو ڕۆژنامە کۆنەکاندا، بە دوای هەر هەواڵو زانیاریەکدا دەگەڕام کە دەربارەی سەید قوتب بدوێت، کۆمەڵێکی زۆر بابەتم دەستکەوت لەو گۆڤارو ڕۆژنامە کۆنانە، وەك گۆڤارەکانی (**الرسالة، الثقافة، الكتاب، الكاتب المعاصر، الأسبوع، البلاغ الأسبوعي، العالم العربي**). لێکۆلینەوەم لەسەرکردن، بابەتێکی چاكو زانیاریەکی بەنرخم تیایاندا دەرهێنا. مەبەستیشم بوو چاوم بە مامۆستا محەممەد قوتبی برای بکەوێت، ئەویش میهرەبان بوو لەگەڵم، هەموو ئەو زانیاریانەی دەربارەی شەهید سەید قوتب داوام لێکرد، پێشکەشی کردم ـ خوای گەورە چاکترین پاداشتی بداتەوەـ.

ماستەرنامەکەم لە دوو بەشدا نووسی: بەشی یەکەم دەربارەی سەید قوتب، بەشی دووەم دەبارەی (**التصوير الفني في القرآن**). لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی نامەکە سەر لە ئێوارەی ڕۆژی چوارشەممە( 1408/4/18)ك، لە هۆڵی کۆلێژی شەریعە بوو، لە **رياض**، لیژنەی هەڵسەنگاندن پێکهاتبوو لە:

ـ دکتۆر ئەحمەد حەسەن فەرحان.

ـ مامۆستا محەممەد قوتب.

ـ مامۆستا محەممەد ئەلراوی، سەرۆکی بەشی تەفسیر لە کۆلێژەکە.

کۆڕەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، جەماوەرێکی زۆر ئامادەبوون، هۆڵەکە جمەی دەهات لە دانیشتووانو بە پێوە وەستاوان، سوپاس بۆ خوا.

مامۆستا محەممەد قوتب شاهیدی دا بۆ نامەکەو خاوەنەکەی، شاهیدیەك کە شانازی پێوە دەکەم، چ شانازیەك!.

لە لاپەڕەی تێبینیەکانیدا دەربارەی بەشی یەکەم کە تایبەتە بە ژیانی سەید قوتب دەڵێت: "نایابە. لە پێگەشتووترین لێکۆڵینەوەکان و وردترینو تەواوترینو هەمەلایەنانەترینیانە، خاوەنەکەی نووسەرو، وەرگێڕێکی زۆر باشە، بەئارامە لەسەر هەڵبژاردنو کۆکردنەوەو پوختەکردنی ئاماژەکانو، دروستکردنی پەیوەندی لە نێوانیاندا، لەکۆکردنەوەی هێڵەکانی کەسایەتی تیایدا، ئەمەش بەدەرخستنی کەسایەتیەکی سیفات ڕوون. . ئەو( بەشە) بە تەنهاو سەربەخۆ دەکرێت بکرێتە نامەی ماستەرەکە!".

لە هەڵسەنگاندنەکەدا بە دەنگی خۆی وتی: "سەبارەت بە بەشی یەکەم ئەوە: وردەکارە، خۆشەویستکەرە، زۆرباشە لە شێوازی خستنە ڕوودا، بە چاوپۆشی دەربارەی ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەکەی لەسەر کراوە، من دەربارەی نووسەری ئەم نامەیە قسە دەکەم. دەڵێم: بە ڕاستی توانایەکی نا ئاسایی هەیە لە تەرجەمەکردنی ژیانی خەڵکیدا ئەگەر لەمەودوا بەکاری بخات لە گۆڕەپانەکانی تردا، ئەوە بەهرەیەکە شایستەیە تۆمار بکرێت، شایستەیە لەسەری پیرۆزبایی لێبکرێت.

توانای ئارامگرتنی هەیە لەسەر کۆکردنەوەی پێکهێنەرەکانی مادەکە، کە لێوەی لێکۆڵینەوەکەی ئامادەکردووە بۆ کەسایەتیەکە، توانای ڕۆچوونی ڕووداوەکانی هەیە، بە لایاندا تێناپەڕێ تێپەڕینێکی خێرا، ئەگەرچی لە خۆیدا ڕوداوێکی بچووکیش بێت، بەڵکو ئەو ئاماژەکانی قووڵ دەکاتەوە، تا هێڵێکی لێ دەربهێنێ لە هێڵەکانی ئەو وێنەیەی کە دەیکێشێت!.

لەسەر ڕوونکرنەوەی واقیع ئارامی هەیە، بەتوانایە لە کۆکردنەوەی هێڵەکاندا!، هەندێك لە خەڵکی لە کۆکردنەوەی هەندێك خاڵدا سەرکەوتوو دەبن، سەرکەوتودەبن لە ڕۆچوون تیایداو لە ڕوونکردنەوەو دەرخستنیدا، بەڵام لە کۆکردنەوەیدا بۆ ئەوەی وێنەیەکی زیندوو، وێنەیەکی زۆر ڕوونو واتابەخشی لێدەربچێت سەرکەوتوو نابن.

ئەو تایبەتمەندی یان بەهرەیەی دراوە بە نووسەری ئەم نامیلکەیە، بریتیە لە: بەتوانایی بەسەر کۆکردنەوەی کەسایەتیەك لە بەشە پەرشو بڵاوەکانی، ئەگەر زانیان کە بەشەکانی لە گۆڤارە جۆراوجۆرەکاندا کۆکردۆتەوە، کە بیست ساڵ یان زیاتر دەگرێتەوەو ئەمرۆ هەندێکیان نادیارن، چونکە دووبارە بڵاونەکراونەتەوە. . .

لە ناخی خۆیدا بە گرنگی زانیوە کە دەربارەی ئەم گۆڤارانە بکۆڵێتەوە، بگەڕێ بە دوای بابەتو هۆنراوەکانی سەید تیایاندا، ئەوە بە ڕاستی توانایەکی گەورەیە، بڕوام وایە کە ئەگەر تەنها ئەوەی پێشکەش بکردایە بۆ بەدەستهێنانی نامەی ماستەرەکەی، ئەوە بەدەستی دەهێنا، تیایدا شایستەی ڕێزلێنانێکی گەورە دەبوو!.

دەڵێم: ئەو لەم بەشەدا خاوەن بەهرەیە، بە توانایە، توانایەکی پێشوەختی دەرخست، کە مژدە دەدات ـ **إنشاء الله** ـ بە بەرهەمی زیاتر لەم ڕێگەیەدا، بە پشتیوانی خوا ئەو بەرهەمە پیرۆزو چاك دەبێت!!".

من شانازی دەکەم بەم شاهیدیە مەزنە لەلایەن مامۆستای بیریار محەممەد قوتبەوە، کە بە پێنووسەکەی خۆی تۆماری کردووە، بە زمانی دەری بڕیوە، سوپاسی خوا دەکەم لەسەر نیعمەتو بەخشندەییەکانی، ئەمە لە ڕێزلێنانی خواوەیەبۆ من، سوپاسو منەت تەنها بۆ ئەوە، منیش لە ئامادەکردنی ئەم کتێبەشدا سووربووم لەسەر پەیوەستبوون بەو سیفاتانەوە کە مامۆستا محەممەد قوتب وەسفی منی پێکرد، ، ئومێدەخوازم کە پێکابێتم لەمەدا. . سەرکەوتوو بووبم تیایدا ـ **إن شاء الله** ـ.

لە دوای هەڵسەنگاندنەکە کتێبخانەی (الاقصی) لە عەممان داوای لێکردم بەشی یەکەمی نامەی ماستەرەکە چاپ بکرێت، منیش لە ژێر ناونیشانی (**سید قطب الشهید الحي**)دا چاپمکردو خوێنەرانیش پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد ـ سوپاس بۆ خوا ـ.

پاشان دکتۆرام هێنا لە تەفسیرو زانستەکانی قورئاندا لە ساڵی 1984، بابەتەکەشی بریتی بوو لە (**مدخل الى الظلال القرآن. المنهج الحركي في ظلال القرآن. في ظلال القرآن في ميزان**) بابەتەکانی سەید قوتبم دەرهێنا دەربارەی ئەمریکا لە

کتێبی (**أمريكا من الداخل بمنظار سيد قطب**). هەروەك بەشی دووەم لە نامەی ماستەرەکەمدا لە کتێبی (**نظرية تصوير الفني عند سيد قطب**)دا دەرهێنا. پاشان دەستمکرد بە دەرهێنانی زنجیرەی (**من كنوز القرآن**).

لەم قۆناغەدا کە لە دە ساڵ زیاترە (1978 - 1989)، بەپێی توانام هەموو ئەو زانیاریانەم کۆکردۆتەوەکە لە کتێبو بابەتەکاندا دەربارەی ژیانی سەیدنوسراون، ئێستەش جارێکی تر دەمەوێت کۆیان بکەمەوە، .

کاتێك لەمساڵدا چاوم پیاگێڕا، بینیم زۆرو چڕوپڕو سوودبەخشە، چاومگێڕایەوە بە کتێبی یەکەمدا (**سيد قطب الشهيد الحي**) بینیم مەبەستەکانی بەسەر چووەو زەمەن پێشی داوەتەوەو بەجێی هێشتووە!!. بەڵکو بە دانپیانانەوە دەیڵم ـ خۆم بێبەری ناکەم ـ چەند هەڵەیەکی مێژوویم بینی کە تێی کەوتبووم لە کتێبی (**سيد قطب الشهيد الحي**)دا. هەندێکیان هەڵە بووە لە مێژووی لەدایکبوونیدا، مێژووی دەرچوونی، مێژووی سەفەرکردنی بۆ ئەمریکا، مێژووی گەڕانەوەی لە ئەمریکا، مێژووی پەیوەندیکردنی بە برایانی موسڵمانەوە، لەگەڵ ئەو کارانەی پێیان سپاردبوو. . . جگە لەمانەش!، ئێستا دان بەوەدا دەنێم، کە بیانوم ئەوەیە بە دەست ئەنقەست نەمکردووە، من لە نووسەرەکانی ترەوە وەرمگرتووە، منیش شوێنیان کەوتم لەو هەڵانەدا کە ئەوانی تێکەوتبوون ـ بەتایبەتی مامۆستا یوسف ئەلعەزم، لە کتێبی (**رائد الفكر الاسلامي المعاصر الشهيد سيد قطب**)دا ـ. لەگەڵ ئەمەدا پۆزش دێنمەوە بۆ خوێنەری بەرێز، بۆ بوونی ئەو هەڵە مێژووییانە لە (**شهيد الحي**)دا، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم لەمەدا، ئێمە دەزانین کە ناتەواویو هەڵە لە سیفاتەکانی مرۆڤن.

لە بەردەم هەموو ئەمانەدا، بینیم بەرژەوەندی لە دەرکردنی کتێبێکی نوێدایە دەربارەی ژیانی سەید قوتب، کە ئەو هەڵانە بسڕێتەوە کە لەوەی پێش خۆیدا هەبوو (**سيد قطب الشهيد الحي**)، زانیاریەکی زۆرو چڕوپڕی بۆ زیاد بکات کە لەم ساڵانەدا دەستم کەوتوون، بەباشمزانی ئەم کتێبە بکەمە سێ بەشو سەرەتایەك.

بەم شێوەیە:

ـ سەرەتا: دەربارەی گەورەبوونی سەید قوتب، تیایدا دەربارەی گوندەکەیو ڕەچەڵەکو خێزانو باوكو دایكو براو خوشکەکانیو شێوەی سەید دوواوم.

ـ بەشی یەکەم: لەگەڵ سەید قوتب لە ڕێڕەوی ژیانە ئەدەبیەکەیدا. لەم بەشەی ژیانیدا (دە) دیمەنم دەرخستووە: ژیانی لە گوندەکە، خوێندنی لە قاهیرە، پیشەی لە وەزارەتی مەعاریف، پەیوەندی بە عەباس مەحمود عەققادەوە، جەنگە ئەدەبیو ڕەخنەییەکانی، ناردنی بۆ ئەمریکا، گەشتی ونبوونی، ئافرەت لە ژیانیدا.

ـ بەشی دووەم: لەگەڵ سەید قوتب لە ڕێڕەوی ژیانە ئیسلامییەکەیدا: سەرەتایەکم بۆ داڕێژاوە، تیایدا ئەو هەنگاوە دوورەم ڕوونکردۆتەوە کە خوای گەورە بە سەید قوتبی هەڵگرت، پاشان باسی هەر سێ قۆناغی ژیانە ئیسلامیەکەیم کردووەو (حەوت) دیمەنم لە ژیانە ئیسلامیەکەی خستۆتەڕوو: سەید قوتب لەگەڵ پیاوانی شۆڕش، سەید قوتب لە ڕێگەیدا بەرەو برایانی موسڵمان، سەید قوتب لەگەڵ برایانی موسڵمان، نەهامەتی یەکەمی لە زینداندا، سەرکردایەتیکردنی بۆ ڕێکخستنی نوێی برایان، نەهامەتی دووەمی لە زینداندا، دادگایی کردنو شەهیدکردنی.

ـ بەشی سێیەم: تایبەتم کردووە بە خستنەڕووی سیفاتو پاشماوەو بەرهەمەکانی سەید قوتب. بە باشم زانی کتێبەکە بەم ناونیشانە بێت (**سيد قطب من الميلاد الى الاستشهاد**) بەپێی ئەوەی کە دەدوێت دەربارەی هەموو ژیانی سەید قوتبو ڕێڕەوی ژیانی بدوێت، من پەلە دەکەمو دەڵێم: ئەم کتێبە درێژەیەکە بۆ ڕێڕەوی ژیانی سەید قوتب، وەرگێڕانی کەسایەتی سەیدو تۆمارکردنی ڕوداوەکانی ژیانی، نەك لێکۆڵینەوە بێت بۆ بیروڕاو بۆچوونەکانیو کێشانیان لە تەرازوودا و ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆ سەیدەو ئەوەی لەسەر سەیدە. بەڵکو لە کتێبی (**في ضلال القرآن في الميزان**)دا هەوڵی ئەوەم داوە، من لە کاتێکدا ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بە خوێنەرانی بەڕێز، داوایان لێدەکەم بە نهێنی دوعای چاکەم بۆ بکەن، ڕێزم لێ بگرن بە ڕاستکردنەوەی هەر هەڵە یان زیادکردنی هەر هەواڵو زانیاریەك کە لەم کتێبەدا دەیبینن و لێی داکەوتبێت، لەگەل ئومێدی

ئەوەدا کە متمانە پێکراوبێت، متمانەکردنێکی زانستیانە، تا پشت پێبەستنی دروست بێت، ئەو زانیاریانە ڕەوانە بکەن لەسەر ئەو ناونیشانەی خوارەوە ـ کە ناونیشانی خۆمە ـ تا بتوانم ـ بە پشتیوانی خوای گەورە ـ لە چاپی داهاتوودا بۆی زیاد بکەم.

من لە کاتێکدا کە ئەم پێشەکیە دەنووسم کە لە یادی بیستو سێهەمین ساڵیادی شەهیدکردنی ئەم بیریارو پێشەنگو بانگخوازە تێکۆشەرەو ئەم پێشەواگەورەیەداین، ئومێد دەخوازم کە ئەم کتێبە شایستە بێت بە پلەو پایەی سەید قوتب لەناوماندا، ببێتە سڵاوی گەورەیی‌و شکۆمەندی لە منەوە بۆ ئەو، لە شوێنی خۆیدا لە جیهانی نەمریدا ـ **إنشاء الله** ـ. داوا دەکەم خوای گەورە ئەم هەوڵە وەربگرێت‌و بیخاتە ترازوی چاکەکانمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. **وصلى الله على سيدنا محمد، و على اله و صحبه وسلم.**

**سێشەممە** 1410/1/17**ك**

1989/8/29**ز**

**دکتۆر سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی**

**صولیح ـ ص. ب:** 669

## سەید قوتب لە چەند دێڕێکدا

ناوی سەید قوتب ئیبراهیم شازلیە، لە گوندی مووشەی سەر بە پارێزگای ئاسیوت لە 1906/10/9 لەدایکبووە، ژیانی منداڵی‌و مێرد منداڵی لە گوندەکەیدا بەسەر بردووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لەوێ دەستپێکردووە.

لە ساڵی 1920 چووە بۆ قاهیرەو لەماڵی خاڵی ئەحمەد حسەین عوسمان ماوەتەوە، لە ڕێگەی خاڵیەوە حزبی وەفدی ناسیوەو دواتر ئاشنابووە بە عەباس مەحمود عەققاد.

پەیوەندی کردووە بە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتاییەوە بەپلەی**(الكفاءة)** بڕوانامەی ئەو قوتابخانەیەی بەدەست هێناوە، پاشان پەیوەندی کردوە بە **(تجهيزية دار العلوم)**ەوە. لەساڵی 1929 چووەتە کۆلیژی **(دارالعلوم)**و لەساڵی1933 تەواوی کردووەو بووەتە خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە ئاداب دا، دواتر بوەتە مامۆستا لەقوتابخانەی وەزارەتی مەعاریف داو بۆ ماوەی شەش ساڵ کاری کردووە.

پاشان گوێزرایەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف و لە کۆمەڵێك مەیداندا کاری دەکرد وەك چاودێری ڕۆشنبیری‌و پشکنین.

ساڵی1948 وەزارەتی ناوبراو لە گەشتێکی پەروەردەیی مەیدانیدا بە نوێنەری خۆی ناردی بۆ ئەمریکا بۆ ئاگاداربوون بەسەر پرۆگرامە پەروەردەیی‌و فێرکاریەکاندا لەوێ، پاش ئەوەی دوو ساڵ مایەوە، لە ساڵی1950 دا گەڕایەوە بۆ میسر.

لەگەڵ گەورە کارمەندەکانی وەزارەتی مەعاریفدا جیاوازی‌و ناکۆکی بۆدروستبوو، لە بەرەنجامدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لەوەزارەتی ناوبراو پێشکەش کرد بە چەند مانگێك دوای دەست پێ کردنی شۆڕش‌و دوای نزیکەی 19ساڵ خزمەت.

لەلاوێتیدا پەیوەندی کرد بە ڕێکخستنەکانی حزبی وەفدەوەو تاساڵی1942تیایدا مایەوە، لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی حیزبدا دەستی کرد بە نوسین‌و چەندین بابەت‌و لێکۆڵینەوەو هۆنراوەی بلاوکردەوە.

لەدوای وازهێنانی لە حیزبی وەفد بۆ ماوەی زیاتر لە10ساڵ خۆی بە دوور گرت لە هەر ئینتمایەکی ڕەسمی بۆ هەر کۆمەڵ‌و ڕێکخستن‌و گروپێك، تا ئەوکاتەی کەخۆی لە (کۆمەڵی برایانی موسوڵمان)دا دۆزیەوەو، بەشێوەیەکی کرداری لەساڵی1953 بوویە ئەندام لەو کۆمەڵەیەداو هەموو ژیانی لەگەڵیاندا بردەسەر.

لە لاوێتیدا ئەدەب و ڕەخنە جێگەی گرنگی پێدانی بوون. چەند ساڵێك بە کاری ڕەخنە گرتنەوە خەریکبو، چەندین بابەت‌و کتێبی لەمەیدانی ڕەخنەدا نووسی، چەندین چامەی شیعری بەرزی نوسی، هەروەها دیوانێکی بلاوکردەوە کەهەندێك لەو چامانەی لەخۆ گرتبوو.

له چلەكاندا ڕویكردە قورئان خوێندنو لێی دەكۆڵیەوە لێكۆڵینەوەیەكی ئەدەبیو ڕەخنەگری، وەبیری كردەوە لەدەركردنی(كتێبخانەی قورئانی نوێ)، پاشان دەستی كرد بە لێكۆڵینەوەی ئیسلام، لێكۆڵینەوەیەكی فیكریو نەزەری، چەند كتێبێكیشی لەم بارەیەوە دەركرد.

قورئانی پیرۆز هەنگاوێكی نوێی بە سەید قوتب ناو، پێشەوایەتی هەنگاوەكانی سەید قوتبی كرد بۆڕێگای بانگەوازو كارو تێكۆشان، ئیتر سەید قوتب لەسەر ئەم ڕێگایە بەردەوامیی وەرگرتو دروشمەكانی ڕێی بۆ بانگخوازان ڕوون كردەوە، لەگەڵ بەردەوامی هەنگاوەكانیدا لێكۆڵینەوەی بۆ قورئان بەردەوام بوو تابەرەنجامی لێكۆڵینەوەكەی لە تەفسیری(**فی ظلال القران**)دا پێشكەش كرد.

سەید قوتب مژدەی بە شۆرش دەدا، لەسەردەمی پاشایەتیدا بانگی بۆ شۆڕش دەكردو نەخشەی بۆدادەناو لەو پێناوەدا دەنگی بەرز دەكردەوە، كاتێك شۆڕش بەرپابوو سەید قوتب لەگەڵ پیاوانی شۆڕشو هەر لە سەرەتای كارەكەوە كاری دەكرد، بەلاّم كاتێك پیاوانی شۆرش لەئامانجەكانی گەل لایانداو، ئامانجەكانیان لەدژی ئامانجە سیاسیەكانی سەید قوتبدا وەستایەوە، سەید وازی لیّ هێنان ولێیان دوركەوتەوەو پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاندن و، بویە یەكێك لەوكەسانەی لەڕیزی پێشەوە لەكۆمەڵی برایانی مەسولّمان دا كەوتە بەر ئازارو ئەشكەنجەو قەتڵو عامی پیاوانی شۆڕشەوە، ئەوەی كەبەسەری هات بەسەری هات! پاشان لەلایەن دادگای شۆڕشەوە پانزدە ساڵ بەندی بەسەردا سەپێنرا، زۆربەی هەرە زۆری ماوەی بەندیەكەی لە نەخۆشخانەی بەندیخانەی لیمان توررە بەسەربرد بەهۆی ئەو نەخۆشیانەی كەتوشی سیەكانوسنگ وگەدەو ڕیخۆڵەكانی بووبوو.

لەساڵی1964 بەلێبوردنێكی تەندروستی لە بەندیخانە دەركرا دوای ئەوەی عەبدولسەلام عارف سەرۆكی عێراقی ئەوكاتە داوای ئازاد كردنی كرد. لەدەرەوەی بەندیخانە تەنها چەند مانگێكی بەسەربرد و بۆجارێكی تر لەگەڵ دەیەها هەزار لەبرایانی مسولّماندا لەهاوینی ساڵی1965توندیان كردەوەلەزیندان بە بیانوی پیلاندانان بۆ گۆڕینی سیستەمی فەرمانڕەوایی. . .

بە ڕەزامەندی حەسەن هوزەیبی ڕابەری گشی برایان. سەید **قوتب** بوویە چاودێری ڕێكخستنی جموجوڵی نوێ برایانی موسولّمان و هەڵدەستا بە ئاراستە كردنی فكرییو پەروەردەیی ڕیكخستن.

دوای دەستگیركردنەوەی بۆ جاری دووەم لە ساڵی 1965دا نارەحەتیو ئەشكەنجەو ئازارێكی بێوێنەی چەشت، ئازارێك مایەی لێكهەڵوەشاندنی ئەندامەكانی لاشەی مرۆڤ بوو!!

لە دادگایەكی ستەمكارانەو سەركەشانەدا فەریق فوئاد دەجەوی فەرمانی لەسێدارەدانی بەسەر سەید قوتب و دوو لە براكانیدا سەپاند، بە دەرچوونی فەرمانی لەسێدارەدانی سەید قوتب، زۆرێك لە خەڵكی جیهانی ئیسلامی بێزارییان دەربڕی، بەتایبەت زانایانو بیریارانو بانگخوازان، توانایەكی زۆریان خستەگەڕ تاكو جەمال عەبدولناسری سەرۆكی میسر ئاسانكاری لە حوكمەكەیدا بكات، بەلاّم عەبدولناسر سەرجەم هەوڵەكانی بەرپەرچدانەوەو ئیمزای فەرمانی لەسێدارەدانەكەی كردو، فەرمانی دەركرد كە دەبێت زۆر پەلەبكرێت لە جێبەجێكردنیدا!!.

قامچی بەدەستەكانی بەندیخانەی جەنگیی پێش دەركەوتنی گزنگی بەرەبەیانی رۆژی دووشەمە 1966/6/29ز، بەرامبەر 13 جەمادی یەكەمی 1386ك فەرمانی لەسێدارەدانەكەیان جێبەجیّ كرد.

سەید قوتب 59 ساڵو 10 مانگو 20 ڕۆژ ژیا، خوای گەورە ژیانێكی كامەرانی بۆ بڕیاردا، ئەوەبوو بوویە شەهیدی ڕێگەی خوا، خوای گەورە لە دوای شەیدكردنیەوە زیندوویەتی بۆ بیرە ئیسلامیە حەرەكیەكەی بڕیاردا، بوویە خاوەن پلەوپایە و ڕێزێكی بەرزو شكۆدار لەلای زانایانو بانگخوازانو تێكۆشەرانی ئیسلام.

سەید قوتب (31) كتێبی لە ئەدەبو ڕەخنەو بیری ئیسلامیدا لە دوای خۆی بەجێهێشت، لە سەروو هەموویانەوە (**في ظلال القرآن**) كە بە هۆیەوە دادەنرێت بە ڕاڤەكارو نوێكەرەوەو ڕابەری بیری ئیسلامی ڕەسەن.

## بەروارەكان لە ژیانی سەید قوتبدا

لێرەدا ئاماژە بەو ڕووداوانە دەکەین لە ژیانی سەیددا کە لێکۆڵەرو توێژەران لەسەری وەستاون، بەڵام بە پشیوانی خوای گەورە لە بەشەکانی تردا بە درێژیو بە بەڵگەو سەرچاوەوە لەم بەروارانە دەدوێین.

ـ لە گوندی (مووش) لە بەرواری 1906/10/9 لەدایکبووە.

ـ لە ساڵی 1912 چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی لە هەمان گونددا، لە ساڵی 1918دا تەواوی کردووەو بووەتە هەڵگری بڕوانامەی سەرەتایی.

ـ بەبۆنەی شۆڕشی (1919)ەوە دوو ساڵ لە قوتابخانە دابڕاوە.

ـ ساڵی 1920 چووە بۆ قاهیرە بۆ خوێندنو لەلای خاڵی ئەحمەد حسەین عوسمان لە گەڕەکی زەیتون ماوەتەوە.

ـ لە ساڵی 1922 پەیوەندی کردووە بە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتاییەوە لە قاهیرە، کە ناوی قوتابخانەی (عبدالعزیز) بوو، سێ ساڵی خوێندنی تێدا تەواوکردو بوویە هەڵگری مۆڵەتی (**الكفاءة**) بۆ خوێندنی سەرەتاییو، بەهۆی لێهاتووییەوە لە خوێندندا لە ساڵی 1925 پەیوەندی بە قوتابخانەی دواناوەندیەوە کرد، کە بریتی بوو لە (**تجهيزية دار العلوم**)[1]، لەم قوتابخانەیەدا تەنها قوتابیە لێهتووەکان وەردەگیران، ئەم قوتابخانەیە قوتابیانی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لە کۆلێژی (**دار العلوم**) وەربگیرێن.

ـ لە ساڵی 1929 پەیوەندی بە کۆلێژی (دارلعلوم)ەوە کردو ساڵی 1933 کۆلێژی ناوبراوی تەواوکردو بوویە هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە ئەدەبدا.

ـ 1933/12/2 لە وەزارەتی مەعاریف بە مامۆستا دامەزرێنرا، یەکەم مووچە کە وەریگرت شەش (جونەیھ) بوو.

یەکەم خزمەتی لە قوتابخانەی (**الداودية**) بوو لە قاهیرە، لە بەرواری 1933/12/2 بۆ ماوەی دوو ساڵ تیایدا خزمەتی کرد.

ـ 1935/9/1 وەزارەتی مەعاریف گواستیانەوە بۆ قوتابخانەی (بەنی یوسف)، لەم بەروارەوە سەید خانوویەکی جوانکیلەی لە حەلوان بە کرێ گرت، دواتر هەموو ژیانی لەگەل کەسوکارەکەیدا لەو خانووەدا بردەسەر.

ـ ناونیشانی خانووەکەیان (45 شەقامی حەیدەر ـ حەلوان) دواتر خانووەکەی لە خاوەنەکەی کڕیەوە.

ـ 1940/3/1 گواسترایەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف تا دەسبەکاربێ وەك (**مُحَرِر عربي**) لە چاودێری ڕۆشنبیری لە وەزارەتدا.

ـ 1942/7/1 بە هۆی گرفتێکەوە لە نێوان سەیدو ئەحمەد نەجیب هیلال کە وەزیری مەعاریف بوو گوازرایەوە بۆ بەشی وەرگێڕانو سەرژمێری لە وەزارەتی مەعاریف ، گرفتەکە هێندە سەید قوتبی بێزارکرد، ویستی دەست لەکار کشانەوەی ڕابگەیەنێ ئەگەر هاتنە ناوەوەی دکتۆر تەهاحسەین نەبوایە لە گرفتەکەدا کە لەو کاتەدا تەهاحسەین ڕاوێژکاربوو لە وەزارەتدا.

ـ نۆ مانگی لە پشکنیندا بەسەر برد لە قوتابخانەکانی سەعیدو دەلتادا، لە نیسانی 1945 گەڕایەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری لە وەزارەتی مەعاریف کە ئەحمەد ئەمین سەرۆکایەتی دەکرد.

ـ نیسانی 1945 یەکەم کتێبی ئیسلامیی دەرکرد، بە ناونیشانی (**التصوير الفني في القرآن**)و، لە ساڵی 1945ەوە وردە وردە لە عەباس مەحمود عەققاد دوورکەوتەوە.

ـ 1948/11/3 لە ئەرکێکی مەیدانیدا بۆ ئاگاداربوون لە پرۆگرامەکانی خوێندن لە ئەمریکا، بە کەشتیەك گەشتی بۆ ئەمریکا کرد.

ـ 1950/8/20 دوای ئەوەی دوو ساڵی لە ئەمریکا بەسەربرد بە فڕۆکە گەڕایەوە بۆ قاهیرە.

دوای گەڕانەوەی بە (چاودێری یاریدەدەر) لە نووسینگەی وەزارەتی مەعاریفدا لە وەزارەت دامەزرێنرا کە لەم کاتەدا ئیسماعیل ئەلقەبانی وەزیر بوو.

---

[1] ـ ئەم ناوانە پەیوەستن بە یاسای خوێندنی ئەوکاتەی میسرەوە.

ـ 1951/10/22 گوازرایەوە بۆ ناوچەی قاهیرەی ڕۆژئاوا.

ـ 1952/5/13 گەڕێنرایەوە بۆ کارەکەی پێشووی (چاودێری یاریدەدەر) لە نووسینگەی وەزیر بۆ لێکۆڵینەوەی هونەریو پرۆژەکان.

ـ 1952/10/18 دوای جیاوازیەکی بەردەوام لە نێوان سەیدو پیاوانی وەزارەتدا، بەهۆی ئەوەی کە دەبوونە بەربەست لە بەردەمیدا، بەهۆی ڕەدکردنەوەی بیروبۆچوونە ئیسلاحیەکانەوە کە ڕوویەکی ئیسلامییان هەبوو، سەید دەست لەکارکێشانەوەی پێشکەش بە وەزیری مەعاریف کرد.

ـ لەبەر ئەوەی سەید 1933/12/2 پەیوەندی کردبوو بە وەزارەتەوە دەبوایە 20 ساڵ خزمەتی بکردایە تا مووچەی خانەنشینی بۆ ببڕایەتەوە، واتە تا 1953/12/3 خزمەتی بکردایە.

بەڵام سەید قوربانیدا بە ئیشوکارو ئەو خزمەتە دوورو درێژەی کە هەژدە ساڵو بیستو یەك مانگی خایاندو ئەگەر یەك ساڵو یەك مانگی تر بمایەتەوە لە خزمەتدا، ئەوە مووچەی خانەنشینی مسۆگەر دەکرد بۆ هەمیشەیی!.

ـ وەزیری مەعاریف ئیسماعیل قەبانی دەست لەکارکێشانەوەی سەید قوتبی زۆر لا گران بوو، لەبەرئەوە چەندین جار هەوڵیدا سەید قەناعەت پێبکات دەست لەکارنەکێشێتەوە، بەڵام سەید هەر سووربوو لەسەر وازهێنان، لە کۆتاییدا وەزیری مەعاریف دەست لەکارکێشانەوەکەی بەرزکردەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، داوایکرد کە ئەو ماوەی خزمەتەکەی ماویەتی مووچەی خانەنشینی بیگرێتەوە بخرێتە سەر خزمەتە نۆزدە ساڵییەکەی، بەڵام ئەنجومەنی وەزیران کە پێکهاتبوون لە پیاوانی شۆڕش لەسەرو هەموویانەوە عەبدولناسر ڕەزامەندی نواند لەسەر دەست لەکارکێشانەوەکە لە بەرواری پیشکەشکردنیەوە واتە لە 1952/10/18 !.

یەکەم دەستبەسەرکردنی سەید قوتب لە سەرەتای ساڵی 1954 بوو، بۆ ماوەی سێ مانگ لەگەڵ سەرکردەکانی برایاندا لە بەندیخانە مایەوە.

ـ دەست بەسەرکردنەوەی دووەمی سیناریۆکەی ڕووداوی(ئەلمەنشیە)بوو، لە 1954/10/26 لەگەڵ هەزاران کەس لە برایانی موسڵماندا بە بیانووی ئەوەی گوایە برایانی موسڵمان پیلانی تیرۆرکردنی جەمال عەبدولناسریان داڕێژاوە.

ـ ساڵی 1955 سەید قوتب درا بە دادگا، دادگا فەرمانی 15ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاند.

ـ سەرۆکی عێراقی عەبدولسەلام عارف داوای لە عەبدولناسر کرد، تاکو سەید ئازاد بکات، ئەوەبوو لە ساڵی 1964 بە لێبوردنێکی تەندروستی لە بەندیخانە دەرچوو.

ـ عەبدولناسر لە مۆسکۆوە لە ڕاگەیاندنێکیدا سەبارەت بەوەی پیلانێکیان ئاشکراکردووە کە گوایە برایانی موسڵمان بە سەرۆکایەتی سەید قوتب کێشاویانە بۆ تیرۆرکردنی سەرۆكو هەڵگێڕانەوەی یاسی فەرمانڕەوایی، دوای ئەم ڕاگەیاندنە سەید قوتب لە 1965/8/9 دەستگیرکرایەوە.

ـ 1965/12/19 لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەیددا لە زیندانی جەنگیدا بۆ ماوەی سێ رۆژ دەستیپێکرد.

ـ 1966/4/12 دادگایی کردنی سەید دەستیپێکرد، دادوەری دادگا فەریق محەمەد فوئاد ئەلدەجەوی بوو.

ـ 1966/8/21 دەجەوی فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ سەید دەرکرد.

ـ شەوی دووشەمە 1966/8/29 زۆر بە پەلەو لە دوای هەفتەیەك بەسەر دەرچوونی فەرمانی لەسێدارەدانەکەیدا، فەرمانی لەسێدارەدان بەسەر سەید قوتبو دوو براکەیدا محەمەد یوسف هەواشو عەبدولفەتاح ئیسماعیل جێبەجێکرا، شایانی باسە ئەم جۆرە کارە لە مێژووی هیچ دادگایی کردنێکدا ڕوینەداوە.

## گەشەكردنی سەید قوتب

سەید لە گوندی مووشەی سەر بە پارێزگای ئاسیوت لە سەعیدی میسر لەدایكبوو، زۆرینەی دانیشتووانی گوندەكە موسڵمان بوون، لەگەڵیاندا هەندێك گاور دەژیانو كەنیسەیەكیان هەبوو لە گوندەكەدا، گوندەكە دەكەوێتە نێوان دوو شاخی بچووكەوە كە لەگەڵ دەشتەكانیاندا دەوری گوندەكەیان داوە.[1]

جیاوازی كۆمەڵایەتی لە نێوان دانیشتووانی گوندەكە هەستی پێنەدەكراو خۆشەویستیو هاوكاری جێگەی جیاوازی كۆمەڵایەتی گرتبووەوەو هەموویان پێكەوە دەژیان، دوور لە ڕقی چینایەتیو چەوساندنەوەی یەكتر. ئاستی گوزەران لە چاو گوندەكانی تردا گونجاو بوو، لە پلەیەكی مامناوەندیدا بوو، هەموو خێزانێك لەم گوندەدا خانوویەكی تایبەتی خۆی هەبوو، خانووی ئەو خێزانەی كە سەید منداڵیو مێردمنداڵی تێدا بەسەربرد، خانوویەكی جوانو دڵگیر بوو، بەڵام ئەم خانووە تا سەر بۆ خێزانەكەی سەید نەمایەوەو باوكی سەید بە هۆی فشاری قەرزاریو ئاتاجیەوە ناچاربوو بیفرۆشێت، كڕیاری خانووەكەش یەكێك بوو لەقیبتیەكانی گوندەكە.[2]

فرۆشتنی خانووەكە كاریگەری زۆری لەسەر ئەندامانی خێزانەكەیان هەبوو، چونكە باوكو دایكو باوباپیرو منداڵەكان هەموویان گەورەبووی نێو ئەم خانووە بوونو هەموویان یادگارییان لەو خانووەدا هەبوو، لەگەڵیدا ڕاهاتبوون.

جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوانەی دەربارەی ژیانو ڕەچەڵەكی سەید قوتب شتیان نووسیوە سەبارەت بەوەی ئایا سەید لە بنەڕەتدا میسریە یان هیندی؟ هەندێكیان ئەوەیان سەلماندووە كە سەید لە بنەڕەتدا هیندیەو بۆ ئەم ڕایەش پشتیان بەستووە بە وتەیەكی سەید خۆی كە دەڵێ لەكاتێكدا مامۆستا ئەبولحەسەن عەلی ئەلنەدەوی چاوپێكەوتنی لەگەڵ دەكا لە میسر لەساڵی 1951، لەو چاوپێكەوتنەدا ئەوە بە مامۆستا نەدەوی ڕادەگەیەنێ كە ئارەزووی گەشتێك دەكات بۆ هیند، نەدەوی وتەكەی پیت بە پیت دەگوێزێتەوە (هۆی ئاسایی و سروشتی، لەبەرئەوەی باپیرەی شەشەمان هیندی بووە، ناوی عەبدوڵڵا بووە، تاكو ئێستاش ڕووكاری هیندی بوون ماوەتەوە لە خێزانەكەماندا).[3]

لەگەڵ ئەوەدا كە سەید بەڵگەی ئەوەی پێشكەش كردووە، كە خێزانەكەیان لە هیندەوە هاتووە، ئەوەبوو ناوی باپیرەی شەشەمی برد كە لەوێوە هاتووە، بەڵام محەمەد قوتبی برای ئەم چیرۆكە ڕەتدەكاتەوە، چونكە من لە ماڵی خۆیان لە مەككەی پیرۆز چاوپێكەوتنم لەگەڵ كرد، وتی: "ئەو چیرۆكە ـ چاوپێكەوتنەكەی نێوان سەیدو نەدەوی ـ تەنها گومانە".

### خێــزانـــەكـــەی

سەید قوتب لە بارەی بنەماڵەو پلەوپایەی بەرزی خێزانەكەیانەوە لەو گوندەدا دەڵێ: (گەورەبوو لە خێزانێكدا كە سەروەتی زۆری نەبوو، بەڵام دیاردەی پلەدارییان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە كاتێك لە كاتەكاندا خاوەنی سەرمایەیەكی گەورە بوون، بەڵام بەهۆی میراتەوە سەرمایەكە دابەشكراو كزبوو، بڕێكی كەمی بۆ باوكی مایەوەو بەردەوام كەمیشی دەكرد)[4]. (دایكیشی لە خێزانێكی هاوشێوەو ڕەچەڵەكدار بوو، ئەوەی بەسەر خێزانی باوكیدا هات هەمان شت لە خێزانی دایكیشی ڕوویدا پیت بە

[1]- طفل من القرية: ل144ء 184، الاطياف الأربعة ل85.
[2]- الاطياف الأربعة: 85.
[3]- تذكرات سائح في الشرق لعربي: نەدەوی، ت153.
[4]- طفل من القرية: ل21.

پیت. بەڵام زیادەیەکی خێزانی دایکی بەسەر خێزانی باوکیدا ئەوەبوو کە دوو خاڵی لە گوندەکەوە نێردرابوونە زانکۆی ئەزهەر، هەروەك دابی زۆربەی خێزانە دەوڵەمەندەکانی گوند بەو شێوەیە بوو، لەم خێزانەدا جۆرێك لە گەشەی زانستی دروستبوو هاوچەشنی ئەو پلەوپایەیە گوندنشینییەی کە هەیانبوو. زیاد لە هەموو ئەمانە، باپیرەی دایکی مانگێك لە تەمەنی لەگەڵ خێزانەکەیدا لە قاهیرە بردەسەر، کاتێك گەڕایەوە بۆ گوندەکەیان خانوویەکی تێدا دروستکرد لە یاساو ڕێکوپێکیو دابو نەریتو ئاستیدا تا ئاستێك لە خانووەکانی پایتەخت دەچوو.

لەم ژینگەیەدا پێگەیشت، هەموو ئەوەی لە چواردەوریدا بوو ئەو هەستەی بۆ دروست دەکرد کە ئەم لە نێوەندێکی جیاوازدا دەژیا، جیا لە نێوەندی گوندەکە). [1]

خێزانەکەیان ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی هەبوو لە گوندەکەدا، بە شێوەیەك ناوو ناوبانگی گوندو گەشەی زانستی پێکەوە کۆکردبووەوە. خەڵکی گوندەکە بە چاوی ڕێزو گەورەییەوە دەیانڕوانیە باوکی، بەشێوەیەك پلەو پایەیەکی بەرزی گرتبوو لە گوندەکەدا.

## باوکی سەید قوتب

حاجی قوتب ئیبراهیمی باوکی سەید، بەخشندەو میواندۆست بوو، زۆری دەبەخشیەوە بەسەر منداڵو ئەندامانی خێزانەکەیدا، بەرامبەریان چروکی نەدەنواند بە هیچ شتێك، لە پێش هەموو خەڵکەوە تازەترین جۆرەکانی سەوزەو میوەی بۆ دەستەبەر دەکردن.

باوکی ڕێژی زۆری کرێکارە غەریبەکانی دەگرت کە لە زەوییەکەیدا کاریان دەکرد، لە هەمان خواردنی خێزانەکەی خواردنیشی بەوان دەدا، لە دیمەنی بەخشندەییەکانی باوکی سەید، ساڵانە سازدانی زۆرێك لە بۆنەکان بوو لە ماڵی خۆیدا، بەتایبەت بۆنەی هەردوو جەژنو عاشووراو نیوەی شەعبانو یادی شەوڕەویو بڵندبوونەوە. لە ماڵەکەیدا قورئانخوێنەکان کۆدەبوونەوەو قورئانیان دەخوێند، لە دوای تەواوکردنی قورئان چاکترین جۆری خواردن بۆ قورئانخوێنەکانو ئامادەبووان دروست دەکرا لە بەیانیو نیوەڕۆو ئێوارەدا. [2]

## گرنگیپێدانە سیاسییەکانی باوکی سەید

باوکی سەید پیاوێکی ڕووناکبیر بوو، شارەزایی لە لایەنەکانی مەعریفەو ڕۆشنبیریدا هەبوو، خاوەنی هۆشیارییەکی سیاسی بوو، یەکێك بوو لە خوێنەرانی ڕۆژنامەکانو هاوبەشی هەبوو لە ڕۆژنامەی (حزبی نیشتمانی) کە ڕۆژانە بە ناوی **(اللواء)**ەوە دەردەچوو، ئەندامی لیژنەی حزبی ناوبراو بو لە گوندەکەدا، باوکی سەید حزبیەکی چالاك بوو، ماڵەکەی کردبووە مەڵبەندێکی سیاسیو مەیدانێك بۆ ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر، خەڵکی گوندەکە بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامەی **(اللواء)**و ئاگاداربوون بەسەر دوا هەواڵە جیهانیو ناوخۆییەکاندا سەردانی ماڵەکەیان دەکرد.

باوکی خاوەنی ڕۆڵ بوو لە گوندەکەداو لە زەمینەسازیدا بۆ شۆڕشی 1919، زۆرێك لە کۆبوونەوە بە ئاشکراو ـ هەندێکی تر بە نهێنی ـ لە ماڵەکەیدا ئەنجام دەدراو، تیایدا بەشداربووان باسی پلانی شۆڕشو شێوازەکانیان دەکرد لە گوندەکەدا. [3]

---

[1] - طفل من القرية: ل21.

[2] - طفل من القرية: ل75 - 79.

[3] - طفل من القرية: ل 145 – 146.

## گرنگیپێدانە ئیسلامیەکانی باوکی سەید

پەیوەندی باوکی بە خوای گەورەوە زۆر بەهێز بوو، پیاوێکی دیندار بوو، پارێزگاری لە نوێژەکانی دەکرد، زۆربەی کاتیش بە جەماعەتو لە مزگەوتدا ئەنجامی دەدان، زۆرجار منداڵەکەی (سەید قوتب)ی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ مزگەوتو دواتر کە سەید گەورەبوو گەشتە تەمەنی (10) ساڵی خۆی دەچوو بۆ مزگەوتو سووربوو لەسەر ئەوەی نوێژەکانی بە کۆمەڵ ئەنجامبدات.

باوکی سەید فەرمانی حەجکردنی بەجێهێنا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی باوەڕەکەی، لە پێناوی خوادا زۆری دەبەخشی بەسەر هەژارو کەمدەستدا، لە ڕووداڵەتەکانی پەیوەستی حاجی ئیبراهیم قوتب بە ئیسلامەوە ئاهەنگەکانی خەتمی قورئان بوو کە لە ماڵەکەی خۆیدا بە بەردەوامی سازی دەکردن بەتایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا.

قیامەت لەگەڵ هەستیدا تێکەڵ بووبوو، زاڵبووبوو بەسەر جوڵەو کارەکانیدا، سەید قوتب کتێبی (**مشاهد القيامة في القرآن**)ی پێشکەش کردووە بە باوکیو لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت: (بە ڕاستی لە هەستمدا ترسان لە ڕۆژی دواییت چەسپاند، کە من هێشتا منداڵ بووم ئامۆژگاریت کردمو ڕاتچڵەکاندم، بەڵام تۆ لەبەرچاومدا دەژییایت، کە ڕۆژی دوایی لە بیرتدایەو یادەوەرییەکانی لە ویژدانتدایە، لەسەر زمانتە، من واملێکدەدایەوە کەئەو توندوتیژییەی تۆ کاتێك مافی کەسێکت لەسەربووایە،یان ئەو لێبووردنەت لەو مافانەی کە هی خۆت بوو، دەگەڕایەوە بۆ ترسانت لە ڕۆژی دوایی، تۆ لە خراپەکردن دەبوورایت لە کاتێکدا توانای بەرپەرچدانەوەیت هەبوو، تاکو بێتە مایەی لێبووردن لە تاوانەکانت لە ڕۆژی دواییدا، تۆ هەندێ جار چاکەت دەکرد بەوەی بۆ خۆت پێویستت بوو تاکو ببێتە توێشوو لە ڕۆژی دواییدا. بەڕاستی وێنە چەسپاوەکەت لە خەیاڵمدایە کە ئێمە هەموو ئێوارەیەك کاتێك لە نان خواردنی شێوان لێدەبووینەوە (**فاتحة**)ت دەخوێندو ئاڕاستەت دەکرد بۆ گیانی باوكو دایکت لە ماڵی دواڕۆژ، ئێمەش منداڵی بچووکی تۆ بووین، لاساییمان دەکردیتەوەو بە پچڕپچڕی وەك تۆ ئایەتەکانمان دەوتەوە، پێش ئەوەی بە تەواوی لەبەریان بکەین).[1]

## دایکی سەید قوتب

دایکی سەید قوتب لە خێزانێکی خاوەن پلەوپایە بوو لە گوندەکەدا، مایەك لەگەڵ باوکی لە قاهیرە ژیابوون پێش ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ گوندو لەوێ جێگیربن.

چوار برای هەبوو، دوانیان لە ئەزهەر دەیانخوێند، خێزانەکەیان ناوو ناوبانگی زانستیو ئایینیان پێکەوە گرێدابوو.

دایکی سەید ئافرەتێکی دیندار بوو، ڕازاوەبوو بە ڕەوشتە جوانەکان، لەگەڵ ئەوەی هەموو کەلوپەلو موڵکی خێزانەکە فرۆشراو هیچی نەما، ئەم ئافرەتە بێزار نەبوو، بەڵکو ئارامی گرتو ڕازیبوو بەو بەشەی خوای گەورە بۆی هێشتنەوە، بە ئومێدو متمانەو یەقینەوە دەژیا. ئافرەتێکی زۆر بە بەزەیيو بەخشندە بوو لە پێناوی خوادا، خۆی هەڵدەستا بە ئامادەکردنی خواردنی ئەو هەموو کرێکارە کە لە کێڵگەکەیاندا کاریان دەکرد، هەر خۆی خواردنی ئەو قورئانخوێنانەی ئامادە دەکرد کە دەهاتن بۆ ماڵیان بۆ قورئان خوێندن. هەموو ئەمانەی بە تەواوی ڕەزامەندی دەروونییەوە دەکرد، چونکە بەمکارەی لەخوا نزیك دەبوویەوە.[2] حەزی لەوەبوو گوێ لە قورئان بگرێتو دەکەوتە ژێر کاریگەریەکەیەوە.

سەید لەمبارەوە ئاگادارمان دەکاتەوە لە کاتێکدا یەکەم کتێبی ئیسلامیی خۆی پێشکەش بە دایکی دەکات بە ناوی (**التصوير الفني في القرآن**)و تیایدا دەڵێت: (درێژەی دەخایاند کە لە گوندەکەداو لە پشت پەنجەرەوە گوێت دەگرت بۆ قورئان خوێنەکان کە لە ماڵماندا بە درێژایی مانگی ڕەمەزان قورئانیان دەخوێند، منت لەگەڵدا بووم دەمویست وەك منداڵ یاریو گاڵەگاڵ بکەم، لەلایەن تۆوە ئاماژەیەکی خێراو چرپاندنێکی بێدەنگکەر دەیگێڕامەوەو بێدەنگ دەبوومو لەگەڵ تۆدا گوێم لە قورئان خوێندنەکە دەگرت، دەروونم مۆسیقای قورئان خوێندنەکەی دەچەشت ئەگەرچی تا ئەو کاتە لە واتاکەی نەدەگەیشتم:

---

[1] - مشاهد القيامة: 5 بە کورتکراوەیی.

[2] - طفل من القرية: 192.

کاتێك لەبەر دەستەکانی تۆدا گەورەبووم منت نارده قوتابخانەی سەرەتاییەوه لە گوندەکەدا، یەکەم ئاواتت ئەمە بوو خوای گەوره دەروازەی چاکەم لێبکاتەوەو قورئان لەبەربکەمو دەنگێکی خۆشم پێببەخشێ تاکو هەموو کات قورئانت بۆ بخوێنم).[1]

دایکی سەید قوتب هاوسەری دووەمی باوکی بوو، چونکە لە پێش ئەوەوە ژنێکی تری هێنابوو. سەید قوتب یەکەم منداڵی کوڕی دایکی بوو، لەبەرئەوە گرنگیەکی زۆری پێدەدا، کردبوویە جێگەی هەمووهیواو ئاواتێکی، لەسەر ئیمانو غیرەتو سەربەرزیو توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی بونیادی کەسایەتی سەیدی دەنا.

دایکی دەیویست سەید پێشوەخت ببێتە پیاو، لەبەرئەوە سەید لەگەڵ ئەوەدا کە منداڵ بوو لە هەموو ڕواڵەتێکی منداڵی خۆی بە دوور ئەگرت. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی دایکی کە دەڵێت: (ئەو گەورەییەی کە لە منداڵیەوە خستە ناخمەوە، وات لێکردم کە ڕابکەم لە هەموو ڕواڵەتێکی منالآنە).[2]

دایکی دوای ئەوە لەگەڵ سەید لە قاهیرە جێگیربوو کۆچی دوایی کرد ، کۆچکردنەکەشی لە ساڵی 1940ز دا بوو.

دایکی سەید پێنج منداڵی هەبوو، دوو کوڕو سێ کچ کە ئەمانەن: نەفیسە، ئەمینە، حەمیدە،سەید، محەمەد.

## خوشك وبراكانى سەيد قوتب

* **نەفیسە:** سێ ساڵ لە سەید گەورەتر بوو، مارەبڕا لەبەکرشافع، نەفیسە چیرۆکێکی پڕ لە جیهادو تێکۆشانو ئارامگرتنی هەیە. ئەوەبوو زیندانی کراو ئازارو ئەشکەنجە درا وەك هەردوو کوڕەکەی، یەکەمیان بەناوی ڕەفعەت کە قوتابی کۆلێژی ئەندازیاری بوو لە زانکۆی قاهیرە، بە تۆمەتی هەستان بە ڕۆڵی ئەڵقەی پەیوەندی لە نێوان سەید قوتبی خاڵیو لە نێوان سەرکردەکانی تری ڕێکخستنی برایاندا دەستگیرکرابوو. . ویستیان لە دژی خاڵی شاهیدی بداتو دان بنێت بە شتێکدا کە نەبووە! بەلآم ڕەفعەت ئارامی گرتو دامەزراو بوو، ئازارو ئەشکەنجەدانیشی هێندە زۆر بوو لاشەی بەرگەی ئەو ئەشکەنجە توندو تیژەی نەگرتو گیانی پاکی سپاردو، بە شەهیدی گەشت بە خوای خۆی لە بەندیخانەی جەنگیدا. نەفیسە زۆر ناڕەحەت بوو بە شەهیدبوونی ڕەفعەتی کوڕی بەلآم ئارامی گرتو خۆڕاگر بوو.

هەروەها کوڕی دووەمی بە ناوی عەزمی کە قوتابی کۆلێژی پزیشکی بوو لەوکاتەدا دەستگیرکراو هێندە ئەشکەنجە درا نزیك بوو ئەویش لە بەندیخانەدا گیان لەدەست بدات.

* **ئەمینە:** ئەمینە گرنگی بە لایەنی ئەدەبی دەداو هاوبەشی هەبوو لە کاری ئەدەبییدا، بە چەند کورتە چیرۆکێکی خۆی بەشداری براکانی کرد لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا (**الأطياف الأربعة**).

ئەمینە مارەبڕدرا لە یەکێك لە زیندانییەکان لە ساڵی 1954 کە ناوی کەمال ئەلسەنانیری بوو. لەکاتێکدا ئەم برایە لە زیندانی قەنادا بوو، ئەمینە هەمووجار سەردانی دەکرد، سەنافیری بەزەیی بە ئەمینەدا هاتەوەو پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کە گرێبەستی هاوسەرگیریەکەیان هەڵبووەشێننەوە، بەلآم ئەمینە مانەوەی قبوڵکرد، زۆر بە وەفابوو بۆ دەسگیرانەکەی، ئەشێت ماوەی دەسگیرانداری ئەمینە لە سەنانیری لە درێژترین ماوەکانی دەسگیرانداریێتی بێت.

لەدوای ئەوەی کەمال سەنانیری لە سەرەتای حەفتاکانداو لە ساڵی 1973 لە زیندان هاتەدەرەوە ئەمینەی گواستەوە، لەوکاتەدا تەمەنی لە (50)ساڵ تێپەڕی کردبوو. . . سەنانیری تێکۆشەر لە پێشەوەی زیندانیەکانی ساڵی 1981دا بوو کاتێ (**أنور السادات**) هەزارەها ڕۆڵەی گەلی میسری لە زیندانەکان توندکرد.

---

[1] ـ التصوير الفني في القرآن.
[2] ـ الأطياف الأربعة: 166.

سەنانێری لە زیندانداا ئازارو ئەشکەنجەیەکی دڕندانە درا، لەژێر ئەشکەنجەو ئازارو قامچی زۆرداراندا گیانی پیرۆزی سپاردو بە شەهیدی گەشتەوە بە خوای خۆی لە بەرواری 1981/10/8.

ئەمینەخان شەهیدبوونی مێردە تێکۆشەرەکەی زۆر کاری تێکردو بە فرمێسکەکانی بۆی دەگریاو بە چامە شیعریەکانی دەیلاواندەوە. لە لاواندنەوەی ئەودا زیاد لە (20) چامەی شیعری داناو لەیەکەم دیوانیدا بە ناوی (**رسائل الى الشهيد**) کۆیکردنەوە.[1]

* **حەمیدە:** ئەدەب لای حەمیدە جێگەی گرنگی پێدان بوو، ئەو بیرانەی کە بە بیروهۆشیدا دەهاتن دەینووسین، هەروەها بەشداری براکانی دەکرد لە گۆڤاری (المسلمون)و (**الاخوان المسلمون**)و، لەجگە لەمانەشدا بابەتی بڵاودەکردەوە.

لە دوای کارەساتەکەی برایانی ساڵی 1954 لەگەڵ دەستەیەك لە خوشکانی موسڵمانی تێکۆشەردا هەستان بە چاودێریکردنی خێزانو ماڵو منداڵی برا زیندانییەکان.

حەمیدە قوتب هاوکاری دەستی ڕاستی زەینەب ئەلغەزالی تێکۆشەر بوو، هەروەك ئەڵقەی پەیوەندیش بوو لە نێوان برا زیندانیەکەی (سەیدقوتب)ولە نێوان سەرکردەکانی ڕێکخستنداو، ڕێنومایی‌و ئامۆژگارییەکانی سەیدی پێدەگەیاندن.

لە کارەساتەکەی ساڵی 1965ی برایاندا حەمیدە قوتب بەشێکی زۆری لە ئازارو ئەشکەنجە بەرکەوت، بە شێوەیەك ئەشکەنجە دەدرا کە باس ناکرێت، ئەو تاکە ئافرەت بوو لە بنەماڵەی قوتب کە فەرمانی زیندانیکردنی بەسەردا سەپێنرا لەلایەن دادوەری سەربازی **محەممەد** فوئادەوە بۆ ماوەی (10) ساڵ لەگەڵ ئیشی قورسدا، شەش ساڵو چوار مانگی لە زینداندا بردە سەر لە نێوان زیندانی جەنگی‌و زیندانی ئەلقەناتردا[2]، لە کۆتاییداو لە سەرەتای حەفتاکاندا لە زیندان ئازادکراو دکتۆر **محەممەد** مەسعود مارەی کردو لەگەڵ هاوسەرەکەی لە فەرەنسا نیشتەجێ بوون.

* **محەممەدقوتب:** بە سیانزە ساڵ دوای لەدایکبوونی سەید لە نیسانی 1919دا لەدایك بوو، **محەممەد** قوتب بەو چەشنەیە کە هەموو جیهان دەیناسێ. . . ئەمیش پشکێکی گەورەی بەرکەوت لە ناڕەحەتی‌و ئازارو ئەشکەنجە چەشتن‌و دوو جار زیندانی کردن لەلایەن ستەمکارانەوە.

جاری یەکەم: ساڵی 1954 لەگەڵ هەزاران دەستگیرکراوی تر لە برایانی موسڵمان، بەڵام **محەممەد** قوتب فەرمانی دادگای بەسەرا نەسەپێنراو چەند ساڵێك بە تەوقیفکراوی مایەوە، دواتر لە زیندان ئازادکرا.

جاری دووەم: زۆرترین ئازارو ئەشکەنجەی چەشت ئەویش لە ساڵی 1965 دابووکە یەکەم کەس بوو لەو ڕۆژەدا دەستگیرکرا.

سەید قوتبی برای بەم بۆنەیەوە لە 1965/8/2 دا نامەیەکی نارەزایی ئاڕاستەی لێکۆڵەرەوە (**مباحث**)ی گشتی میسری کرد، بەتایبەتی ئەفسەر (ئەحمەد ڕاسیخ) لەسەر دەستگیرکردنی **محەممەد**ی برای کە نەیان دەزانی لە کوێ دەستبەسەرو زیندان کراوە. پێی وتن: (پۆلیسی بەریتانی کاتێك بیریاری ئینگلیزی (برتراند رسل)یان دەستگیرکرد کەسوکارەکەیان ئاگادارکردەوە لە شوێنەکەی، ڕسل بیریارە، **محەممەد**یش بیریارە).

ئەوانیش وەڵامی نامەکەیان بە دەستگیرکردنی خۆی دایەوە بە حەوت ڕۆژ دوای نامەکەی.[3]

**محەممەد** قوتب لە زیندان ئازارو ئەشکەنجەیەکی بێ وێنەی چەشت، بەشێوەیەك پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوبووەوە کە لە ژێر ئەشکەنجەدا کوژراوە، بەڵام کاتێك دەرکەوت ئەو پڕوپاگەندەیە ڕاست نیەو **محەممەد** بە زیندوویی لە زینداندا ماوەتەوە خەڵکی نازناوی "شەهیدی زیندوو"یان پێ بەخشی.

**محەممەد** قوتب دادگایی نەکراو فەرمانی دادگاشی بەسەردا نەدرا، بۆ ماوەی (7) ساڵ لە زینداندا بە ڕاگیراوی مایەوە تا سەرەتای حەفتاکان ئازادکرا.

[1] - دار الفرقان لە عەممان بڵاویکردەوە، چاپی یەکەمی 1985 دەرچوو.
[2] - مذابح الاخوان في سجون ناصر جابر الرزق: 115.
[3] - الموتى يتكلمون: سامي جوهر/ 120121.

مامۆستای ڕاستەقینەی محەممەد قوتب سەید قوتبی برای بوو، بەشێوەیەك کە کاریگەری سەید زۆر بە ڕوونی بە کەسایەتی محەممەد قوتبەوە دیارە.

محەممەد قوتب یەکەم دانراوی بە چاپ گەیەنراوی خۆی پێشکەش کردووە بە سەید بە ناوی (سخريات صغيره)، لە پێشکەشکردنەکەدا هاتووە: (بۆ ئەو برایەم کە فێری کردم چۆن بخوێنمەوەو چۆن بنووسم، خستمیە ژێر چاودێری خۆیەوە لە منداڵیمەوە. ئەو بۆ من باوكو براو هاوڕێ بوو، ئەم کتێبە پێشکەش بەو دەکەم بە ئومێدی ئەوەی توانیبێتم شتێك لەو قەرزە گەورەیە بدەمەوە).[1]

مامۆستا محەممەد قوتب لە ئێستادا دادەنرێ بە پێشەنگی بانگخوازە ئیسلامیەکانو بیریارە حەرەکیەکان، لە زۆرێك لە کۆنگرە ئیسلامیەکاندا بەشداری کردووە لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی، ژمارەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەو باسی ئیسلامیو موحازەراتی پێشکەش کردووە، خاوەنی زیاد لە (15) کتێبی بەنرخی ئامانجدارە لە فیکری ئیسلامیدا.

## بینایی سەید لە محەممەد قوتبی برایدا

سەید بیناییەکی تیژی هەبوو لە محەممەد قوتبی برایدا بە شێوەیەك ئامادەی دەکرد کە دوای خۆی جێگەی بگرێتەوە. کاتێ کە دیوانی (الشاطئ المجهول)ی بڵاوکردەوە پێشکەشی کرد بە محەممەدی برای، لە پێشکەشکردنەکەیدا ئەم هۆنراوەیە هاتووە:

أي ذلك اللفظ الذي في حروفه
رموزٌ وألغاز لشتى العواطف
أخي ذلك اللحف الذي في رنينه
ترانيم إخلاص، و ربا تآلُف
أخي أنت نفسي حينما أنت صورة
لآمالي القصوى التي لم تشارفي
تمنيت ما أعيا المقادير، إنما
وَجَدتُكَ رمزاً للأمالي الصوادف
فأنت عزائي في حياة قصيرة
وأنت إمتدادي في الحياة و خالفي
تَخَذتُكَ لي إبناً، ثم خذنا، فيا ترى
أعيش لِألقى مِنك إحساس عاطف

بەڕاستی ئومێدو هیوای سەید لە محەممەدی برایدا هاتەدی، خوای گەورە تەمەنی پێداو بوویە جێگری سەید، محەممەد دادەنرێت بە درێژەپێدەری ژیانی سەیدو شوێنکەوتەی لە بیروبۆچوونەکانیدا.

[1] - پێشەکی (سخريات صغيرة)ی موحەممەد قوتب: 5.

## ژیانی سەید لە گوندەکەیدا

سەید ماوەی منداڵیو مێردمنداڵی لە گوندەکەیدا بەسەربرد، تا تەمەنی (15)ساڵی تەواو نەکرد گوندەکەی بەجێنەهێشت.

سەید لەناو خێزانێکی گونجاوی تەبادا کە پەیوەندی تاکەکانی لەسەر خۆشەویستیو سۆز دامەزرابوو گەشەی کرد، باوكو دایکی کاریگەریەکی زۆریان لەسەر پەروەردەو گەشەی سەید هەبوو، بە شێوەیەك کاریگەری ئەو پەروەردەیە لە زۆر رووەوە بە کەسایەتی سەیدەوە دەردەکەوت، لەناو ناخیدا زۆرێك لە واتاو بیریان چاند، بە ڕاستی بۆ سەید پێشەنگێکی چاکەکار بوون.

لە ساڵی 1912دا تەمەنی گەشتە شەش ساڵ و کەسوکاری ناردیانە خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی گوندەکەیان، لە گوندەکەیاندا تیپی نووسەران (**فريق الكتاب**)ی لێبوو بە سەرۆکایەتی شێخێك کە پڕوپاگەندەی زۆری دژی قوتابخانە بڵاو دەکردەوە گوایە قوتابخانە دژی قورئانو قورئان لەبەرکردنە، ئەوەی بڵاودەکردەوە کە ئەو پێیخۆشە قوتابیان لە قوتابخانە دووربکەونەوەو پەیوەندی بەوەوە بکەن تاکو قورئانی پیرۆز لەبەربکەن.

بەڵام سەید کە لەو کاتەدا ساڵی دووەمی خوێندنی بوو، تەمەنی لە هەشت ساڵ تێپەڕی نەکردبوو، هەوڵیدا کە هەموو پڕوپاگەندەکانی تیپی نووسەران بەدرۆ بخاتەوە، لەبەرئەوە سەید بوویە سەرۆکی تیپی قوتابخانە دژ بە تیپی نووسەران.

بیروباوەڕی سەید لەسەر ئەوە دامەزرا کە دەبێت بە لەبەرکردنی قورئان پێشبڕکێ لەگەڵ تیپی نووسەراندا بکرێت چونکە ئەو لایەنە تایبەتمەندی ئەوتیپەیە. بەم شێوەیە قوتابیانی قوتابخانەی بانگکرد بۆ پێشوازیکردنو چوون بەدەم لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزەوە.

سەید لە پۆلی دووەمی سەرەتاییەوە ڕویکردە قورئان لەبەرکردن: (کەواتە با گرنگیپێدانی ئاراستەی لەبەرکردنی قورئان بکات تا بەڵگە گەورەکەی ئەوان پووچ بکاتەوە، زۆر خۆی ماندوو دەکردو تەندروستی شەکەت دەبوو، تا نیوەی شەو نەدەنووست بۆ ئەوەی هەموو شەوێك بەو بەشە قورئانەدا بچێتەوە کە لەبەری کردبوو، هاوشان لەگەڵ جێبەجێکردنی وانەکانی خوێندندا. بە مشێوەیە ساڵێکی تەواو نەکرد سەید سێیەکی قورئانی لەبەکرد، لەبەرکردنێکی باش، ئامادەی دانیشتن بوو لەگەڵ هەرکەسێکدا ـ لە قورئان لەبەرکردندا ـ تەحەددای بکردایە)[1].

سەید لەسەر پلانی لە لەبەرکردنەکەی بەنەخشەو هیممەتێکی بەرزەوە بەردەوام بوو بە شێوەیەك هەموو ساڵێك (10) جوزئی لەبەر دەکرد. لە پاش سێ ساڵ بە تەواوی هەموو قورئانی لەبەرکرد، تەحەددای هەرکەسێکی دەکرد کە ڕوبەڕوی ببوایەتەوە، داوای لێدەکرد کە لەبەرکردنەکەی تاقی بکاتەوەو گوێی لێبگرێ لە هەر سورەتو ئایەتێك کە ئارەزوویەتی. بەم شێوەیە سەید قوتب لە تەمەنی (10) ساڵی و لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییدا هەموو قورئانی لەبەرکرد.

سەید هەر لە منداڵیەوە لەسەر هەست بە پیاوەتی کردن گەورە بوو، هەروەك چۆن لەسەر دینداریو خواپەرستی گەورەبوو، ئەگەرچی منداڵێکی تەمەن دە ساڵان بوو، بەڵام وەك هەڵسوکەوتی پیاوان هەڵسوکەوتی دەکرد.

ئەوەبوو وەك پیاوان بە کۆمەڵ نوێژەکانی لە مزگەوتدا ئەنجام دەدا، تا سەعات (10)ی شەو لەگەڵ پیاوان لە مزگەوت دەمایەوە، شەوان بەسەر شەقامەکانی گوندەکەیدا وەك پیاوان دەڕۆیشت، ئەگەر ئامۆژگاریکەرێك ئامۆژگاری خەڵکی بکردایە ئەمیش دادەنیشتو گوێیبیستی ئامۆژگاریو وتەکانی دەبوو. ئەوەی کە دەیبیست بیری لێدەکردەوەو، هەندێ جاریش بە جورئەتو ئازایەتیەوە ڕائەوەستا بۆ ئەوەی مشتومڕ لەگەڵ ئامۆژگاریکەرەکە بکات!

بەڕێوەبەری قوتابخانە سەرەتاییەکە کاریگەری پەروەردەییو ڕەوشتیو رۆحی لەسەر سەید هەبوو، سەید (متمانەی بەم بەڕێوەبەرە هەبووەو خۆشی دەویست، هاوڕێیەتی دەکردو کاریگەری هەبوو لەسەری. . )[2].

سەید لە خوێندندا زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڕێوەبەرەکەیان دوو کتێبی پێبەخشی کە بریتی بوون لە دیوانی (**ثابت الجرحاوي**)و کتێبی مێژووی (**محمد بك الخضري**)، ئەم دوو کتێبە زۆر کاریگەرییان لەسەر سەید هەبوو، ئەوەی لەو دوو

[1] - طفل من القرية: سيد قوتب، 41.
[2] - سەرچاوەی پێشوو: 114.

کتێبەدا هەبوو سەید بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەبەری کرد. ئەمەش بەڵگەی جدییەتو پتەویو پاکیو وردەرزی سەید بوو.

## ڕۆشنبیری سەیدو کتێبخانەکەی لە گوندەکەدا

سەید لەسەر خۆشەویستی خوێندنەوەو هاوڕێیەتی کتێبو کۆکردنەوەی مەعریفەو ڕۆشنبیری گەورە بوو. هەر بەم جۆرەش ناسرابوو لەناو خەڵکی گوندو لە نێوندی ڕۆشنبیرەکانی گوندەکەیدا.

هەموو جارێك کتێب فرۆشێك بە ناوی مام سالح سەردانی گوندەکەی دەکردو سەید (ڕێکوپێكو زۆر چالاك بوو لای ماك سالح، چاك سەیدی دەناسی، چاکترین کتێبی بۆ هەڵدەگرت کە مەترسی زۆریشی هەبوو ـ دەیاگەیاندە دەستی ـ هاوڕێکەمان هەرگیز لە کڕینی کتێبدا چروکی نەدەکرد هەرچەندە نرخەکەی بەرزبووایە، تەنانەت ئەگەر نرخی یەك زنجیرە بگەشتایەتە پێنج قرش!)[1].

سەید ڕۆژانەکەی خۆی کۆکردەوەو پاشەکەوتی دەکرد، لە چاوەڕێی هاتنی مامسالح دا دەبوو بە کتێبەکانییەوە تاکو بە پارە پاشەکەوت کراوەکەی کتێبی لێبکڕێ.

ئەگەر پارە پاشەکەوتکراوەکەی بەشی نەکردایە پشتی بە باوکی دەبەستو داوای یارمەتی لێدەکرد، ئەویش پارەی دەدایە تا هەرچیەکی ئەوێت بیکڕێت.

ئەگەر کتێبێك سەرنجی ڕابکێشایەو توانای کڕینی نەبوایە ئەوا لە مامساڵحی دەخواستو دوای خوێندنەوەی بۆی دەگێڕایەوە، داوای لێدەکرد کە بۆی هەڵبگرێت تا جاری داهاتوو بۆ ئەوەی لێی بکڕێت.

سەید ناوبانگی دەرکرد (بەکتێب خوێندنەوە لە نێوەندی ڕۆشنبیرانی گوندەکەدا، لە پێش چاویاندا چەندین پلە بەرزبوویەوە، هەموو خەڵکی مژدەی داهاتوویەکی پرشنگداریان پێدەدا. . چۆن؟ ئەی هەر بە منداڵی کتێبخانەیەکی گەورەی پێکەوە نەنا کە لە گەورەییدا گەشتە ئاستێك یەك دۆلابی تەواو کتێبی تێدابوو؟)[2].

## سەید خەڵکی ڕۆشنبیر دەکاتو بەشداری لە شۆڕشدا دەکات

باوکی سەید لە گوندەکەدا سیاسیەکی چالاك بوو، ئەندامی لیژنەی حزبی نیشتمانی بوو، هەروەها بەشداری هەبوو لە ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (**اللواء**)دا.

نیشتمانییەکان ـ لەناویاندا بەڕێوەبەری قوتابخانەکە لاوێك بوو سەید خۆشی دەویست ـ دەهاتن بۆ ماڵی سەیدو لەوێ کۆبوونەوەکانیان ئەنجام دەدا، (لەم کۆبوونەوانەدا وتووێژ ئەدراو، لە هەندێکیاندا منداڵەکە (سەید) ئامادەبوو، هەندێکی نهێنی بوو هیچ کەس لەبارەیەوە هیچی نەدەزانی، منداڵەکە ناوی (أفندینا عباسو شێخ عبدالعزیز جاویشو محمد فرید)ی دەبیست. . . . )[3].

لەبەرئەوەی باوکی سەید سیاسیەکی ڕووناکبیر بوو خەڵکی گوندەکە ڕویان لە ماڵی دەکرد تاکو ئاگاداری نوێترین دەنگوباس و ڕوداوەکان بن، باوکی سەیدیش ڕۆژنامەی (**اللواء**)ی بۆ دەخوێندنەوە (وردە وردە سەید بەشداری پیاوە گەورەکانی کرد لەوەی سازیان دابوو لەکاتێکدا سەید تازەگەشتبووە ساڵی چوارەمی سەرەتایی. زۆرجار لە جێگەی باوکی ڕۆژنامەی بۆ خەڵکە ئامادەبوەکە دەخوێندەوە کە بۆ گوێ لێگرتنی هاتبوون بۆ ماڵی ئەمان)[4].

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو: 129.

[2] – هەمان سەرچاوەی پێشوو: 131.

[3] – هەمان سەرچاوەی: 146.

[4] – هەمان سەرچاوە: 146-147.

له ساڵی 1919دا شۆڕشی گەل ڕوویداو سەید لە گوندەکەیاندا بەشداری شۆڕشی کرد، وتەی ڕێکدەخستو وتاری ئامادە دەکردو لە شوێنە گشتیو مزگەوتەکاندا بۆ خەڵکی دەخوێندەوە. (ئەو موعجیزەیە ڕوویدا کە جارێك گومانی لێدەبوو، جارێك بڕوای پێ دەهێنا، لەسەردەستی سەید قوتب خۆیدا ڕوویدا، هاتە پێش بۆ مومارەسەکردنی شۆڕشو وزەوتین پێدانی، خۆی وتارەکانی دەنووسیەوەو هەندێ لە دێڕە شیعریەکانی تێدەخست ـ وایدانابوو ڕێکوپێکو کێشدارن بەڵام شێواوبوون ـوە لە مزگەوتو شوێنە گشتیەکاندا بەسەر خەڵکیدا دەیخوێندەوە بە جۆرێك ـ ئەم وتارانە ـ پیرۆزی شۆڕشی بردە ناخی هەموانەوە، وایان لێهات گوێیان دەگرت بۆ هەرکەسێك هاواری بۆ شۆڕش بکردایە ئەگەرچی منداڵێکی بچووکی وەك سەید بووایە کە تەمەنی لە(10) ساڵ تێپەڕینەکرد بوو).[1]

## سەید دەچێت بۆ قاهیرە

دوای ئەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لە گوندەکەدا تەواوکردو، دوای دوو ساڵ دابڕان لە خوێندن بە هۆی شۆڕشەوە لە ساڵی 1918 داو، دوای هێوربوونەوەی بارودۆخو ئیشوکار خێزانەکەی سەفەری قاهیرەیان بۆ ڕێکخست بۆ ئەوەی لەوێ خوێندنەکەی تەواو بکات.

لە ساڵی 1920 ڕۆشت بۆ قاهیرەو لەلای خاڵی کە ناوی ئەحمەدحسەین عوسمان بوو جێگیربوو، کە ماڵەکەیان دەکەوتە گەڕەکی زەیتونەوە.

خاڵی سەید لە دەرچووانی زانکۆی ئەزهەر بوو، لە ڕۆژنامەگەریو وانە وتنەوەدا کاری دەکردو لە ڕۆژنامەکاندا بە ئیمزای "ئەحمەد ئەلموشی"یەوە شتی بڵاودەکردەوە کە ئەم نازناوە دەگەڕێتەوە بۆ گوندی مووشە. هەروەها لایەنگری حزبی وەفدو هاوڕێی عەباس مەحمود عەققاد بوو.[2]

## خوێندنی لە قاهیرە

دوای ئەوەی سەفەری کرد بۆ قاهیرە زیاتر لە ساڵێك لە خوێندن دابڕا، لە ساڵی 1922 دا پەیوەندی کرد بە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتاییەوە کە ئەو کەسەی وەردەگیرا لەوێ دەبوایە تەمەنی لە پانزە ساڵ تێپەڕی بکردایە، لە ساڵی 1924 قوتابخانەی ناوبراوی تەواوکرد بە پلەی (مۆڵەتی لێهاتوویی بۆ فێرکردنی سەرەتایی)، کە بڕوانامەیەك بوو دەدرا بە دەرچووانی ئەو قوتابخانەیە، خوێندن لەو قوتابخانەیەدا بەرامبەر بە دواناوەندی یان ئامادەیی ئەمڕۆیە، هەڵگرانی مۆڵەتی (**الکفاءة**) وەك وانەبێژ لە قوتابخانەکانی سەر بە وەزارەتی مەعاریف کاریان دەکرد.

سەید لە ناو ناخیەوە ئارەزوومەندی زیادکردنی زانستو درێژەدان بە خویندن بوو نەك دامەزراندن، قوتابی زیرەكو لێهاتووی دەرچووی قوتابخانەی مامۆستایان ڕێگەی پێدەدرا درێژە بە خوێندن بدات لە ڕێگەی پەیوەندی کردن بە (تەجهیزیەی دار ئەلعلوم)ەوە. سەید لە ساڵی 1925 پەیوەندیکرد بە قوتابخانەی تەجهیزیەوە کەسەربە کۆلێژی (دار ئەلعلوم) بوو.

سەید لە ساڵی 1929دا تەجهیزیەی تەواوکردو پاشان لە کۆتایی هەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بە کۆلێژی (دار العلوم)ەوە، چوار ساڵ لەوێ مایەوەو لە ساڵی 1933 دار ئەلعلومی تەواوکردو بوویە هەڵگری بڕوانامەی (لیسانس) یان (**الإجازة العالیة**) لە ئەدەبو زمانی عەرەبیدا.

سەید لە پرۆگرامەکانی خوێندنی کۆلێژی دار ئەلعلوم ڕازی نەبوو، هەر بەوەش ئارام نەبوو کە ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بە پرۆگرامەکان لە کۆلێژی ناوبراو دەربڕێ، بەڵکو هەنگاوی ئیجابی یەك لە دوای یەکی کرداری دەنا، کە بە ڕاستی هەنگاوەکانی سەیر بوون.

لە کاتێکدا کە قوتابی کۆلێژی ناوبراو بوو یاداشتنامەیەکی پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی کۆلێژ کرد، تیایدا پێشنیاری گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندنی کۆلێژی ناوبراوی کردبوو.

ئەوەی جێگەی سەرنجو سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەم پێشنیارە لە کاتێکدا دەکات کە هێشتا قوتابیەو، هەر خۆیشی ئەو پرۆگرامە گونجاوەی دەستنیشان کرد کە لە پێشنیارەکەیدا داوای کردبوو، وە بەلایەوە پەسەند بوو.

[1] - هەمان سەرچاوە: 151.

[2] - مامۆستا موحەممەد قوتب ئەم زانیارییەی پێدام.

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەبوو پێشنیارەکەی بە یاداشتنامەیەکی ڕاستەوخۆ پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی کۆلێژ کرد بە ئازایەتیو بوێری چوونە پێشەوەوە.

سەید لە کۆلێژەکەیدا تەنها قوتابیەکی ئاسایی نەبوو وەك زۆربەی قوتابیان، بەڵکو هەموو گیانی زیندوێتیو چالاکیو لێکۆڵینەوەو بە ئاگایی بوو، لە ناو قوتابیاندا بە بیروبۆچوونە ڕەخنەگریەکانی ناسرابوو، هەمیشە ڕای خۆی بە ڕاستەوخۆو ئازایانەو توندیەوە لە بابەتەکانی ئەدەبو ڕەخنەو شیعردا پێشکەش دەکرد.

زۆرجار مشتومڕە ئەدەبیو ڕەخنەگریەکانی لە کۆلێژدا بەڕێوە دەبرد، لەم مشتومڕانەدا قوتابیان دەبوون بە دوو دەستە یان زیاترەوە، سەید سەرۆکایەتی ئەو دەستەیەی دەکرد کە ڕاوبۆچوونیان لە بەرامبەر دەستەی دووەمدا دەوەستا، زیاتر ئەم مشتومڕانە بە گەرمیو توندیو ڕەقی دەچوون بەڕێوە.

مامۆستاکانی سەید ڕێزی سەیدیان زۆر دەگرتو سەرسام بوون بە زانستو هیممەتو کەسایەتیەکەی، ئەگەرچی سەید لە هەندێ بیروڕاو بابەتو قەزیەی فیکریو ئەدەبیدا بیروڕای جیا لەوانی هەبوو.

لە بەڵگەکانی ڕێزداری سەید لەلای مامۆستاکانی ڕێپێدانی بوو بۆ پێشکەشکردنی بابەتی ئەدەبی لەسەر قادرمەکانی کۆلێژی دارلعوم کە تیایدا قوتابیانو مامۆستایان ئامادەی گوێگرتن دەبوونو لەلایەن مامۆستایانەوە سەید پێشکەش دەکرا بە ئامادەبووان.

لە ساڵی 1923 کاتێ سەید قوتابی قوناغی سێیەمی کۆلێژی ناوبراو بوو، موحازەرەیەکی ئەدەبیو ڕەخنەیی بۆ سازدرا بە ناونیشانی (**مهمة الشاعر في الحياة، و شعر الجيل الحاضر**)، محەمەدمەهدی عەللام کە مامۆستایەکی کۆلێژ بوو سەیدی پێشکەش کردو لە سەرنجیدا لەسەر بابەتەکە وتی: "ئەگەرچی من سەیدم وەك قوتابی پێشکەش کرد، شادومان دەبم کە یەکێك لە قوتابیەکانم، من ئەمڕۆ دەڵێم ـ کاتێك گوێم لە بابەتەکەی گرت ـ ئەگەر جگە لە سەید هیچ قوتابیەکی ترم نەبێت بەسمە بۆ ئەوەی دڵخۆشم بکاتو متمانەم پێ ببەخشێ، دڵنیام بۆ ئەوەی ئەمانەتی زانستو ئەدەب هەڵبگرم لە کەسێکدا کە گومانم لە هەستانی نیە بەو کارە. . من سەید قوتب دادەنێم بە شانازیەك لە شانازیەکانی (**دار العلوم**)، کاتێك وتم دارلعلوم ئەوە مەبەستم (**دار الحكمة والأدب**)ە)[1].

گرنگی پێدانەکانی سەید لە کاتێکدا قوتابی کۆلێژ بوو، تەنها گرنگیدان نەبوو بە ئەدەبو ڕۆشنبیری، بەڵکو چالاکیەکی لەبەرچاوی هەبوو لە هەردوو بواری سیاسیو کۆمەڵایەتیدا، ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە سەید ئەندامێکی پارتی (وەفد) بوو، لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا نووسینو بابەتی بڵاودەکردەوە.

سەید بەشداری لە دروستکردنی کۆمەڵی (دار العلوم)دا کرد کە ئامانجی پارێزگاری کردن بوو لە زمانی عەرەبیو ئەدەبو زانستەکانی، هەروەها وەستان لە ڕووی دوژمنەکانیدا.

لە ساڵی 1933 ئەم کۆلێژە گۆڤاری (دار العلوم)ی وەرزییان دەرکرد، سەید بە بابەتەکانی لە زۆر بواردا بەشداری دەکردن. . لە گرنگترینو گەورەترینو ناودارترین بابەتەکانی، بابەتێك بوو لەسەر (ڕەخنەگرتنی کتێبی دوا ڕۆژی ڕۆشنبیری لە میسر)دا کە دانراوی دکتۆر (تەها حسین) بوو، لە پاشدا سەید بە کتێبێکی سەربەخۆ ئەم بابەتەی بڵاوکردەوە.

## پیشەی سەید لە وەزارەتی مەعاریفدا

ساڵی 1933 سەید کۆلێژی (دار العلوم)ی تەواوکردو لەگەڵ تەواوکردنیدا لە قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریفدا دەستی بە کاری وانە وتنەوە کردو،دۆسیەی خزمەتەکانیشی لەو بەشەدا پارێزراوە لە بەڕێوەبەرایەتی (تۆمارکردنو پاراستن) لە دیوانی گشتی وەزارەت. (ژمارەو هێمای دۆسیە: 12- 5/21)[2].

سەید لە (**تحضيرية الداودية**) لە قاهیرە لە 1933/12/2دا وەك مامۆستادامەزرا کە مووچەی مانگانەکەی تەنها شەش (جونەیە) بوو! وە بۆ ماوەی دوو ساڵ لەوێدا مایەوە.

---

[1] ـ مهمة شاعر في الحياة (9-10) بە کورتکراوەیی.

[2] ـ سيد قطب/ عبدالباقي: 17.

له 1935/9/1دا گوێزرایەوە بۆ قوتابخانەی (دمیات)ی سەرەتایی، بەڵام کەش‌و هەوای دمیات بە هۆی شێداری کەشەکەیەوە کە ئازادی دەدا لەگەڵ تەندروستیە هەستیارەکەی ئەمدا نەدەگونجا،لەبەر ئەوە کاری لەسەر ئەوە کرد کە لەوێ بگوێزرێتەوە.

له 1935/12/1دا گوێزرایەوە بۆ قوتابخانەی (بنی سیف)ی سەرەتایی.

له 1936/11/1دا گوێزرایەوە بۆ قوتابخانەی (حەلوان)ی سەرەتایی دوای زیاتر له شەش ساڵ کاری وانە وتنەوەو پیشەی مامۆستایەتی گوازرایەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف له بەرواری 1940/3/1. لەوێ وەك (محرر)ی عەرەبی له چاودێری ڕۆشنبیری گشتیدا کاری دەکرد، پاشان ناردیان بۆ بەڕێوەبەرایەتی وەرگێڕان‌و ژمێریاری له بەرواری 1940/4/13، دواتر گوازرایەوە بۆ ئەوەی وەك پشکنەر له فێرکردنی سەرەتاییدا کار بکات له بەرواری 1944/7/1. ئەم گواستنەوەیەی سەید بە هۆی توڕەبوونی وەزیری مەعاریفەوە بوو له سەید بە هۆی چالاکیە ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و سیایەکانیەوە).[1]

له نیسانی 1945دا سەرلەنوێ گێڕایانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری گشتی کە ئەحمەد ئەمین سەرۆکایەتی دەکرد، لەم کارەیدا تا کۆتایی ساڵی 1948 مایەوە، تا ئەوەبوو پلانرێژانی وەزارەت پلانی سەفەرێکیان بۆ داڕشت بۆ ئەمریکا بۆ کاری زانستی‌و له 1948/11/13 سەفەری کرد بۆ ئەمریکا (له گەشتێکی زانستیدا لەلایەن وەزارەتی مەعاریفەوە بۆ تایبەتمەندی وەرگرتن له پەروەردەو بنەمای پرۆگرامەکاندا وەك له دۆسیەکەیدا بە پیت تۆمارکراوە له وەزارەتی مەعاریف، سەید بۆ ماوەی دوو ساڵ له ئەمریکا مایەوەو پاشان بەجێی هێشت‌و له 23/8/ 195 گەڕایەوە.

پاش گەڕانەوەی بە پیشەی چاودێری یاریدەدەر له نووسینگەی وەزیری مەعاریفدا دامەزرێنرا، کە لەو کاتەدا ئیسماعیل ئەلقەبانی وەزیری ئەم وەزارەتە بوو، پاشان گوێزرایەوە بۆ ناوچەی قاهیرەی ڕۆژئاوای فێرکاری له 1951/10/22 دواتر هێنرایەوە بۆ وەزارەت له 1952/5/17 تا کار بکات وەك چاودێری یاریدەدەر له لێکۆڵینەوە هونەرییەکان‌و پرۆژەکاندا. له کۆتاییدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی له وەزارەت پێشکەش کرد، ئەوەش له بەرواری 1952/10/18دا بوو.[2]

له 1954/1/13دا ئەنجومەنی وەزیران له حکومەتی شۆڕش بە سەرۆکایەتی جەمال عەبدولناسر ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر دەست لەکارکێشانەوەی سەید قوتب له وەزارەتی مەعاریف لەو بەروارەوە کە سەید تیایدا دەست کێشانەوەکەی پێشکەش کردبوو، کە دەکاتە 1952/10/18 نەك لەو بەروارەوەی کە ئەنجومەنی وەزیران ڕەزامەندی نواندبوو، ئەمەش بۆ ئەوەی سەید قوتب شایستەی مووچەی خانەنشینی نەبێت دوای هەژدە ساڵ‌و دە مانگ‌و شانزە ڕۆژ له خزمەت. . .

ئەم بڕیارەی ئەنجومەنی وەزیران زیانمەند بوو بۆ سەید، له کاتێکدا ئەم بڕیارە درا کە پەیوەندیەکانی حکومەت بە کۆمەڵی برایانەوە گرژبووبوو.[3]

لەم ماوەیەدا سەید زۆرێك پێشنیارو پرۆژەی پێشکەش کرد بۆ چاکسازی پرۆگرامەکانی خوێندن‌و ڕاستکردنەوەو بەرەوپێش بردنی، ئەگەرچی ئەم کارانەی ڕووبەڕووی تووڕەیی‌و ڕقی سەرۆکەکانی دەکردەوە. بەڵام ئەو مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوان نەبوو، هەروەها ئامانجی زیادکردنی پلەو زۆرکردنی بڕی مووچە نەبوو، وەك زۆربەی فەرمانبەران، بەڵکو هەموو خەمێکی وتنی هەرشتێك بوو کە بەلای ئەمەوە حەق بوو، بیرکردنەوەی بەردەوامی ئاستی دەزگاکانی وەزارەت‌و چاککردنی کارەکانی بوو. .

بەڵام وەزارەت پێشنیارەکانی سەیدی ڕەدکردەوەو چ پێش سەفەرکردنی بۆ ئەمریکاو چ پاش گەڕانەوەشی له ئەمریکا.

سەید ئاماژە بە نموونەیەك لەو تەنگژانەی سەرۆکەکانی دەکات له وەزارەتدا کە بۆیان دروستکردبوو، هەروەها ئەو ئاگادار کردنەوانەی کە بۆیان دەردەکرد.

---

[1] - سيد قطب/ عبدالباقي: 30.
[2] - سيد قطب/ عبدالباقي: 43.
[3] - سيد قطب/ عبدالباقي وەری گرتووە له دۆسیەی سەید له وەزارەتی مەعاریف.

ئەمەش لە بابەتێكدا كە لە گۆڤاری (**الرسالة**)ی ساڵی 1946دا بڵاوی كردووەتەوەو تیایدا هۆی گواستنەوەی خۆی لە وەزارەتەوە بۆ كاری پشكنین ڕوون دەكاتەوە، ئەوەش ڕووندەكاتەوە كە ئەگەر بە هۆی قەناعەت پێكردنی دكتۆر تەها حسێنەوە نەبوایە كە ڕاوێژكار بوو لە وەزارەتدا پێدەچوو هەر ئەو ساڵە وازی بهێنایەو دەستی لە كارەكەی بكێشایەتەوە.

لەمبارەیەوە سەید دەڵێت: ئەو ماوەیە جەنگ بوو، فەرمانەكان عورفی بوون، وەزیر كە ئەحمەد نەجیب هیلالی بوو وتی: ئەبێت ئەم فەرمانبەرە دەربكرێت، یان دوور بخرێتەوە لەم خاكەدا، یاخود پەژموردە بكرێت. . بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی لەمبارەیەوە هەندێك شتی پێگەیاندم!! بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی؟ بەڵێ: بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی، پێی ڕاگەیاندم كە ئەو ـ سەید ـ لە بەرژەوەندی ئۆپۆزسیۆن كاردەكات، جگە لەوەی دۆسیەكەشی پاك نیەو دوو ئینزاری تێدایە لەسەر نووسینەكانی لە ڕۆژنامەكاندا كە بابەتی سیاسین و بەلاَم ئەو فەرمانبەرە! فەرمانبەر، واتە بەندە. هیچ بیروبۆچوونێكی نەبێت لە قەزیەی خاكەكەیدا ئەگەرچی ئەم بیروبۆچوونەشی سیفەتی حزبایەتی پێوە دیار نەبێت،هاڵم پێگەشت كە من دووردەخرێمەوە لە وڵات.

منیش بڕیارمدا ئیستیقالە بكەم! دكتۆر تەها حسین نەیهێشت، وتی: نابێت ئەم كارە بكەیت تا من لەو وەزارەتدا بم، وتم بەڵام سەر نەوی ناكەم بۆ ئارەزووی وەزیرەكان، با ڕووبەڕووم ببنەوە بەوەی دەربارەم دەوترێت، پاشان هەرچیەكیان دەوێت با بیكەن، هەروەها منیش ئەوەی بمەوێت دەیكەم.

وتی: ئەگەر دەست لەكار بكێشیتەوە چی دەكەیت؟ لەگەڵ ئەوەدا من ئەزانم ئەركت چەندە گرانە، وتم: ئەوەی كە بۆم دەست بدات ئەوە دەكەم، من لە پەككەوتەكانی دیوان نیم.[1]

## بابەتەكانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا

پەیوەندی كردنی سەید قوتب بە ڕۆژنامەو گۆڤارەكانەوە لە سەرەتای ژیانییەوەو لە لاوێتیدا دەستی پێكرد، لەگەڵ گەشتنی بۆ قاهیرەو مانەوەی لەلای خاڵە ڕۆژنامەنووسەكەی ئەمیش پەیوەندی كرد بەو ڕۆژنامانەوە. یەكەم بابەتی لە ڕۆژنامەی (البلاغ)ی ڕۆژانەی ساڵی 1922 بڵاوكردەوە، واتە بە دوو ساڵ دوای ڕۆشتنی بۆ قاهیرە كە لەو كاتەدا تەمەنی شانزە ساڵ بوو، قوتابی قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی بوو.

سەید لە ڕۆژنامەكانی (**الحياة الجديدة، الاهرام، الاسبوع، كوكب الشرق، الوادي، المصور، الثقافة، الرسالة، الدعوة**) و گۆڤارەكانی (**الفكر الجديد، العالم العربي، الاخوان المسلمون، البلاغ، الجهاد، المقتطف**و. . . **هتد**) بابەتەكانی بڵاودەكردەوە.

بەرهەمە ئەدەبیو فیكریە فراوانەكەی سەید قوتب لە سەرەتای ژیانیدا بووبووە جێگەی سەرسوڕمانو سەرنجی ئەدیبو خوێنەرو لێكۆڵەرەوەكان تا گەشتە ئەو ئاستەی یەكێكیان ـ عەلی ئەحمەد عامر ـ ئەم شایەتیە سەیرەی پێشكەش كرد (گەواهی دەدەین ئێمە كە ئیمزامان كردووە لەسەر ئەمە كە هاوڕێكەمان سەید قوتب لەو كەسانەیە پلەو پایەیان بەسەر تەمەنیاندا بەرز بۆتەوە. . بەڵام ئێمە لە میسرداین. . لە میسری پاسەوان كراوداین. . وڵاتی ئازاردانە. . )[2] ئەی ئەبێت پلەو پایەی سەید چۆن بێت لە چلەكاندا كاتێك سەید بوویە وێنەی بەرچاو و دەنگی بەرگوێی عەرەب؟ ئەبێت لە چ پلەو پایەیەكدا بێت لە كاتێكدا چووە پێشەنگی ئەدیبە عەرەبەكانو ڕەخنەو ئەدەبی عەرەبییەوە؟ ئەبێت چۆن بێت لە كاتێكدا بەردەوامی وەرگرت لە فیكری ئیسلامییدا تاكو گەشتە پلەی ڕابەرایەتی؟ وە لە ڕێگەی كاری تێكۆشانی ئیسلامییدا تاكو گەشتە پێشی پێشەوە؟ ئەبێت دوای ئەوانە چۆن شاهێدیەكی بۆ بدرێتو چ ڕێزێكی لێبنرێ؟ بەڵام ئەوەی ئەو چەشتی لە دەربەدەركردنو بەڵاو ئەشكەنجەدانو خراپە لەگەڵدا كردنو پشتگوێ خستنو چەوساندنەوە، هیچ ئەدیبو بیریارێكی تر نەلە كۆنو نەلە نوێدا نەیچەشت.

---

[1] - گۆڤاری (الرسالة) ذمارة 6، 81 بەرواری 1946/7/22.

[2] - گۆڤاری الاسبوع.

ئەوەبوو گیانی بەخشی، چونکە ئامادە نەبوو گەردنی کەچ‌و سەری نەوی بکات. ستەمکاران‌و خوێنرێژان دڵڕەقانەترین هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کرد وەك تاوانبار مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد. هیچ سەیر نییە!! (ئێمە لە میسری پاسەوان کراوداین. . . کەولاتی ئازاردانە!). .

کارکردنی سەید قوتب لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لە یەك شێوەدا نەبوو، لە هەندێکیاندا وەك فەرمانبەر کاری دەکردو لە بەرامبەر ئەو بابەتانەی کە دەینووسی یان ئەو لاپەڕانەی کە تەحریری دەکردن، مووچەیەکی مانگانەی وەردەگرت وەك (الاهرام، البلاغ).

لە هەندێکی تریاندا بەبێ بەرامبەر بابەتی هەفتانەی دەنووسی‌و بلاوی دەکردەوەو تەنها بەوەندە ڕازی دەبوو کە ڕۆژنامەکە لاپەڕەکانی لە بەرامبەر بابەتەکانیدا والا دەکرد.

زۆربەی بابەتەکانی لە جۆری دووەم بوون ـ واتە بێ بەرامبەر ـ وەك بلاوکراوەکانی (**الاسبوع، كوكب الشرق، مصور، الوادي، الثقافة، الرسالة، الدعوة**)و جگە لەمانەش. .

هەندێکیان سەید خۆی سەرۆکایەتی‌و سەرپەرشتی‌و تەحریری دەکردن‌و زیاد لە چەند بابەتێکی لە یەك ژمارەدا بلاودەکردەوە، وەك گۆڤارەکانی (**الفكر الجديد، العالم العربي، الاخوان المسلمون**).

## لەو گۆڤارانەی تیایدا دەینووسی

**لە بیستەکاندا:** (**البلاغ، البلاغ الاصلاحي، الجهاد، الحياة الجديدة، الاهرام، المقتطف، الوادي**، . . . هتد).

**لە سییەکاندا:** (هەندێك لە گۆڤارەکانی پێشوو لەگەڵ (**كوكب الشرق، روز اليوسف، أبوللو، الامام، الاسبوع، الرسالة، الثقافة، دار العلوم**) لەگەڵ ئەو گۆڤارانەی کە لەو ماوەیەدا دەردەچوون وەك (**الكاتب المصري، الكتاب، السوادي، الشؤون الاجتماعية، الاديب**)ی لوبنانی‌و هەندێکی تر. هەروەها چاودێری‌و سەرپەرشتی هەردوو گۆڤاری (الفكر الجديد، العالم العربي) دەکرد.

**لە پەنجاکاندا:** نووسینەکانی لە هەرسێ گۆڤاری (**الرسالة، الثقافة، الكتاب**)دا بلاودەکردەوە لەگەڵ ئەو گۆڤارانەی کە لەو ماوەیەدا دەردەچوون وەك (**اللواء الجديد**) کە لاوانی حزبی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی فەتحی رزوان و (**الاشتراكية**)ی حزبی (**مصر الفتاة**) بە سەرۆکایەتی ئەحمەد حسین‌و (**الدعوة**) کەساڵح عشماوی بە ناوی برایانی موسڵمانەوە دەریدەکرد.

هەر لەم ماوەیەدا سەرپەرشتی گۆڤاری (**الاخوان المسلمين**)ی کرد کە زۆر تەمەنی نەکرد.

سەید هەر لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیەوە ڕێزی وانە وتنەوەو ڕۆژنامەگەری دەگرت‌و هاوسەنگی دەکرد لە نێوان کارەکەی لە وەزارەتی مەعاریف‌و پەیوەندی کردنی بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە.

ئەوەبوو گۆڤاری (**الاسبوع**) لە ساڵی 1934 دا پرسیارێکی ئاراستەی سەید کرد دەربارەی ڕۆژنامەگەری‌و وانە وتنەوە، لە پرسیارەکەدا هاتبوو: (ڕۆژنامەو قوتابخانە، کامیان هەڵدەبژێری؟ بۆچی؟)

ئەوەی لە وەلامی سەیددا هاتووە بۆ ئەم پرسیارە: "هەست بە ناڕەحەتی دەکەم لە بەرامبەر ئەم پرسیارەدا ـ سوێند بە خوا ـ نازانم کامیان بەڕێزترە، وە کامیان لە داهاتوودا بەسەر ژیانمدا زاڵ دەبێت! لە نێوان ڕۆژنامەو قوتابخانەدا گەشەم کرد، ئێستاش هەر لە نێوانیاندام، هەردووکیانم پێکەوە خۆشدەوێت، لە هەر یەکێکیاندا بۆ شەوقێکی تەواوی شاراوە لە دەروونمدا تووێشووم بینیەوە، جیاوازیم لە نێوانیاندا نەکردووە بەو پێیەی کە بڕوام پێیەتی، جیاوازییەك کە تەواو ڕوون بێت، من بە قوتابخانە زۆر بەختیارم، ئەگەرچی ناڕەحەتی زۆری تێدایەو کەشێکی تەسکی هەیەو لەگەڵ توانا بەکاربردنێکی شەکەتکەرو پاداشتێکی کەم، بەلام لە کەشی ڕۆژنامەگەری فراواندا هەرکاتێك توانیم بە دەستی خەم پشوو ئەدەم)[1].

---

[1] - گۆڤاری الاسبوع، ژمارە 36، ل14-15.

عەبدولباقی محەمەد حسینی توێژەر هەستاوە بە ئامادەکردنی لیستێك (بیبلۆگرافیا) بۆ بابەتەکانی سەید کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوی کردونەتەوە کە دەتوانرێت هەڵوێستەیان لەسەر بکرێتو لە کۆتایی کتێبەکەیدا بە ناوی (**سيد قطب حياته وأدبه**) تۆماری کردووە.

لە لیستەکەدا هاتووە کە ژمارەی هۆنراوەو بابەتەکانی سەید کە بڵاوی کردوونەتەوەو کەوتوونەتە بەردەستی (455) بابەتو چامەی شیعرییە، کە بەسەر (19) گۆڤارو ڕۆژنامەدا دابەشبوون. بەڵام ئەوەی کەوتووەتە بەردەستی عەبدولباقی محەمەد کەمترە لەوەی کە سەید لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردوونەتەوەو دەستی توێژەری پێنەگەشتووە. . .

سەید ماوەیەکی دوورو درێژ لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا کاری کرد کە زیاتر بوو لە چارەکە سەدەیەك، لەوبارەیەوە زۆرێك لە ڕاستیو نهێنیەکانی بۆ ڕوون بوویەوەو، ڕووبەڕووی زۆرێك لە تەنگپێهەڵچنین بوویەوە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە کاری ڕۆژنامەگەرییان لە ژێردەستدا بوو.

بەتایبەتی لە دواقۆناغەکانی پەیوەندی سەید بە گۆڤارو ڕۆژنامەکانەوە ڕووبەڕووی ئازارو تەنگژەیەکی زۆر بوویەوە کاتێك ڕویکردە بیری ئیسلامیو بیروبۆچوونێکی ئیسلامی تێکۆشەرانەو بانگخوازانەی بۆ دروستبوو، بە شێوەیەك زۆربەی گۆڤارەکان دەرگایان بە ڕوودا داخستو لاپەڕەکانیان پێچایەوە لە بابەتەکانی سەید قوتب، چونکە گۆڤارەکان دژی ئەو پەیامە بوون کە سەید هەڵگری بوو، دژی ئەو بیرەبون کە بیری خۆی لەسەر بونیادنابوو.

سەید پەردەی لەسەر ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە هەڵماڵیو گلەیی لەو کەسانەش کرد سەرپەرشتییان دەکردن، هەڵوێستە چەوتەکانی خشتنەڕوو، هەروەها پەیوەندییە گومان لێکراوەکانیانی دەردەخستو پەیوەندی ئە لایەنانەی بە دەزگا هەواڵگریە عەرەبیو بیانیەکانەوە ڕوون دەکردەوە.

لە بابەتێکدا بە ناوی (**الدولة تخنق الأدب**) لە گۆڤاری (**الرسالة**)، لە ساڵی 1950دا دەڵێت: "دەوڵەت لە میسردا پێویستە کارێکی هەبێت، ئەبێت کارەکەی چی بێت ئەگەر فیکر نەخنکێنێتو کۆتو پێوەند نەکاتە هەردوو دەستو هەردوو قاچی؟".

لە هەمان بابەتدا دەڵێت: "ڕۆژنامە میسرییەکان ـ تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت ـ دەزگای نێودەوڵەتی، کە نە میسریینو نە عەرەبیین پشتگیریان دەکەن، کۆمەڵە دەزگایەکن پێنووسەکانی موخابەراتی بەریتانیو ئەمریکیو فەرەنسی بەشداری تێدا دەکەن، پاشان میسریو عەرەبی!!. . کۆمەڵە دەزگایەك زیاتر خزمەتی سەرمایەداری جیهانی دەکات وەك لە خزمەتی قەزیەی گەلانی عەرەبی، خزمەتی داگیرکەری دەرەکیو لایەنە فەرمانڕەواکانی دەکات پێش ئەوەی خزمەتی نیشتمانو گەلانی هەژاری خۆی بکات. نهێنیەکە ئەمەیە کە دەوڵەت ئەو مەرجانەی دەیسەپاند بەسەر کتێبەکاندا نەیدەسەپاند بەسەر گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چونکە لە پشتیانەوە پێنووسەکانی سیخوڕو بەرژەوەندی سەرمایەداری جیهانی هەبوو، پشتگیری گۆڤارەکانیش هەر لە ئەستۆی ئەماندابوو، کۆسپەکانی لە بەردەمیاندا ڕادەماڵیو ڕێگای بۆ فراوان دەکردن، تاکو پڕوپاگەندە ئاووردەکانیان بڵاوبکەنەوە لە هەموو لایەکی وڵاتانی عەرەبییەوە".[1]

[1] گۆڤاری الرسالة ژمارە 943، 1951/7/30.

## پەیوەندی سەید بە ئەدیبو بیریارەکانەوە

پەیوەندی سەید بە ئەدیبو بیریارەکانەوە کۆنەو، هەر لە سەرەتای ژیانیەوە پەیوەندی پێوە کردنو لەگەڵ کۆڕو هۆڵەکانی کۆڕگرتندا لە یەکەم ڕۆژی گەشتنە قاهیرەیەوە پەیوەندی بەست کە لە لای خاڵە ئەدیبە ڕۆژنامەنووسەکەی مایەوە. لە ئەدیبە یەکەمینەکان کە سەید پەیوەندی پێوەکردن عەباس مەحمود عەقاد بوو، سەید کرایەوە بە ڕووی کتێبخانە فراوانو گەورەو گشتگیرەکەیدا، بەردەوام ئامادەی کۆڕە هەفتانەکەی دەبوو کە سەرلەبەیانی هەموو ڕۆژی هەینیەك دەیبەست.

لە سەرەتای بیستەکانەوە بۆ ماوەی زیاتر لە چارەکە سەدەیەك سەید بەشداری کۆڕەکانی عەقادی کرد، ئەم پەیوەندیە پێشوەختەی سەید بە عەقادەوە ئەدەبی لەلای سەید خۆشەویست کردو زیاتر ئارەزوومەندی بوو، بە شێوەیەك ئیتر ڕووی کردە ئەدەبو توێشووی تێدا کۆکردەوەو کردیە ئامانجی خۆی لە قۆناغە ئەدەبیەکەی ژیانیدا.

سەید لەگەڵ ئەو پەیوەندیە توندوتۆڵەی لەگەڵ عەباس مەحمود عەقادو ئەو هاوڕێیەتیە گەرمەی لە نێوانیاندا هەبوو، پارێزگاری لە کەسایەتی سەربەخۆو بیرکردنەوەی ئازادی خۆی دەکرد، نموونە بۆ ئەم لایەنە دێنێتەوەو دەڵێت: ( لەم هاوڕێیەتیە نەدەترسام ـ هەرچەندە بەهێزبوو ـ کە کاریکاتە سەر بۆچوونم چونکە هاوڕێیەتی ترم هەبوو کە بەهێزتر بوو لەم هاوڕێیەتیە، ئەویش هاوڕێیەتی ویژدانی خۆم بوو، نەخێر، بەڵکو هاوەڕێیەتیم بۆ کەسایەتی خۆم، سووربوونم لەسەر ئەوەی ون نەبێت لە هیچ کەسایەتیەکی تردا).[1]

سەید قوتب ژیانێکی ئەدەبی دووردرێژی بردەسەرو لەو ماوەیەدا ئاشنابوو بە زۆرێك لە ئەدیبانو پەیوەندی پێوەکردنو لەگەڵیاندا کۆدەبووەوە، یان هاوڕایان دەبوو یاخود ڕای جیاواز دەبوو لێیان، پاڵپشتی دەکردن یان بەرەنگاریان دەبوویەوە، لەگەڵ یەك دەڕۆیشتن یان ڕاکانیان بەریەك دەکەوتن، لەگەڵ هەندێکیان مشتومڕی دووردرێژی ئەنجامدەدا، لەگەڵ هەندێکی تریاندا دەکەوتە جەنگی ئەدەبیەوە.

لەو ئەدیبانەی کە سەید پەیوەندیو هاوڕێیەتی لەگەڵیاندا هەبوو جگە لە عەباس مەحمودعەقاد کە پەیوەندیەکەیان درێژی خایاندو کاریگەریەکی زۆری لەسەر جێهێشت، ئەم ئەدیبانە بوون (تەها حسین، ئەحمەد حەسەن حەمزە، ئەحمەد زەکی ئەبو شادی، تۆفیق ئەلحەکیم، ئیبراهیم عەبدولقادر ئەلمازنی، یەحیا حەقی، مەحمود تەیمور، محەممەد مەندور، عەبدولحەمید جەودە ئەلسەحار، ئەحمەد ئەمین، عەبدولمونعیم خەلاف، عەباس خزر، عەلی تەنتاوی، ئەنوەر ئەلمەعداوی، نەجیب مەحفوز).

عەقاد لە نێوانی هەموویاندا کاریگەریەکی لەبەرچاوی لە ژیانی ئەدەبیو فیکریی سەیددا هەبووە، هەر ئەو مامۆستای یەکەمو یەکەم مامۆستای قوتابیەکەی خۆی (سەید قوتب) بوو.

ئەگەر لە ژیانی ئەدەبیو فیکری سەید بکۆڵینەوە ـ بە شێوەیەکی خێرا ـ لەگەڵ عەقاددا دەبینین بەم شێوەیەیە:

- سەرەتا پەیوەندی قوتابێتیو مامۆستایەتی لە نێوان سەیدو عەقادا لە سەرەتای لاوێتیدا دەستیپێکرد.
- پاشان گۆڕا بە خۆشەویستیو سەرسامیەکی گەورەی قوتابیەکە بە مامۆستاکەی.
- پاشان قوتابیەکە بە تەواوی واتا بوویە (مورید)ی مامۆستاکەی.
- دواتر ئەم قوتابیە موریدە وای لێهات بوویە هەڵگری هەموو بیروڕاکانی مامۆستاکەی.
- پاشان گەشتە ئاستی ترسان لە فەنابوون لە مامۆستاکەیداو توانەوەی کەسایەتیەکەی لە کەسایەتی ئەودا.
- دواتر لە تێگەیشتن لە بابەتە ئەدەبیو فیکریەکاندا سەربەخۆیی بۆ ئەم موریدە دروستبوو.
- پاشان ئەم موریدە ڕێگەی بە خۆیدا لە هەندێك بابەتی ئەدەبیو فیکریدا پێچەوانەی مامۆستاکەی بدوێت.
- پاشان وردە وردە دەستیکرد بە دوورکەوتنەوە لە مامۆستاکەیو قوتابخانەکەی لە ئەدەبو شیعرو ژیاندا.
- دواتر بە تەواوی ئیعلانی کۆتایی دەرچوونی خۆی کرد لە قوتابخانەی مامۆستا پێشووەکەیو، لە بەرامبەریدا دەوەستایەوە تا گەشتە ئاستێك مامۆستا بێ مەیل بێت بۆ موریدەکەیو ڕقی لێهەڵبگرێت، پاشان هەنگاونانی هەریەکەیان لە دوو ڕێگای جیاوازی هاوتەریبەوە لە جیهانی فیکرو لێکۆڵینەوەدا. . .

[1] گۆڤاری الرسالة، ژمارە 943 ل1087.

ـ لە پاشاندا گەڕانەوەی سەید قوتب ـ موریدەکەی مامۆستا عەقاد ـ بۆ کێشانی بیروڕاو بۆچوونەکانی مامۆستاکەی پێشووی بە ترازووی قورئانو ڕاستکردنەوەی لەسەر بنچینەی قورئان، وە ڕێککردنی بە دەقە قورئانیەکانو خستنەڕووی دژبوونی بیروڕاکانی مامۆستاکەی بۆ بڕیارە قورئانیەکان.

ـ سەید ژیانی دەستپێکرد بە قوتابێتیو موریدی بۆ مامۆستا عەقاد.

ـ کۆتایی پێهێنا بە بوونی بە پیاوێکی قورئانی سەربەخۆ!.

لە ماوەیەکی زیاد لە دە ساڵیدا سەید قوتب کۆمەڵێك جەنگی ئەدەبی بەناوبانگی لەگەڵ ئەدیبە هاوچەرخەکانیدا هەیە لەسەر مینبەری ئەو گۆڤارانەی لەو ڕۆژگارەدا دەردەچوون، لەو جەنگانە:

- جەنگی مینبەری ئازاد، ساڵی 1934.
- جەنگی لەگەڵ ڕافعیەکان، ساڵی1938.
- جەنگی لەگەڵ دکتۆر محەمد مەندور 1943.
- جەنگی لەگەڵ عەبدولمونعیم حەلاف 1944.
- جەنگی لەگەڵ درێنی خەشەبە 1943.
- جەنگی لەگەڵ سەلاح زهنی 1944.
- جەنگی لەگەڵ ئیسماعیل مەزهەر 1946.
- جەنگی لەگەڵ پیرانی ئەدەب (عەقادو تەها حسینو تۆفیق حەکیمو محەمەد حسین هەیکەلو ئەحمەد ئەمین) لە ساڵی 1947.

## ناردنی سەید قوتب بۆ ئەمریکا

### چالاکیەکانی پێش ناردنی بۆ ئەمریکا

سەید لە نیوەی دووەمی چلەکانەوە ڕاستگۆیانەو زۆر بە گەرمی ئاراستەی خۆی بەرەو ئیسلامو بانگرکردن بۆ ئیسلام گۆڕی، هەروەك گرنگی تایبەتی ئەدا بە بابەتە سیاسیو کۆمەڵایەتیو نیشتمانیەکان کە میسرو گەلەلانی میسر تێیدا دەژیان.

شێوازو ڕێبازە ئەدەبیەکەی بەکارئەهێنا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە، واتە سەید ئەدەبی گواستەوە لە قۆناغی (ئەدەب بۆ ئەدەب)ەوە بۆ قۆناغی (ئەدەب بۆ خزمەتی ژیانو بیروباوەڕ).

میسر لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە لە کۆمەڵێك قەزیەو گرفتدا دەژیاو، دەینالاًند بە دەست چەندین گرفتو کێشەوە لەسەر هەموو ئاستو ناوەندەکان.

سەید چاك هەستی بەوە دەکرد کە خەڵکی لە چ واقیعێکدا دەژینو بەدەست چیەوە دەناڵێنن، دەیڕوانی بۆ بنچینەی نەخۆشیەکەو سەرچاوەی بەڵاکە، سەرچاوەی هەردووبەڵاکەشی لە داگیرکاری بەریتانیادا دەبینیەوە کە دەستی گرتبوو بەسەر وڵاتاندا.

هەروەها سەید وای دەبینی کە نۆکەرو دەستو پێوەندەکانی بەریتانیا لە وڵاتدا هۆکارێکی تری بنچینەیی گرفتو واقیعە تاڵەکە بوون، وەك: کۆشك و حکومەتو حیزبەکان و چین خوازەکان و گەورە بازرگانەکان و خاوەن بانگەوازە بەتاڵو پڕوپووچەکان و دوژمنانی ڕەوشتوخووە بەرزوجوانەکان، لەبەرئەوە سەید بە چڕی هێرشەکانی ئاراستەی هەموو ئەو لایەنانە دەکردو جەنگێکی بەهێزی توندی لەگەڵیاندا بەرپاکرد.

رۆژنامەو گۆڤارەكانی بەكاردەهێنا بۆ بڵاوكردنەوەی بابەتە ئیعلامیە توندو بەهێزەكانی وەك گۆڤاری (**الرسالة، الثقافة**)، كاریكرد بۆ دەركردنی گۆڤارێكی تایبەت وەك (**الفكر الجديد**) كە بابەتەكانی لەو گۆڤارەدا لەوپەڕی پلەی توندوتیژیو ڕەقیو بوێریو ڕاشكاوانەییدا بڵاودەكردەوە. .

حكومەتو كۆشكی پاشایەتی زۆر نارەحەت بوون بەم كارانەی سەید، ئەوەبوو دوای كەمتر لە چوار مانگ بەسەر تەمەنی گۆڤارەكەدا دایانخست، كۆشكی پاشایەتی هیچ بەڵگەیەكی بەدەستەوە نەبوو بۆ زیندانیكردی سەید، چونكە لەو ڕۆژانەدا یاسا جۆرێك لە ڕێزو تایبەتمەندی هەبوو، سەید قوتبیش بە جۆرێك دەستەواژەكانی دادەڕشت كە نەكەوێتە ژێر تۆڵەو ڕەخنەی یاساوە، بەمشێوەیە خۆی لە سزای یاسا دەربازدەكرد، لەو دەمەدا سەید بە هۆی پەیوەندیە دێرینەكەیەوە پەیوەندی بە سەرۆك وەزیران (مەحمود فەهمی نەقراشی)یەوە هەبوو، نەقراشی كاری كرد بۆ ڕێكخستنی گەشتێك بۆ سەید تاكو بینێرێت بۆ ئەمریكا، ناردنی سەید بۆ ئەمریكا هەوڵێك بوو بۆ ڕزگاربوون لە سەیدو خۆپاراستن لە بابەتەكانیو لە چالاكیە ئیسلاحیەكانی كە كۆشكو حكومەتی سەغڵەت كردبوو.

ئارەزووی هەر سێ لایەنەكە (كۆشك و حكومەت و سەرۆكەكانی لە وەزارەتی مەعاریف) لەم ئامانجەدا ـ ناردنی سەید ـ یەكیانگرت، ئەوەبوو گەشتەكەی بۆ ئەمریكا بۆ ڕێكخرا. [1]

## نهێنی ئەركی سەید لە ئەمریكا!

ناردنی سەید بۆ ئەمریكا بۆ ئەركێكی دیاریكراو نەبوو وەك دەستخستنی بڕوانامەی ماجستێر یان دكتۆرا هەروەك هەندێك وای بۆ دەچن، بەڵكو مەبەست ئەوەبوو سەید لە وڵات دووربخرێتەوە.

لەبەرئەوەی لە پشكنینی هونەریدا لە وەزارەتی مەعاریف كاری دەكرد گەشتێكیان بۆ ڕێكخست كە لەگەڵ ڕوكاری دەرەوەی كارەكەیدا بگونجێت، داوایان لێكرد ئاگاداریو شارەزایی پەیدا بكات بەسەر پرۆگرامو یاسای فێركردن لە ئەمریكادا، بەو بیانووەی كە سەید پسپۆڕە لە پرۆگرامو بەرنامە سازیەكانی خوێندنداو، لێكۆڵەرە لە شێوازەكانی فێركردندا.

سەید لە ئەمریكا پەیوەست نەبوو بە زانكۆیەكی دیاریكراوەوە یان كەرەسەی تیۆرێكی تایبەت بە خوێندن، یان كاتێكی دیاریكراوو سنووردار، بەڵكو بە تەواوی ئازاد بوو لە بوارەكانی لێكۆڵینەوەو تایبەتمەندیو كاتو شوێندا.

پاش گەشتنی سەید بۆ ئەمریكاو بەسەربردنی چەند مانگێك لە فێربوونی زمانی ئینگلیزیدا -چونكە پێشتر ئەكادیمی زانستیانەی لە كۆلێژی دارالعلوم نەخوێندبوو-، وە پاش ئەوەی بە تەواوی شارەزای زمانی ئینگلیزی بوو دەستی كرد بە گەشتی مەیدانی بەسەر زانكۆو پەیمانگاو قوتابخانەكاندا، بە ئامانجی ئاگاداربوون بەسەر پەیڕەوو پرۆگرامی فێركاریو شارەزابوون بەسەر بەرنامەو شێوازەكانی وانە وتنەوە لە ئەمریكا.

گەشتەكەی سەید ژمارەیەك لە ویلایەتە ئەمریكیەكانی گرتەوەو سەردانی چەندین شاری جیاجیای كرد وەك: نیویۆرك، جریلی، دنفر، سان فرانسیسكۆ. [2]

---

[1] أمريكا في الداخل: سيدقطب، 15-18.
[2] هەمان سەرچاوە: 19-20.

## گەشتەکەی

له 1948/11/3دا گەشتەکەی سەید بۆ ئەمریکا لەسەر پشتی پاپۆڕێك لە ئەسکەندەریەوە بۆ نیویۆرك دەستی پێکرد، لەوێدا لەسەر پشتی پاپۆڕەکە چەند ڕووداوێك ڕوویدا کە ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین لەوانە:

1- بیرکردنەوە و بیرکەوتنەوەی سەید بۆ نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەر مرۆڤ، کە دەریای بۆ ڕاهێناوەو توانای هەڵگرتنی کەشتیەکانی پێبەخشیوە. وەك دەڵێت: (**ما أحسست ما في هذه اللفتة من عمق، قدر ما أحسست، ونقطة صغيرة في خِظَمِّ المُحيط، تحملنا و تجري بنا، والموج المتلاحم والزرقة المطلقة من حولنا، والفلك سابحة متناثرة هنا و هناك. . ولاشئ الا قدرة الله، و الا رعاية الله، والا قانون الكون الذي جعله الله، يحمل تلك النقطة الصغيرة على تبجج الامواج وخظمها الرهيب**).[1]

کە باسکردنە لە نهێنی هەڵگرتنی پاپۆڕ لەلایەن دەریاوە لە ژێر چاودێری خواو بەپێی یاسا کەونیەکان.

2- لە شەوێکی ڕوناکی مانگەشەودا وەستا بوو، بیری دەکردەوەو سەرنجی دەدا، بە شێوەیەك ئیمانەکەی زیادی دەکردو زیاتر دڵنیایی پێدەبەخشی بەرامبەر خوای گەورە، وەك دەڵێت: (**أحسست هذه الموسيقى العلوية الشاملة، موسيقى الوجود، مرة وأنا في عرض المحيط والباخرة تمر، مر الريح على وجه الخظم، والنسيم رخاء، والليل ساكن، والقمر مفضفض اللائ. . .**).[2]

3- لەژێر سێبەری ئەم بارە ئیمانیەدا لەگەڵ دەروونی خۆیدا دەدوا: (من بچم بۆ ئەمریکاو تێیدا بڕۆمو بێم وەك ڕۆشتنو هاتنی مرۆڤە ئاساییەکان، ئەوانەی تەنها بە خواردنو خەوتن قەناعەت دەکەن، یاخود دەبێت جیاوازیەك هەبێت بە هەندێك سیفەتی جیاکەرەوەی دیاریکراو؟ ئەو شتەش جگە لە ئیسلامو پەیوەستبوون بە ئادابو پابەندبوون بە پرۆگرامەکانیەوە لە ژیاندا نەبێت ئەبێت چیتر بێت، لەو نێوەندە ئاڵۆزو زیادەڕەوەدا، ئەو نێوەندەی قاڵکراوە بەهەموو هۆکارو چێژ وەرگرتنو حەرامێك؟ منیش ویستم پیاوی دووەم بم. . . .).[3]

4- دوای ئەوەی بەم شێوەیە بیری کردەوە کە هێشتا هەر لەسەر پاپۆڕەکەیە، بڕیاری پابەندبوون بە ئیسلامو بانگەشە بۆکردنی دا لە ئەمریکا. . وە لەلایەن ئافرەتێکەوە لە پاپۆڕەکەدا تاقیکردنەوەیەکی قورسی ڕووبەڕووبویەوە،بەلاّم خوای گەورە پاراستیو بەسەر ئەو تاقیکردنەوەدا سەری خست، دەڵێت: (ویستم پیاوی دووەم بم ـ موسڵمانێکی پابەند ـ خوای گەورەش ویستی تاقیم بکاتەوە: ئایا من ڕاستگۆم لەوەی کە ڕووم تێکردووە یان هەر تەنها داڵغەیەکە؟

هەر ئەوەندەبوو چوومە ژوورەکەمەوە ڕاستەوخۆ تەقەی دەرگا هات، کردمەوە، دەبینم کچێکی پێکەوتووی جوان، باڵابەرز، نیوە ڕووت، لاشەی بە جۆرێك بوو بە هەموو شێوەیەك لەخشتەبەر بوو، بە زمانی ئینگلیزی دەستیکرد بە قسەکردن: ئایا گەورەم ڕێم ئەدات ئەمشەو لای میوان بم؟ منیش داوای لێبوردنم لێکرد کە ژوورەکە تەنها بۆ یەك جێگە ئامادەکراوە، جێگەکەش یەك نەفەریە!.

وتی: زۆرجار یەك جێگە دوو نەفەر دەگرێت!!

منیش زۆر بێزار بووم لە بەرامبەر بێ ئابڕوویی ئەم ئافرەتە کە ویستی بە زۆر بێتە ژوورەوە، دەرگاکەم بە توندی بە ڕوویدا داخست، تاکو بکەوێتە دەرەوەی ژوورەکە، گوێم لە کەوتنی بوو بە زەویە تەختەکەدا لە ڕێڕەوەکەدا، ئافرەتەکە سەرخۆشیش بوو. . .)[4]

5- دوای ئەم سەرکەوتنە ـ زاڵبوونی بەسەر هەواو ئارەزووەکانو هەڵخەڵەتێنەرەکاندا ـ سەید گۆڕا بۆ بانگخوازێك بۆ ئیسلام، تەنانەت لەسەر پشتی پاپۆڕەکەش!.

---

[1] گواستنەوەی دەقەکە بە زمانی عەرەبی وەك خۆی لە بەر بەهێزی دەربڕینە ئەدەبییەکەی سەیدە کە لە وەرگێڕانیدا ئەشێت ئەو هێزەی لەدەست بدات.

[2] گواستنەوەی دەقەکە بە زمانی عەرەبی وەك خۆی لە بەر بەهێزی دەربڕینە ئەدەبییەکەی سەیدە کە لە وەرگێڕانیدا ئەشێت ئەو هێزەی لەدەست بدات.

[3] أمريكا في الداخل: سيدقطب، 21-22.

[4] أمريكا في الداخل: سيدقطب، 27.

هەروەهاسەید ئاگادارمان دەکاتو دەڵێت کە: "گاورێکی مژدەدەری بینی کە هەوڵی بڵاوکردنەوەو پڕوپاگەندەی مژدەدەرانەی ئەدا لەناو سەرنشینە موسڵمانەکانی پاپۆڕەکەدا، ئەمیش ـ سەید ـ هەستی ئیمانی بەئاگا هاتەوەو ڕۆیشت بۆ لای کاپتنی پاپۆڕەکەو داوای لێکرد کە مۆڵەت بدات بە نەفەرە موسڵمانەکان تاکو لەسەر پاپۆڕەکە نوێژی هەینی ئەنجام بدەن، ئیتر بەشداریان لەم خۆپیشاندانو مەراسیمە ئیسلامیەدا کردو سەید قوتب هەستا بە خوێندنەوەو پێشکەشکردنی وتارو پێشنوێژی کردن بۆ نوێژکەران، لە نێوەندی سەرسوڕمانێکی زۆری سەرنشینەکانی تر ئەوانەی کە بەسەیرکەرو بەبێ لایەن مابوونەوە. .

پاشان ئافرەتێکی گاوری یوگسلافی هاتە پێشەوەو باسی کاریگەری وتارەکەی سەیدو ئەو چەند ئایەتەی کرد کە لە قورئان سەید خوێندی.

سەید ئەم ڕووداوە باسدەکات، بەتایبەتی ئەو ئافرەتە یوگسلافیەو گەواهیەکەی دادەنێت بە بەڵگەیەك لەسەر ئیعجازی قورئانو کاریگەری لە دەروونی خەڵکیدا تەنانەت لە کەسانێکی جگە لە عەرەبیش. ."[1]

6- خزمەتگوزارەکەی ئوتێل کە هەموو جار بە سەیدی ئەوت کە ئەودەتوانێت هەرچیەکی مەبەستە لە داواکاری جنسی ئەم بۆی ڕاپەڕێنێتو، بە قسەکردن لەبارەی هەندێك لەو کارە ناپەسەندانەوە دەیوروژاند.

7- ئەو لاوە عەرەبەی کە دەیویست لە خشتەی بەرێت بەوەی چیرۆکی موغامەراتی زایەندی خۆی لەگەڵ کچە ئەمریکیەکاندا ئەدا بەگوێیدا.[2]

## هەوڵەکان بۆ ئیحتیواکردنی سەید

دوای شکستهێنانی هەوڵەکانیان بۆ سەرلێشێوانو لەخشتەبردنو تێکدانی لایەنی ڕەوشتی سەید، هەستان بە کۆمەڵە هەوڵدانێك بۆ لە خۆگرتنی سەید لە هەردوو لایەنی فیکریو سیاسیەوە. . . !!. سەید ئاگادارمان دەکات لە نموونەی ئەو پێشبڕکێیەی لە نێوان موخابەراتی ئینگلیزیو ئەمریکیدا هەبوو بۆ ئیحتیواکردنی، چۆن خوای گەورە یارمەتیدا کە لە هەموو هەوڵەکاندا سەربەرز بە دینەکەیەوە دەربچێتو سەرکەوتووبێت.

یەکێك لەو هەوڵانە ئەوەبوو کە سیخوڕی ئینگلیزی (جون هیو ورس دن)پێی هەستا ـ کە ماوەیەك لە میسردا مابووەوەو پروپاگەندەی ئەوەی کردبوو کە گوایە موسڵمان بووەو ناوی خۆی ناوە (**جمال الدين**)و ئافرەتێکی موسڵمانیشی مارە کردبوو، پاشان لە ئەمریکا جێگیربوو، هەر لەوێدا کتێبە ترسناکەکەی (**التيارات السياسية والدينية في مصر الحديثة**)ی دانا، سەید هەندێك لەو کارانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە (دن) پێی هەستاوە لەگەڵیدا:

1- ئاگاداری کرد لەوەی کە زۆرێك لە کاربەدەستان لە دەوڵەتی ئەمریکیدا دەرچووی پەیمانگا تەبشیریەکاننو بە دەیان ناوی کەسایەتی ناوداری لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکیو بواری سیاسیدا بۆ دەستنیشان کرد، پێدانی ئەم زانیاریانە بە سەید لەبەر خوا نەبوو، بەڵکو ئەوەی لای (دن) گرنگ بوو ئەوەبوو ڕۆژهەڵاتیەکان متمانە نەدەن بە نیەتی ئەمریکا بەرامبەر بە ڕۆژهەڵاتیەکان. سەید قوتب گومانی پەیداکرد لە وتەکانی (دن)، بە هۆکاری تر لە ڕاستی وتەکانی کۆڵیەوە.

2- پێشنیاری کرد بۆ سەید تا کتێبەکەی (**العدالة الاجتماعية في الاسلام**) وەرگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی کە لە ساڵی 1949دا دەرچووبوو، بەرامبەر بە (10)هەزار دۆلاری ئەمریکی، بەڵام سەید پێشنیارەکەی (دن)ی ڕەدکردەوەو کتێبەکەی

---

[1] أمريكا في الداخل: سيدقطب،23-24.
[2] أمريكا في الداخل: سيدقطب، 27-28.

پێشکەشکرد بە (کۆنگرەی ئەمریکی بۆ لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان)و ڕۆژهەڵاتناس (یوحەننا ـ ب. هاردی) مامۆستا لە زانکۆی هالیفاکس لە کەنەدا وەریگێڕا بەبێ بەرامبەر.[1]

3- (دن) زیاتر لە جارێك وتوێژی لەگەڵ سەید کرد دەربارەی ڕوداوە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانی میسر، وە ئەو مەترسیانەی لە داهاتوودا چاوەڕێی دەکات.

کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین بەشێکی زۆری وتوێژەکانی (دن)ی لەگەڵ سەید داگیرکرد، ئەوەبوو کۆمەڵێك زانیاری خستەڕوو بۆ سەید قوتب هەروەك لە کتێبەکەی (**التيارات السياسية والدينية في مصر**) دا بە وردیو درێژی هاتووە سەبارەت بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانو ئامانجو چالاکیو پرۆگرامەکانیان.

پاشان ئاگاهیدا بە سەید لەو مەترسیە خراپەی هەڕەشە لە میسر دەکات ئەگەر کۆمەڵی برایانی موسڵمان سەرکەوتن بەدەست بهێنن لە سەرکردایەتیو فەرمانڕەواییو ئاراستەکردنی میسردا، بۆسەیدی خستەڕوو کە ئومێدو هیوایان بەستۆتەوە بە ڕۆشنبیرو موفەکیرەکانەوە تاکو نەهێڵن ئەم کۆمەڵە بگەنە دەسەڵاتو ببنە فەرمانڕەواو، وڵات ببەستنەوە بە ژیاری ڕۆژئاواوە!.

(دن) ئامۆژگاری سەید قوتبی کرد کە واز لە دژایەتیو هێرشکردنە سەر بەریتانیا بێنێت، چونکە ئەگەر بەریتانیا لە میسردا نەما ئەوا ئەمریکا جێگەی دەگرێتەوە کە دوژمنکاری ئەو زیاترە.[2]

سەید لە ئەمریکا خاوەنی چالاکی بوو، هاتوچۆی دەکرد لە نێوان چەندین ویلایەتی ئەمریکیدا، سەردانی ژمارەیەك زانکۆو پەیمانگای کردو، ئاگادارو شارەزا بوو بەسەر پرۆگرامو شێوازەکانی وانەوتنەوە لەوێ. هەڵدەستا بە گەشتی مەیدانی پشکنین، لەم گەشتانەیدا لێکۆڵینەوەی نموونە لەبەرچاوەکانی کۆمەڵگای ئەمریکی دەکردو لە ڕوانگەیانەوە ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئەمریکادا هەڵدەسەنگاند، هەروەها تێکەڵدەبوو بە ئەندامەکانی کۆمەڵگاو لە ژیانیانی دەکۆڵیەوەو مشتومڕی لەگەڵ دەکردنو تێبینیەکانی دەربارەیان تۆمار دەکرد. . هەندێك لە بابەتەکانی ئەناردەوە بۆ گۆڤارو ڕۆژنامەکان لە میسر، هەندێك جاری ناوی ئەو شارەی تۆمار دەکرد کە بابەتەکەی تیا نووسی بوو.

لە شاری جیلی بە زۆری سەردانی پەیمانگای مامۆستایانی دەکردو هەر لەو شارەدا مشتومڕی سازدەکرد، ڕەخنەی دەگرتو تێبینی دەدا لەسەر دیمەنی خراپەکاری لادان لەوێ، هەر بۆ ئەم مەبەستە بەشداری یانەی کەنیسەی جیلی کردو تێبینی ئەو فەسادو خراپەکاریەی کرد کە هەموو شتێکی لە وڵاتەکەدا گرتبووەوە تەنانەت گەشتبووە کەنیسەش.

لەم شارەوە سەید بابەتێکی ئیمانی بەرزی ناردەوە کە ناوی نابوو (**أضواء في بعيد**)و گۆڤاری (الكتاب) لە میسر بۆی بڵاوکردەوە.

هەروەها بەشداری هەبوو لە گۆڤارەکانی جیلی دا وەك (Falcran)، پەیوەندی هەبوو لەگەڵ هاوڕێکانی لە میسر لە سنووری (نامەی برایەتی)دا، لە دێڕێکی ئەو وەڵامەیدا کە بۆ تۆفیق حەکیمی نووسیبوو سەبارەت بەو کتێبەی کە بە دیاری بۆی ناردبوو (**الملك والاديب**)دا دەڵێت: "بە ڕاستی تەنها یەك شت لەم ئەمریکایەدا کەمو ناتەواوە ـ لە کاتێکدا ئەمریکا پڕە لە هەموو شتێك ـ تەنها شتێك لەلایان نرخی نەبێت گیانە. ."[3].

لە نامەیەکی تریدا کە بۆ عەباس خزری ناردووە دەڵێت: (ئەمریکا دەشێت بۆ ئەوەی ببێتە "وەرشەی جیهان"و کاری خۆی بە چاکترین شێوە بەئەنجام بگەیەنێت. . بەڵام جیهان هەمووی وەك ئەمریکای لێبێت. ئەوە بە دڵنیاییەوە کارەساتێکی مرۆییە )، لە نامەکەیدا بۆ مامۆستا جەبر دەڵێت: (برام مامۆستا جەبر. . ئەمریکا گەورەترین ئەفسانەیە جیهان ناسیبێتی!، ئەتوانین سوود لە ئەمریکا وەرگرین بە تەنها لە گەشتی زانستیدا: میکانیكو کارەباو کیمیاو کشتوکاڵو لەم بابەتانە، بەڵام هەوڵدەین سوود لە ئەمریکا وەرگرین لەلێکۆڵینەوە تیۆریەکاندا ـ لە نێوانیاندا شێوازی وانە وتنەوە ـ وای بۆ دەچم کە هەڵەمان کردبێت توندترین هەڵە، وە کشابین بە دوای شێوازی ئەمریکیدا لە پروپاگەندەدا! لەگەڵ ئەمەدا حەزناکەم پەلە بکەم، دڵنیام

[1] أمريكا من الداخل: 28-29.

[2] موحەمەد قوتب ئەو هەواڵەی پێدام.

[3] أمريكا في الداخل: 153.

لێرە شتانێك هەیە كە تا ئێستا نەمزانیون. ئەگەرچی وا پێویست بكات كە ڕێبازی مەڵبەندی دەولی سەركەوتووترین ڕێبازی ئەمریكی بێت!.

بە ڕاستی بە كرداری لە زمانی ئینگلیزیدا پێشكەوتم، پێشكەوتنێكی لەبەرچاو، بەڵام بە لێبڕانی تایبەتی خۆم، بە ڕاستكردنەوەی شێوازی ئەمریكیو موتوربەكردنی، ئەگەر دەیەكی ئەم لێبڕانە لێرە كردوومە لە میسردا لێبڕامایە بەس بوو بۆ ئەوەی ئێستە پێی گەیشتووم، جگە لە ئاسانی لە وتوێژدا كە ئەوە لێرە بە سروشتی حاڵ چاكترە!.

بەڵام ئەوانەی دەربارەی ئەمریكا دەدوێن وەك چۆن دەربارەی حەوت سەرسوڕهێنەرەكەی دنیا دەدوێن، ئەوە هەوڵی ئەوە ئەدەن لە پشتی ئەم گەورە كردنەوە نرخێك بۆ خۆیان دەست بخەن!).

## گەڕانەوەی لە ئەمریكا

سەید كەمتر لە ئەمریكا مایەوە، لە كۆتا ڕۆژەكانی مانەوەیدا گیانی پڕبووبوو لە ئالودەیی بۆ میسرو خەڵكەكەی، بیركردنەوەی زیادی كردبوو بۆ ئەوەی بۆی بگەڕێتەوە، بەپێی ئەوەی كە بوونی سەید لە ئەمریكادا وەك بوونی قوتابییەك نەبوو كە خوێندنێكی دیاریكراو تەواوبكات، بەڵكو وەفدێكی ڕەوانەكراوبوو، گەشیارێك بوو بۆ زانكۆو پەیمانگاكانی ئەمریكا، لەبەرئەوە ئەركەكەی ئەركێكی مەیدانی كرداری بوو، لەبەر هەموو ئەمانە بڕیاری كۆتایی هێنانی گەشتەكەی لە دەستی خۆیدا بوو.

ئەشێت ئەوەی زانیبێت كە ئەو هۆیانەی لە پێناویدا دوورخرایەوە نەمابن یان ونبووبن، سەرەڕای ئەوەی مەلیك فاروق دەسەڵاتی بە شێوەیەكی كرداری لاوازبووبوو بەسەر وڵاتدا! بەمشێوەیە سەید بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ میسر، كەسوكارو هاوڕێكانی لە كاتی گەڕانەوەی ئاگاداركردەوە، لە بەرواری 1950/8/20دا گەشتەوە قاهیرە. پاش سێ ڕۆژ لە گەڕانەوەی پەیوەندی كردەوە بە پیشەكەیەوە لە وەزارەتی مەعاریفەو، لە دۆسیەكەیدا لە وەزارەت ناوی تۆماركرایەوە لە 1950/8/23 بە پیشەی (چاودێری یاریدەدەر) لە نووسینگەی وەزیری مەعاریف.[1] . . سەید قوتب گەشتەوە وڵاتی خۆیو نیازی ئەمریكاو هاوكارەكانی پووچكردەوە، ئەوانەی كە ویستیان سەید بقۆزنەوەو بگەڕێتەوە بۆ میسر (زوڕنایەكی) ئەمریكی بێت و زەمینەسازی بۆ داگیركاری ئایندە بكات لە میسردا.

بەڵام بەهۆی ئیمانەكەیەوە بەرزبوویەوەو پابەندبوونی بە ئیسلامەوە زیادی كرد، كاتێك ڕۆژەكانی ئەمریكای تەواوبوو، بووبوو بە موسڵمانێكی هۆشیارو باوەڕدارێكی پابەند، بووبووە خاوەنی ئاراستەیەكی كرداری بۆ بانگەوازی ئیسلامیو تێكۆشان لە پێناویداو ،چاككردنی وڵاتو لابردنی خراپەو خراپەكاری تێیدا.

ویستی ئەمریكیەكان لە بەرامبەر ویستی خوادا شكستی هێنا، سەید گەڕایەوە بۆ هێرشكردنە سەر ئەمریكاو دەرخستنی ناوەڕۆكی ئەمریكا، دژایەتی هاوكارانو ئەڵقە لەگوێكانی ئەمریكای دەكردو نەخشەكانی پووچەڵ دەكردنەوە لەناو وەزارەتی مەعاریفەو دەرەوەیدا، لە پێگەیەكی ئیسلامی ڕوونەوە ڕووبەڕوویان دەبوویەوە!!.

## لەگەڵ سەید لە گەشتی ونبوونیدا

مەبەست لە گەشتی ونبوونی سەید: بریتیە لەو ماوە زەمەنیەی كە سەید تیایدا ژیاو خۆی نەدەناسی، ئامانجو پەیامو كاری خۆی نەدەزانی، نەزان بوو بە نهێنی ژیانو سروشتی گەردوونو پەیوەندی نێوان خۆی و ژیانو گەردوون!.

گەشتی ونبوونی سەید: ئەو ماوە زەمەنیە بوو كە سەید تیایدا ژیا، ژیانێكی پڕ لە دڵەڕاوكێی ونیو ماندوویی‌و پەشێوی، هیچ هەڵبژاردنێكی هەڵبژێراو جێگەی متمانەو پەسەندی هەڵبژردنی ئەم نەبوو!.

گەشتی ونبوونی سەید ئەو ماوە زەمەنیە بوو تیایدا سەید بیروباوەڕو بۆچوونو فەلسەفەی ئەورووپیو ڕۆژئاواییە مادیە نەفامیەكانی وەرگرت سەبارەت بە گەردوونو ژیانو مرۆڤ، ئەمانە هەمووی لای سەید ئاڵۆزیو گرێی دروستكرد، گومانو

[1] سید قطب: عبدالباقي، 43.

دوودڵی له ناخیدا چاند، دڵەڕاوکێو نائارمی بۆ هێنایه پێش!!، بەشێوەیەك دژ ئەوەستا لەگەڵ ئەو بیره سەرەتاییه ئیسلامیانەی که لای گەلاڵه بووبوو،وه له منداڵیو سەرەتای لاوێتیەوه فێریان بووبوو، بەهۆی لێکۆڵینەوه ئیسلامیەکانیەوه ببوه هەڵگریان.

گەشتی ونبوون لەلای سەید ئەو ماوه زەمەنیه بوو که تیایدا بەربەرەکانێ له نێوان ئەو بیروبۆچوونه ئیسلامیانەی که پێشتر وەریگرتبوو، لەگەل ئەو بیروبۆچوونه مادیه رۆژئاواییانەی که له لاوێتیدا وەری گرتن دروستبوو، هەریەك لەم دوو بۆچوونه جیاوازه له ناخی سەید قوتبدا دەیویست بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ ببێتو سەید بکاته خاوەنی خۆیو خۆشی ببێته خاوەنی سەید، لەم نێوەندەدا سەید وەستا، وەستانێکی سەرگەردانو نائارامو ڕاڕا!!، یان بڵێین: وەستا له نێوان ئەم دوو بانگەوازەدا، وەستانێکی ونی دەربەدەری بێهودە!!.

هەندێك له خوێنەران سەریان لەم ڕاستیه سوڕدەمێنێ، هەندێکی تریشیان بەلایانەوه سەیره، کۆمەڵی سێیەمیش گومانیان هەیه که ئایا ڕۆژێك له ڕۆژان سەید ونبووه؟ ئەی ڕۆژێك له ڕۆژان پەشێوو بێهودەو سەرگەردان بووه؟.

هەندێك له خەڵکی ئەمه بە دوور دەزانن چونکه سەید قوتبیان نەناسیوه تەنها وەك بیریارێکی ئیسلامیو پێشەنگێکی ڕەسەن نەبێت، نەیانناسیووه تا قۆناغی بەخشینه فیکریەکەی که خوای گەوره کۆتایی ژیانی سەیدی لەسەرهێنا.

هەندێکیان سەیدیان وەك ئەدیبێکی ڕەخنەگری بەزەوق ناسیووه پێش ئاراسته ئیسلامیه دیاریکراوەکەی، ئیتر ئاگاداری گەشتی ونبوونو سیماکانی ونبوونی سەید نین لەو ماوەیەدا.

گەشتی ونبوونی سەید بەشێکی شاراوەیه له ژیانی ئەم پیاوەداو، لەلایەن زۆربەی خۆشەویستانو قوتابیەکانیەوه ونو شاراوەیه!!، ئێمه پێمانخۆشه ئاگاداریان بکەینەوه بەسەر ئەم بەشه ونو شاراوەیەی ژیانی سەیدا تاکو لێکۆڵینەوەکه دروستو بێ کەموکوڕی دەربچێت لەلایەكو، بۆ ئەوەی له دەلاقەی ژیانی واقیعیی خۆیەوه ئەو واقیعەی که تیایدا ژیاوه پێشکەش بکرێت بەوەی که هەیبووەو لەسەری بووه، نەك له ڕووی ئەو وێنه نموونەییەوه که خەڵکی حەزدەکەن پێی بناسرێت و لەسەر ئەو بنچینەیه ژیانەکەی پێشکەش بکرێت!!.

هەورووەها ئەم بەشه ونو نادیارەی ژیانی سەید دەخەینەڕوو بۆ ئامانجێکی تر، ئەویش ئەوەیه که فەزڵی خوای گەوره بزانین بەسەریەوه که له سەرگەردانیو ونبوونو گومانو تاریکیەکانەوه دەریهێنا بۆ هۆشیاریو هیدایەتو دڵنیاییو بڕوا!!، پاشان بۆ ئەوەی خەڵك چاك له سروشتی ئیجابی جوڵەی سەرسوڕهێنەری ئەم ئاینه تێبگەن که چۆن گۆڕانو وەرچەرخان بەسەر کانگای دەروونەکاندا دەهێنێتو چۆن لەم ئیسلامه گەورەیەدا مرۆڤەکان دەگۆڕێن به شێوەیەکی تر، لەم کارگەی ئیسلامەدا چۆن مرۆڤەکان به کەسایەتیەکی ئیجابی بزواوی مەزنەوه دەردەچن وەك ئەو نموونه زیندووەی که بەسەر بیریاره پێشەنگه شەهیدەکەماندا هات!!.

## ماوەی زەمەنی ونبونی سەید قوتب

ئەبو حەسەنی نەدەوی بۆمان دەگێڕێتەوە کە دیمانەیەکی لەگەڵ سەید سازداوە لە کۆتایی ساڵی 1951دا دوای کۆتایی هاتنی گەشتی ونبوونەکەی‌و دەڵێت: (سەید هەر لە منداڵیەوە لە گوندەکەیاندا لەسەر داب‌و نەریتی ئیسلامی گەورەبوو، دوای ئەوەی چوو بۆ قاهیرە ڕوی کردە ئەدەب‌و ڕەخنەو لێکۆڵینەوەو ڕۆشنبیری‌و مەعریفە، تا بویە هەڵگری ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی مادی، ئەمەش وایلێکرد بە قۆناغی گومان‌و دوودڵی لە ڕاستیە ئاینیەکاندا تێپەڕێت تا ئەوپەڕی ئاست!)، بەپێی وتەکانی مامۆستا نەدەوی ـ لەم قۆناغەدا ـ لە کاتی ونبوونەکەیدا ـ سەید ڕویکردۆتە قورئانی پیرۆزو دەستیکردوە بە لێکۆڵینەوەی بۆ مەبەستی ئەدەبی، بەڵام قورئان گواستنەوەو گۆڕانێکی فراوانی بەسەردا هێنا بەرەو جیهانی ئیمان‌و دڵنیایی!.

گەشتی ونبوونی سەید نزیکەی (15) ساڵی خایاند، ئاستی ونبوونی لەم ماوەیەدا بە پلەی جیاجیا بوو، لە ئاستی جیاجیادا بوو، بەڵکو پلەو نمرەکانیش بەرزو نزمیان دەکردو مۆلەق بوون.

وەسوەوسەو گومان‌و خەیاڵ وردە وردە دزەی کردە ناخی سەیدەوە، بە شێوەیەکی پلەپلەیی دەروون‌و بیروبۆچوونی داگیرکرد!، هەر بەشێوەیەکی تەدریجی کاریگەریەکی ڕوون‌و ئاشکراتر لەسەری دەرکەوت‌و زاڵبوو بەسەر هەڵس‌و کەوتەکانیدا ، بەڵام لە کۆتاییدا ئەم کاریگەریانە بەرەو لاوازی ڕۆشتن‌و، سەید تێدەکۆشاو خۆی ماندوو دەکرد تا بە تەواوی ڕزگاری ببێ‌و دەربچێت لە ژێر کاریگەری ئەو بارەی تێی کەوتبوو، ئەمەش هەندێ جار لە هەندێ هۆنراوەیدا دەردەکەوێت‌و لە هەندێکی تریشیاندا وندەبێت!.

بەڵام هەر ئەوەندە بەس بوو سەید هەڵسوکەوتی کرد لەگەڵ ڕاستیەکانی ئیسلام‌و بیرە ئیمانیەکاندا ئیتر کاریگەری قۆناغی ونبوونی لەسەر لاوازبوو تا وایلێهات بەتەواوی لە دەرەنجامەکانی ڕزگاری‌بوو.

گەشتی ونبوونی سەید نزیکەی 15 ساڵ درێژەی کێشا لە نێوان (1925 – 1940). واتە گەشتی ونبوونی دەستپێدەکات لە کاتێکدا لە خوێندنی دواناوەندی دایە، لەگەڵیدا ئاوێزان دەبێ کاتێك دەچێتە زانکۆ، لە دوو ساڵی کۆتایی زانکۆیدا ئەگاتە لوتکەی ونبوون، کە دەکاتە ساڵی (1932- 1933).

لە ساڵی یەکەم لە ژیانی فەرمانبەریدا بە قوڵایی ونبوونیدا ڕۆچووبوو بە تایبەتی دوو ساڵی یەکەم (1934 – 1935).

## هۆیەکانی ونبوونی سەید قوتب

هۆی ڕاستەوخۆی ونبوونی سەید دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆر بەخێرایی ڕۆشت بەرەو ڕۆشنبیری ماددی ڕۆژئاواو وەریگرت، هەموو ئەو بنەماو بیروبۆچوونانەی ەرگرت کە ئەو ڕۆشنبیریە لە خۆیداهەڵی گرتبوو!!.

ئاشکراشە ڕۆشنبیری سێ سەدەی کۆتایی (18، 19، 20) کە سەیدو مامۆستاکەی "عەقاد" تیایدا ڕۆچووبوون (جیائەکرێتەوە بە هەنگاونان بەرەو تاکڕەوی، گەشەی ئازادی فیکری‌و دەروونی، هێنانەدی بەهایەکی تایبەت‌و دەرچوون لە هەموو بەها باوەکان، لەبەر ئەوەهەرکەس بەبێ پێودانێکی جێگیر لێی هەڵبگۆزێت ئەوا لە بوارەکانیدا نگرۆ دەبێت، لە تەوژمە تاریکیەکانیدا وندەبێت).[1]

ئەم ڕۆشنبیریە مادیە ڕۆژئاواییە ڕۆشنبیریەکی نەفامی‌و پێچەوانەی بیروبۆچوونە ئیسلامیەکان بوو، دژئەوەستا لەگەڵیان.

ئەم ڕۆشنبیریە بەشێوەیەکی ڕوون‌و لەبەرچاو کاریگەری لەسەر لایەن‌و بەش‌و بوارەکانی مەعریفەی مرۆیی بەجێهێشت ، بەشێوەیەك لایەن‌و بەش‌و بوارەکانی مەعریفەی ئەو سەردەمە هەموی بوویە ئاوێنەی ئەو ڕۆشنبیریە مادیە ڕۆژئاواییە.

پێویست ناکات هێندەش دوور بڕۆین!، با گوێبیستی سەید قوتب بین کە دان دەنێ بەو سیفەتە ماددیە نەفامییەی ڕۆشنبیری ئەوروپی‌و ڕۆژئاوادا، کە دوای ئەوەی خوای گەورە هیدایەتیدا تێبینی خۆی لەسەر تۆمارکردو ڕەهەندەکانی خستەڕوو، هەروەها شیبکردەوە،هەروەك لە بەشی (**التصور الاسلامي والثقافة**)ی کتێبی (**معالم في الطريق**) لاپەڕە (171 – 172)دا ڕوونی کردووەتەوە!.

---

[1] سید قطب: برکات، 43.

سەید دان بەوەدا دەنێت کە لە ماوەیەکی زەمەنی تەمەنیدا ڕویکردۆتە ڕۆشنبیری ڕۆژئاواو ئاماژە بە کاریگەریەکانی دەکات لەسەر خۆی، پاشان دان بە فەزڵی خوای گەورەدا دەنێت کە ڕێنومایی کرد بۆ بیری ئیسلامی ڕاستەقینەو دەڵێت: (ئەوەی ئەم وتەیە دەنووسێت مرۆڤێکە ژیاو چل ساڵی ڕەبەق خوێندیەوە، کاری یەکەمی لەو ماوەیەدا خوێندنەوەو ئاگاداربوون بوو بەسەر زۆربەی بەشەکانی مەعریفەی مرۆییدا. . . ئەمەش نە لە تایبەتمەندیو نە لە هیوایەتەکانی بوو. . . پاشان گەڕایەوە بۆ سەرچاوەکانی عەقیدەو بۆچوونەکانی، ئەوەتە ئێستە دەبینێت کە ئەوەی خوێندوویەتیەوە زۆر زۆر کەمە لە چاو ئەو سەرمایە گەورەیەدا. . پەشیمان نیە لەوەی کە چل ساڵ تەمەنی تیا بەسەربرد چونکە بەڕاستی کرۆکی نەفامیو هەموو جۆرە لادانەکانی ناسی، نەفامی ناسی کە چەندە بێنرخو بێئەرزشو سووکە. . . شارەزابوو، شارەزابونێکی دڵنیا کە ناگونجێت موسڵمان لە وەرگرتندا دوو سەرچاوە پێکەوە گرێبدات).[1]

کەواتە هۆکاری سەرەکی بریتیە لەوەی کە سەید ڕۆشنبیری ڕۆژئاوای وەرگرت بە هەموو بیروبۆچوونو بنەمایەکی فیکریەوە، لەگەڵ هەست نەکردن ـ یان لەبیرچوونەوەی ـ بۆ بیروبۆچوونو بڕیارە ئیسلامیەکان. ئەو کەسانەشی بەرپرسن لە ونبوونی سەید هەموو ئەو کەسانە بوون کە دەرگای ڕۆشنبیری مادی ڕۆژئاوایان بە ڕوودا کردەوەو سەوڵ لێدانیان لەو دەریایەدا بۆ ئاسان کرد!.

لە پێشەوەی ئەو کەسانەش کەبەرپرسن لە ونبوونی سەید قوتب، سەید خۆیەتی! کە ڕوخسەتی بە خۆیدا لەو سەرچاوە بێگانەیەوە بنۆشێ لە کاتێکدا جێگیرنەبووبوو لەسەر بنەماکانی ئیسلامەکەی، لەسەر زەمینەیەکی ئیمانی پتەوی بەهێز دانەمەزرابوو!.

هەروەها مەحمود عەقادی مامۆستای کە بەردەوام سەید هەوڵی ئەوەی ئەدا چاوی لێبکاتو لە هەموو شتێکدا جێ پێکانی هەڵبگرێ. . . بەڵێ سەید چاوی لێکردو لاسایی کردەوە لە ڕۆچوون لەو ڕۆشنبیریە ڕۆژئاواییەدا کە هەموو سەرچاوەکانی لە کتێبخانە گەورەکەی مامۆستاکەیدا دەست دەکەوت!.

بە هەمان شێوە خاوەنی گۆڤارو ڕۆژنامەکان کە بیروبۆچوونی مادی دژ بە ئیسلامیان دەگەیاندە ئەو لاوانەی تامەزرۆی ڕۆشنبیریو مەعریفەت بوون، ئەمانە بەرپرسی سێیەم بوون لە تێکدانی سەیدو لاوە هاوشێوەکانیدا.

## ونبوونی سەید فیکری بوو نەك ڕەوشتی

**ونبوون دوو جۆرە:**

**یەکەم:** ونبوونی فیکری، کە بەسەر ژیریو زیهنو بۆچووندا دێو لە بازنەی بیروبۆچوونە نەزەریەکاندا دەمێنێتەوە.

**دووەم:** ونبوونی ڕەوشتی، ئەو ونبوونو لادانەیە بەسەر ڕەوشتو کردارو هەڵسوکەوتەکاندا ڕەنگ دەداتەوە.

ئەم جۆرە ونبوونە ئەشێت مرۆڤ لە هەموو چوارچێوەو سنوورێك دەربکێشێتە دەرەوەو، هەموو جۆرە دابو نەریتو بەهایەك پێشێل بکات، ڕوبکاتە هەموو خراپەو هەڵەو تاوانێك وەك: خواردنەوەی مەشروبو داوێن پیسیو تاوانکردن. زۆرجاریش پەیوەندی لە نێوان هەردوو جۆرەکەدا دەبێت، بەشێوەیەك ئەو کەسەی دەکەوێتە جۆری یەکەمەوە "ونبوونی فیکری"زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە جۆری دووەمەوە "ونبوونی ڕەوشتی" یاخود کۆتایی گەشتی ونبوونەفیکریەکەی بە ونبوونو لادانی ڕەوشتی دێت. ئەو مرۆڤەی بیروبۆچوونی ڕاست لەدەست دەدات ـ زۆرجار ـ ڕەوشتو هەڵسوکەوتو ڕفتاری ڕۆژانەی لەدەست دەدات، جگە لە کەسانێکی زۆر کەم نەبێت کە لە کاتێکدا ونبوونی بیریی ڕووی تێکردون ڕەوشتو هەڵسوکەوتیان تا ئاستێکی باش بە پارێزراوی ماوەتەوە، سەید قوتب لە ونبوونەکەیدا یەکێکە لەو نموونە کەم وێنانە کە ونبوونەکەی تەنها تیۆریو بیری بوو، ونبوونەکەی کەوتە سەر ژیریو زیهنو بیروبۆچونەکانی، هێندە درێژ نەبوویەوە بگاتە ونبوونی ڕەوشتیو لادانی هەڵسوکەوتی، ڕەوشتی سەید نەکەوتە ژێر کاریگەری بیرە نامۆکەیەوە. . . بەو مانایەی سەید قوتب ژیانی بە لادراویو

---

[1] معالم في الطريق: سيد قطب، 176.

ڕیزپەڕیو بەدڕفتاریەوە نەبردەسەر، ژیانی سەید ژیان بەسەربردنێکی ئاژەڵی نەبوو، هەرگیز لە سەید نەبینراوە عارەقی خواردبێتەوە، یان تاوانێکی گەورەی کردبێت یان ئالودەی بەدڕەوشتیو مادەسڕکەرەکان بووبێت!.

کەسایەتی سەید لە ونبوونە فیکریەکەیدا لێکهەڵنەوەشا، هەروەها سروشتیشی خراپ نەبوو، ئەگەرچی نائارامو ونو پەشێو بوو، ئەو هەموو بیروباوەڕە بانگەشەی دەکرد بۆ لادانو خراپەکاری، بەڵام ڕێکخەرە فیترەیکانی سەیدو قەوارەی ئەو فیترەیە جوڵەکانی کپ دەکردەوەو هەڵسوکەوتو ڕەوشتەکانی ڕێکدەخست، لەم نێوەندەشدا ئازاری زۆری دەچەشت، ناڵەی ئەم ئازارەش ئاوێزان لەگەڵ هاوارو ئازاردا لە بەرهەمەکانیدا دەردەکەوێت!!.

جا ئەگەر سەید مومارەسەی ونبوونی ڕەوشتیو ئاکاریی لە جیهانی واقیعدا بکردایە ئەوە هەرگیز هەستی بەم دووفاقەییە توندە نەدەکرد، ئەم ئازارو ناڕەحەتیانەی نەدەچەشت، ناڕەزایی دەربڕین لە بەرهەمە ئەدەبیە شیعریەکانیدا ڕەنگی نەئەدایەوە!. ئەمەش هەمان شیکردنەوەی مامۆستا محەمەد قوتبە بۆ دەرکەوتنی کاریگەری ونبوونە فیکریەکەی سەید لە بەرهەمە شیعریەکانیدا لە ماوەی ونبوونیدا، لە کاتێکدا گفتوگۆی نامەیەکی ماستەری نووسەر دەکات لە ساڵی 1980دا (**سيد قطب والتصوير الفني في القرآن**)، دەڵێت: ونبوونی سەید جیاوازە لە ونبوونی گەورە ئەدیبو شاعیرو ڕۆشنبیرە میسریەکانی تر ـ لە نێوانیاندا عەقاد ـ کە هەردوو جۆرە ونبوونەکەیان پێکەوە گرێدابوو، ئەوانی تر ونبوون، ونبوونێکی فیکری، ونبوونێکی ڕەفتاری، بە کرداریش تیایدا دەژیان، بە لادانو تاوانو خراپە ئەنجامدان!!، بەڵام سەید لە ونبوونەکەیدا وەك ئەمانە نەبوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو ئازاری دەچەشتو گنگڵی ئەدا، پرسیاری دەکردو ناڕەزایی دەردەبڕی!!، سەید لە ماوەی ونبوونەکەیدا چەندین چامەی داناو کردنیە ئاوێنەی دەروونیو ڕەنگدانەوەو سیماکانی ژیانی، کە سەرەتاکانی لە شێوەی هۆنراوەی ونبووندا دەستپێدەکات وەك هۆنراوەکانی عومەر ئەلخیام

لە دوو بەشی یەکەمی دیوانەکەی (**الشاطئ المجهول**)دا (29) چامەی تۆمارکردووە کە ئاماژە بەم ڕاستیە دەکەن لە ژێر دوو ناونیشاندا (**ظلال و رموز**)، (**صور وتأملات**) هەروەها مامۆستا یوسف عەزم دەربارەی سەید دەڵێت: "مامۆستاکەمان لە کۆتاییەکانی سەردەمەکان لەگەڵیدا بووە، دەری دەبڕی کە دیوانەکەی پاشماوەیەکە لە پاشماوەی نەفامیەکەی، چەندە پێویستە کە دەستی بگاتە هەموو ئەوەی کە لە دیوانەکەیدایەلە هەر نوسخەیەکدا کەگەشتبێتە هەر بەشێکی زەوی تا کۆیان بکاتەوەو دەستیان بەسەردا بگرێت.

لەو چامانەی کە تێیدا ونبوونی سەید دەردەکەوێت: (**الشعاع الخابي، خراب، في الصحراء، النفس الضائعة، الغد المجهول، غريب، السر، سخرية الاقدار، يوم خريف، قافلة الرقيق، أقدام الرمال**). ئەوەش دوپات ئەکەینەوە کە ونبوونی سەید تەنها دڵەڕاوکەو گومانو دوودڵی بوو، بێباوەڕیو ئیلحاد نەبوو، بەرەو پێشەوە نەڕۆیشت تا بگاتە بێباوەڕی، ئەگەر سەید بگەیشتایەتە ئاستی بێباوەڕبوون، ئەوا لە هۆنراوەو چامەکانیدا هەستمان بەو گیروگرفتە سەختە نەدەکرد، هەستمان بە هاوارو گلەییو ئازار نەدەکرد!.

سەید قوتب تەنها ڕۆژێك لە ژیانیدا بێباوەڕ نەبووە، ڕۆژێك لە رۆژان بێباوەڕ نەبووە بە خوای گەورەو نەفی بوونی خوای نەکردووە، لەو هۆنراوانەیدا کە ونبوونی سەیدی تیادەخوێنرێتەوە لە هیچ بەشێکی هۆنراوەکانیدا لە دەرگای بڕوابوون بە خوای نەداوە، چونکە بۆ ئەم بابەتە ڕێگەی بە خۆی نەداوە بیری لێبکاتەوە یان پرسیاری بەدەوریدا دروست بکات یان گومان پەیدابکات بەرامبەر ئەم ڕاستیە!.

بەڵام هەڵوێستی لە بەندایەتیەدیاروئاشکراکان ـ بەتایبەتی نوێژ ـ وەك نووسەر دەڵێت کە هیچ شتێکم لەوبارەوە بەردەست نەکەوتووە نە بەچاكو نە بەخراپ، لێرەدا هیچ قسەیەك نیەسەبارەت بەوەی کە سەید نوێژەکانی بە تەواوی کردبێت لە ماوەی ونبوونیدا، هەروەها هیچ قسەیەك نیە کە پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێت، واتە بلێت سەید لەو ماوەیەدا وازی لە نوێژکردن هێناوە.

سەید تەنانەت لە ماوەی ونبوونەکەشیدا بەردەوام دژایەتی ڕەوشت نزمیو خراپەی دەکردو بانگەشەی بۆ ڕەوشت بەرزیو شکۆداری دەکرد، چەندین بابەتی هەیە کە لە سیبیەکانو چلەکاندا بڵاوی کردوونەتەوەو تێیدا هێرش دەکاتە سەر بەدڕەوشتو

لادراوو خراپەکاران، تێڕوانینی ڕۆژئاوا بۆ زایەندو ئارەزوو بەرپەرچ دەداتەوەو، بانگەشە بۆ سەرپێچی کردنو خۆپاراستن لە گیرۆدەبوون پێوەی دەکات.

لە گۆڤاری (**الرسالة**)دا بە بەرواری 15/ ئەیلول/ 1933 بابەتێکی بڵاوکردووەتەوە لە ژێر ناونیشانی (**العالم يجري**) کە ئەم دەستەواژانەی تێدا هاتووە: (لە میسری ئەمڕۆدا بانگەشەیەکی گەرمو ترسناك هەیە بۆ چاولێکەری ڕۆژئاوا، بۆ ڕۆشتن بە دوای ڕۆژئاوادا، ئەگەرچی ئەمڕۆ ڕۆژئاوا ئاڕاستەی خۆی نازانێو وێڵە. وەك کەسێك ڕێگەی ونکردبێت لە بیابانەکانی ژیاندا، ئەمەش وەك ئەوە وایە ئێمە بڕۆین لە دوای یەکێکەوە کە دەڕوات، بەڵام نازانێ بەرەو کوێ!!!، ئەم بانگەوازە پێویستە ئاگاداری لێبکرێ. . . پێویست نیە ڕۆژهەڵات ئارامی خۆی لەدەست بداتو بکەوێتە دوای ڕۆژئاوا. . بەبێ سەرنجدانو بیرکردنەوە.

نامەیەك ـ پەیامێك ـ هەیە بۆ ڕۆژهەڵات کە ئێستە کاتی هاتووە، پەیامێکی دامەزراوە لەسەر ئەو تایبەتمەندیە ڕەسەنانە کە تێیدایە، ئەمەش لە داهاتوودا دەبێتە ئەرك لەسەری ـ بەڵکو بووە بە ئەرك ـ چونکە ڕۆژئاوا خەریکە تیادەچێت لە لاوازی و بێهێزی و زیادەڕەوی و ملنانو، زۆری پێکدادانەکانیدا. . . ).[1]

هەروەها سەید هێرش دەکاتە سەر بانگخوازە عەرەبیەکانو پاڵپشتانی کۆمەڵگا بێ ئابڕووەکان، ئەوانەی دەیانەوێت چاو لە ڕۆژئاواییەکان بکەن لە کۆمەڵگا ڕوتەکانیدا لەوێ، بە دەربڕینی زۆر توندوتۆڵ هێرش دەکاتە سەر ڕۆژنامە بێ ئابڕووەکان لە هەموو شوێنێکدا:. . . کۆمەڵێك مندالْ هەن لە ماڵی خۆیاندا ئابڕویان نیە، بە ڕوتا دەوەڕن هەروەك چۆن سەگ دەوەڕێت: ئەمە دواکەوتنە! ئەم کۆنەپەرستیە! ئەمە وەستانە! پێت دەڵێت: لە ئەوروپاو ئەمریکاو لە جیهانی پێشکەوتوخوازدا گۆشتەکان تێکەڵ دەبنو لاشەکان ڕووت دەبنەوە!.

ئەی منالان! لە جەنگەڵستانیشدا هەروایە، گۆشتەکان تێکەڵ دەبنو لاشەکان دەردەکەونو ڕووت دەبنەوە!، بەڵام جەنگەڵستان ڕێزدارترو بێ زیانترە!، چونکە لەوێدا فیترەت ڕاسترو پاکترە. . .[2] لێرەدا بانگەشەیەکی سەید بۆ چاولێنەکردنی ڕۆژئاواییەکان لە ژیانە شەهوانیو بێ ئابڕووەکەیاند هەیە، داوادەکات بە گەڕانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتو ژیانە ئیسلامیە پیرۆزەکەی.

لە ساڵی 1946دا لە گۆڤاری (**العالم العربي**) بە ناونیشانی (**عودوا الى الشرق**) بابەتێکی نووسی کە ئەمە هەندێك لە وتەکانیەتی لەم بابەتەدا (بێگومان ژیان لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی خۆشترە، زیاتر دابینکەری پشووە، بەڵام هەرگیز بەرزترو بەڕێزتر نیە، لە ڕوی مرۆڤایەتیەوە زیاتر پێشکەوتووتر نیە ـ ژیانێك مرۆڤ تیایدا لە هەموو سنوورێك دەربچێ، ژیانێك تێکەڵاویو ڕابواردن دابین دەکات، لە کۆڕو هۆڵی سەما و ئاهەنگو شوێنە زانستیەکاندا، بە هەموو ئەوەی کە لە تێکەڵاویدا هەیە لە ئازادیو خۆشیو دەرچوون، ئەمە ژیانێکە بێگومان خۆشە، بەڵام ژیانێکە زیاتر بۆ لای ئاژەڵ خواردەبێتەوە نەك ژیانی مرۆڤ، ئەوە ژیانی کۆنەپرستیو دواکەوتنە لەگەشەو پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا. . . ئەو ژیانە ئاوی غەریزەکانی زایەندی دەدات، خۆشیەکانی جەستە دابین دەکات، لەزەت وەرگرتن ئازاد دەکات، کە هیچ دابێك نەیگرێتەوە، هیچ سنوورێك لە بەردەمیدا ڕانەوەستێ، ـ ئەوە ـ ئازادی کۆیلەو ئاژەڵە، نەك ئازادی مرۆڤ)، (هەرکەسێك ئارەزوی چێژوەرگرتنی ئاژەڵیانەی ئازادو ئاسان و بێنرخ دەکات ئەوە لە ژیانی ڕۆژئاوادا هەیەو، بۆ ئەوکەسەی دەیەوێت بەرفراوانە، هەرکەسیش ئارەزووی ئازادی مرۆیی دەکات ئەوە لە ڕۆژهەڵاتدا دەیبینێتەوە، کە چ ئازادیەکی پیرۆزی ڕۆحی تێدایە کە بەرزترە لە هەموو چێژەکانی جەستە، بەرزترە لە هەموو ئازادیەکی فیکر لەسەر شێوازی کۆیلە ڕۆژئاواییەکان.

ئەم ژیانە ڕۆژێك لە ڕۆژان سەردەکەوێت، کاتێك ئەوەی بەناوی شارستانیەتی ڕۆژئاواوەیە (شارستانیەتی ئاژەڵو کۆیلە) ئاوادەبێت!!).[3]

---

[1] گۆڤاری الرسالة ساڵی دوانزەهەم، ژمارە: 17.

[2] بابەتی (مفارقات) لە گۆڤاری (الرسالة) ژمارە 689، ل1018.

[3] بابەتی (عودوا لى الشرق)، ژمار ، ل3-4، سالي 1946.ز

## ئافرەت لە ژیانی سەید قوتبدا

پوختەی ئەم بەشە ئەوەیە کە سەید دووجار خۆشەویستیەکی ڕاستگۆیانەی شەرەفمەندانەی کردووە ـ ئافرەتی دەستنیشان کردووە یان هەوڵیداوە دەستنیشانی بکات ـ بەڵام ژنی نەهێناوە، ژیانی ئەم دونیای بەجێهێشت، بێ ئەوەی ژن بهێنێت، نزیکەی (60) ساڵ بە ڕەبەنی مایەوە.

لێرەدا یادەوەریەکی خۆشم بیردەکەوێتەوە لە یەکێك لە دوژمنانی دینەوە بیستم کە بەڵگەیە لەسەر ئاستی بەکارهێنانو گرنگیپێدانی پروپاگەندە لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ ناشیرین کردنو شێواندنی وێنەی کەسایەتیو پێشەنگەکانی فیکرو بانگەوازی ئیسلامی.

یەکێك لەو برادەرانە وتی: سەید قوتب بانگەشەی بۆ شتێك دەکرد کە خۆی بەشێوەیەکی کرداری پێوەی پابەند نەبوو، بەو بەڵگەیەی کە ئەو برادەرە سەید قوتبی بینیوە لەسەر یەکێك لە شەقامەکانی قاهیرە رێگەی کردووە ـ دوای دەرچوونی لە زیندان لە ساڵی 1964 ـ ژنەکەیو کچە گەورەکەی لەگەڵدا بووە، کە هەردووکیان ڕووتو سفور بوون، سەرو قاچو ڕانیان لەگەڵ سنگیاندا ڕووت بووە!!!.

لەگەڵ ئەوەدا سەید لە هەموو تەمەنیدا ژنی نەهێناوە هەتاکو منداڵی هەبێت!.

## خۆشەویستی یەکەمی لە گوندەکەدا

یەکەم کەس کە خۆشەویستیی چووە دڵی سەیدەوە لە گوندەکەی خۆیاندا بوو ـ موشە ـ پێش سەفەرکردنی بۆ قاهیرە، کە پەیوەندی خزمایەتیەکی دوور پێکەوەی دەبەستنەوە ـ کچی مامی خێزانی مامی بوو ـ.

ئەم کچە بە پیاوەتیو ئازایەتیو مەردایەتی سەید سەرسام بوو، کە بەردەوام هەوڵیستی پارێزگاریکردن بوو لە قوتابییە کچەکانی قوتابخانەو، بەرگری قوتابییە هاروهاجو دزێوەکانی دەکرد لەوەی قسە بە کچان بڵێن یان توانجیان تێ بگرن، ئەم کچە هەندێك جار لەگەڵ هاوڕێکانیدا ئەهاتن بۆ ماڵی سەید بەو بیانوەی لەگەڵ خزشکەکەیدا یاری دەکەن، بەڵام سەید هەستی بەوە دەکرد کە خۆی مەبەستە لە سەردانەکەدا. . ئیتر خۆشەویستی ئەم کچە چەسپا لە دڵی سەید قوتبدا، هەستی دەکرد ئەویش هەمان هەستی لەگەڵ دەگۆڕێتەوە! (. . نهێنی جوانیەکەی لەلای ئەو ئەوەبوو کە خاوەنی سروشتێکی تایبەتی بوو!، ئەگەرچی لەوکاتەدا نەیدەزانی سروشتی تایبەتی چیە.[1]

سەید گوندەکەی بەجێهێشتو بەمەبەسی خوێندن ڕۆیشت بۆ قاهیرەو ئیتر خۆشەویستی یەکەمی لە گوندەکەدا بەجێهێشت، بەڵام لە خەیاڵیدا هەر مایەوەو لە بیریدا بوو لێی جیانەدەبوویەوە.

دوای زیاتر لە سێ ساڵ دابڕان لە قاهیرەوە گەڕایەوە گوندی (موشە)و یەکەم کار کە لە دوای گەشتنەوەی پێی هەستا (پرسیاربوو لە چارەنووسی کچە منداڵەکە کە یەکەم جار ئالودەی کرد، زانی کە شوی کردووە! شوەکەی لە لادێیەکی دوور لە گوندەکەیانەوە!! ئیتر سەید وا خۆی دەبینیەوە کە پێویستی بەوە هەیە لە کۆمەڵ بکێشێتەوە، چاوەکانی بینیەوە کە هۆن هۆن فرمێسك دەرێژن).[2]

[1] طفلة من القرية/ سيد قطب: 55.
[2] طفلة من القرية/ سيد قطب: 55.

## خۆشەویسی دووەمی لە قاهیرە

دوای ئەوەی کۆلێژی تەواوکرد بۆ جاری دووەم خۆشەویستی دووەمی بۆ خۆی گرت، ئەمەش لە کۆتایی سییەکاندا بوو کە لەو کاتەدا لە وەزارەتی مەعاریف کاری دەکرد.

خۆشەویستی دووەمی کچێکی قاهیرەیی بوو، ڕوکاری ئەچووەوە سەر خۆشەویستی یەکەمی، (لەو کچانە نەبوو کە نەریت بە جوانی دەدانە قەڵەم ـ پێکهاتەی لاشەی جگە لە سنگە سەرنجڕاکێشەکەی ـ زۆر باش نەبوو. بەڵام لە دەمو چاویدا ڕاکێشانێکی فریودەر هەبوو، ڕەنگی شەرابی بوو، ناوچاوی ڕوون بوو، لە چاوەکانیدا درەوشانەوەیەکی سەیر هەبوو، لێوەی پرشنگێکی فریودەر دەردەچوو).[1]

سەید دوای ئەوەی ئەم ئافرەتەی خۆشویست لە کەسو کاری ئافرەتەکە چووە پێشەوە بۆ داواکردنی. ئافرەتەکەش دە ساڵ لە سەید منداڵتر بوو.

## ئازارچەشتنی سەیدو خۆشەویستەکەی پێکەوە

سەید لە خەویدا بونیادی هێلانەی خێزانێکی بەختەوەری نا، لە شەوی دیاریکردندا دەستی گرت بۆ ئەوەی ئەڵقەی دەسنیشانکردنی لە پەنجە بکات بەڵام (هەستی بە دەستی دەکرد کە لە نێو دەستیدایە، سەیریکرد کە فرمێسکێك لە چاوەکانیەوە دەرژێتە خوارەوە).[2]

هەر لەو کاتەدا هەستی بەوە کرد کە خەوەکەی هەڵوەشایەوە، ئیر سەید خۆری واقیعێکی تاڵو پڕ لە ئازاری لێهەڵهات!!.

لە دوای پێداگرتنی سەید لە خۆشەویستەکەی تا نهێنی فرمێسکەکەی پێبڵێت، خۆشەویستەکەی دانی بەوەدانا کە لە پێش ئەوەی لەگەڵ سەید یەکتر بناسن، چیرۆکێکی خۆشەویستی هەبووە لەگەڵ کوڕی ئەفسەرەکەی دراوسێیاندا.

دوای ئاشنابوونی سەید بەم ڕاستیە ناڕەحەتە، ئازاری ئەچەشت لەگەڵیدا، ئەویش ئازاری لەگەڵ ئەم ئەچەشت، هەردووکیان لە ماوەیەکی زەمەنیو ژیانێکی بە ئازارو دڵەڕاوکێو بێبەشبووندا دەژیان.

سەید ناتوانێت ئەو ئافرەتە بهێنێ، چونکە دڵی عازەب نیە، سەید حۆریەکی چاوگەشی قاهیرەی دەویست کە دڵو لاشەی عازەب بن بەڵام لە جلوبەرگێکی قاهیریدا بێت.

لەگەڵ ئەوەدا سەید توانای نەدەشکا بەسەر لێجیابوونەوەو لەبیرکردنیدا، چونکە خۆشەویستیەکەی لەناوجەرگەی دڵیدا نەخش بووبوو، ئاسمانی ژیانی داگیرکردبوو!.

چەند ساڵێك پێکەوە ژیانێکی پڕ لە ئازارو ناڕەحەتو موعاناتێکی توندو دڵەڕاوکەیەکی مرێنەریان بردەسەر. سەید لەم ئەشکەنجەو ناڕەحەتیو بێبەشبوونو گرفتانە بابەتێکی بۆ بەرهەمە ئەدەبیە بەرزەکانی گەڵاڵە کرد لە پەخشانو لە شیعر.

**لە پەخشاندا:** چیرۆکێکی ڕۆمانسی بەرزی بە ناوی (أشواك) سەبارەت بەو ماوەیەی ژیانی نوسی و، لە ساڵی 1947دا بە چاپی گەیاند، لەم چیرۆکەدا تۆماری ئەزموونەکانی لەگەڵ کچە ـ دەستگیرانە ـکەیدا کردووە و، وێنەی کێشاوە بە هەموو قۆناغە جیاجیاکانیەوە.

لە چیرۆکەکەدا ناوی (سامی) لەخۆی و (سمیرە)ی لە دەستگیرانەکەی ناوە، بۆ هۆنینەوەی چیرۆکەکە هەرچی بە خەیاڵیدا هاتبێت بۆی زیادکردووە ـ وەك ڕازاندنەوەی ئەدەبی ـ.

چیرۆکەکەی پێشکەش کردووە بە کچە دەستگیرانەکەیو لە پێشکەشکردنیدا وتوویەتی: "بۆ ئەو کەسەی لەگەڵمدا عیشقی هەڵگیرساند، خوێنی لێتکاو خوێنم لێتکا، سەرگەردان بووم، پاشان ئەولە ڕێگەیەکەوە ڕۆیشت، منیش لە ڕێگەیەکی ترەوە، بە بریندارى لەدوای جەنگ، نە دەروونی ئەو بۆ ئارامگرتنو نەدروونی من بۆ جێگیربوون".[3]

[1] أشواك: سيد قطب: 41.
[2] أشواك: 10.
[3] هەمان سەرچاوە.

**لە هۆنراوەدا:** سەبارەت بە خۆشەویستەکەی چەند چامەیەکی شیعری بەرزی داناوە، لەوانە: (**تطهير الصنم، عبادة جديدة، حب مشكور، نهاية المطاف، بعد الأوان، الكأس المسمومة**).

وا دەردەکەوێت کە نیەتی ئەوەی هەبووە هۆنراوەکانی ئەشکەنجەو بێبەشبوون کۆبکاتەوەو لە دیوانێکدا بە ناوی (**الكأس المسمومة**)وە بلاوی بکاتەوەو بە چاپی بگەیەنێت ـ بەلام لێی پاشگەز بووەتەوە ـ.

گرفتو ئەشکەنجەو ئازارەکانی زیاتر لە چامە شیعری (**الكأس المسمومة**)دا دەردەکەون کە لە سالی 1941 دا بلاوی کردەوە، کەلەوکاتەدا لە لوتکەی گرفتو ئازار چەشتندا دەژیا.

## لە کۆتاییدا دەستنیشانکردنەکەی هەلوەشاندەوە

دوای ئازارچەشتنێکی زۆر کە چەند سالێکی خایاند، سەید بڕیاری هەلوەشاندنەوەی دەستنیشانکردنەکەو دوورکەوتنەوە لە دەزگیرانەکەی دا، ئیتر پرسیاری دەکرد: "تۆ بلێی رێگەی هەلە کردبێت، کە داوای حۆریەکی عازەبی لە کچێك لە کچانی قاهیرە کردبێت؟ یان هەر لەسەرەتاوە رێگەی هەلەکرد کاتێك داوای ژیانی خێزانداری کرد کە بە ئاسایی بۆ ئەم نەدەگونجا؟".[1]

بەمشێوەیە جیابوونەوەو. . . هەریەکەیان لە رێگەی خۆیەوە رۆیشت.

ئەوەبوو سەید ئەزموونو چیرۆکە تالەکەی خۆی لەگەل ئەودا لەبیر نەچوویەوە، هەرکاتێك بیری دەکەوتەوە هەستی بە ئازارو بێبەشبوون دەکرد، لەبەر ئەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە خۆشەویستیو دەسنیشانکردنو ژنهێنان چاوی پۆشیو دوورکەوتەوە!، بەلام ئافرەتەکە کەمێك ئازاری چەشتو چیرۆکی ئەو نارەحەتیەی لەبیرچوویەوەو لەپاشاندا شووی کرد!.

دوای چەند سالێك، کاتێك سەید لە یەکێك لە شەقامەکانی قاهیرەوە دەڕۆیشت، کتوپڕ چاوی پێکەوتو قسەیان لەگەل یەك کرد، ئافرەتەکە بە سەیدی گوت: ئایا تاکو ئێستا وەك خۆت بە تەنها ماویتەوە؟. سەید وتی: بە هەر حال ئەمە گرنگ نیە. . ئەی تۆ؟، پاشان سەید لایەکی کردەوە بەلای ئەو منداڵە بچکۆلەیەی کە دەستی بە لایەکی جلەکانی ئافرەتەکەوە گرتبوو. . وتی: ئەمە کوڕی تۆیە؟ ئافرەتەکە وتی: بەلێ! ناوی (سەمیر)ە، ناوە هەلبژێردراوەکەی تۆ.[2]

## کۆتا هەولی ژنهێنانی

کاریگەربوونی بە چیرۆکەکەی لەگەل خۆشەویستە پێشووەکەیدا بۆ ماوەی چەند سالێك درێژەی خایاند، ئەوەش بەدورخستنەوەی لەوەی جارێکی تر بکەوێتە خۆشەویستیەوە لەگەل کچێکی تر، بکەوێتە ناو داواکردنو دەستنیشانکردنو ژنهێنانەوە.

لەم چەند سالەدا خۆی یەکلاکردەوە بۆ کاری ئەدەبی جۆراوجۆر، ئەم کارە ئەدەبیانە سەیدی سەرقالکرد لەوەی بیپەرژێتە سەر ڕوکردنە خۆشەویستیو عیشق، زالبوو بەسەر غەریزەیداو بەرز بوویەوە بەسەر هوتافی دلو بانگی گیانیدا.

---

[1] أشواك: 5.
[2] أشواك: 70.
[3] أشواك: 128-129.

لەسەرەتادا ڕویکردە فیکری ئیسلامی، دواتر ڕویکردە کاری ئیسلامی، ئەویش سەرقاڵیو کاری نوێی بۆ پەیداکرد، کە هەموو ژیانو فیکرو دڵی داگیرکرد، ئیتر ئەوەندە کاتی نەبوو تا بیر لە ژنهێنان بکاتەوە.

سەفەری کرد بۆ ئەمریکا، بۆ ماوەی دوو ساڵ لەوێ مایەوە، پاشان گەڕایەوەو بۆ جارێکی تر بیری لە ژنهێنان کردەوە، کەوتە گەڕان بە دوای پەیداکردنی هاوبەشێکی ژیاندا، بەڵام سەرقاڵیو کارە زۆرەکانی مۆڵەتێکی وایان پێنەدا کە بە تەواوی بگەڕێتو بتوانێت هاوسەرێك دیاری بکاتو هەڵی بژێرێت!.

پاشان شۆڕش ڕوویدا، کارەکانی سەید لە دوای شۆڕشەوە قوولو فراوان بونەوە لەگەڵ پیاوانی شۆڕشو لەگەڵ کۆمەڵی **(الاخوان لمسلمون)**، کاری لەگەڵ ئەم دوو کۆمەڵەیە هەموو کاتەکانی ژیانی داگیرکرد.

لەپێش زیندانی کردنیەوە لە ساڵی 1954 زۆری نەمابوو یەکێك لە کچە دیندارە مولتەزیمەکان دەسنیشان بکات، هەنگاوەکانی یەکەمی ئەم کارەی نا، بەڵام ڕووداوە تازەکان بەرەو ڕووی بوونەوە، ڕێگەی هەوڵدانەکانی لێگرت، ستەمکاران خزاندیانە ناو زیدانەوە تاکو ساڵەکانی تەمەنی لە زینداندا بەرێتە سەر، پاشان بە لێبوردنێکی تەندروستی لە ساڵی 1964 لە زیندان دەرکرا، کە لەو کاتەدا تەمەنی لە پەنجاو نۆ ساڵ نزیك بووبوویەوە.

یەکەم شتێك دوای دەرچوون لە زیندان بیری لێکردەوە بریتی بوو لە گەڕان بە دوای هاوسەری ژیاندا، گەرا تا نسیبی خۆی دۆزیەوە لە یەکێك لە ئافرەتە چاکەکاندا، ئەوەندەی نەمابوو دەستنیشانو مارەی بکات، ستەمکاران مۆڵەتیان نەدا[1] و هێندەی نەبرد زۆر بە خێرایی توندیان کردەوە لە زیندان لە ساڵی 1965 تاکو بە شەهیدی بۆ دواجار ماڵئاوایی بکاتو بگات بە خوای خۆی، لە ساڵی 1966دا شەهیدکراو ڕۆیشت بۆ بەهەشتی نەبڕاوە تاکو لەوێ پشکی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت وەربگرێ -**إن شاء الله**.

[1] مامۆستا موحەممەد قوتب ئەمەی پێڕاگەیاندم.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە بەم پێشەکیە دەستپێدەکەین کە تیایدا ئاماژە بەو هەنگاوە دوورە دەکەین کە خوای گەورە سەیدی پێ گواستەوە لە ڕێگەیەکەوە بۆ ڕێگەیەکی تر.

لە بەشی یەکەمدا باسمان لە "گەشتی ونبوون" کرد کە ماوەیەکی زۆر سەیدی پێدا ڕۆیشت، لەوبارەیەوە وتەی خۆیمان هێنایەوە، کە سیماکانی ونبوونی خۆی لەو ماوەیەدا دەردەخات، ئاماژە بە دڵەڕاوکەو نائارامیو موعاناتەکانی دەکات کە تێیدا ژیاوە.

## هەنگاوێکی دوور بەرەو جیهانی ئیمانو دڵنیایی

ئەگەر سەید بەردەوام بووایە لە گەشتی ونبوونەکەیدا ئەوا هەموو تەمەنی بە دڵەڕاوکێ لەدەست ئەدا، وێڵو نائومێدو خەمبار ئەبوو، پرسیاری دەکردو وەڵامی دەست نەدەکەوت، لێکۆڵینەوەی دەکردو نەدەگەیشتە ئەنجام، ئەگریاو ئازاری ئەچەشت، ئەشکەنجەی ئەچەشتو هاواری ئەکرد، پیشی ئەخواردەوەو نارەزایی دەردەبڕی، نە دڵو نە دەروونو نە ژیانی خۆی نەدەدۆزیەوە!.

بەڵام خوای گەورە فەرمانێکی تری بۆ بڕیار داوە، ڕێگەیەکی نوێی بۆ وێنە کێشاوە، ئەرکو ڕۆڵێکی گەورەی بۆ ئامادەکردووە!!.

سەید کەوتە سەر ڕێگەی تازەو گوازرایەوە گواستنەوەیەکی دوور بۆ جیهانی ئیمانو دڵنیایی، جیهانی ئیسلامو کارکردن، جیهانی فیکری ئیسلامیو ڕۆشنبیری ئیسلامی، جیهانی بانگەوازو جموجوڵو جیهادو تێکۆشان. .

سەید لەسەر ڕێگە ئیسلامیە تازەکەی دەستی بە ڕۆیشتن کرد، بە هەنگاوی دامەزراوی سەرکەوتوو، ئیتر بە تەواوی لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر گۆڕا، وا هەستی دەکرد کە بە دەروونو هەستو گیانیەوە، بە مەشاعیرو هەنگاویەوە، هەموویان لە دایك دەبنەوە لە دایکبوونێکی نوێ، زاخاو دەدرێنەوە بە زاخاوێکی ئیسلامی ڕەسەن. .

سەید لە گونجاوی لەگەڵ ژیانە ئیسلامیە تازەکەیداو لە تووانەوەی تیایدا وایلێهات وەك ئەوەی مرۆڤێکی تر بێت، مرۆڤ بڕوای نەدەکرد کە ئەو سەیدەی ناسیویەتی لە (گەشتی ونبوونەکەیدا) هەمان ئەو سەیدە بێت کە ئێستا ئەیناسێتو نووسراوەکانی دەخوێنێتەوە لە (**في ظلال القرآن**)و (**معالم**)و (**خصائص التصور الاسلامي**)دا، بەڵکو خەریکە دڵنیابێت لەوەی ئەو دوانە دوو کەسی جیاوازن، دوو کەسایەتی جیاوازن!!.

## نهێنیەکە لە سروشتی ئەم ئاینەدایە

کاتێك مرۆڤ دەوەستێو پرسیار لە نهێنی ئەم گواستنەوە ئیمانیە دوورە لە ژیانی سەید قوتبدا دەکات، ئەو سەرسوڕمانەی نامێنێ کاتێك دەزانێ ئەمە نهێنیەکە کەوا سەیدی لەسەر ڕاگیر بووە.

سەید لە پێشدا لەم نهێنیەی دەکۆڵیەوەو بەدوایدا دەگەڕا، هەر بە دوای ئەم نهێنیەدا ژیانێکی ونبووی درێژی نارەحەتی بڕی.

تا لە کۆتاییدا خوای گەورە یارمەتیدا بۆ زانینی ئەم نهێنیە، چاوەکانی کردەوە بە ڕووی مەشخەڵی ئەم ڕێگەیەدا، سەید دەرکی ئەم نهێنیەی کردو بیروبۆچوونو تێڕوانینەکانی خۆی بۆ بوونەوەرو ژیانو مرۆڤ گۆڕی.

ئەم نهێنیەش بریتیە لە ڕووناکی ئیمان، کە سەرجەم گیانی سەیدی ڕووناك کردەوە، تاریکیەکانی ڕامالی، ئیتر سەید کەوتە هەنگاونان لە ڕووناکیەکانی نورو ئیماندا، بە شێوەیەکی ڕێك لەسەر ڕێگەیەکی ڕێك.

فەزڵی ئەوەی کەسەید پێی گەیشت ئەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە، چونکە خوای گەورەبوو کە ئەم نیعمەتە گەورەیەی بەسەردا ڕژاندو منەتباری کرد بەم منەتە گەورەیە.

سەید خۆی هەست بەم منەتە خواییە دەکاتو دان بەم فەزڵە خواییەدا دەنێت: (**يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ**) (**الحجرات** : 17 ).

هۆكاری ئەم وەرچەرخانە نوێیەی سەید قوتب، ئاشنابوونی سەیدە بەم ئاینە، بە سروشتو بە سیماو تایبەتمەندیو بنەماكانی ئیسلامی مەزن، كە موسڵمانی تێكەڵ بەم ئاینە دەگوێزێتەوە لە جیهانێكەوە بۆ جیهانێكی تر، ئەمە سروشتی زیندووی ئەم ئیسلامەیە، ئەمە سیمای كارلێككەری جوڵەی ئیجابی ئەم ئیسلامەیە، ڕفتاری ئیسلام بەم شێوەیەبوولەگەڵ یارانی پێغەمبەردا(درودی خوایان لەسەربێت) كە گواستنیەوە گواستنەوەیەكی دوورن لە ژیانی نەفامیو ونبوونەوە بۆ ژیانی بەختەوەریو كارو تێكۆشان، هەر بەم شێوەیە كاری كردووەتە سەر هەر كەسێك كە ڕووی تێكردبێتو لەگەڵیدا ژیابێت.

سەید بەم شێوەیە ڕووی لە ئیسلام كرد، ئیسلامیش بەو شێوەیە كاری لە سەید كرد، كاریگەری خۆی لە ژیانیدا تۆماركرد، بەم شێوەیە ئەم گواستنەوەو هەنگاوە دوورە نوێیەی سەید دیمەنێكە لە دیمەنەكانی ڕێزو منەتی خوای گەورە بەسەر سەیدەوە، نموونەیەكی ڕێزداریە بۆ سروشی ئەم ئاینە مەزنە!.

## گواستنەوەكە پلە بە پلە بوو

گواستنەوە ئیمانیە نوێیەكەی سەید گواستنەوەیەكی كتوپڕ نەبوو، كە لە شەوو ڕۆژێكدا لە سەید قوتبێكی وێڵ ونبووەوە ـ وەك لە گەشتی ونبوونەكەیدا ناسیمان ـ گۆڕابێت بۆ بیریارێكی ئیسلامی پێشەنگ، گواستنەوەكە پلە بەپلە بوو، كارلێككردن لەگەڵ جیهانە نوێیەكەدا پلە بە پلە بوو.

گواستنەوەو هەنگاوەكە كاتێك دەستیپێكرد كە ڕووی كردە قورئانی پیرۆز بۆ مەبەستی ئەدەبیو، توێژینەوەی دەكرد لە كتێبخانەی **(القرآن الجدیدة)**دا. هەندێك لە ڕێنومابیە قورئانیە فیكریەكان كاری تێكردو لەسەریان ڕاوەستا، وە لە كتێبەكەیدا **(العدالة الاجتماعیة في الاسلام)** تۆماری كردن. .

سەیدقوتب سەفەری كرد بۆ ئەمریكاو لەوێ واتاكانی ئیمان لە دەروونیدا قوڵبوونەوەو بە تەواوی چەسپین و، لە پەڕەكانی دڵیدا دەدرەوشانەوە، وای لێهات لەسەر ڕووناكی ئەم ئیمانەوە دەركی نهێنیوئامانجی ژیانی كرد.

ئەم پرشنگە ئیمانییەی بە (موسیقی الوجود) واتا مۆسیقای بوون ناوناوە، دەڵێت كە دوو جار هەستی بەم مۆسیقایە كردووە: (جارێكیان كە من لە قولایی دەریادا بووم، پاپۆڕەكەش وەك ڕۆیشتنی با دەڕۆیشت بەسەر شەپۆلەكاندا، ئاورنگەكان پەخشو بلاوبوون، شەو بێدەنگ بوو، مانگیش پرشنگی خۆی ئەدرەوشاندەوە.

دووەمیان من لەسەر لوتكەی چیایەك بووم، كە دەیڕوانی بەسەر سان فرانسیسكۆ و باخچەی خواكاندا، كە لەوێوە بەرزاییو نزماییەكانی هەردوكیان دەردەكەوێ، لەلای لوتكەی ئەو شاخە بەرزە كە لەگەڵ ئاسماندا دەست لەملانێی یەكتر بوون. . نازانم چۆن هەستم كرد، نازانم چۆن بلێم، جگە لەوەی لەو چركەیەدا تەنها یەك دەربڕین بەسەر زمانمدا هات، كە ڕووناكی هاویشتە ناو دەروونمەوە، وەك چۆن مۆمێك ڕێگەیەك بۆ دوور دەردەخات پاشان وندەبێت، یەك دەربڕین .. تیایدا هەستمكرد هەموو ئەوەی لەو كاتەدا بە خەیاڵی مندا هات پیرۆزیو ڕوونی تەسبیحاتی مۆسیقای بوون بوو)[1].

ئەم پرشنگە ئیمانیە یەكسەر كاری كردە گیانی سەید، لەسەر ڕووناكی ئەم پرشنگەوە نهێنی ژیانی بۆ دەركەوت لە كاتێكدا كە لەوێ لەلای باخچەی خواكان لە سان فرانسیسكۆ ڕاوەستابوو ڕایگەیاندكە : (نەخێر! ئەم ژیانە هەر لەخۆیەوە نەبووە، لەدایكبووی ڕێكەوتی كوێر نیە. . نەخێر ! یەك ئاواز هەیە كە بە هەموو گەردوندا دێتو دەچێت. بەڵام گوێكان لە هەموو كاتێكدا نایبیستن، یەك سیستەم هەیە هەموو پارچەكانی ڕێك خستووە، بەڵام چاوەكان لە هەموو ساتەكاندا نابینن.

لەوێدا پرسیاری لە ڕاستی ئەو شتە دەكرد كە هەستیپێكرد: (ئایا خەیاڵاتەكان هەڵیان خەڵەتاندوم؟ خەوەكان درۆیان لەگەڵدا كردووم؟ نەخێر ئەوەی دەستم بەری دەكەوێت، چاوەكانم دەیبینن، گوێكانم دەیبیستن بە ڕاستی نازانم، بەڵام بەدرۆیان ناخەمەوە، ئەوەبەركەوتنی ئەم چركە تێپەڕیوەیە بۆ ڕۆحم، تیشكدانەوەیەتی لە ویژدانمدا. . )[2].

[1] بابەتی (الموسیقي الوجود) لە گۆڤاری الكتاب/ نیسانی 1950، ل326.

[2] گۆڤاری الكتاب: نیسانی 1950.

پاشان ڕاستی ئیمان لە دەروونیدا چەسپا، زاڵبوو بەسەر ویژدانو هەستو بیریدا، هەستو بیرو کردارەکانی ئاڕاستەکرد بەرەو ئەو ئامانجە دیاریکراوە، ڕۆحی سەید شیرینی ئیمانی چەشتو هەستی کرد کە وەك ئەوە وایە سەرلەنوێ لەدایك بووبێتەوە.

هەموو بەشەکانی خۆی لەسەر ئیمان ڕێکخست و کۆکردەوە، سوور بوو لەسەری، دڵنیابوو پێی، بە بەنرخترین شتی دادەنا، بەڵکو بەنرخترین بوو، بەرزتر بوو لە ژیانی خۆی.

بەم ئیمانەی وەڵامی کۆتایی پڕ لە دڵنیایی دەست کەوت بۆ ئەو پرسیارەی کە لە گەشتی ونبوونەکەی پێشوویدا خستبوویە گومانەوە، ئەو پرسیارەی کە هەندێ جار ئاڕاستەی زیندو و مردووەکانیشی دەکرد، ئیتر وەڵامەکەی دەستکەوتو زانی کە لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی هاتووە؟ هێڵی ڕۆیشتنو مەبەستو کۆتایی زانی، هەستی دوودڵیو گومانو دڵەڕاوکە لە سەید دوورکەوتەوە، بەهۆی ئەم ئیمانەوە دەستکەوتێکی گەورەی دەست کەوت لە جیهانی هەستو جیهانی بیرکردنەوەدا!.

## ژیانی ئیمانیی سەید لە سێبەری قورئاندا

سەید ئەو بەشەی کە لە ژیانی مایەوە، لە ژیانێکی ئیمانی ئیسلامی گەورەدا بردیە سەر، ژیانێکی بەرزو پاك لە ژێر سێبەری قورئانی پیرۆزدا. لە بارەی ئەو بەشەی ژیانیەوە لە پێشەکی (**في ظلال القرآن**)دا دەڵێت: (ژیان لە سێبەری قورئاندا نیعمەتە، نیعمەتێکە کەس نایزانێ ئەو کەسە نەبێت کە دەیچێژێ، نیعمەتێکە ژیان بەرزدەکاتەوەو بەرەکەتی تێدەخاتو پاکی دەکاتەوە، سوپاس بۆ خوا، بە ڕاستی خوای گەورە بە ژیان لەژێر سێبەری قورئاندا بۆماوەیەك لە تەمەن منەتی لێنام. لەو ماوەیەدا لە نیعمەتی خوای گەور لەزەتێکی وام چەشت کە هەرگیز لە ژیانمدا لەزەتی وام نەچەشتووە، چەشتم ـ لەژێر سێبەری قورئاندا ـ ئەو نیعمەتەی کە تەمەن بەرزدەکاتەوەو بەرەکەتی تێدەخاتو پاکی دەکاتەوە. . .

ژیام لەژێر سێبەری قورئاندا.. هەستم بە گونجانێکی جوان کرد لە نێوان جوڵەی مرۆڤ بەو شێوەیەی کە خوای گەورە دەیەوێت، وەجوڵەی ئەم گەردوونە بەو شێوەیەی خوای گەورە بەدیهێناوە.

ژیام لەژێر سێبەری قورئانداو..، گەردوون دەبینم زۆر گەورەترە لە ڕووە دیارەکەی، گەورەترە لە حەقیقەتیدا، گەورەترە لە فرەلایەنی بەشەکانیدا. . .

لەژێر سێبەری قورئاندا.. فێربووم کە لەم بوونەدا هیچ شوێنێك بۆ ڕێکەوی کوێر نیە ، بۆ ڕیزپەڕی دژ نیە. . .

بەم شێوەیە ژیام لەژێر سێبەری قورئاندا بە دەروون ئارامیی، نهێنی دڵنیا، ویژدان سەقامگیر. . ژیام و دەستی خوام دەبینی لە هەموو ڕووداوێکدا، لە هەموو فەرمانێکدا. ژیام لە سایەی خوای گەورەو لەژێر چاودێری ئەودا، ژیام و هەست بە ئیجابیەتی سیفاتەکانی خوای گەورەو، کاریگەرییان دەکەم. . .

چ دڵنیاییەکە ئەم بۆچوونە دروستی دەکات؟ چ ئارامیەکە ئەیرێژێ بەسەر دڵدا؟ چ متمانەیەکە لە ڕاستیو خێرو چاکسازیدا ؟ چ هێزو بەرزبوونەوەیەکە بەسەر واقیعی بچووکدا، کە سەررێژی دەکات لە ویژداندا ؟)[1].

### سەید لە ( ظلال )دا دان بە ونبوونە فیکریەکەیدا دەنێت

سەید لە (**ظلال**)دا، لە زیاتر لە جێگەیەکدا دان بە فەزڵی خوای گەورەدادەنێت بەسەریەوە، بە گواستنەوەی لەلایەن خوای گەورەوە گواستنەوەیەکی دوور، لە ژیانی دۆشداماویو پەشۆکاویو ونبوونەوە بۆ جیهانی ئیمانو ڕەزامەندیو یەقین، ئاماژە بە جیاوازی نێوان دوو کەس دەکات، یەکێکیان ڕزقو ڕۆزیو نیعمەتی ئیمانی پێبەخشراوەو یەکێکی تریان لێی بێبەشە، وەك ئەوەی ئاماژە بە ژیانی ئێستاو ونبوونەکەی پێشووی خۆی بکات (بە ڕاستی بەهاو بایەخی ئەو ئیمانەی کە ئومەتی موسڵمان

---

[1] هەڵبژاردەیەك لە پێشەکی (في ضلال) ج1: 1-4.

پارێزگاره لەسەری لە سەر زەویداو بووه بە میراتگری لە کاتی پێشترین نامەکانەوه، ئەو ئیمانە بەرزترین بەهاو بایەخە، بەهێزترینیانە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، بەهایەکە لە ڕێپیشاندانو نوور، لە متمانەو ئارامی، لە ڕەزامەندیو بەختەوەری، لە زانیاریو یەقین، هیچ دڵێك نیە لەم بەهایە بەتاڵ بێت دڵەڕاوکێو تاریکی دای نەپۆشێت. وەسوەسەو گومان باڵی بەسەردا نەکێشێت، خەفەتو بەدبەختی داگیری نەکات، پاشان دەڕواتو لێکهەڵدەوەشێت لە تاریکیە قەقناسەکاندا، لە ونبوونێکی پشت شکێنەردا نازانێت پێکانی لە کوێدا دادەنێت!.

ناڵەی ئەو دڵانەی بێبەش بوون لەم توێشووه، بێبەش بوون لەم نووره، لە هەموو سەردەمێکدا ناڵەی پڕ لە ئازارن. . ئەمە ئەگەر لەو دڵەدا هەستو زیندوویەتی هەبێت، ئارەزووی زانین هەبێت، پەرۆشی بۆ یەقین هەبێت. . . بەڵام دڵە سەرکەشە ڕەقە تاریکەکان، ئەوە هەست بەم پەرۆشبوونەش ناکات، شەوقو ئارەزوو بۆ زانین ماندووی ناکات. . ).[1]

سەید بە ڕوونی دانی بە باری پێشووی خۆیدا ناوەو لەگەڵ ئەو بارەی کە تیایدا ژیاوه لە ونبوونو ماندوێتیو دوودڵی، ئەمەش لە کاتی قسەکردنیدا دەربارەی نیعمەتی ئیمانو کاریگەریەکانی لەسەر مرۆڤی بڕوادارەدەردەکەوێت.

(بە ڕاستی ئیمان گەورەترین نیعمەتە کە خوای گەورە بەندەیەك لە بەندەکانی خۆی لەسەر زەویدا پیێ منەتبار دەکات، ئەو ئیمانە گەورەترە لە منەتی بوون کە خوای گەورە لە سەرەتادا بەخشیویەتی بەو بەندەیەی، گەورەترەلە هەموو ئەو شتانەی پەیوەستە بە بوونەوه لە نیعمەتو ڕۆزیو تەندروستیو ژیانو خۆشی. . . ).[2]

لەم مەعریفەتەوه کە ئیمان ئەیبەخشێ بە مرۆڤی بڕوادار، بڕوادارەکە دڵئارامیو ئاسوودەیی وەردەگرێت، چێژی لێوەردەگرێت بەوەی ڕووئەدات لە دەوریدا، بەوەی لە خۆی ڕووئەدات. ئەو ـ بڕوادارە ـ ئەزانێت لە کوێوه هاتووه؟ بۆچی هاتووه؟ بۆ کوێ ئەچێت؟ لەوێ چی دەبینێ؟. .

لەم مەعریفەتەوه هەستی دڵەڕاوکەو گومانو پەشێوی ون دەبێت کە لە ئەنجامی نەزانینی سەرەتاو پاشەڕۆژەوه دروست دەبێت، لە ئەنجامی نەزانینی پێچراوەکان لە ڕێگەدا، نەبوونی متمانە بەو حیکمەتەی کە شاراوەتەوه لە پشتی هاتنو چوونیەوه، لە پشتی چوونی لەم ڕێگەدا دروست دەبێت.

ئەو هەستە وندەبێت کە وەك هەستی خیامی شاعیرە کە لە هۆنراوەیەکیدا دەریدەبڕێت:

**لبست ثوب العمر لم أستشر**

**فصرتُ فيه بين شتى الفكر**

**وسوف أنضو الثوب عني ولم**

**أدرِ لماذا جئت؟ أين المفر؟**

دیارە خیام ئاماژە بەوە دەکات کە بەبێ ویستی خۆی ژیانی پێبەخشراوەو چەندین بیروبۆچوونی ئاڵوگۆڕ کردووه، بەڵام نەگەیشتۆتە ئەو حەقیقەتەی کە بزانێت بۆچی هاتووەو بۆ کوێ دەچێت.[3]

(ئەم هەستە وندەبێت کە من لەگەڵیدا ژیام لە ماوەیەك لە ماوەکانی ونبوونو دڵەڕاوکەدا پێش ئەوەی بژیم لەژێر سێبەری قورئاندا، پێش ئەوەی خوای گەورە دەستم بگرێ بۆ ژێر سێبەری پیرۆزی خۆی.

ئەو هەستەی کە ڕۆحە ماندووەکەی لەهەموو گەردوون داڕنیو منیش دەرم بڕیوەو دەڵێم:

**وقف الكون حائراً: أين يمضي؟**

**ولماذا؟ وكيف. . لو شاء يمضي؟**

**عبث ضائعُ وجهدٌ غبين**

**ومصيرٌ مقنع ليس يُرضى.**

---

[1] الظلال: بەرگی یەکەم، 342.

[2] الظلال: بەرگی شەشەم، 3351.

[3] وەرگێر.

ـ سوپاس‌و منەت بۆ خوای گەورە ـ من ئەمڕۆ دەزانم کە گەردوون هەرگیز ئەو هەڵوێستە خراپەی نیە ؟ ڕۆحی گەردوون بڕوای بە پەروەردگارەکەی هەیەو تێدەگات، تەسبیحات‌و سوپاسی دەکات، گەردوون بە یاسای خۆی دەڕوات ئەو یاسایەی کە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردووە، لە گوێڕایەڵی‌و ڕەزامەندی‌و تەسلیم بووندا!. ئەمەش دەستکەوتێکی گەورەیە لە جیهانی شعوردا، لە جیهانی بیرکردنەوەدا، هەروەك دەستکەوتێکی مەزنە لە جیهانی هەست‌و دەمارەکاندا، لەسەروو ئەوەوە دەستکەوتێکی مەزنە لە بواری کارو چالاکی‌و خێراکردنی کارو کارتێکردندا. . )[2].

## قۆناغە ئیسلامیەکانی ژیانی سەید قوتب

### پەیوەندیە سیاسییە ڕابردووەکانی

سەید ژیانی سیاسی خۆی لەگەڵ حزبی (وەفد)دا دەستپێکرد، کە حزبێکی خاوەن جەماوەرێکی زۆرینە بوو، سەعد زەغلول دامەزرێنەری ئەم حزبە بوو، ناوی ئەم حزبەش لە ڕووداوی (الوفد)ەوە هاتووە کە کۆمەڵێك ناوداری میسری بە سەرۆکایەتی ئینگلیز کۆبوونەوەو وتوێژیان لەگەڵ کردن سەبارەت بە ئازادی میسر، ئەمەش دوای شۆڕشی 1919ز، هۆی پەیوەندی کردنی سەید هەر لە سەرەتای لاوێتیەوە بە حزبی وەفدەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاشنابوونی سەید بە عەقادو سەرسامبوونی بە خۆی‌و کتێبخانەکەیەوە، عەقادیش وەفدی بوو.

گۆڤارو ڕۆژنامەکانی حزب لاپەڕەکانیان بە ڕووی بابتەکانی سەید قوتبی وەفدیدا کردەوەو، ئەویش بەرهەمەکانی لە کەناڵەکانیەوە بڵاودەکردەوە.

سەید زیاتر لە (17) ساڵ لەگەڵ حزبی وەفدا مایەوە، تاکو ڕوداوی شوباتی (1942) ڕویدا.

لەم ڕوداوەدا باڵیۆزی بەریتانیا لە قاهیرە ئاگاداریەکی هەڕەشە ئامێزی ئاڕاستەی مەلیك فاروق کرد کە پۆستی سەرۆك وەزیران ببەخشێت بە مستەفا نوحاس و ئەو وەزارەت ڕێکبخاتەوە، پێویستە ئەمەش لە ماوەی تەنها (24) کاتژمێردا ئەنجامبدات!.

فاروقیش سەری شۆڕکرد بۆ هەڕەشەو فەرمانەکەی باڵیۆزی بەریتانی‌و پۆستی سەرۆك وەزیرانی سپارد بە سەرۆکی حزبی وەفد مستەفا نوحاس کە کابینەی وەزارەتی نوێ دابمەزرێنێ!، بەمشێوەیە حزبی وەفد گەیشتە کورسی فەرمانڕەوایی لە ڕێگەی زرێپۆشەکانی ئینگلیزەوە و بە چاکەی ئیستیعماری بەریتانی، بەمەش حزبی وەفد زۆربەی جەماوەری خۆی لەدەستداو زۆربەی لایەنگرانی لێکشایەوە.

سەید لە پێشەوەی دڵ ڕەنجاوەکان بوو لە حزبەکەی، زۆر تووڕە بوو بەرامبەر بە حزب‌و سەرۆکەکەی "نوحاس" کە قبوڵی دستێوەردانی ئینگلیزی کرد، ئیتر لە ڕیزی ئەندامانی حزب چووە دەرەوەو بە کەسێکی وەفدی نەما !.

کۆمەڵێك بە هۆی ئەم ڕوداوەوە لە حزب جیابوونەوەو حزبێکی نوێیان پێکهێنا بە ناوی (**الطليعة الوفدية**) یان حزبی (**السعديين**) کە دەگەڕێتەوە بۆ سەعد زەغلولی دامەزرێنەری یەکەمی حزبی وەفد. سەید قوتب چووە ناو ئەم حزبە نوێیەوە.

سەید لەگەڵ حزبی سەعدیەکاندا مایەوە تا ساڵی 1945ز. دوای ساڵی 1945 لە هەموو حزبەکان کشایەوەو بێ پەیوەندی حیزبی مایەوە!.

[1] چامەی (بيت يوم خريف) لە (الشاطئ المجهول)دا.

[2] الضلال: بەرگی شەشەم، 3352-3353.

له ساڵی 1945دا سەید بابەتێکی ڕەقو توندو تیژی نووسی ئاڕاستەی سەرکردایەتی حزبەکانی کرد لە میسردا بە ناوی (پرۆگرامەکانتان ڕێك بکەنەوە، یان پاشەکشە بکەن پێش ئەوەی هەموو شت لەدەست بچێت)، تێیدا داوای لێکردن پرۆگرامی حزبەکانیان ڕێکبخەن بەشێوەیەك وەڵامی داواکاریەکانی گەلی میسری بداتەوە یاخود لە سیاسەت بکشێنەوە.[1]

لە کۆتایی ساڵی 1945دا لە (**الرسالة**)دا بابەتێکی بڵاوکردەوە ناوی نا (تۆ لە کوێی ئەی مستەفا کامیل؟). مستەفا کامیل دامەزرێنەری (حزبی وەتەنی) بوو لە سەرەتای سەدەی بیستداو سەرکردەیەکی نیشتمانی دڵسۆز بوو هەموو میسریەکان یەکدەنگ بوون لەسەر ڕێزگرتنی.

سەید لەم بابەتەیدا لەگەڵ هەموو گروپەکانی میسردا ئیعلانی جەنگی کرد، هەروەك چۆن ئیعلانی بەرپەرچدانەوەی هەموو گروپەکانی کرد، دەرچوونی خۆی لە هەموویان ڕاگەیاند، ڕونی کردەوە کە ئینتمای بۆ هیچ گروپێك نیە :(ئەم پێنووسە بۆ گروپێك لە گروپەکان نیە، خاوەنەکەی وای لێهاتووە لەناو گروپەکاندا جگە لە باوە قورەتەکان هیچی تر نابینێت، دوای ئەوەی گۆڕەپان لە هەموو بەهێزێك چۆڵ بوو، ئەو بەمە ـ بەم پێنووسەی ـ ڕوودەکاتە میسری نەمر، میسر نەمرترو بەرزترە).[2]

سەید هۆی وازهێنان لە گروپەکان ڕوندەکاتەوە، وێنەی کەسایەتیو پیاوەکانی گروپەکان دەکێشێو دەڵێ: (وا نابینم لە هیچ گروپێك لەم گروپانەدا کەسێك شایستەی ئەوەبێت حەماسەتی بۆ جۆش بدرێتو کاری لە پێناودا بکرێت!.

ئەو پیاوانە هەموویان وەکو یەکنن پیاوانی نەوەی ڕابردون، بۆ هەموویان عەقڵیەتێك هەیە کە بۆ ئەم نەوەیە ناشێت، ئەویش عەقڵیەتی چارەسەری ناوەندە، هەموویان پێگەیشتن، هەژارییش نەخۆشیەکی وڵات نشینە. . .

ئەمانە هیچیان وا ڕانەهاتوون کە بشێن بۆ سەرۆکایەتی ئەم نەوە نوێیە، هەستێکی ماندوو، دڵێکی بەتاڵ لە ئیمانێکی گەرم بە گەل و نەتەوەکەیان).[3]

سەید لە کاتێکدا وازی لە هەموو گروپەکان هێنا لە ساڵی 1945دا لەو کەسانە نەبوو کە نائومێد دەبن لە چاکسازی، لەوانەش نەبوو کە پاڵدانەوە بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، لەبەرئەوە دوای وازهێنانی لە گروپەکان لە ماڵی خۆیدا دانەنیشت بەسەر نیشتمانەکەیدا بگرىو ویستەکانی خۆی بکاتە قوربانی!.

سەید دوای دوورکەوتنەوەی لە گرووپەکان چالاکی تاکەکەسیانەی لەبەرچاوی هەبوو، لە بانگەواز بۆ چاکسازی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو فێرکاری، بابەتە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاودەکردەوە وەك (**الرسالة، الثقافة**)و. . . هتد.

هەروەها دوو گۆڤاری دامەزراند بۆ ئەم مەبەستە، یەکەمیان (**العالم العربي**)و دووەمیان (**الفكر الجديد**) بوو.

شوێنی نیشتەجێبوونی لە (حەلوان) مەڵبەندێکی سیاسی گشتی بوو، لاوە بەپەرۆشەکان بۆ ئیسلاح ڕوویان تێدەکردو لەوێدا گوێیان بۆ لێکدانەوەکانی سەیدو ئامۆژگاریو ئاڕاستەکردنەکانی دەگرت.

سەید بە تاکەکەسی بەردەوام بوو لەسەر بانگەواز بۆ ئیسلام، بەبێ ئینیمایەك بۆ هیچ گروپێك لە گروپەکان و هیچ کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکان، تا ساڵی 1953 کاتێ کە ونبووی خۆی لە کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین دا دۆزییەوەو پەیوەندی پێوە کردن، لەگەڵیان بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.

---

[1] الرسالة: ساڵی 13، بەرگی 2، ژمارە 627، ساڵی1945، ل 723.

[2] الرسالة ـ 13 ـ بەرگی 2 ذمارە 648، 1925، ل1309.

[3] الرسالة: ساڵی چواردەهەم، بەرگی 2، ژمارە681، ساڵی 1946.

## قۆناغە ئیسلامیەکانی ژیانی سەید

لەپێشدا ئەوەمان وت کە ڕوکردنە ئیسلامی سەید شتێکی کتوپڕی نەبوو، لەسەر یەك ئاستیش نەبوو، بەڵکو پلە بەپلە بوو، لەبەر ئەوەیە کە ژیانە ئیسلامیەکەشی قۆناغ بە قۆناغە.

سەید قۆناغەکانی ژیانی خۆی دابەشکردووە ـ خۆی شارەزاترە بە ژیانی خۆی ـ بەسەر پێنج بەشدا:

لە ساڵی 1951دا مامۆستا ئەبو حەسەنی نەدەوی سەردانی میسری کردو لەگەڵ سەید کۆبووەوە ـ لەو ڕۆژەدا سەید بۆچوونێکی ئیسلامی دیاری هەبوو ـ سەید باسی هەر پێنج قۆناغەکەی ژیانی خۆی بۆ مامۆستا نەدەوی کرد:

*یەکەم:* گەشەکردنی لەسەر دابو نەریتی ئیسلام لە گوندەکەیاندا، کاتێك لە ماڵی خۆیان بوو.

**دووەم:** چوونی بۆ قاهیرە، ئەوەبوو هەموو پەیوەندیەك پچڕا لە نێوان سەید لە قاهیرەو گەشەکردنی لە گوندەکەیاندا، ڕۆشنبیریە دینیە ئیسلامیەکەی پەرشوبڵاوەی کرد.

**سێیەم:** تێپەڕبوونی بە گومانو دوودڵیدا لە ڕاستیە ئاینیەکان تا ئەوپەڕی سنوور.

**چـوارەم:** ڕوکردنە قورئانو خوێندنەوەی بۆ مەبەستی ئەدەبی.

**پێنجـەم:** کارتێکردنی قورئان لە سەید، تا وردە وردە بەرەو ئیمانو پەیوەستبوون هێنای.[1]

هەروەها مامۆستا یوسف ئەلعەزم ژیانی ئیسلامیی سەید قوتبی دابەشکردووە بۆ سێ قۆناغ:

**یەکەم:** ئیسلامیاتی هونەری.

**دووەم:** ئیسلامیاتی گشتی.

**سێیەم:** ئیسلامیاتی بزاڤگەرایی ئامانجدار.[2]

لێرەدا ماوەی هەریەك لەو قۆناغانە دیاری دەکەین، تایبەتمەندی هەر قۆناغێك و، تایبەتمەندیە فیکریەکانی سەید لە هەر قۆناغێکدا ڕوون دەکەینەوە. . .

## قۆناغی یەکەم: قۆناغی ئیسلامیاتی هونەری ئەدەبی

ئەم قۆناغە لە کاتێکەوە دەستپێدەکات کە سەید ڕویکردە قورئانو بۆ ئامانجو مەبەستی ئەدەبی لێی کۆڵیەوە.

ئەمەش لە ساڵی 1939دەستپێدەکات کاتێك لە گۆڤاری (**المقتطف**)دا بابەتێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی (**التصوير الفني في القرآن الكريم**).

بابەتەکەی بە پێشەکیەك دەستپێکردبوو، تیایدا ڕونیکردبووەوە ـ لەگەڵ ئەوەی چەندین لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەیانی بە چواردەوری قورئاندا ئەنجامدراوە ـ بەڵام تا ئێستا لەلایەنی هونەریەوە لێی نەکۆڵراوەتەوە لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستەقینەی سەربەخۆ، تیایدا ئەوەی ئاشکراکرد کە پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی هونەری ڕەخنەگرانەی بەیانی بۆ قورئان بکرێت، ئەو ئەدەبە دەربخات کە قورئان لەخۆی گرتووە لە جوانی وێنەکێشان و، تایبەتمەندیە هونەریەکانیو، پێویستیەکانی شێوازی قورئانیو، زیندوویەتی دەربڕینەکانیو، ڕۆحانیەتی ئاراستەکەی شیبکاتەوە).

لە کۆتایی بابەتەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە بابەتی (**التصوير الفني في القرآن الكريم**) بابەتێکی چڕوپڕو دوورو درێژەوەو ـ سەید ـ لەم بابەتەی دەرگای لەبەردەم لێکۆڵەرەوەکاندا کردۆتەوە تاکو لێکۆڵینەوەی خۆیان ئەنجام بدەن (نیەتم هیچ نەبوو لەوەی پێشکەشم کرد تەنها نموونە هێنانەوە نەبێت، تەنهاسەرنج ڕاکێشان نەبێت، من نیەتم کورتکردنەوە نیە، تا ئێستاش لە دوای ئەمانەوە زۆر شت هەیە باسم نەکردووە. بابەتەکە چڕوپڕە، شیاوە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕوناکی بەخش. . . پاشان دەڵێت: ئەمە پەلەکردنێك بوو لەم لێکۆڵینەوە تازە چڕوپڕەدا، بەوئومێدەی پێشەکیەك بێت بۆ لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی گەورە ئەگەر خوا ویستی لێی بێت).[3]

---

[1] مذكرات سائح في الشرق العربي: 189 نەوەوی.

[2] رائد الفكر الاسلامي المعاصر: يوسف العظم، 149-151.

[3] المقاطف بەرگی 94، بەشی سێو دووهەم، شوباتو مایسی 1939.

سەید شەش ساڵی ڕەبەق چاوەڕوانی کرد بەڵام هیچ یەکێك لە توێژەرانی قورئانی پیرۆز لە دەرگای ئەم بابەتەی نەدا!.

لە بەهاری ساڵی 1945دا سەید کتێبە قورئانیە ئیسلامیە جوانە بەنرخەکەی (**التصوير الفني في القرآن الكريم**)ی پێشکەش بە خوێنەران کرد کە یەکەم کتێبی لەو جۆرەی بوو، وەلە نیسانی ساڵی 1945دا بەچاپ گەیەنرا، تیایدا هەموو دۆزینەوەکانی بۆ ئەو تیۆری هونەری جوانیەی کە لە شێوازی قورئانیدا هەیە تۆمارکرد. کە برتی بوو لە (وێنەکردنی هونەری) ،کە یاسایەکی لەبەرچاوی شێوازی دەربڕینی قورئانیە. نووسەرو ئەدیبو ڕەخنەگرو ڕۆشنبیران زۆر سەرسام بوون بەم نووسراوەی سەیدو لە هەموو ناوەندەکاندا دەنگی دایەوەو جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران بوو، هەندێکیان لەسەر لاپەڕەی گۆڤارەکان خۆیان قەرزاری سەید کرد بە تایبەتی لەسەر گۆڤاری (**الرسالة**) وەك: عەبدولمونعیم خەلاف، عەلی تەنتاوی، عەلی ئەحمەد باکسیر، عەبدوللەتیف شبلی، نەجیب مەحفوز، تۆفیق حەکیم، ئەحمەد ئەلشەرباتیو. . کەسانی تریش.

## پڕۆژەی كتێبخانەی قورئانی نوێ

ئەدیبو ڕەخنەگرەکان سەید دائەنێن بە پێشەنگو سەرمەشقی ئیستاتیکا (تیۆری جوانناسی) کە (تیۆری وێنەگرتن)ە، کتێبەکەی دائەنێن بە دۆزینەوەی تیۆرەکە، نەك تەنها کتێبێك بێت لە بەیانی قورئانو ڕەوانبێژیەکەیدا!.

مامۆستا عەلی تەنتاوی ـ دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە ـ دانی بەوەدا نا کە خوای گەورە کلیلێکی تایبەتی داوە بە سەید، بەهۆیەوە گەوهەری بەیانی قورئانی کردەوە، ئەم کلیلەی سەید بە کەسی تر نەدراوە!.

لە کتێبەکەماندا کە بۆ ئەم بیردۆزە تەرخانمان کردووە (**نظرية التصوير الفني عند سيد قطب**) ڕونمان کردۆتەوە کە خوای گەورە سەید قوتبی تایبەتمەند کردووە بە دوو کلیل، بەهۆیانەوە دەرگای خەزێنەی گەوهەری قورئانی پێکردەوە:

**یەکەمیان: کلیلی جوانی** لە پڕۆژەی (**مكتبة القرآن الجديدة**)و،بناغەی کتێبخانەکەشی کتێبە پێشەنگەکەی (**التصوير الفني في القرآن**)ە.

**دووەمیان: کلیلی حەرەکی** لە ڕاڤەکردنە حەرەکیە سەرمەشقەکەی لە (**في ظلال القرآن**)دا.

بەم شێوەیە سەید بیری کردەوە لە ئامادەکردنی پڕۆژەیەکی ئەدەبی ڕەخنەگریو ناوی نا (**مكتبة القرآن الجديدة**)، ئەمەش لە ساڵی 1945دا.

ئامانجی لەم کتێبخانە قورئانیە ئەوەبوو (لێکۆڵینەوە لە جوانی دەربڕینی قورئانیدا هەمووی ئاڕاستە بێ بەم ئاڕاستەیەدا، بۆ ئەم جوانیە نەمرە بنواڕین لە گۆشەیەکی ترەوە جگە لەو گۆشە ڕەوانبێژییە باوەی لەسەر بناغەی وشەو دەربڕین دامەزراوە).[1]

سەید لەسەر ئەوە پێی دائەگرت کە بە چاوی ڕەخنەگرێکی ئەدەبیەوە بۆ شێوازی قورئانو دەربڕینەکانی دەڕوانێتو بە هەستە ئەدەبیە رەخنەگریە پڕ لە جوانیەکەی تێی دەفکرێو دەیخوێنێتەوە (ئامانجی من لێرەدا ئامانجێکی ئەدەبی ڕوونە، بە هەستی ڕەخنەگرێکی ئەدەبی سەربەخۆوە نەبێت بە قورئان کاریگەر نابم ، ئەگەر لە کۆتاییدا پیرۆزی هونەر، بە پیرۆزی دین گەیشت، ئەوە ئەنجامێك نەبوو کە من هەنگاوم بۆ نابێت).[2]

دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر کتێبی (**التصوير الفني**)و لە نیسانی ساڵی 1947دا کتێبی قورئانیی دووەمی دەرکرد، کە دووەم کتێبی (کتێبخانەی نوێی قورئان) بوو بە ناوی (**مشاهد القيامة في القرآن**)، کورتی کردبووەوە لەسەر دەرخستنی

---

[1] گۆڤاری الرسالة ساڵی 14، بەرگی 1 ژمارە ،ل14.
[2] مشاهد لقيامة في القرآن: 10.

(وێنەگرتنی هونەری) لە بابەتێك لە بابەتەکانی قورئاندا کە دیمەنەکانی دوارِۆژە (**مشاهد القيامة**)، بەوەی لە دیمەنە جوانو نازو نیعمەتە هەستیو مادیەکان لە بەهەشتدا، هەروەها دیمەنی ئازارو ئەشکەنجەی هەستیو مادی لە دۆزەخ دوابوو.

نیەتی وابوو کەبەردەوام بێت لەسەر دەرکردنی باسەکانی لەم بابەتەداو درێژە بدات بە لێکۆڵینەوەکانی لە پرِۆژەی کتێبخانەی قورئانی نوێدا.

سەید سووربوونی خۆی لەسەر دەرکردنی چەند کتێبێکی تر راگەیاند کە ئەمانەبوون:

1- **القصة بين التورات والقرآن.**

2- **النماذج الأنسانية في القرآن.**

3- **أساليب العرض الفني في القرآن.**

4- **المنطق الوجداني في القرآن.**

بەڵام هیچ یەکێکیانی دەرنەکردو، لێیان کشایەوە، مەیدانی کاری گواستەوە بۆ لێکۆڵینەوەی قورئانیی دیکە کە لێکۆڵینەوە فیکریەکانی بوو، ئەو لێکۆڵینەوانەی گەیاندی بە قۆناغی دووەمی ژیانە ئیسلامیەکەی.

بەم شێوەیە پەیوەندیکردنی زانستی سەید بە قورئانەوە پەیوەندی کردنێکی ئەدەبی هونەری رەخنەگری بوو.

قۆناغی یەکەمی ژیانی ئیسلامیی سەید قۆناغی چوارەمی ژیانە گشتیەکەیەتی، کە لەبارەیەوە بۆ مامۆستا نەدەوی دوابوو" ئەو روویکردە قورئانو لێی دەکۆڵیەوە بۆ مەبەستی ئەدەبی.

عادل حمودە دەربارەی قۆناغی یەکەمی ئیسلامیاتی ژیانی سەید دەڵێت: سەید قوتب بە چاویلکەی رەخنەی ئەدەبی ئیسلامی دۆزیەوە.[1]

سەید رویکردە قورئان، روکردنێکی ئەدەبی، لێی کۆڵیەوە لێکۆڵینەوەیەکی جوانی رەخنەگری، بەڵام قورئان سەیدی بەرەو جیهانیکی ئیمانیی هەنگاو پێهەڵگرت.

هەر لەبەر ئەمەیە سەید کتێبەکەی (**التصوير الفني**) بە ناونیشانێکی وروژێنەر (**لقد وجدت القرآن**) دەست پێدەکات، کە تیایدا کورتەی هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵ قورئاندا رِوندەکاتەوە هەر لە منداڵیەوە تا کاتی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە کە تیایدا قورئانی دۆزیەوە: (لەکاتێدا لێبوومەوە لەخۆئامادەکردن بۆئەم باسە، لەدەروونی خۆمدا لەدایکبونێکی نوێی قورئانم بینیەوە، وەك ئەوەی هەرگیز لەوەو پێش نەمبینیبێت).[2]

بەڵێ" بە راستی قورئانی دۆزیەوە، لێی کۆڵیەوە بۆ مەبەستی ئەدەبیو رەخنەگریو هونەریو جوانی. بە قورئان ئیمانی دۆزیەوە، ئیمانێکی زیندوی کاریگەری بزوێنەر.

قۆناغی ئیسلامیاتی هونەری ئەدەبی بە نووسینی بابەتی (**التصوير الفني في القرآن**) دەستپێکرد، ئەم قۆناغە لە ساڵی 1947 کۆتایی هات بە لەچاپدانی کتێبی (**مشاهد القيامة في القران**) واتە: ئەم قۆناغە نزیکەی هەشت ساڵی لە تەمەنی سەیدی پرِکردەوە.

[1] سيد قطب من القرية الى المشنقة: 68.
[2] التصوير الفني: 8.

## قۆنـاغی دووەم: ئیسلامیاتی گشتی

**العدالة الاجتماعية في الاسلام:**

میسر لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە لە ڕووی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریەوە لە قۆناغێکی ترسناکدا دەژیا. سوپای ئینگلیزی داگیرکەر لە میسر بوو، مەلیك فاروقی خراپەکارو دەستوپێوەندەکانیو جۆرەها گروپو تاقمی دژبەیەكو یەکترخۆرو پاشاو گەورەسەرمایەدارو چینخوازەکان و بازرگانەکانی جەنگ، هەموو ئەمانە لە میسردا بوون.

زۆربەی زۆری گەلی میسر ژیانیان لە بارێکی چەقبەستوودابوو، لە هەژاریو برسێتیو بێبەشبووندا ئەژیانو، ڕاتەکانی کۆمەڵایەتی گەورە ڕووی ئەدا.

لەم نێوەندەدا شیوعیەکان گورجو گۆڵو چالاکبوون لە بانگەشەکردندا بۆ ڕێبازەکەیان، منەتیان بەسەر هەژارو کرێکارو جوتیارەکاندا دەکرد بەو بەهەشتەی لە خەیاڵی خۆیاندا بۆیانیان ئامادە دەکردن، ئەو بارودۆخە بۆگەنەیان قۆستبووەوە کە باشترین بارودۆخی گەشەکردنیان بوو، چونکە شیوعیەت لە بارودۆخی بۆگەنو کۆمەڵگای نەخۆشدا نەبێت گەشە ناکات!.

سەید لەگەڵ ئەم بارانەدا دەژیا، ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیە شێوێنراوانە ئازاری دەداو بێزاری دەکرد.

لەلایەکی ترەوە بەهۆی بەردەوامی تێڕوانینو، وردبوونەوەکانی لەقورئانی پیرۆزو، زۆرهەڵوێستەکردن لە بەرامبەر ئایەتەکانیدا چەندین ئامۆژگاریو ئاراستەکردنی ئیسلاحی هەڵێنجا لەئیشوکارە کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریەکاندا، ئەم تێگەیشتنەی کە قورئان بە سەیدی بەخشی بەهۆی هەڵوێستەکردنەکانیەوە لە بەردەم ئایەتو ئەحکامەکانی قورئاندا بە باشی وەریدەگرتو کاریگەری لەسەر دڵو دەروونی جێدەهێشت، بەم شێوەیە دەستی لە زۆرێك لە ڕاستیە قورئانیەکان گیربوو.

ئەوەی بۆدەرکەوت کە ئیسلاحی سیاسیو دادپەروەری کۆمەڵایەتی نە لەلای شیوعیەکانو نە لەلای ڕۆژئاواییەکان نیە، بەڵکو لە ئایەتەکانی قورئانو ڕاستیەکانی ئیسلامدایە.

خوای گەورە بەکارهێنانی زاراوەی **(العدالة الاجتماعية)** ـ واتە دادپەروەری کۆمەڵایەتی ـ خستە دڵی سەیدەوە، بەمەش بەرپەرچی هەردوو زاراوەکەی تری دایەوە کە لە نێوەندە کۆمەڵایەتیو ئیسلاحیەکاندا باوبوو کە بریتی بوون لە **شیوعیەت** و **ئیشتراکیەت!!.**

بە کتێبە بەناوبانگەکەی **(العدالة الاجتماعية في لاسلام)** سەید لە نووسەرێکەوە گۆڕا بۆ بیریارێکی ئیسلامی، قۆناغی **ئیسلامیاتی فیکریی گشتی** پێ بردەسەر، هەر بەم کتێبە هەنگاوە یەك لەدوای یەکەکانی بەرەو فیکری ئیسلامی دەستپێکرد کە لە دواییدا بوو بە ڕابەری ئەو فیکرە.

**ئەم کتێبە ـ لەگەڵ دەرچوونیدا ـ مقۆ مقۆیەکی گەورەی لە نێوەندە جیاجیاکاندا خولقاند:**

1- نێوەندە شیوعیەکان دژایەتیان دەکرد، خاوەنەکەیان بە دوژمنی سەرسەختی شیوعیەت دایە قەڵەم، چونکە چاوی خەڵکی ستەملێکراوی بە ڕوی دەرگایەکدا کردەوە جیا لەو دەرگایەی ئەوان بانگەشەی خەڵکیان بۆ دەکرد.

2- نێوەندی ڕۆژئاوایی، لە دژی وەستان و خاوەنەکەیان بە خاوەنی بانگەوازێکی ئیسلامی دایە قەڵەم، ئیسلامو بانگخوازانیشی دوژمنی ئەوانن.

3- ناوەندی حکومی ڕەسمی، کتێبەکەو ئاڕاستە نوێیەکەی سەید قوتبیان بە سەرکەوتن دایە قەڵەم بۆ بانگەوازی دوژمنەکەیان **(الاخوان المسلمين)** کە لە کاتی دەرچوونی ئەو کتێبەدا توند کرابوون لە زیندانەکان لە پاداشتی پارێزگاریکردنیان لە فەلەستینو شەڕکردنیان لەگەڵ جولەکەدا!!، لەبەر ئەوە نێوەندە حکومیەکانیش دژایەتیان کرد.

4- بەڵام نێوەندە ئیسلامیەکان بەتایبەتی لاوانی کۆمەڵی برایانی موسڵمان دڵخۆشبوون بەم کتێبەو پێی سەرسام بوونو بە نوێکاریو داهێنانێکی گەورەیان لە بانگەوازی ئیسلامیدا دانا، ئاڕاستەی نوێی فکری سەید قوتبیان بە دەستکەوتێکی گەورە دانا بۆ بانگخوازانو، زۆر بە نزیکیان دەزانی لە برایانی موسڵمانەوە، تەنانەت هەندێکیان سەیدیان دانا بەوەی لە ڕێگەی بەرەو ئیخوانی بوونیدایە، ئەگەر هەندێکیان هەر بە ئیخوانیان دانەنابێت!.

لاوانی برایان پێشوازیان لەم کتێبە کردو دەیانخوێندەوەو لەگەڵیدا تێکەڵ بوونو پێی کاریگەر بوون.

**گۆڤاری الفكر الجديد:**

هەر لەم قۆناغە ئیسلامیەی ژیانیدا گۆڤاری (**الفکر الجدید**)ی دەرکرد، ئەوەبوو ژمارەی یەکەمی لە کانوونی دووەمی 1948دا لێدەرکرد، بەڵام تەنها سێ مانگ بەردەوام بوو، لە مارسی 1948داو دوای دەرچوونی دوانزە ژمارە حکومەت گۆڤارەکەی داخست.

ئەویش بەهۆی شێوازە توندە ئیسلاحیەکانی سەید لەو بابەتانەی بڵاوی دەکردەوە کە حکومەتی زۆر تەنگەتاو کردبوو تا ئەو ئاستەی خۆی پێڕانەگیرا لە بەرامبەریداو فەرمانی داخستنی دەرکرد.

ناونیشانی بابەتەکانی هەموویان ناونیشانی توندوتیژو گورچکبڕو ئازایانە بوون، تەعبیریان لە عەقڵیەتی سەیدو ڕێبازی بیرکردنەوەیو، شێوازی هێرشبردنی لە دەربڕینداو، ئازایەتی لە ئیسلاحدا دەکرد.

## بابەتەکانی لە گۆڤارە ئیسلاحیەکاندا

دوای ئەوەی ساڵی 1950 لە ئەمریکا گەڕایەوە، بە هیممەتێکی بەرزو ئامانجێکی مەزنو بە پەیامێکی ئیسلامیی ئیسلاحیەوە، کە ئەیویست بەرقەراری بکات دەستبەکار بوو.

سەید کاتێك سەیری دەکرد کاروبار لە میسردا زیاتر بەرەو خراپبوون دەچێتو، ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی زیاتر بەرەو داڕوخان دەچێت، گەلیش مەینەتیەکانی زیاد دەکات، لەبەر ئەوە هەستا بە ئەرکی ئیسلامییو گۆڕانکاریەکانی.

لە چەند ڕێگەیەکەوە سەرقاڵی بانگەوازە ئیسلاحیەکەی خۆی بوو لە دیدو بۆچوونێکی ئیسلامیەوە لەوانە: نووسین لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، نووسینی کتێب، پێشکەشکردنی کۆڕو سیمینار، سەردانی یانە ئەدەبیەکان، خۆئامادەکردنی نهێنیو ئاشکرا بۆ گۆڕانو ئیسلاح.

سەید دەربارەی هەوڵەکانی خۆی دەڵێت: (لە ساڵی 1951دا من لە زۆرانبایەکی سەختدا ڕۆچووم دژ بە بارودۆخی پاشایەتی فەرمانڕەواو چینخوازەکانو سەرمایەداری ئەمەش بە پێنووسو وتاردانو کۆبوونەوەکان. دوو کتێبم لەو بوارەدا[1] دەرکرد. جگە لە بڵاوکردنەوەی سەدەها بابەت لە ڕۆژنامەکانی (**الحزب الوطني الجدید**)و (**الحزب الاشتراکي**)و گۆڤاری (**الدعوة**) کە مامۆستا ساڵح عەشماوی دەریدەکرد، لەگەڵ گۆڤاری (**الرسالة**)و هەموو ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە ئامادەبوونایە بابەتەکانی منیان بڵاوبکردایەتەوە)[2].

توندترین بابەتەکانی گۆڤاری (**الاشتراکیة**) بۆی بڵاوکردەوە کە زمانحاڵی حزبی ئیشتراکی بوو (ئەحمەد ئەمین) دایمەزراندبوو.

لە کاتێکدا هێمنترین بابەتەکانی ئەو بابەتانە بوون کە گۆڤاری (**الدعوة**)ی ساڵح عشماوی بۆی بڵاوکردەوە،

لەگەڵ ئەوەدا بابەتەکانی لە ڕۆژنامەی (**اللواء الجدید**)دا کە زمانحاڵی (**الحزب الوطني الجدید**) بوو بە سەرۆکایەتی فەتحی رزوان بابەتانێك بوون لە نێوان توندویژیەکی زۆرو، هێمنیەکی بەهێزدا بوون!.

## قوتابخانەکانی خەشم و قین

لێرەدا دوو بابەتی شۆڕشگێڕانەی توندی ئەم قۆناغەمان بۆ هەڵبژاردوون، دوو بابەتی شۆڕشگێڕانە، بەڵام لە هێمنترین بابەتەکانیەتی چونکە لە گۆڤارێکی زۆر هێمندا بڵاوی کردوونەتەوە کە گۆڤاری (**الرسالة**)یە.

**یەکەمیان:** بابەتی (قوتابخانەکان بۆ نارِزایی) کە بە قسەی یەکێك لە هاوەڵەکانی دەستپێدەکات لە کاتێکدا سەرزەنشتی سەید دەکات: (**ئەوەچیە بەو شێوەیە ناڕازیت لە هەموو دیمەنەکان و لە هەمووبارودۆخەکان؟دەرونت ئارام کەرەوە ئەی براکەم، وازلەبەدیهێنراوەکان بهێنە بۆ بەدیهێنەرەکەیان، چونکە ئەم ڕەفتارانەی تۆ هیچ سودێکی نیە!! سەیدیش لە**

[1] ئەوانیش (معركة الاسلام والرأسمالية)و (السلام والمعارض و لاسلام) بوو.

[2] کتێبی (لماذا يعدموني) یان (كلمات الأخيرة) ئەوەش دانپیانانی خۆیەتی لە بەرامبەر لێکۆڵەرەوەکان لە ساڵی 1965.

وەڵامی ئەم هاوەڵەیدا نووسیویەتی:( بەڕاستی ئەگەر کارەکە بدرایەتە دەستی من، ئەوە لاوازی ئەو قوتابخانانەم دەردەخست کە حکومەت بونیادی ناون، تیایدا یەك شتم فێری گەل دەکرد کە بریتیەلە: نارەزایی ! نارەزایی نەخۆشی و دەردی بارودۆخ و دیمەنە شێواوەکانە، کە لە هەموولایەکەوە زاڵبووە بەسەر ژیانی ئەم نەوەیەدا. نارەزایی بەڵگەی زیندویەتیەکی پەنگخواردووە ، ڕازیبونیش بەم بارودۆخە هەمیشەییە جۆرێکە لە نائومێدی و ڕەشبینی، یان گەلەکان دەکوژێت یان بەرەو لێکهەڵوەشاندن دەبیات. .

بەڵێ! ئەگەر کارەکە بەمن بسپێرایە، ئەوا قوتابخانەیەکم بۆ نارەزایی لە سەر ئەم نەوەیە دروست دەکرد، دروستم دەکرد لەسەر پیاوانی سیاسەت لەم وڵاتەدا. .

قوتابخانەیەکیش بۆنارەزایی لەسەر ئەو نوسەرو ڕۆژنامە نوسانە. . .

قوتابخانەیەك بۆنارەزایی لەسەر ئەو وەزیرانە. .

قوتابخانەیەك بۆنارەزایی لەسەر پاشاواتەکان و جگە لەوانیش. . .

قوتابخانەیەك بۆنارەزایی لەسەرئەو ئوروستوکراتیانەی کە دەزانن ئەوانە کێن. . .

قوتابخانەیەك بۆ نارەزایی لەسەر ئەوانەش کە ئوروستوکرات نین. .

قوتابخانەیەك بۆ نارەزایی لەسەرئیزگە، ئەو ئیزگەیەی کە هەرچی لە هۆڵ و یانەکاندا ڕودەدات دەیگوێزێتەوە. .

قوتابخانەیەك بۆ نارەزایی لەسەرئەوڕۆژنامە بێ ئابڕوانە. .

لە کۆتاییدا قوتابخانەیەك بۆ نارەزایی لەسەر ئەم گەلە، کە ڕێگە بەهەموو ئەم سوکایەتی پێکردنانە دەدات وە هەموو بارودۆخێکی قبوڵە، بەبێ ئەوەی ڕاپەڕێت و هەموئەوانەو ئەمانە برەنجێنێت. .

قوتابخانەکانی نارەزایی! ئای کەچەندە گەل پێویستی بەمە هەیە، بەڕاستی ئەم گەلە لە خواردن و خواردنەوە زیاتر پێویستی پێیان هەیە. .

–ئەم قوتابخانانەش– تەنها پێنوسە دڵسۆزە گورجوگۆڵەکان دروستی دەکەن. . وە ئەم کارە ئەرك و پێویستە لەسەر هەموو خاوەن پێنوسێك، وە تەنها یەك هاواریش لەگەڵ هەوادا بە فیرۆ ناڕوات، چونکە هەوا باشتر پارێزگاری لە دەنگەکان دەکات. . وە لەگەڵ ژیاندا نائومێدی نیە. . . )[1].

**دووەمیان:** بابەتی (بێزاری)ە، کە چەند هەفتەیەك پێش هەڵگیرساندنی شۆڕش گۆڤاری (**الرسالة**) بڵاوی کردۆتەوە بە بەرواری 19ی مایس 1952.

بابەتەکە بەم وشەیە دەستپێدەکات (ئەوەیە کە هەستی پێدەکەیت لە دەموچاوی خەڵکی ئەم ڕۆژگارەدا، وەهەستی پێدەکەیت لە قسەکانیاندا لە هەموو شوێنێکدا. . . بێزاری‌لەهەموشتێك، وەلەهەمووبیروبۆچونێك، وەلەهەموکارێك، وەلەهەموکەسێك، وەلەهەمووئاراستەیەك. . . بێزاریەك لە ئازارێکەوە دەرچووە کە مردووە! دەرچووە لەنائومێدبونەوە لە کارەکان و لە پیاوەکان، وەلە بەفیرۆدانێکی هەمەلایەنەوە، وە لە سوکایەتی پێکردنەوە. .

خەڵکی لاپەڕەی ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە، بەسەر مانشێتە گەورەکاندا بەبێ هەڵوێستە کردن تێدەپەڕن، وەك ئەوەی شتێك بۆ هەڵوێستە لەسەر کردن لە ئارادا نەبێت. . . !

ئەوەی لەژیانی سیاسیدایە بێزاریە . . بێزاریە . . بێزاریەك وشەکان لە لێوەکاندا دەمرێنێت، لە تەنگەژەو گرفتە ئابوریە خنکێنەرەکاندا، ئیتر کەس نارەزایی دەرنابڕێت، چونکە نارەزایی هیچ سودێکی تێدانیە؟ئازارچەشتن چ سودێکی هەیە؟بێزاریە. . بێزاری. . بێزاریەك وشەکان لە لێوەکاندا دەمرێنێت

ئایا میسر وڵاتی شێتیە؟یان ئەوەتە من شێتم؟چونکە لەوە تێنەگەشتوم کە لە میسردا بەرژەوندیەکان هەیە، وە لە میسردا کۆمپانیاکان هەیە، پاشان ئەوە چیە منیش لەم ڕۆژگارەدا وەك ئەو خەڵکەی ترو وەکو میللەت بێدەنگ نابم؟ئایا هەست بەو بێزاریە ناکەم کەبەسەر دەموچاوەکانەوە دەردەکەون؟ئایا هەست بەو خەمە ناکەم کەبەسەر سنگەکاندا چەسپیون؟)[2].

---

[1] الرسالة: 14، برگی2، ژمارە491.

[2] الرسالة: 1081-1082، بەرگی یەکەم/ ژمارە 985، لاپەڕە 545-546.

ئەمانە نموونەی چالاکیە ئیسلاحیەکانی بوون لە قۆناغی ئیسلامیی دووەمیدا، لە قۆناغی ئیسلامیاتی فیکریی گشتیدا لەگەڵ ئازاری گەلەکەیدا دەژیا، تێبینی پێویستیە سەرەکیەکانی دەکرد، وەك هەندێ لە ئەدیبو نووسەرو ڕۆشنبیرەکانی ئەو ڕۆژە ئارەزوی گۆشەگیری لە ماڵی خۆیدا نەدەکرد. بەڵکو دادەبەزیە ناو کۆمەڵگاوە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا دەکردو گرفتو کێشەکانی بەرجەستە دەکردن.

ژیانی ئیسلامیی فیکریی سەید بانگەوازبوو بۆئیسلاحوشۆڕشو گۆڕانکاری، دژایەتیکردن بوو بۆخراپەگشتی و تایبەتیەکان لەسەرجەم لایەنەکانی ژیان لە کۆمەڵگادا.

## قۆناغی سێیەم : قۆناغی ئیسلامیاتی حەرەکی

مەبەست لە ئیسلامیاتی حەرکی: تێگەیشتنی ڕاستو هەمەلایەنەیە بۆ ئیسلام، وەك چۆن لە قورئانو سوننەتدا هاتووە، پەیپێبردنی تایبەتمەندیوبنەماکانیەتی، هەڵوێستەکردن یان وەستانە لەسەر سروشتی ئیسلام خۆی، تێبینیکردنی ئەرکەکانیو لاکردنەوەیە بەلای سیفەتی **ئیجابیەتی واقیعی** و **کاریگەری بزاوتن** لە ئیسلامدا.

لە دوای ئەم تێگەیشتنە ئیجابیانەوە بۆ ئیسلام، پەیوەستبوون لە بیروبۆچوونو، لە بەندایەتیو یادکردنو، لە ڕەوشتو هەڵسوکەوتدا دێت.

پاشان هەستان بە لێبڕانی کرداری، پێشکەشکردنی شاهیدی حەق بەشێوەیەکی کرداری بۆ ئەم ئیسلامەو گوێزانەوەی بۆ ناو گۆڕەپان، گۆڕەپانی جیهادو بانگەوازو ڕوبەڕوبوونەوە،ڕوبەڕوبوونەوەی نەفامی، ڕوبەڕوبوونەوەی خاوەن بانگەوازە پڕوپوچەکان.

هەموو ئەمانە لە قۆناغی سێیەمی ئیسلامیی سەیدا جێبەجێ کران باشترین جێبەجێکردن، پێیان هەستا باشترین پێهەستان، ڕاپەڕاندن باشترین ڕاپەڕاندن، چەندین لێکۆڵینەوەو باسی حەرەکی ڕەسەنی پێشکەشکرد لە (**في ظلال و الخصائص و المقومات و المعالم وهذا الدين**)دا، بەکرداری توانایەکی زۆری لە گۆڕەپانی بانگەوازدا بەخشی، کۆتابەخشینی تواناکانیشی بریتی بوو لە بەخشینی گیانی پاکی لە پێناو ئەم واتایانەدا، جێهێشتنی دنیا بوو بە شەهیدی لە پێناوی خوای گەورەدا. .

ئەم قۆناغە لە ساڵی 1953وە دەستپێدەکات لەوکاتەوەی سەید پەیوەندیکرد بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوەو لە ڕیزەکانیاندا خۆی ڕێکخست، وە کۆتایی هات بە شەهیدبوونی لە 1966/8/29.

ئەم قۆناغە لە پیرۆزترین قۆناغە ئیسلامیەکانی ژیانی سەید بوو، لەم قۆناغەدا زۆرترین بەخشینو بەرەکەتو جیهادو بانگەوازو فیکرو پەروەردەی پێشکەشکرد.

### سەید پێشەنگی فیکریی بزاڤی ئیسلامیە

ئەم قۆناغە دائەنرێت بە قۆناغی پێگەیشتنی فیکریو حەرەکی بۆ سەید قوتب، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژو ساڵەکانی ئەم غۆناغەدا زیاتر سەید پێگەیشتو، پەیپێبردنو هۆشیاریو جووڵەی زیادی دەکرد. بەردەوام گەشەی دەکردو لە بازنەی ئەم جموجوڵە فراوانەیدا بەرەو سەرەوە هەنگاوی دەنا، تیایاندا گەیشتە چەندین بڕیارو ڕاستی نوێ، لە مەیدانەکانیدا گەشتی خۆی دەکردو بواری نوێی تیایاندا دەهێنایە کایەوە، تا ئەوەبوو ئەجەل پێشوازی لێکردو بە شەهیدی گەشتەوە بە پەروەردگاری لەوپەڕی پلەی هۆشیاریو تێگەیشتنو جووڵەو چالاکیدا، لەوپەڕی پلەی بانگەوازو ڕێکخستنو جیهاددا!.

ئەو وێنەی سەید کەلەم قۆناغەیدا لەسەری جێگیر بووبوو، دوا وێنەی سەیدە کە تیایدا بە ڕووی خەڵکیدا دەرکەوت، خەڵکی لەو وێنەیەوە سەیدیان بینیو، هەر لەو وێنەیەوە ناسیانو، هەر لەو وێنەیەشەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن وەك بیریارێکی ئیسلامی حەرەکی ڕەسەن.

ئەم وێنەیەش ئەو وێنەیەیە کە سەید حەزی دەکرد پێوەی دەرکەوێتولەڕوانگەیەوە بناسرێت، بیروبۆچوونەکانی لەسەر ئەم بنچینەیە پێشکەش بکات، بەڵام قۆناغەکانی پێشوو، قۆناغی مێژوویی ڕابوراون، تێپەڕینو کۆتاییان پێهات، بەنیسبەت سەیدەوە جگە لە ڕەهەندێکی مێژوویی هیچی تر نین، هەرکەسێك دەربارەی قۆناغەکانی پێشووی دەدوێت با لەم گۆشەنیگایەوە لێی بدوێت، پێویستە قۆناغەکانی پێشووی ژیانی سەید باسی لێوەبکرێتو بخرێتە ڕوو تا ئەگاتە قۆناغی کۆتایی، لەوێدا دابخرێتو قۆناغی کۆتایی باس بکرێت!. چونکە سەید خۆی هەموو قۆناغەکانی بە کرداری بڕیو لە سنووری قۆناغی پێش کۆتاییدا نەوەستا تاکو خەڵکی تیایدا بووەستن.

بەڵکو پێویستە سەید بەو شێوەیە بە خەڵك پێشکەش بکرێت کە خۆی تیا پێشکەش کردووە، بەوشێوەیەی بۆ خۆی پێی خۆشەو لە کۆتایی تەمەنیدا پێی ڕازی بووە، خوای گەورەش ڕەزامەندی لەسەر ئەو ژیانە بووە بۆ سەید.

سەید لەم قۆناغەدا کۆمەڵێك کتێبو لێکۆڵینەوەو توێژژینەوەی هۆشیارانەی تۆکمەی پێشکەش کرد، کە تەواوی تێگەیشتنەکانی خۆی بۆ ئیسلامو بیرکردنەوەی لە قورئانو، بۆچونی بۆ کارو بانگەوازو جموجوڵو جیهادی تێدا کۆکردۆتەوە.

سەید بەهۆی ئەم باسو لێکۆڵینەوانەوە بوو بە پێشەنگی فیکری ئیسلامی هاوچەرخ، لەڕوی خستنەڕو، لە ڕوی بەیانکردن و بۆزیادکردنەوە، لەڕوی ڕوبەڕوبونەوەی نەفامی پێی، لە ڕوی سەرلەنوێ دارشتنەوەی مرۆڤی موسڵمان لەسەر بنچینەکانیەوە.

**ئەو کتێبانەشی لەم قۆناغەدا دەریکردن بریتین لە:**

1- في ظلال القرآن ـ بەتایبەتی چاپە پوختەکراوەکەی.
2- هذا الدين.
3- المستقبل لهذا الدين.
4- الاسلام ومشكلات الحضارة.
5- خصائص التصور الاسلامي.
6- مقومات التصور الاسلامي.
7- معالم في الطريق.

## هەندێك لە کارەکانی سەید لەم قۆناغەدا

وتمان ئەم قۆناغە لە ساڵی 1953وە دەستپێدەکات کاتێك بەشێوەیەکی کرداری پەیوەندی کرد بە ڕیزەکانی کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە. لە دیارترین کارەکانی لەم قۆناغەدا ئەوەبوو: سەرکردایەتی برایانی موسڵمان کارە ڕۆشنبیرییە بانگەوازیەکانیان بەو سپارد، وەك دەرکردنی ڕۆژنامەی (الاخوان المسلمين) بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، پێشکەشکردنی وتەکانی **سێشەممە** لە مەڵبەندی گشتی برایانی موسڵمانو، پێشکەشکردنی وتەو گوتار لە بۆنە ئیسلامیەکاندا.

لە بەرواری 1953/3/2 بە نوێنەری (**لجنة الدراسات الاجتماعية المصرية**) ڕۆشت بۆ دیمەشق بۆ کۆنگرەی (**الدراسات الاجتماعية**) کە لەوێ بەسترا، لەو کۆنگرەیەدا وتەیەکی پێشکەشکرد دەربارەی (پەروەردەی ڕەوشتی وەك هۆکارێك بۆ بەرقەرارکردنی تەواوکاری کۆمەڵایەتی).[1]

هەر لە دیمەشقدا لەگەڵ سەرکردەکانی کاری ئیسلامی لە سوریا کۆبویەوە، وێنەی لەگەڵ هەریەك لە مامۆستا عەلی تەنتاویو مامۆستا عیسام ئەلعتاردا گرتووە.

**لە کۆلێژی ئاداب ـ زانکۆی دیمەشق ـ موحازەرەیەکی کاریگەری پێشکەشکرد**

**محەممەد** یاسینی هاوڕێی دەربارەی موحازەرەکەی دەڵێت: (موحازەرەیەکی جوان بوو، سەید قوتب تیایدا بۆ ماوەی دوو سەعات قسەی کرد، لە جوانی دەربڕینی قورئان ئەکۆڵیەوە، نە کاغەزو نە کتێبی بەدەستەوە نەبوو. )[2]

دوای کۆتایی هاتنی کۆنگرەکە لە دیمەشق، سەید قوتب لە ڕێگەی وشکانیەوە ڕووی لە ئوردن کرد بۆ سەردان، مامۆستا یوسف ئەلعەزم دەگێڕێتەوە کە دەسەڵاتدارانی ئوردنی ئەو ڕۆژە ڕێگری سەید قوتبیان کردو نەیانهێشت بچێتە ئوردنەوە، بە فەرمانێك کە لەلایەن سەرکردەی ئینگلیزی (گلۆپ)ەوە بۆیان هاتبوو کە لەو ڕۆژەدا بە ئارەزووی خۆی فەرمانڕەوایی ئوردنی دەکرد!!.[3]

لە 1953/12/2دا سەید بە نوێنەرایەتی برایانی موسڵمان چوو بۆ قودس بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی ئیسلامی میللی کە لە قودس بەسترا، (ئەگەر وەفدەکان هەموویان بەشێوەی سەردانی کۆمەڵی نەرۆیشتنایەتە قودسەوە، ئەوە بۆ جاری دووەم سەید بێبەش دەکرا لە چوونە ناو قودسەوە هەروەك چۆن نەیانهێشت سەردانی یەکەمی بکات!).[4]

لە دیارترین ئەو ڕوداوانەی بەسەریدا هات لەم قۆناغەدا، زیندانی کردنی بوو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی برایانی موسڵمان لە ساڵی 1954، ئەوەبوو لەگەڵ براکانیدا ئازارو ئەشکەنجەیەکی بێ بەزەییانەی زۆری چەشت، پاشان لە ساڵی 1955و لەبەردەم دادگایی کردنێکدا کە ئەفسەر جەمال سالم سەرکردایەتی ئەکرد دادگایی کرا، دادگا فەرمانی 15 ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاند. نزیکەی 10 ساڵ تیایدا مایەوەو پاشان بە لێبوردنێکی تەندروستی لە ساڵی 1964 ئازادکرا.

لە گرنگترین کارەکانی لەم قۆناغەدا، سەرکردایەتی کردنی ڕێکخستنی نوێی برایان بوو. کە لەسەرەتادا سەرکردایەتیەکی فیکری بوو، بەڵام پاش دەرچوونی لە زیندان بوو بە سەرکردایەتیەکی فیکریو کرداری پێکەوە، تا ئەوکاتەی جارێکی ترو لە مانگی ئابی 1965دا دەستگیرکرایەوە، ئەمجارەش ئازارو ئەشکەنجەیەك درا کە لەباسکردن نایەت، پاشان لە دادگایی کردنێکدا کە ئەفسەر فوئاد دەجەوی سەرۆکایەتی دەکرد دادگایی کرا، لەم دادگایی کردنەدا فەرمانی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێنراو پاشان فەرمانەکە جێبەجێ کرا.

ژیانی سەید قوتب لەم دوا قۆناغە کۆتاییە پیرۆزەی ژیانیدا، بەخشینێکی نوێکەرەوەی بەردەوام بوو، بەخشینێك بەبێ وەستان، جا ئەوبەخشینە بەخشینە فیکرییە پەروەردەییەکانی بوویێت کە لە کتێبە حەرەکیە پێگەیشتوو تۆکمەکانیدا دەری دەکردن، یان بەخشینێکی کرداری واقیعی بوبێت لە ڕوانگەی ئەو داستانە پڕ لە جوامێریو نەمریانەی کە بە خۆڕاگریو

---

[1] رائد الفكر الاسلامي المعاصر: يوسف العظم، 38.

[2] گۆڤاری الشهاب:/ ساڵي 4، ذمارة11، 1970/8/15ص9.

[3] رائد الفكر الاسلامي: يوسف العظم، 38.

[4] هەمان سەرچاوە: 38-39.

دامەزراوی، بە چاونەترسیو ئازایەتی، بە ئارامگرتن و شکۆداری لە زیندانەکاندا تۆماری کردن، یان بە دامەزراندنو سەرکردایەتی کردنی بوویێت بۆ ڕێکخستنی نوێی برایان.

لە هەموو ئەمانە گرنگتر ـ لە ڕووی دەرونیەوە ـ گێڕانەوەو گرێدانەوەی پەیوەندیەکانی بوو لەگەڵ برایانی موسڵمان لە دەرەوەو ناوەوەی زیندان، پێشکەوتووترین جۆری ڕێکخستنی ئیسلامی دامەزراند کە نهێنیو زۆر کاریگەر بوو لە میسر. . . ئەم دامەزراندنە لەو بارودۆخەپڕ لە مەترسیەدا دائەنرێت بە کردەوەیەکی خۆکوژی -ئەگەر ئەم تەعبیرە شیاو بێت- کە باڵی بەسەر زەوی کەنانەدا کێشابوو.[1]

## حەوت دیمەن لە ژیانە ئیسلامیەکەی سەیدقوتب

## دیمەنی یەکەم: سەید قوتب لەگەڵ پیاوانی شۆڕشدا

### پلانی ئیخوانی پێشوەخت بۆ شۆڕش

مێژوونووسە ئیخوانەکان لەگەڵ مێژوونووسە بێلایەنە بەویژدانەکان یەکدەنگن لەسەر هەبوونی پلانێکی ئیخوانی پێشوەخت بۆ شۆڕشی میسری، ئەم پلانەش لە سەرەتای چلەکاندا دەستی پێکردوە.

ئەم وتەیە لە کتێبی مێژوونووسەکانی برایاندا هاتووە وەك (**صفحات من التأريخ**)ی سەلاح شادی بەرەحمەت بێت، هەروەها(**الاخوان المسلمين رؤية من الداخل**)ی مەحمود عەبدولحەلیم، (**الاخوان المسلمين والنظام الخاص**)ی ئەحمەد عادل کەمال، (**حقيقة الخلاف بين الاخوان المسلمين و جمال عبدالناصر**)ی ڕابەری گشتی پێشوو **محەمەد** حامد ئەبو نەسر -بەرەحمەت بێت-، (**أسرار الحركة الضباط الأحرار والاخوان المسلمون**)یحسەین حەمودە، (**الصامتون يتكلمون**)ی سامی جەوهەر، یاداشتەکانی عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوف- ڕەحمەتی خوای لێبێت -کە ناوی نابوو (**أرغمت فاروق على التنازل عن العرش**).

لە یاداشتەکانی عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوفدا ئەم ڕاستیانە کورت دەکەمەوە، بەو ئیعیبارەی گرنگترین بەڵگەنامەیە دەربارەی پلانی ئیخوانی پێشوەخت بۆ شۆڕشو کۆکردنەوەی ئەفسەرە مولتەزیمەکان بۆ هەستان بە شۆڕش.

عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوف دان بەوەدا دەنێت کە مەحمود لەبیب دەستنیشانکراوی برایانی موسڵمان بوو بۆ کاروباری سەربازی، عەبدولمونعیم وەك ئەفسەرێك لە دوای دەرچوونی لە کۆلێژی جەنگی بە مەحمود لەبیب گەشتو ئاشنابوون بە یەکتری.

عەبدولڕەئوف ڕاهاتبوو لەسەر ئامادەبوون لە **وتەکانی سێ شەممە** دا، کە پێشەوای شەهید حەسەن بەننا لە مەڵبەندی گشی برایانی موسڵمان پێشکەشی دەکرد، پاشان وایلێهات ئەفسەری دیکەشی بانگ دەکرد بۆ ئامادەبوونی وتارەکانو لەگەڵ خۆی دەیهێنان، لە پێشەوەی ئەو کەسانە کە عەبدولڕەئوف بانگی کردن نەقیب جەمال عەبدولناسر بوو، ئەمەش لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1942دا.

یەکەم ئوسرەی[2] ئیخوانی کە تایبەت بە ئەفسەرەکان پێکهێنرا لە حەوت ئەفسەری برایان پێکهاتبوو لە ساڵی 1944دا، بەرپرسی ئەم ئوسرەیە مەحمود لەبیب بوو، ئەندامەکانیشی: عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوف، جەمال عەبدولناسر، کەمالەدین حسەین، حسەین ئەحمەد حەمودە، سەعد تۆفیق، سەلاح خەلیفە، خالید محێدین بوون!!.[3]

پاشان چەندین ئوسرەی تری برایان بۆ ئەفسەرانی سوپا پێکهێنرا.

---

[1] سيد قطب: بركات، 19.

[2] أسرة وشەیەکی ئیسلامی ئیخوانییە لە جێگەی (شانە) بەکار دەهێنرێت کە زاراوەیەکی سیاسی تەنزیمیە.

[3] مذكرات عبدالمنعم عبدالرؤف: 43.

دوای دوو ساڵ بەسەر دروستکردنی ئەم ئوسرە ئیخوانیانەدا لە ئەفسەران، حەوت ئەندامەکەی یەکەم ئوسرە پەیمانیاندا بە عەبدولڕەحمان ئەلنەدەوی کە بەرپرسی (**النظام الخاص**)ی کۆمەڵی برایانی موسڵمان بوو لەسەر بەرنامەی خواو تێکۆشان لەپێناوی خوادا، ئەمەش لە سەرەتای ساڵی 1946دا.[1] ئەم حەوت برایە ناوی ڕێکخستنی برایانی ئەفسەر (**تنظيم الاخوان الضباط**)یان بۆ ئوسرەکەی خۆیانو سەرجەم ئوسرەکانی ئەفسەرانی برایان هەڵبژارد.[2]

ڕۆژ بەڕۆژ ڕێکخستنی برایانی ئەفسەر کە مەحمود لەبیب سەرۆکایەتی دەکردن زیادی دەکردو بەهێزو پتەوتر دەبوو، وە چالاکترین ئەندامەکانی عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوفو جەمال عەبدولناسر بوون، ئەم ڕێکخستنی ئەفسەرانە سەر بە (**النظام الخاص**) بوو کە عەبدولڕەحمان ئەلسندی سەرۆکایەتی دەکرد.

تا ئەوەبوو ئاگربەستی (ڕۆدس )لە نێوان جولەکەو وڵاتانی عەرەبیدا لە ساڵی 1949 ڕوویدا، سوپای میسر لە فەلەسین پاشەکشەی کرد، جەمال عەبدولناسری ئەفسەر لە نێوان پاشەکشەکردوەکاندا بوو کە لە فالوجە گەمارۆ درابوو.

سەرکردایەتی برایانی ئەفسەر بە سەرۆکایەتی مەحمودلەبیبو بەئامادەبوونی هەردوو ئەفسەر عەبدولڕەئوفو عەبدولناسر ژمارەیەکی زۆر کۆبوونەوەیان ئەنجامدا، تیایدا گەیشتنە ئەوەی کە: پێویستە تۆڵەی شەهیدکردنی حەسەن بەننا بکرێتەوە، ئاگاییو خۆپاراستنی زۆر بکرێت لە (پاسەوانی ئاسنین) کە سەر بە ـ کۆشکی پاشایەتی بوو ـ تاکو ڕێکخستنەکەیان ئاشکرا نەبێتو بتوانن دەربازبن لە دەستی دەستووری پاشایەتیو، هەستن بە کودەتایەك بۆ بەدیهێنانی دەستورێکی ئیسلامیو ڕاهێنانی کۆمەڵێك لە برایانی موسڵمانو دەستکردن بە جەنگ دژ بە سوپای ئینگلیز.[3]

لە مایسی ساڵی 1949دا جەمال عەبدولناسر بانگکرا بۆ نووسینگەی ئیبراهیم عەبدولهادی سەرۆك وەزیر بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا بە تۆمەتی ئەوەی کە عەبدولناسر سەر بە برایانی موسڵمانە، بەڵام جەمال عەبدولناسر توانی ئەم تۆمەتە ڕەدبکاتەوە.[4]

مەحمود لەبیب موچەی مانگانەی مانگێکی نارد بۆ خێزانەکەی عەبدولناسرو پێی ڕاگەیاند کە برایانی ئەفسەر گرنگی ئەدەن بەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ جەمال عەبدولناسردا ئەنجامدراوە، ئەوان لێی ناگەڕێن.

بەهۆی ئەم ـ لێکۆڵینەوەیەوە لەگەڵ عەبدولناسر ـ مەحمود لەبیبی بەرپرسی برایانی ئەفسەر پێشنیاری گۆڕینی ناوی ڕێکخستنەکەیانی لە (**تنظيم الاخوان الضباط**)ەوە کرد بە (**الضباط الاحرار**) بۆ ئەوەی ناوی برایانی موسڵمان لەخۆیان دووربخەنەوە، کە پاشاو گروپەکانو ئینگلیز زۆر پێی ناڕەحەت بوون.[5]

لە ئەیلولی ساڵی 1949دا جیاوازی کەوتە نێوان هەردوو ئەفسەری چالاکی دیار لە ئەفسەرانی ئازاد کە عەبدولڕەئوفو عەبدولناسر بون، عەبدولناسر دەیویست پەلەبکات لە کاری کودەتادا، دەیویست دەرگای ڕێکخستن بکاتەوە بە ڕووی سەرجەم ئەفسەرانی سوپادا، ئەگەرچی پەیوەست نەبن بە برایانی موسڵمانەوەو لەگەڵ ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ئیسلامیشدا تەبانەبن. !

عەبدولڕەئوفیش پەیوەست بوو بەو پەیمانەوە کە بە برایانی دابوو، سووربوو لەسەر گوێڕایەڵی بۆ ڕێنومابیەکانی نووسینگەی ئیرشادی برایان، داوای دەکرد کە تەنها ئەو ئەفسەرانە وەربگیرێن کە لە برایانی موسڵمانن، هیچ ئەفسەرێکی تر نەهێنرێتە ناو ڕیزی ڕێکخستنەکەیانەوە !.

ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە کێشەکەیان بەرنە لای فەریق عەزیز میسری، عەزیز بکەن بە دادوەر لە نێوان هەردووکیاندا، ئەویش داوای لێکردن کە پێکەوە ڕێبکەون بۆ دەرکردنی ئینگلیزو هەڵوەشاندنەوەی دەستووری پاشایەتی، خۆ ئەگەر پێکەوە ڕێکنەکەوتن، ئەوا هەردووکیان بە دوو هێڵی تەریب وەك سکەی هێڵی شەمەندەفەر بۆ ئەو ئامانجە بکۆشن.

[1] مذكرات عبدالمنعم: 44-46.
[2] مذكرات عبدالمنعم: 46.
[3] مذكرات عبدالمنعم: 63-64.
[4] مذكرات عبدالمنعم: 64.
[5] هەمان سەرچاوە: 94.

عەبدولناسر بە عەبدولڕەئوفی ڕاگەیاند کە ئامانجی ئەو بریتیە لە: هەڵوەشاندنەوەی دەستووری پاشایەتی، وە جگە لەو ئەفسەرانەی کە لە برایانی موسڵمانن کۆمەڵێکی تر ئەفسەری هێناوەتە نێو ڕێکخستنەوە ـ بەبێ ئاگاداری سەرکردایەتی ڕێکخستنی برایان وەك: سەلاح سالمو عەبدولحەکیم عامر[1]، لە دوای چەند مانگێك مەحمود لەبیب نەخۆش کەوتو تووشی ئیفلیجی بوو، نەیدەتوانی قسە بکاتو لەسەر جێگە کەوت، عەبدولڕەئوفی تێکۆشەر مەحمود لەبیبی سەرکردەی خۆی لەو جیاوازییەی نێوان خۆیو عەبدولناسر ئاگادار کردەوە، ڕاوبۆچوونە نوێکانی عەبدولناسری بۆ ڕوونکردەوە.

لە ساڵی 1950دا کۆچی دوایی کرد لە کاتێکدا زۆرێك لە نهێنیو شتومەكو ئابوونەو ئەڵقەکانی ڕێکخستنی برایانی لابوو.[2]

## عەبدولناسر دەست بەسەر نهێنیەکانی ڕێکخستنی برایاندا دەگرێت

عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوف سەفەری کرد بۆ شوێنی کارکردنی لە سینا، مەحمود لەبیب چاوەڕێی مردنی دەکرد، : حسین حەمودە کە یەکێك بوو لە ئەفسەرانی برایان دەگێڕێتەوە کە لە دوای سەفەرەکەی عەبدولڕەئوف جەمال عەبدولناسر چی دەکرد، دەڵێت: (پێش وەفاتی مەحمود لەبیب سەردانم کرد، بینیم کە جەمال عەبدولناسری لەلایە، بە منو بە عەبدولناسری وت: من دەمرم، یاداشتنامەیەك دەنووسم بە ناوی ئەفسەرانی برایانەوە، لیستێکیش دەکەم بۆ ئەو ئابوونانەی کە لای منە، هەمووی دەدەمە دەست عەبدولناسر، تاکو ڕێکخستنی برایان بۆ ئەفسەران هەر بەردەوام بێت، داوای لە عەبدولناسرو عەبدولڕەئوف کرد کە هاوکاری یەکتربکەن.

کاتێك مەحمود لەبیب گیانی سپارد، عەبدولناسر و حسەین حەمودە بەشداری ناشتنی تەرمەکەیان کرد، عەبدولناسربۆ حەمودە دانی بەوەدا ناوە کە پێش وەفاتی حەمودە نهێنیو ناوو سامانی ڕێکخستنی برایانی ئەفسەر کە ناسرابوو بە (**الضباط الاحرار**)ی لە مەحمود لەبیب وەرگرتووە.

دوای ماوەیەك، عەبدولناسر بە حەمودەی وت: کە ئەو ـ واتە عەبدولناسر ـ کۆمەڵێك ئەفسەری تر دەهێنێتە ناو ڕێکستنەکانەوە کە لە ئەفسەرانی برایان نین.

ئیعلانی جیاکردنەوەی ڕێکخستنی ئەفسەرانی لە کۆمەڵی برایانی موسڵمان کردو پێی گوت: بە مردنی حەسەن بەناو مەحمود لەبیب پەیوەندی برایانی ئەفسەر پچڕاوە لەگەڵ ئەفسەرانی سوپا.

عەبدولناسر وادەبینێت کە ـ بۆ مەبەستی ئەمنی ـ پەیوەندی بپچڕێت لەگەڵ عەبدوڕەحمان سندی سەرۆکی دەزگای نهێنی مەدەنی برایانی موسڵمان (**الجهاز السري المدني للأخوان المسلمين**).[3]

جەمال عەبدولناسر لە دوای ساڵی 1950وە ڕێکخستنی ئەفسرانی ئازادی جیاکردەوەو، لە سەرکردایەتی برایانی موسڵمانی دابڕی، چەندین ئەفسەری نا ئیخوانی هێنایە ناویەوە کە خاوەنی ڕەفتاری ناشرین بوون، خاوەنی ڕەوشتی بەرز نەبوون وەك: عەبدولحەکیم عامرو زەکریا محێدینو سەلاح سالمو جەمال سالمو کەسانی تریش.

---

[1] هەمان سەرچاوە: 65.

[2] هەمان سەرچاوە: 65.

[3] هەمان سەرچاوە: 65-66.

[4] أسرار حركة الضباط الاحرار والاخوان المسلمون: حسين حمودة، 150-151.

لە بەرامبەر ئەم ڕەفتارەدا سەرکردایەتی برایانی موسڵمان وای بەباش زانی کە ئەفسەرە ئیخوانەکان لە ڕێگەی ئابوونەو ئوسرەو هێڵەکانی تری پەیوەستبوونەوە پەیوەندی بکەنەوە بە کۆمەڵی برایانەوەو بەردەوامی بە پەیوەندیەکانیان بدەن.

سەرکردایەتیەکی تایبەتی بۆ دیاری کردن کە پیوەست بوو بە سەرکردایەتی برایانەوە، بەوپێیەی کە عەبدولناسر لە سەرکردایەتی برایان جیابووبوویەوە، بەوەی کە عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوف لە سینا بوو، بەهۆی گرفتەوە نەیدەتوانی سەرکردایەتی ئەو کارە بگرێتە دەستو کارەکانیان ڕاپەڕێنیٚ، مەکتەبی ئیرشاد ئەرکی سەرکردایەتیکردنی ئەفسەرانی سوپای سپارد بە موقەدەم ئەرکانی سوپا ئەبومەکاریم عەبدولحەی.[1]

لەم باسە کورتەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازاد ـ کە لە ساڵی 1952 لە میسردا هەستا بە شۆڕش ـ لە بنچینەوە ڕێکخستنێکیئیخوانی بوو، بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە ئیخوانی مایەوە، لە ساڵی دامەزراندنیەوەولە 1946 تا ئەوکاتەی عەبدولناسر لە ساڵی 1950 ئەو ڕێکخستنەی لە ڕێکخستنی برایان دابڕی.

لەگەڵ ئەمەدا برا ئەفسەرەکان لەنێو ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازاددا بە ئامادەییو کاریگەریو بەهێزیو تایبەتمەنداری خۆیانەوە مانەوە لەکاتێکدا عەبدولناسر جیای کردبووەوە لە ڕێکخستنی برایان، چەندین ئەفسەری چالاکی برایانی تێدا مایەوە، وەك: کەمالەدین حسەینو حسەین حەموودەو سەلاح خەلیفەو کەسانی تر، ئەمە جیا لەو ڕێکخستنە ئیخوانیە نوێیەی بۆ ئەفسەرانیان پێکهێنابوو کە ڕێکخستنێکی جیابوو لە ئەفسەرانی ئازاد، کە ئەفسەری ئیخوانی ئەبو مکارم عەبدولحەی سەرۆکایەتی ئەکرد.

تا دوارۆژەکانی خۆئامادەکردن بۆ شۆڕش، عەبدولناسر پەیوەندی ئەکرد بە سەرکردایەتی برایانەوە، وای دەردەخست کە بەردەوامە لەسەر لایەنگری بۆ برایانو هەر سەر بەوانە، وە ئەو ئەفسەرە نائیخوانیانەی کە هێناویەتیە ناو ڕێکخستنی ئەفسەرانەوە ئەوە ناگەیەنیٚ کە دابڕابێتو پچڕابێت لە ئەندامێتی کۆمەڵی برایانی موسڵمان!!.

### عەبدولناسر لە ڕێگەیەکی نوێوە پەیوەندی بە سەرکردایەتی برایانەوە دەکاتەوە

عەبدولناسر دەیویست پەیوەندیەکی ڕوکەشیو خەیاڵی لە نێوان ئەوو سەرکردایەتی نوێی برایاندا بهێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازادی جیاکردبووەوەو دایبڕی بوو لە ڕێکخستنی برایان، خۆی بە تەنها سەرۆکایەتیو چاودێری دەکرد!!.

پەیوەندیە ڕاستەقینەو سەرەکیەکەی لەڕێگە یاساییەکەیەی خۆیەوە پچڕا کە ڕێگەی عەبدولمونعیم عەبدولڕەئوفو حسەین حەمود بوو، کەسانێکی تری ئەفسەر مابوون کە پەیوەستبوون بەو بەیعەتەی کە دابوویان. . .

ئەوان دەیانزانی ئامانجە تازەکانی عەبدولناسر چیەو، ئاگاداری ئەو گۆڕانکاریە نوێیانەش بوون کە عەبدولناسر بەسەر ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازاددا هێنابوی!.

<u>عەبدولناسر لە ڕێگەیەکی نوێوە پەیوەندی کرد بە سەرکردایەتی برایانەوە. ئەویش ڕێگەی (سلاح شادی) بوو –ڕەحمەتی خوای لێبێت –کە ئەفسەرێکی ئیخوانی بوو!!.</u>

شادی لە کتێبەکەیدا (صفحات من التأریخ) ئەگێڕێتەوە کە لە کۆتایی ساڵی 1950داو دوای وەفاتی مەحمود لەبیب برای ئەفسەر عەبدولفەتاح غەنیم هاتووە بۆ لای ئەمو پێی ڕاگەیاندووە کە عەبدولناسر ئارەزوومەندە سەرلەنویٚ پەیوەندی بە برایانەوە بکاتەوە. سەلاح شادی ئەمەی بە شەهید عەبدولقادر عەودە ڕاگەیاند، عەودەش ئەم کارەی بە شادی سپارد کە لە ڕێگەی ئەوەوە ئەم پەیوەندیە گریٚ بدرێتەوە!.

یەکەم پەیوەندیکردن لە نێوان شادیو عەبدولناسردا لە نووسینگەی پارێزەر حسەین عشماوی ئەنجامدرا، پاشان پەیوەندی عەبدولناسر بە سەرکردایەتی برایانەوە لە ڕێگەی شادیەوە بەردەوامی وەرگرت!.[2]

---

[1] هەمان سەرچاوە: 67.
[2] صفحات من التأريخ: صلاح شادي 122.

بەمەش جەمال عەبدولناسر دەرباز بوو لەو ئەفسەرە ئیخوانیانەی کە عەبدولناسریان دەناسی، حەزەریان دەکرد لەوگۆڕانکاریە کتوپڕانەی کە بەسەر فکری عەبدولناسردا دێت، دەیانزانی کە ئارەزومەندی دابڕینی ڕێکخستنی ئەفسەرانە لە ڕێکخستنی برایان: وەك عەبدولمونعیم عەبدولرەئوفو حسەین حەمودە.

بەم شێوەیە ڕاستی نیەتو مەبەستە شاراوەکانی عەبدولناسر لەم تیمە نوێیەدا ـ شادیو براکانی ـ شارایەوەو خەفەبوو، هۆشیار نەبوونەوە بەلای فڕوفێڵو تەڵەکەکانیدا، تێبینی ئەوەیان نەدەکرد کە عەبدولناسر ئەم پەیوەندیە ئەقۆزێتەوە. لەبەر ئەوە پەیمانو بەڵێنەکانی عەبدولناسریان لە ڕووی قسەو گوفتارە دەرەکیەکانیەوە وەرگرت.

کۆمەڵێك لە برایانی بەڕێز لەسەر ئەم هێڵە نوێیە پەیوەندییان لەگەڵ عەبدولناسر گرێدا کە بریتی بوون لە: سەلاح شادی، حسەین عشماوی، عەبدولقادر حلمی، فەرید عەبدولخالق، سەلاح ئەبو ڕەقیق.[1]

## عەبدولناسر پەیمانەکەی لەگەڵ برایاندا ئەشکێنێ

پەیوەندی لەنێوان لیژنەی نوێی برایان و عەبدولناسرو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لە ئەفسەرانی برایان بەردەوامبوو، لە ڕۆژەکانی دواییداو لە پێش هەڵگیرسانی شۆڕش پەیوەندیەکان زیادیان کرد، لیژنەکە هەموو ئەو شتانەی کە لە نێوان ئەوانو عەبدولناسردا ڕوویدەدا دەیگەیاندە ڕابەری گشتی حەسەن هوزەیبی بەڕەحمەت بێت.

عەبدولقادر حیلمی دەگێڕێتەوە، کە لیژنە ئیخوانیە پەیوەندیدارەکە بە عەبدولناسرەوە، کۆتا ئەنجام کە پێی گەیشت ختیە بەردەست حەسەن هوزەیبی ئەمەش لەپێش هەڵگیرسانی شۆڕشدا، وە ڕابەری گشتی بیروڕای خۆی سەبارەت بە عەبدولناسر بۆ لیژنەکە دەربڕی، ژمارەیەك پرسیاری ئاڕاستەی لیژنەکە کرد سەبارەت بە عەبدولناسرو کۆمەڵەکەی (گرنگترینیان: ئەو ئەفسەرانە تا چەندە پەیوەستن بە ئیسلامەوە؟، چەندە دڵسۆزییان هەیە بۆ وتەکەیان کە دەڵێن کاردەکەن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی شەریعەتی ئیسلامی؟، ئایا ڕێکەوتنەکە بە ئاشکراییو ڕوونیو ڕاشکاوانە تەواوبوو، ئایا ڕێکەوتوون لەسەر بەشداری تەواو لە نێوان برایانو ئەفسەرانی ئازاد لەکودەتاکەدا، وەلە بەرپرسیاریان لە بەرامبەریداو لەهاوکارییان لە جێبەجێکردنیدا لەدوای سەرکەوتنەوە. ؟ لە کۆتاییدا ڕابەری گشتی ڕەزامەندی خۆی پیشاندا بەو دوو مەرجەی پێشەوە. . .

ئەم برایانە ڕەزامەندیەکەی ڕابەری گشتیان وەرگرت، لە ماڵی عەبدولقادر حلمی بە عەبدولناسر گەیشتن، حلمی هەندێك لەو شتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەو چاوپێکەوتنەدا ڕوویداوە، دەڵێت: (لەگەڵ جەمال عەبدولناسردا کۆبووینەوە، بیروبۆچوونی ڕابەری گشتیم بۆ ڕوونکردەوە بە دوورودرێژی، عەبدولناسریش هەموو مەترسیەکانی ڕابەری گشتی بە ڕاست لە قەڵەمدا، تەئکیدی لەسەر وەرگرتنیان کردەوە، پێشتر لەسەر ئەو خاڵانە ڕێکەوتبوو لەگەڵ ئێمە. . . )!!. لە هەمان شوێنو لە هەمان کاتدا لە 22/تەموزی/1952 لە ماڵی عەبدولقادر حلمی دووبەدوو سەلاح شادی لەگەڵ عەبدولناسر بۆ ماوەیەکی کورت کۆبوویەوە (لەم چاوپێکەوتنەدا یادی پەیمانەکەی پێشوویان کردەوە لەسەر بیروباوەڕو ئامانجەکان، کە پێش هاتنە پێشەوەیان بۆ ئەم هەنگاوە چارەنووسسازە پەیمانیان دابوو بە خوای گەورە لەسەری، ، خوایان بە شاهید گرت لەسەر ئەم پەیمانە بە خوێندنی سورەتی ئەلفاتیحە. . . ).[2]

شۆڕش لە 23/تەموزی/1952دا بە ڕێکخستنێکی گەورە لە نێوان برایانی موسڵمانو عەبدولناسردا هەڵگیرسا، لە 30/تەموزی/1952دا یەکەم چاوپێکەوتن لە نێوان ڕابەری گشتی حەسەن هوزەیبیو عەبدولناسردا ڕوویدا لە ماڵی ساڵح ئەبو ڕەقیق کە یەکێك بوو لە ئەندامانی لیژنە پێنج کەسیەکەی برایان کە لەگەڵ عەبدولناسر ڕێکەوتبوون بە ئامادەبوونی هەر پێنج ئەندامی لیژنەکە.

ئەبو ڕەقیق دەگێڕێتەوە کە عەبدولناسر لەو چاوپێکەوتنەدا بەرپەرچی هەموو ڕێکەوتنو هاوکاریو پرسو ڕایەکی دایەوە و گوتی: (بەرپەرچی چاودێری هەر لایەنێك دەکەمەوە جگە لە شۆڕش): مامۆستا هوزەیبی سەری سوڕما لە قسەکەی

[1] الاخوان المسلمون: محمود عبدالحليم: 3، 133-135.
[2] صحفات من التأريخ: شادي، 176-177.

عەبدولناسر، رووی دەمی کردە حەسەن عشماوی و پێی وت: ئایا ڕێکەوتوون لەسەر بەشداری ئەی حەسەن؟ عشماوی وەلاٌ می دایەوە: بەڵێ ڕێکەوتین! بەلاٌم عەبدولناسر بە هوزەیبی وت: ئێمە لەسەر هیچ شتێك ڕێنەکەوتووین!!)[1].

پاشگەزبوونەوەی عەبدولناسر لەو ڕێککەوتنەی لە نێوانیاندا بوو، شتێکی کتوپڕ بوو بۆ هەر پێنج براکەو بۆ ڕابەری گشتیش، دانیشتنەکە بە مشتومڕێکی گەرم بەردەوام بوو، تا ڕابەری گشی بەم وتەیەی بۆ عەبدولناسر کۆتایی بە دانیشتنەکە هێنا: "گوێ بگرە ئەی جەمال! ڕێکەوتن نەهاتە بەرهەم. . بە جموجوولێکی ئیسلاٌحی داتان دەنێین. . ئەگەر چاکەتان کرد ئەوە چاکە بۆ ولاٌتەکەی خۆتان دەکەن. . ئەگەر هەڵەتان کرد ئەوە ئامۆژگاریتان ئاڕاستە دەکەین بەوەی کە خوای گەورە ڕازی دەکات. . ".

پاش ئەوەی عەبدولناسر چووە دەرەوە، هوزەیبی بە پێنج براکەی وت ـ وەك ئەوەی لە غەیبەوە ئاگادار کرابێ ـ: (ئەم پیاوە هیچ خێرێکی تێدا نیە، پێویستە دوورە پەرێزی لێبکرێ!!)[2].

پاشان ڕووداوەکان بەدوای یەکدا هاتن، ئەو کەلێنی جیاوازییەی لە نێوانی برایانی موسڵمانو عەبدولناسرو پیاوانی شۆڕشدا هەبوو فراوانتر بوو، تا سەرەنجام بە پچڕانی پەیوەندیو جیابوونەوەی تەواو لە نێوان هەردوولایەنەکەدا کۆتایی هات.

پاشان عەبدولناسر دەستیکرد بە پیلانگێڕان دژ بە برایان، ئەوەبوو شانۆگەریەکەی (المنشية)ی دروستکرد کە برایانی موسڵمانی پێ تاوانبار کرد بەوەی گوایە تەقەیان لێکردووەو ویستوویانە تیرۆری بکەن، بەم بیانووەوە قەسابخانەیەکی دلڕەقانەی لەناو زیندانەکانی میسردا بۆ برایانی موسڵمان داناو، چەندین کارەساتی یەك لەدوای یەکی بەسەردا هێنان!!.

بەم شێوەیە دەبینین کە چۆن ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازاد بە ئیخوانیەتێکی پاك دەستی پێکرد، چۆن برایان جەماوەریان ئامادەکرد بۆ شۆڕش بەهۆی ئەفسەرە ئیخوانەکانەوەو لەسەر دەستی ئەوان، چۆن عەبدولناسر کە ئەفسەرێکی متمانە پێکراو بوو لەلای برایان، ڕێکخستنەکەی لە ڕێکخستنی برایان دوورخستەوە، تا بە تەواوەتی ڕێکخستنی ئەفسەرانو شۆڕشی دابڕی لە برایان، وە بە خراپترین شێوەو شێواز بەگژی برایاندا چوویەوە. . . . !!!

## سەید قوتب و پیاوانی شۆڕش

چیرۆکی سەید قوتب لەگەڵ پیاوانی شۆڕشدا چیرۆکێکی سەیرە، بە هەوڵە ئیسلاٌحیەکانی سەید لەپێش شۆڕشەوە دەستپێدەکات، پاشان پەیوەندیکردنی هەندێ لە پیاوانی شۆڕش بە سەیدەوە بە ماوەیەکی کەم پێش هەڵگیرسانی. ئەفسەرەکانی لەسەر کتێبو بیروبۆچوونەکانی دەرسیان وەردەگرت، پاشان ڕێکەوتن لە نێوان سەیدو پیاوانی شۆڕشدا، چۆن ئەوان هەندێ ئەرکی ئیسلاٌحییان دابوو بەسەریدا، چۆن بەسەر سەیدقوتبیاندا هەڵدەداو ستایشیان دەکرد، پاشان چۆن چیرۆکەکەی لەگەڵ ئەوان بە جیابوونەوەی تەواو و دابڕانی تەواو لەگەڵیان کۆتایی پێهات، سەید بەتەواوی لایدایەوە بەلای برایانی موسڵماندا، تاکو هەموو ئەوەی لەسەر دەستی عەبدولناسر بەسەر برایانی موسڵماندا هات، بەسەر ئەمیشدا هات، پاشان عەبدولناسر لە سێدارەیدا!!.

### هەوڵەکانی سەید قوتب لە زەمینەسازیدا بۆ شۆڕش

ئەوەمان زانی کە سەید دوای گەڕانەوەی لە ئەمریکا ساڵی 1950 ڕویکردە فیکری ئیسلامیو کاری ئیسلامی گشتی.

خۆی یەکلایی کردەوە بۆ چاکسازی کۆمەلاٌیەتیو سیاسیو ئیسلامی، بانگەوازەچاکسازیەکەی لە ئیسلامەوە سەرچاوە پێگرت، دژایەتی دیاردەو بارودۆخە شێواوەکانی ناو کۆمەڵگای دەکرد.

وایلێهات بابەتی ئیسلاٌحی ئیسلامی بەهێزو توندوتیژی دەنووسیو لە هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەیەکدا بلاٌوی دەکردەوە کە بۆیان بلاٌوبکردایەتەوە.

---

[1] صحفات من التأريخ: 182.

[2] الاخوان المسلمون: محمود عبدالحليم/ 3، 240.

له دیارترین گۆڤاره ئیسلاَحیه‌کان که له پێش شۆڕشه‌وه ده‌رده‌چوون سێ گۆڤار بوون:

1- (**الاشتراكية**)ی ئه‌حمه‌د حسه‌ین سه‌رۆکی حزبی ئیشتراکی، که پێشتر ناوی (**مصر الفتاة**) بوو.

2- (اللواء الجديد)ی فه‌تحی رزوان، سه‌رۆکی حزبی نیشتمانی نوێ (**الوطن الجديد**).

3- (**الدعوة**)ی سالح عشماوی، وه‌کیلی کۆمه‌ڵی برایانی موسلمان.

سه‌ید چه‌ندین بابه‌تی به‌هێزی له‌م گۆڤارانه‌دا بلاوکرده‌وه، هه‌روه‌ها له چه‌ندین ڕۆژنامه‌و گۆڤاری تردا، وه‌ك: **الرسالة، روز اليوسف، الأهرام، المصور**، . . . هتد.

سه‌ید له‌و بابه‌تانه‌ی که له پێش شۆڕشدا ده‌ینووسین‌و بلاوی ده‌کردنه‌وه دژایه‌تی ڕابه‌رانی خراپه‌ولادانه‌کانی ده‌کرد له ژیانی کۆمه‌لاَیه‌تی‌و ئابوری‌و سیاسیدا، له‌سه‌روهه‌مووو خراپه‌کاره‌کانه‌وه هێرشی ده‌کرده سه‌ر به‌رپرسه‌کان به‌بێ ئه‌وه‌ی ناویان بهێنێ به‌تایبه‌تی کۆشکی پاشایه‌تی‌و ده‌ستو دایه‌ره‌که‌ی مه‌لیك فاروق و پیاوانی ولایه‌نه‌کان، هه‌روه‌ها گه‌وره سه‌رمایه‌دارو چینخوازه‌کان و، ئه‌ستێره‌کانی لادان‌و هه‌ڵوه‌شێنه‌رانی کۆمه‌ڵگا له هونه‌رمه‌نده ئافره‌تو پیاوه‌کان و، پیاوانی ئینگلیزو به‌کرێگیراوه فه‌ره‌نسی‌و ئه‌مریکیه‌کان و، . . . که‌س‌و لایه‌نی تری له‌م جۆره.

بابه‌ته توندەکانی سه‌ید سه‌رنجی جه‌ماوه‌ری ڕاکێشابوو، جێگه‌ی ڕێزلێنان بوو، دڵیانی که‌مه‌نکێش کردبوو.

ئه‌وه‌مان له‌بیر ناچێته‌وه که ئه‌م بابه‌تانه ئه‌شکه‌نجه‌و ئازاری زۆریان بۆسه‌یدبه‌دوای خۆیاندا ده‌هێنا، جاری وا هه‌بوو ده‌زگای (**الرقابة**) چاودێری بابه‌ته‌که‌ی ده‌کرت، ڕێگه‌ی نه‌ده‌دا ڕۆژنامه‌کان بلاوی بکه‌نه‌وه، جاری وا هه‌بوو سه‌ید بانگده‌کرا بۆ دادگایی کردن‌و وه‌لاَمدانه‌وه له‌سه‌ر بابه‌ته‌که‌ی، دوای ئه‌وه‌ی بلاوده‌کرایه‌وه، ئه‌مه‌ش له ده‌زگاکانی پۆلیس یان دادگاکاندا.

سه‌ید نووسین‌و چالاکیه‌کانی ڕۆژ به ڕۆژ زیادی ده‌کردو زیاتر هه‌ستی به ڕازی بوون ده‌کرد له تواناکانی‌و هه‌ستی ده‌کرد په‌یامێکی مه‌زن‌و ئامانجێکی پیرۆز ده‌چه‌سپێنێت.

به‌لاَم هاوه‌ڵ‌و براده‌رو خۆشه‌ویسته‌کانی به‌زه‌ییان پیایدا ده‌هاته‌وه، ده‌ترسان ڕووبه‌ڕووی مه‌ترسی له‌ناوچوون ببێته‌وه، ئاگاداریان ده‌کرده‌وه‌و داوایان لێده‌کرد که کاره‌کانی سووك بکات، ئه‌ویش وه‌لاَمی ده‌دانه‌وه‌و ئه‌و پاڵنه‌ره‌ی بۆ ڕوون ده‌کردنه‌وه که پاڵی پێوه‌ده‌نێت بۆ گه‌شه‌کردنی زیاترو زیاترکارئه‌نجامدان.

له بابه‌تێکدا به ناوی (**إنها العقيدة في الله**) ئاماژه‌ی کردووه به په‌رچدانه‌وه‌ی یه‌کێك له هاوه‌ڵه‌کانی کاتێك داوای که‌مکردنه‌وه‌ی کاری لێده‌کات‌و به‌زه‌یی پیایدا دێته‌وه، ئه‌م بابه‌ته‌ی له کتێبی (دراسات الاسلامیه)دا بلاَوکردۆته‌وه، ئه‌مه‌ش ده‌قی نامه‌ی هاوه‌ڵه‌که‌یه‌تی: (هاوه‌ڵه‌که‌ی پێی وت: ئه‌ی برام، ڕوخسه‌تم پێبده که پێت بڵێم: خه‌ریکه من لێت تێنه‌گه‌م، تۆش ئه‌ته‌وێت له ڕووی ته‌وژمه‌که‌دا بووه‌ستیت. . تۆ خۆت فڕێ ده‌ده‌یته ناو تیاچوونه‌وه به بێ پێشبینیکردن. . تۆ وه‌ك ئه‌وه‌ی بته‌وێت له ژیان رزگارت بێت هه‌ڵسوکه‌وت ده‌که‌یت. . پێم بڵێ: بۆ حسابی کێ خۆت ڕووبه‌ڕووی ئه‌م هه‌مووه ده‌که‌یته‌وه؟ ئه‌م گه‌له نه‌گه‌یشتووه‌ته ئاستێکی وا له هۆشیاریدا که له ئامانجه‌کانتدا شوێنت بکه‌ون، په‌ی به‌وه به‌رن که تۆ ده‌ته‌وێت.

تۆ ڕووبه‌ڕووی هێزێکی بێ وێنه‌ی داپلۆسه‌ر ده‌بیته‌وه، هێزێك له توانایدا هه‌یه ولاَتان‌و نه‌ته‌وه‌و گه‌لان داگیربکات، هێزێکی ڕاهێنراو، که به‌کرێگیراوی له هه‌موو شوێنێکدا هه‌یه، ده‌زگای خۆی هه‌یه که ڕاهاتوون له‌سه‌ر کارکردن. . ئه‌م هێزانه ده‌توانن له‌به‌رچاوی هاونیشتمانیه‌کانتدا بتکه‌نه مرۆڤێکی تۆمه‌تبار، ئه‌توانێت ته‌نانه‌ت داتبڕێت له سومعه‌ی خۆت، وه‌ك خائین بۆ خه‌ڵکی بتخاته‌ڕوو، هه‌زار شاهیدیش ده‌دۆزێته‌وه، هه‌زار ده‌زگای پڕوپاگه‌نده‌ی هه‌یه، که به شه‌وو ڕۆژ ده‌هۆڵی بۆ ده‌کوتن.

تۆ نه‌ده‌وڵه‌مه‌ندی‌و نه گه‌نجی، پیاوێکی به‌ره‌و پیری ده‌چیت. . تۆ پشتت نه‌داوه به هیچ گروپ‌و ده‌زگایه‌که‌وه. . تاهه‌رکاتێك بژێویت لێبڕا پێت ببه‌خشن، یان ببه‌خشن به‌سه‌ر که‌س‌و کارتدا کاتێك یارمه‌تی تۆیان لێبڕا. . . ).

سه‌ید قوتب به‌رپه‌رچی ئه‌م به‌زه‌یی پیاهاتنه‌وه‌و ئه‌م ئامۆژگاریانه‌ی هاوڕێ‌و هاوه‌ڵه‌که‌ی به‌م وته‌یه دایه‌وه: ئه‌ی برام، من هه‌ست به هه‌موو ئه‌م مه‌ترسیانه ده‌که‌م، هه‌موو ئه‌م مه‌ترسیانه ده‌بینم.[1]

[1] دراسات إسلامية: سيد قطب، 141-142.

کاتێك هاوەڵەکەی تۆمەتباری کرد بەوەی کە ئەو ئەیەوێت بمرێت، سەید پێی وت: ئەمەوێت بژیم، ئەمەوێت بژیم ژیانێکی دوورو درێژ، من تا هەنووکە لە ژیان تێر نەبووم، من ئەرکەکانم تەواو نەکردووە کەمێکی نەبێت، ئومێد دەکەم سەرکەوتووبم بۆ هەستان پێیان. . . شتێکی تریش: من ماوەیەك لە ژیانم لە خوای گەورە دوورکەوتمەوە، من هیوا ئەخوازم کە بژیم تا بە نزیکەی ئەوە لە تەمەنم ببەخشم بۆ هاوسەنگی کردنی تەرازووەکە. . . من لە کۆتاییدا ئەوەم بیرناچێت کە پیاوێکی خاوەن نارەحەتیم، مردنو ژیان غەیبن لە غەیبی خوای گەورە، ڕەوا نییە ئەم دوانە لە بیری هیچ کەسێکدا بێن کە بیەوێ ئەرك جێبەجێ بکات. یان خراپەیەك بگۆڕێت، یان بڕواتو بێت، تەنانەت لە بازرگانیو بژێویشدا. . . . )[1]

سەید لەو ڕاپۆرتەی کە لە ساڵی 1965دا پێشکەشی کردووە بە لێکۆڵەرەوەکان ئاماژەی بۆ هاوەڵەکانی کردووە لە چاکسازیدا لە ماوەی پێش هەڵگیرسانی شۆڕشدا: (لە ساڵی 1951دا من بە پێنووسو وتاردانو کۆبوونەوە لە ململانێیەکی توندا دژ بە هەلومەرجی پاشایەتی فەرمانڕەواو، دژ بە چینایەتیو سەرمایەداری ڕۆچووبووم، دوو کتێبم[2] لەم بابەتەدا دەرکرد، جگە لە سەدان بابەت لە ڕۆژنامەی حزبی (**الوطن الجديد**)و حزبی (**الاشتراكي**)و گۆڤاری (**الدعوة**) کە مامۆستا ساڵح عشماوی دەری دەکردوگۆڤاری (**الرسالة**)و، هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارێك کە پەسەندی بکردایە بۆم بڵاوبکاتەوە. . )[3].

## کاریگەری سەید لەسەر ئەفسەرانی سوپا، یان کاریگەربوونی ئەفسەرانی سوپا بە سەید

ئەفسەرە نیشتمان پەروەرەکانی سوپا ئەوانەی حەزیان لە ئیسلاحو گۆڕانکاری دەکرد، بە بابەتە ئیسلاحیە شۆڕشگێڕانە گۆڕانکاریەکانی سەید کاریگەربوون، هەرچی سەید بینووسیایە لە کتێبو بابەت ئەوان دەیانخوێندەوە.

سەرکردایەتی ڕێکخستنی نهێنی داوای لە ئەفسەرەکانی کرد کە بابەتەکانی سەید بخوێننەوەو خۆیان بە کتێبە فکریە ئیسلامیەکانی ڕۆشنبیر بکەن.

یەکەم کتێبی فیکریی سەید (**العدالة الاجتماعية في الاسلام**) بوو کە لە یەکەمین ئەو کتێبانە بوو ئەفسەرانی ئازاد دەیانخوێندەوەو لە کۆبوونەوە نهێنیەکاندا لێی دەکۆڵانەوە.

هەندێکیان سەیدیان ئەچواند بە پیاوی فەرەنسی بەناوبانگ (میرابۆ) کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینی لە سازدانی شۆڕشی فەرەنسیدا، نازناوی (میرابۆی شۆڕشی میسری)یان بری بوو بەسەریدا!!.

## سەید لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕش لە پێش هەڵگیرسانیدا

لە دیاردەکانی ڕێزگرتنی ئەفسەرانی شۆڕشو سەرکردەکانی بۆ سەید قوتب پێش هەڵگیرسانی، ئەوەبوو ئەو سەرکردایەتیە بە سەرۆکایەتی عەبدولناسر پلەوپایەی سەیدیان دەزانی، لەبەر ئەوە گەورە ئەفسەرانی سوپا ئەهاتن بۆ ماڵەکەی لە حەلوان. پرسو ڕایان پێدەکرد لە سازدانی شۆڕشدا. لەگەڵیدا لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی دەکۆڵینەوە!.

سلیمان فەیاز بۆمان دەگێڕێتەوە لە بابەتی (**سيد قطب بين النقد الأدبي وجاهلية القرن العشرين**) لە گۆڤاری (**الهلال**)دا کە سەردانی سەیدی کردووە لە ماڵی خۆی لە حەلوان دوای هەڵگیرسانی شۆڕش، لەوبارەیەوە ئەم وتوێژەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە نێوان ئەوو سەید قوتبدا لە باخچەی ماڵەکەیدا ڕوویداوە: (پرسیارم لێکرد سەبارەت بە بیروڕای بەرامبەر ئەم شۆڕشە؟

زەردەخەنەیەکی کردو پێی وتم: لێرەو لەژێر ئەم دارەدا ئەفسەرانی ئازاد لە کاتی خۆسازدان بۆ شۆڕشدا هەندێ لە کۆبوونەوەکانیانی خۆیان لەگەڵ مندا گرێدا، .

---

[1] دراسات إسلامية: سيد قطب، 144.

[2] (معركة الاسلام والرأسمالية)و کتێبی (الاسلام والسلام العالمية.

[3] لماذا أعدموني: 11.

پاشان سەید چووەماڵەوە، گەڕایەوەو زەرفێکی لەگەڵ خۆی هێناو چەند وێنەیەکی لێ دەرهێنا، یەکە یەکە وێنەکانی پیشانی مندا کە لە هەموو وێنەکاندا سەیدی تێدابوو، وێنەکان لە ژێر ئەو دارەدا گیرابوونو هەمووشیان وێنەی شەو بوون، کە لە ژێر ڕووناکی فلاشدا گیرابوون، لە هەموو وێنەکاندا ئەفسەرە ئازادەکانی تێدابوو، ئەو هەمیشە لە ناوەڕاستی دانیشتنەکاندا بوو!!، دوای ئەوەی کۆتا وێنەم دایەوەدەستی، وتم: محەممەد نەجیب لە نێویاندا نابینم؟

وتی: ئەمیان وەك واجیهەیەك هێنا بۆ شۆڕش، پلەی سەربازی حسابێکی هەیە!.

پاشان ئاماژەی بۆ وێنەی جەمال عەبدولناسر کردو وتی: ئا ئەوە سەرۆکی ڕاستەقینەی شۆڕشە، ئێستا بە دوای نەجیبدا وێڵە، سبەینێش بە جۆرێکی تر دەبێت!!.

پێموت: ئایا تۆ ڕازیت لەم شۆڕشە؟

وتی: لە بەرەوپێشچوونی ئیشوکارەکانیدا شتێك نابینم دڵخۆشکەر بێت!، ئەم ئەمریکاییانە لە بری ئینگلیز هەوڵی قۆستنەوەی دەدەن!، تێدەگەیت چیم مەبەستە. . . )[1].

لەبارەی ئامادەبوونی ئەفسەرانی ئازادەوە بۆ ماڵی سەید قوتب تاکو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن سەبارەت بە هۆکارەکانی سەرکەوتنی شۆڕش، یەکێك لە ئەفسەرانی برایانی موسڵمان بە ناوی مەحمودئەلعەزب لە پۆرسەعیدەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (بەڕاستی مامۆستاو پێشەنگەکەمان کە چاودێری شۆڕشی کرد سەید قوتب بوو، بە کۆڕپەلەییو لەدوای لەدایکبوونیشی فەرمانی پێدەکردین کە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین. . .

ناگونجێ سوپا ئەوە لەبیر بکات کە سەید قوتب باوکی شۆڕش بوو، باوکی شۆڕشگێڕان بوو، خۆ بەکەمزانینەکەی زیاتر ئێمەی پەیوەست کردبوو پێوەی، زیاتر بە بەگەورەمان دەگرت.

مەحمود عەزب بەردەوام دەبێت لەسەر گێڕانەوەکانیو دەڵێت: چەند ڕۆژێك پێش شۆڕش، لە سەید قوتبەوە فەرمانێکمان پێگەشت کە ئامادەباش بین، من بەرپرسی ڕێکخستنی پۆرسەعید بووم، کاتێك فەرمانەکەم پێگەیشت، چووم بۆ قاهیرە، ڕۆشتم بۆ ماڵی مامۆستا سەید، ئەمەش لە 19/تەمموزی/1952دا، هەندێك لە سەرکردەکانی شۆڕش لەلای بوون ـ لە نێوانیاندا جەمال عەبدولناسر ـ سەید ئەوەی بۆ باسکردم کە منو ئەوەی لەگەڵمدایە بەتەواوی ئامادەبین، دەبێت برایانی مەدەنی ئەوانیش ئامادەبن، ئەگەر گوێمان لە دەنگی هەڵگیرسانی شۆڕشەوە بوو، دەبێت ئێمە پارێزەرانی بین، ئاگاداری کردینەوە لە خوێن نەڕشتن!)[2].

## سەید لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕش لە پاش هەڵگیرسانیدا

بەپێی پەیوەندیە بەهێزەکانی سەید بە سەرکردەکانی شۆڕشەوە لەپێش هەڵگیرسانیدا، شتێکی مەنتیقیە ئەم پەیوەندیە لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕش زیاد بکاتو پتەوتر بێت، ڕێزگرتنی ئەوان لە سەید زیاد بکاتو کاری ئیسلاحی پێ ڕاسپێرن.

پاڵپشتیکردنی سەید بۆ شۆڕش لە کاتی هەڵگیرسانیدا بەهێز بوو، حەماسەتی سەید بۆی بەرز بوو. مامۆستا ئەحمەد عەبدولعەزیز عەتار دەڵێت: (ڕێزگرتنی شۆڕش بۆ سەیدو پێزانینی بۆ جوانیو فەزڵی سەید لە ئاستێکدابوو کە هەموو ئەندامێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بە دەوریدا کۆدەبوونەوە، لە زۆربەی کارەکاندا دەگەڕانەوە بۆ لای، تەنانەت ئەو یەکەم کەسێکی مەدەنی بوو کە هەندێ جار ئامادەی دانیشتنەکانی ئەنجومەن دەبوو، ئەوانیش لە ماڵەکەی خۆی لە حەلوان سەریان لێدەدا)[3].

---

[1] ڕۆژنامەی (اللواء)ی ئوردنی، ژمارە696، 1986/9/10.

[2] گۆڤاری (كلمة الحق): 38.

[3] هەمان سەرچاوە: ساڵی یەکەم، صفر1387، لاپەڕە 37.

ئەحمەد عەتار باسی هەندێ لەو کارانە دەکات کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆڕش بە سەیدی سپارد و دەڵێت: (ئەنجومەنی شۆڕش بڕیاریدا ـ بڕیارەکەشی لە گۆڤاری (آخر الساعة) بلاوی کردەوە ـ کە پلەی وەزیری مەعاریف بدرێتە سەید وەك لەبیرمبێت، بەڵام سەید قوتب داوای لێبوردنی کرد!.

تکایان لێکرد کە پلەی بەڕێوەبەرایەتی ئیزگە بگرێتە ئەستۆ، داوای لێبوردنی کرد!. لە کۆتاییدا ڕازی بوو لەسەر وەرگرتنی پۆستی سکرتێری گشتی دەزگای تەحریر، چەند مانگێك تیایدا مایەوە. . .

جیاوازی لە نێوان سەید قوتبو عەبدولناسرو هاوەڵەکانیدا دەستی پێکرد، سەید ناچار کرا بۆ دەستکێشانەوە لە دەزگای تەحریر)[1].

بەڵام عادل حەمودە لە کتێبەکەیدا (سيد قطب من القرية الى المشنقة)دا باسی هەندێ لەو کارانە دەکات کە ئەنجومەنی شۆڕش سپاردی بە سەیدو دەڵێت: (ئەوانەی لەگەڵ ڕۆژەکانی یەکەمی شۆڕشدا ژیاون، دڵنیامان دەکەن کە سەید قوتب نووسینگەیەکی لە بینای ئەنجومەنی شۆڕشدا هەبوو، لەو نووسینگەیەدا ئەمایەوە، مانەوەیەکی شێوە هەمیشەیی، چونکە ئەرکی پڕۆگرامەکانی فێرکردن بەمو بە محەمەد سەعید ئەلعوریان سپێردرابوو. .

هەر لەو کاتەدا کەمالەدین حسەینی لە نزیکەوە ناسی کە هەڵیبژارد بۆ ئەوەی پلەی وەزیری پەروەردەو فێرکردن وەربگرێت کە ئەو خۆی وەری گرتبوو. . . )[2].

## محەممەد قوتب پەیوەندیەکەیانی سەید بە پیاوانی شۆڕشەوە دەگێڕێتەوە

گۆڤاری (الغرباء) دیمانەیەکی لەگەڵ محەممەد قوتبدا سازدا، لەو پرسیارانەی کە ئاراستەی کرد: پەیوەندی سەید قوتب بوو بە پیاوانی شۆڕشەوە لەکاتی هەڵگیرسانیدا.

لە وەڵامی محەممەد قوتبدا هاتووە: (بەڵێ لە مانگەکانی یەکەمیدا پەیوەندیەکی شەخسی هەبوو پێیانەوە، کاتێك بانگهێشتیان کرد بۆ ئەوەی ببێتە ڕاوێژکاری شۆڕش لە ئیشوکاری ناوخۆدا، ئەویش ماوەیەك کاری لەگەڵ کردن، بەڵام لە یەکەم ساتدا ـ ناڵێم لە هەفتەی یەکەمەوە بەڵکو لە ڕۆژی یەکەمەوە ـ دژایەتی شۆڕشی بۆ کۆمەڵی برایانی موسڵمان بۆ ڕونبوویەوە، ئەویش هەوڵیدا لە نێوان هەردوو لایەنەکەدا گونجاندن بکات بەڵام زۆری نەخایاند بۆی دەرکەوت هیچ ڕێگایەك بۆ گونجاندن نیەو، پەیوەندی لەگەڵیاندا پچڕاند.

ئەم ماوەیە سێ مانگی خایاندو پەیوەندی ئەم لەگەڵ پیاوانی شۆڕش پەیوەندیەکی پتەوو تەواو بوو. پاشان پچڕانەکەی پلە بە پلە بوو، تا گەشتە پچڕانی تەواو دوای نزیکەی دوو مانگی تر)[3].

بەڵام سەید خۆی لەبەردەم لێکۆڵەرەوەکانیدا سەبارەت بە پەیوەندی بە پیاوانی شۆڕشەوە لە کاتی هەڵگیرسانیدا دەڵێت: (قاڵبووم لە کارکردن لەگەڵ پیاوانی شۆڕش لە 23 یۆلیۆ تا شوباتی 1953 تا ئەوکاتەی جیاوازی کەوتە نێوان بیرکردنەوەی منو ئەوان سەبارەت بە دەزگای تەحریرو پڕۆگرامی پێکهێنانی و، بەدەوری مەسەلەی تردا کە ئەوکاتە هەبوو، کە پێویست بە درێژکردنەوە ناکات)[4]. بەڵام سەبارەت بە کاتژمێرەکانی کارکردن لەگەڵیان دەڵێت: (من ڕۆژانە زیاتر لە 12 کاتژمێر کارم لەگەڵ دەکردن، نزیك لە پیاوانی شۆڕشەوە، لەگەڵیاندا، وە لەگەڵ ئەوانەی لە چواردەوریاندا بوون).

---

[1] هەمان سەرچاوە: 39

[2] سيد قطب من القرية الى المنشقة: 11.

[3] گۆڤاری (الغرباء) ساڵی 13، ژمارە1972/3، لاپەڕە 12.

[4] هەمان سەرچاوە: 13.

## ئاهەنگی ڕێزلێنانی سەید قوتب لەلایەن پیاوانی شۆڕشەوە

پیاوانی شۆڕش ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی گەورەیان بۆ سەید سازدا، تیایدا ستایشێکی گەورەی سەیدیان کردو زۆرێکیان بەسەردا هەڵدا.

مامۆستا ئەحمەد عەبدولغەفور عەتار یاوەری سەید ئامادەی ئاهەنگەکە بوو، لە گۆڤارەکەیدا (**كلمة الحق**) هەندێ لە ڕوداوەکانی ئاهەنگەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە.

ئاهەنگەکە لە بنچینەدا گوتارێك بوو دەسەڵاتدارانی شۆڕش بانگهێشتی سەیدیان کردبوو بۆ پێشکەشکردنی لە یانەی ئەفسەران (**الزمالك**)، ناوی گوتارەکەیان نابوو (**التحرير الفكري والروحي في الاسلام**) ئەمەش دوای چەند مانگێك لە هەڵگیرسانی شۆڕش، واتە لە مانگی ئابی 1952دا.

سەید لە وادەی دیاری کراودا ـ بەیاوەری ئەحمەد عەتار ـ ڕۆیشت بۆ پێشکەشکردنی بابەتەکەی، ئەحمەد عەتار دەڵێت: (لە کاتی دیاریکراودا لەگەڵیدا ئامادەبووم، یانەکە قەرەباڵغ بوو بە باخچەکانیو شوێنە فراوانەکەی، کۆمەڵێکی زۆر لە جەماوەر ئامادە بوون، زۆرێك لە پیاوانی سیاسیو گەورە پلەدارانی ئەدەبو فیکرو یاساو شەریعەو مامۆستایانی زانکۆو کۆلێژو پەیمانگاکان ئامادەبوون.

بڕیار وابوو **محەمەد** نەجیب ئامادەبێت، ئەو سەید پێشکەش بکات، بەڵام عوزرێکی ڕێگر وای لێکرد نەتوانێت ئامادەبێت، نامەیەکی نارد کە بەسەر ئامادەبوواندا خوێندرایەوە، کە یەکێك لە ئەفسەرەکان خوێندیەوە. . . کورتەی وتەکەی **محەمەد** نەجیب ئەوەبوو: کە ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی ئامادەبێت. سوود لە زانیاری سەید وەربگرێت، وەسفی سەیدی کردبوو بە **ڕابەرو مامۆستاو سەرپەرشتیاری شۆڕش**. **محەمەد** نەجیب نامەکەی بە ئەنوەر ساداتدا ناردو عەبدولناسر خوێندیەوە!!.

ئەفسەران موحازەرەکەیان کردە بۆنەیەك بۆ ئاهەنگ گێڕان. . . لەبری ئەوەی سەید وتاریان بۆ بدات، وتارخوێنەکان دەستیانکرد بە وتاردان دەربارەی سەیدو ستایشکردنی، ئەویش دانیشتبوو!.

یەکێك لە ئەفسەرەکان ئاهەنگەکەی بە چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز کردەوە. یەکێکی تر لە گەورە ئەفسەران وتی: (بڕیاروابوو سەرۆك **محەمەد** نەجیب هەڵبستێت بە پێشکەشکردنی مامۆستای گەورە، ڕائیدی شۆڕشە پیرۆزەکەمان، بیریاری ئیسلامی یەکەم لە چەرخەکەماندا مامۆستا سەید قوتب. بەڵام فەرمانێك ڕێی لە ئامادەبوونی گرت. . . داوای لە من کردووە کە مامۆستا سەید قوتب پێشکەش بکەم، ئەگەرچی پێویستی بە پێشکەش کردنو پێویستی بە ناساندن نیە).

دکتۆر تەها حسین ئامادەی ئاهەنگەکە بوو، هەستاو وتەیەکی جوانی پێشکەش کرد، تیایدا وتی: (دوو سیفەت لە سەید قوتبدا هەیە بریتین لە: نموونەییو سەرسەختی، باسی سەیدو ئەدەبو زانیاریەکەیو ڕۆشنبیریو بەرێزیەکەیو گەورەییو تێگەشتنی بۆ ئیسلام کرد. . . باسی کاریگەریی سەیدی لەسەرشۆڕشو پیاوانی کرد. تەها حسین بەمە کۆتایی بە قسەکانی هێنا: سەید قوتب لە ئەدەبدا گەیشتە لوتکەو سەرکردایەتی، لە خزمەتی میسرو عەرەبو ئیسلامدا گەیشتە لوتکەو سەرکردایەتی! پاشان سەید قوتب هەستاو وتەیەکی زارەکی پێشکەش کرد لە نێوەندی چەپڵەی چەپڵەلێدەرانو هوتافی هوتافکێشاندا!. دەربارەی شۆڕش وتی: ( شۆڕش بە ڕاستی دەستی پێکرد، بۆ ئێمە نیە ستایشی بکەینو پیایدا هەڵبدەین، چونکە تا ئێستا هیچ کارێکی نەکردووە ـ شایانی باس بێت ـ، ڕۆیشتنە دەرەوەی پاشا ئامانجی شۆڕش نەبوو، بەڵکو ئامانج لە شۆڕشەکەدا گەڕانەوە بوو بۆ وڵاتو بۆ ئیسلام. . . ).

پاشان سەید وتی: (من لەسەردەمی پاشایەتیدا، لە هەموو چرکەیەکدا لە ڕووی دەروونیەوە ئامادەبووم بۆ زیندانی کردن، لەم سەردەمەشدا لەخۆم دڵنیا نیم، من لەم سەردەمەشدا لە ڕووی دەروونیەوە زیاتر لەمەوپێش ئامادەم بۆ زیندان و بۆ جگە لە زیندانیش!).

لێرەدا جەمال عەبدولناسر هەستایەیوەو بە دەنگە بەرزە دیارەکەی وتی: (برای گەورەم سەید، وەڵڵا، دەستیان پێت ناگات بەسەر جەستەکانی ئێمەدا نەبێت، جەستانێکی بێگیان، پەیمانت دەدەینێ بەناوی خواوە، بەڵکو پەیمانت بۆ نوێ دەکەینەوە، کە ئێمە قوربانی تۆ بین تا مردن!!!).

خەڵکی چەپڵەیەکی توندی بەردەوامیان لێدا، لەگەڵ هوتاف کێشانی یەك لەدوای یەك بە ژیانی سەید قوتب، پاشان ئەفسەر مەحمود غەریب هەستاو قسەی کرد دەربارەی ڕۆڵی سەید لە زەمینەسازیدا بۆ شۆڕش، دەربارەی ئامادەبوونی لە ماڵی سەید لەپێش شۆڕشدا، دەربارەی ئەو کەسانە کەلەلای سەید بینیونی، جگە لە عەبدولناسر پیاوانو ئەفسەرانی تری شۆڕشی لەوێ بینیوە!!.

تێڕوانینی پیاوانی شۆڕشی ڕوونکردەوە بەرامبەر سەید، دەربارەی سەید. پاشان مامۆستا ئەحمەد غەفور عەتار هەستایەوەو لەسەر وتەکانی تەها حسین، دەربارەی سەید سەرنجی خۆی دەربڕیو وتی: (سەید توندە لە حەقدا، ئەو ئەگەر بڕوای بە شتێك هەبوو لەسەری سوور دەبێت، بڕوا ناهێنێت بە حەق نەبێت، ئەو لە تێکۆشانو جیهادیدا توندو سەختە، هیچ فەرمانێك لەو فەرمانانە کە پیاوان بە خراپترین شێوە تێکدەشکێنن ورەو سەختی سەید خاوناکاتەوە. . . یەکەم سیفەتی سەید بریتیە لە بڕوابوون بەخوا، ئەو دەزانێت کە هێزی حکومەت گەورەیە، بەڵام بڕوای وایە کە خوا گەورەترە، ئەم ئیمانە ئەو هێزە گەورە زەبەلاحە بچووكو لاواز دەکاتەوە. بەهۆی بڕواکەیەوە بەوەی کە خوا گەورەترە ئەمیش گەورە ئەبێت بەسەر ئەو هێزەدا، لەبەر ئەمەیە گوێ نادات بە هێزی سەرکەش، بەهێزی فەساد، هێزی خراپەکاری گەورە، ئیمانەکەی بە گەورەیی خوا پاڵی پێوە دەنێت بۆ وەستان لە ڕووی ئەم هێزانەدا، بۆ سەرکەوتن بەسەریاندا. . . دوای کۆتایی هاتنی ئاهەنگەکە جەمال عەبدولناسر لە خواحافیزی سەید قوتبدا بوو، ئەفسەرو سەربازو جەماوەری خەڵکەکە هوتافیان بە ژیانی سەید قوتب دەکێشا). [1]

ئەم زانیاریە سەرسوڕهێنەرانە بە بەس دەزانین بۆ خوێنەری بەڕێز، هەروەك یەکێك لە ئامادەبووان ـ ئەحمەد عەتار ـ گێڕایەوە تەعلیقی لەسەر نادەین، تەنها بە ئاماژەیەك نەبێت بۆ ئەو چاو ڕوونیە ئیمانیە تیژەی سەید قوتب کە چۆن دیمەنە ڕوکەشەکان هەڵیان نەخەڵەتاند، خاوەنی تێڕوانینێکی تەسك نەبوو کە تەنها ئەوەی لەبەرچاویدایە هەر ئەوە ببینێت. بەڕاستی سەید خاوەن تێڕوانینێکی تیژ بوو، بەهۆیەوە دوارۆژی دەبینی، لێوەی دەیڕوانیە بنچینەی یاساو ڕاستیەکان، ئەگەرنا زیندانیو مردن بە واتای چی لەسەر دەستی پیاوانێك کە بەدەوریدا کۆبوونەتەوە، هوتافی بۆ دەکێشنو چەپڵەی بۆ لێدەدەن؟!!.

بیری خوێنەری دەخەینەوە کە عەبدولناسر ئەوکەسەی لەبەرامبەر جەماوەرێکی زۆردا لە ئاهەنگەکەدا سوێندی خوارد کە پارێزگاری لە سەیدو ژیانی بکات، ئەوکەسە بوو پەیمانی پێدا ببێت بە قوربانی ئەو تاکو مردن، هەر ئەو بوو کە فەرمانی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپاند، فەرمانیدا بە جێبەجێکردنی ئەو حوکمە، عەبدولناسر خۆی هۆیەکی ڕاستەوخۆی شەهیدکردنو مردنی سەید بوو دوای چواردە ساڵ لە بەرواری ئەم سوێندو پەیمانەوە!!!.

[1] گۆڤاری (كلمة الحق): ساڵی 1، ژمارە2، مایس1967، لاپەڕە 37-38.

## سەیدو دەزگای تەحریر

دوای شۆڕشو لە سەرەتای ساڵی 1953دا عەبدولناسر ویستی حزب یان دەزگا یان ڕێکخستنێکی سیاسی دروست بکات تاکو ببێتە واجیهەی شۆڕشو حزبی شۆڕش، دروستی بکات تاکو پارێزگاری لێبکات، تەحەدای کۆمەڵی برایانی موسڵمانی پێبکات کە گەورەترین ڕێکخستنی ئیسلامیو خاوەن زۆرترین هێزی جەماوەر بوون لە میسردا. ئەم فەرمانەی عەبدولناسر بە دامەزراندنی (**هيئة التحرير**) لە 1953/1/23دا بوو.[1]

دوای ئەمە عەبدولناسر داوایکرد لە برایانی موسڵمان بێنە ناو دەزگای تەحریرەوەو ناوچەو ڕێکخستنەکانیان هەڵبوەشێننەوە!، عەبدولناسر لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەم –یەنایەر–ی ساڵی 1953 ئیبراهیم تەحاوی ئەفسەری نارد بۆ لای لیوا سەلاح شادی بۆ ئەم مەبەستە، سەلاح شادیش پێشنیارەکەی عەبدولناسری ڕەدکردەوە. عەبدولناسر داوای لە برایان کرد کە کۆبوونەوەیەك لەگەڵی سازبدەن بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەی توانەوەی برایان لە دەزگای تەحریردا!.

دەستەی وتوێژکارانی برایان لەگەڵ عەبدولناسر لە ماڵی ڕاوێژکار حیلمی عەبدولباقی کۆبوونەوە، کە سەلاح ئەبو رەقیقو فەرید عەبدولخالقو سەلاح شادیو حەسن عشماویو حیلمی عەبدولباقی لەناویاندابوون.

دوای لێکەڵینەوەو تاوتوێکردنێکی بەرفراوانی باسەکە لەگەڵ عەبدولناسر، بەرپەرچی ئەوەیاندایەوە کە برایان لە دەزگای تەحریردا بتوێنەوەو ببێتەبەشێك لەودەزگایەو بە عەبدولناسریان وت: نەخێر.

عەبدولناسریش ئەم سەرپێچییەی لەدۆسیەی برایاندا لەلای خۆی تۆمارکرد، ئەم (نەخێر)ەی خستە سەر (نەخێر)ەکانی تریان. ئیتر ڕقو قینی زیاتر بوو بەرامبەریان لەسەر ئەمە.[2]

مەحمود عەبدولحەلیم دەگێڕێتەوە کە سەرکردایەتی برایان ڕێگەی لە هیچ ئەندامێکی برایان نەگرت کە بە ئارەزووی خۆیان جولە بکەن، ڕێگرییان نەکردن لە بەیەکگەیشتن لەگەڵ ئەندامانی دەزگای تەحریرو سەردانی نووسینگەکانی.

لەبەرامبەر بانگەوازی چەندجارەی عەبدولناسر بۆ برایان کە بچنە ناو هەیئەوە ژمارەیەك لە برایان هەستان بە سەردانی بنکەی سەرکردایەتی هەیئە، چاویان کەوت بە چینی ئاراستەکەر لەوێ، بەو خاوەن بیرانەی کە بنەماکانیان دارێژابوو، ئامانجەکانیان دیاری کردبوو، کە لە مامۆستای زانکۆو گەورە نووسەران بوون. . . کاتێك پێیان گەیشتن، بەسەر ئەو بنەماو ئامانجانەی کە دایانڕشتووە ئاگاداربوون، وتەی ترسناکیان لێبیستن،

ئەوەیان لێ بیستن کە هەیئە لە برایانی موسڵمان ئاسۆ فراوانترە، نمونە بەرزەکانی هەڵناکشێت تا محەممەدو عومەرو خالید، بەڵکو فراوان دەبێت تا لینینو مارکسو فرۆیدیش بگرێتەوە. !

ئەم برایانە گەڕانەوە بۆ لامان بە ڕەدکردنەوەی داواکەی عەبدولناسرەوە. . . مامۆستا ئەلبەهیلخەولی یەکێك بوو لە ئەندامانی وەفدەکە ئەوەی بینی بوویو بیستبووی بۆی گێڕامەوە. هەواڵی پێدام کە فەیلەسوفەکانی هەیئە پێیان ڕاگەیاندووە گەنجینەکانی دەوڵەت کراوەیە بۆ بانگخوازان دژ بە بەرامبەرەکانیان.

عەبدولناسر زۆر جەختی ئەکرد لەسەر ڕاکێشانی دوو کەسایەتی برایان بۆ ناو هەیئە بەتایبەتی، ئەوانیش هەردوو برا: ئەلبەهیلخەولیو سەید قوتب بوون، تەنانەت هەندێك ڕۆژنامە ـ وەك (**أخبار اليوم**) ـ لە پێشبینییەکانیاندا بڵاویان کردەوە کە سەید قوتب پاڵێوراوە بۆ پلەوپایەیەکی گرنگ، لە نێوەندە ئیخوانییەکاندا ئەوەبڵاوبوویەوە کە سەید پاڵێوراوە بۆ وەزیری مەعاریف و، مامۆستا ئەلبەهیلخەولی بۆ پلەیەکی گرنگ لە وەزارەتی ئەوقاف!، وا دەردەکەوێت سەید قوتب لەو ڕۆژانەدا پەلەیکرد لە ڕاگەیاندنی پچڕانی پەیوەندی خۆی بەو هەیئەوە. . . .

منو مامۆستا مەحمود عەبدولحەلیم لە پەیوەندیدا بووین بە عەبدولناسرەوە سەبارەت بە هەیئەو سووربوونی لەسەر ئەوەی کە سەیدڕابکێشێت بۆناو هەیئە، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نەبووین کە لەوکاتەدا سەید ـ لەکۆتایی ساڵی 1952و سەرەتای 1953 ـ بە ڕەسمی ئەندامی کۆمەڵی برایانی موسڵمان بوبێت بەشێوەیەکی کرداری و لە ڕێکخستنی ئەواندا بوبێت!.

---

[1] الاخوان المسلمون: محمود عبدالحليم، 3:175.

[2] صحفات من التأريخ: 208-218، الاخوان المسلمون/ 3: 26-28.

ماممۆستا مەحمود عەبدولحەلیم مەبەستی ئەوەیە کە سەید قوتب زۆر نزیك بوو لە برایانی موسڵمانەوە، خەڵکی بە برایان دایان ئەناو عەبدولناسریش هەر بە هەمان تێڕوانینی خەڵکیەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد!.

بەڵام سەبارەت بە تایبەتمەندی سەید بە هەیئەوە، وادەردەکەوێت عەبدولناسرلەگەڵ خۆیدا بەشداری پێکردووە، لەکاتی بیرکردنەوە لە دەزگایەك یان لە حیزبێك، وە لە بیرکردنەوەلە هەیئەی تەحریردا، ئەمەش چەند مانگێکی لە ساڵی 1952دا خایاند.

کاتێك لە 1953/1/23 مەرسومی کۆماری بە دروستکردنی هەیئە دەرچوو سەید بەرپرسیاریەکی سەرەکی تێدا وەرگرت!.

سەیدقوتب سکرتێری هەیئە نەبوو، چونکە عەبدولناسر خۆی سکرتێر بوو، لەبەر ئەوە ئەگونجێ یاریدەدەری عەبدولناسر بووبێت.

کارکردنی سەید لە هەیئەی تەحریردا درێژەی نەخایاندو لە دوو مانگ کەمتر بوو، ئەوەبوو هەیئە لە 1953/1/23دا دامەزرا، سەید لە شوباتی هەمان ساڵدا لێی کشایەوە، هەروەك لە ڕاپۆرتەکەیدا هاتووە کە بۆ لێکۆڵەرەوەکانی نووسیوە.

## سەید هەوڵی ڕێکخستنی نێوان عەبدولناسرو برایانی موسڵماندا دەدات

سەید هەوڵی ئیسلاحی دەدات لەنێوان عەبدولناسرو برایانی موسڵماندا لەکاتێکدا جیاوازی نێوان برایانی موسڵمانو عەبدولناسر زیادی کرد، پەیوەندی نێوان سەیدو عەبدولناسر پەیوەندیەکی چاكو بەهێز بوو، لەو کاتەدا سەید بە ڕەسمی لە برایان نەبوو. سەید دەترسا ئەو جیاوازیە سەربکێشێ بۆ پێکدادان، ئەمەش زیانێکی گەورە بوو بۆ برایانو شۆڕش، بۆ کۆمەڵگاوبۆ نیشتمان.

لەبەر ئەوە سەید هەوڵی چاکسازی لە نێوان برایانو عەبدولناسردا دەدا بەو پێودانگەی کە هاوڕێو دۆستو نزیکی هەردوو لایەنەکە بوو.

سەید هەستی بە پیلانگێڕانێکی بۆگەن دەکرد لەلایەن کۆمەڵێك لە نزیکەکانی عەبدولناسرەوە، ئەوانەی سینەی عەبدولناسریان پڕکردبوو لە ڕقو قین بەرامبەر بە برایانی موسڵمان، ڕاپۆرتی پڕ درۆو دەلەسەیان دەخستە بەردەمی لەبارەی برایانەوە، هانیان دەدا بۆ هەڵشاخان بە ڕووی برایاندا.

دەستی بێگانە ئەم کەسانەی دەبزواند، هەندێکیشیان بەکرێگیراوی موخابەراتی ئەمریکی بوون!.

سەید لە ڕاپۆرتەکەیدا بۆ لێکۆڵەرەوان دەڵێت: (لەوەدا کە پەیوەندی بە جیاوازی نێوان پیاوانی شۆڕشو برایانی موسڵمانەوە هەیە، من لەو کاتەدا لە نزیکەوە تێبینی گەشەکردنیم دەکرد، چونکە من ڕۆژانە زیاتر لە 12 کاتژمێر لە نزیکی پیاوانی شۆڕشەوە کارم دەکرد، لەگەڵیانداو لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کە لەگەڵیاندا بوون، ئەڵێم: ئەوەی ئێستا گرنگە ئەوەیە کە مامۆستا فوئاد جەلال ئەندامێکی کۆمەڵەی جوتیار (**جمعية الفلاح**)[1] بوو وەکیلی کۆمەڵە بوو. . هەروەها وەزیر بوو لە یەکەم وەزارەتی دوای شۆڕشدا، من لە زۆر بۆنەدا تێبینی ئەوەم دەکرد کە ئەوکەسە برەو بە جیاوازی نێوان برایانی موسڵمانو پیاوانی شۆڕش دەدا، ترسی برایانی لەسەر پیاوانی شۆڕش قەبە دەکرد، متمانەی سەرۆك عەبدولناسری دەقۆستەوە پێی، ئەم بیروبۆچوونانەی

---

[1] (جمعیة الفلاح) کۆمەڵەیەکی ئەمریکی گومانلێکراو بوو، لە ساڵی 1951 دکتۆر ئەحمەد حسین دروستیکرد، تا گێرەو کێشە دژی ئیخوان دروستبکات، هەندێك لە گەورە ئەدیبو سیاسەتمەداران پەیوەندییا پێوەکرد، وەك موحەممەد سەلاحەدینو دکتۆر عەبدوڕڕەزاقئەلشهوریو ئەحمەد ئەلباقوری: لماڎا اعدمونی.

له زۆر بۆنەدا بڵاودەکردەوە، له منی نەدەشاردەوە، چونکه وایدەبینیم که له پیاوانی شۆڕشەوە نزیکم‌و جێگەی متمانەی ئەوانم، لەگەڵ هەڵبژاردنی من لەلایەن ئەوانەوە بۆ هەندێ پۆستی گەورەی گرنگ، لەگەڵ پرس‌وڕاکردنمان ـ بەکراوەیی ـ سەبارەت بەوبارودۆخانەی که لەو کاتەدا له ئارادابوون، وەك مەسەلەی کرێکارەکان‌و جموجوڵە شیوعیه تێکدەرەکان لەناویاندا، تەنانەت وەك مەسەلەی ماوەی ئینتیقالی وماوەکەی، هەروەها ئەو دەستوورانەی کەلەو ماوەیەدا دەرچوو.

گرنگ ئەوەیە من پەیوەندی دەبینم له نێوان پیلانەکەی مامۆستا فوئادو کۆمەڵەی جوتیاردا وەك ڕێکخراوێکی ئەمریکی له ئاراستەو پەیوەندیدا وە له نێوان هەڵگیرسانی ئاگری جیاوازی له نێوان شۆڕش‌و برایاندا.

من لەوکاتەدا هەوڵمدا ـ ئەوەندەی ئەگونجا ـ نەهێڵم پێکدادان ڕووبدات، که هەستم به ئیشارەتەکانی دەکرد، بەڵام نەمتوانی. . . له کۆتاییدا ئاراستەکەی تر زاڵ بوو. . ).[1]

## سەید له پیاوانی شۆڕش جیائەبێتەوەو لا ئەدات بەلای برایاندا

سەید قوتب لەتوانایدا بوو لەگەڵ عەبدولناسردا بمێنێتەوەو بەهرەمەندبووایە له پلەوپایەو پۆست‌و سامان، ڕێك بێت لەگەڵیدا لەسەر ستەم‌و خراپەکاری‌و سەرکەشیەکانی بەرامبەر به لەزەت وەرگرتن لەو نیعمەتانەی که لەلای عەبدولناسر هەبوو!.

ئەگەر سەید خراپەکارو بازرگانی بیروباوەڕو فیکر بوایە، شوێنکەوتەی دونیاو خۆشی‌و لەزەتەکانی بووایە ـ هەروەك زۆرێك له دووڕووە خراپەکارە بازرگانەکانی چواردەوری وایان کرد - لەتوانایدا بوو ئەم کارە بکات ـ!!.

بەڵام سەید بەم شێوەیەی نەکرد، ڕاستگۆبوو له ئیلتیزامیدا به بیروبۆچوونە چاکسازیەکەیەوە، ڕاستگۆبوو له مامەڵەو پەیوەندی‌و پەیوەستی‌و پشتگیریەکانیدا!.

سەید گومانی ڕاستگۆیی‌و نیشتمان پەروەری‌و ئارەزووکردنی چاکسازی‌و دژایەتیکردنی خراپەو بڵاوبوونەوەی دادپەروەری به پیاوانی شۆڕش ـ بەتایبەتی سەرۆکەکەی عەبدولناسر ـ دەکرد، لەسەر ئەم بنچینەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، لەپێش شۆڕش لەگەڵیاندا ڕێککەوت، دوای شۆڕش هاوکاری لەگەڵ کردن، به شەوو ڕۆژ لەگەڵیان بوو، زیاتر له 12 کاتژمێر ڕۆژانە کاری لەگەڵ دەکردن.

عەبدولناسر هەندێك پۆستی خستە بەردەم سەید ـ بەپێی قسەی خۆی ـ بەڵام سەید ڕەدی کردنەوە، چونکە مەبەستی پیشە وەرگرتن‌و کۆکردنەوەی سامان نەبوو، وەزارەتی مەعاریفی ڕەدکردەوە، بەڕێوەبەرایەتی ئیزگەی ڕەدکردەوە، شتی تریشی ڕەدکردەوە.

سەید له مەڵبەندێکی گرنگی هەیئەی تەحریردا کاری وەرنەئەگرت گەر بۆ ئەوە نەبوایە که چوارچێوەیەکی ئیسلامی ببەخشێت به هەیئەکە، ڕەهەندێکی پەروەردەیی پێببەخشێت تاکو لاوانی میسرو نەوەی شۆڕش پێبگەیەنێ لەسەر ئیسلام‌و بنەماکانی.

بەڵام له زۆربەی پیاوانی شۆڕشدا بەتایبەتی عەبدولناسری سەرکردە، جیا لەوەی دیتەوە، بینی فەلسەفەی شۆڕش و پەیڕەوی هەیئەی تەحریر ئەوەنیە که ئەم ئەیەوێت‌و داوای بۆ دەکات‌و هیوای بۆ دەخوازێت!.

له عەبدولناسرەوە ستەم‌و دەستدرێژی‌و کوشت‌و بڕو دژایەتی بینیەوە، فرۆفێڵ‌و پیلانگێڕان‌و ڕق‌و قینی لێبینیەوە، درۆو دووڕوویی لێبینیەوە، ڕقبوون له حەق‌و جەنگ کردن لەگەڵ ئیسلام‌و ڕقلێبوونی بانگخوازانی ڕێگەی خواو برایانی بینیەوە. .

[1] لماذا اعدموني: 13-14.

ئیتر دوورکەوتنەوەو دابڕان لە نێوان سەیدو عەبدولناسردا، هەروەهاله نێوان سەیدو پیاوانی تری شۆڕش ـ تاکە شێك بوو کە سەید دەبوایە بیکردایە، لەبەر ئەوە لێیان جیابوویەوەو سەرپێچی کردن، لێیان دابڕا، ئەو پلەو پایەیەو پیشەو سەروەت و سامانەی بۆ بەجێهێشتن کە هەولێیان دەدا بەهۆیەوە لە خشتەی بەرن!.

ئەم دابڕانو جیابوونەوەیەی لە سەرەتای ساڵی 1953دا بوو، واتە بەچەند مانگێك دوای شۆڕش: (سەرقاڵبووم لە کارکردن لەگەڵ پیاوانی شۆڕش لە تەموز تا شوباتی 1953، تا ئەوکاتەی وای لێهات بیرکردنەوەی منو ئەوان جیاوازی تێکەوت سەبارەت بە هەیئەی تەحریرو پرۆگرامی پێکهێنانی، دەربارەی بابەتی تر کە لەوکاتەدا هەبوون پێویست بەشیکردنەوەی ناکات. . . لەهەمان کاتدا پەیوەندیەکانم بە کۆمەڵی برایانەوە بەهێزتر دەبوو. . . ).[1]

## دیمەنی دووەم: سەید قوتب لە ڕێگەیدا بەرەو برایانی موسڵمان

سەید قوتب بە کتوپڕیو بەبێ پێشەکی پەیوەندی نەکرد بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە، بەڵکو ڕێگەیەکی زەمەنی دووری گرتەبەر تا گەیشتە کۆمەڵی برایان، چەندین قۆناغی دوابەدوا هەیە کە سەید پیایاندا هەنگاوی پلەپلەی ناوە، تا گەیشتە ئەوەی بەرەسمی ببێت بە برایەکی موسڵمانی کارا لە کۆمەڵی برایانی موسڵماندا!.

### هەڵەکان لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندیەکانی سەید بە بریانەوە

زۆرجار وابووە کە نووسەرو دانەرو قسەکەرەکان کەوتوونەتە هەڵەی مێژووییەوە، ئەویش لەکاتی قسەکردنیاندا لە پەیوەندی سەید قوتب بە برایانی موسڵمانەوە، کە هەندێك وتە دەهێننەوەو هەندێ گێڕانەوە دەگێڕنەوە هیچ ڕاستیەکی تێدانیە، بەڵگەشیان لەسەری نیە، بەڵکو دژی ئەوە دەوەستن کە سەید قوتب خۆی دەربارەی پەیوەندیەکانی بە برایانی موسڵمانەوە دەیگێڕێتەوە:

**لەو هەڵانە:**

ـ سەید چاوی بە ڕابەری برایانی موسڵمانو دامەزرێنەری کۆمەڵەکەیان حەسەن بەنا کەوتووە و گوێی لە وتارێکی گرتووە، پێی سەرسام بووە، وتەکانی کاری تێکردووەو بنەماکانی کتێبی (**العدالة الاجتماعية في الأسلام**)ی داوە بە حەسەن بەنا لە ساڵی 1948 بۆ ئەوەی چاپی بکات، حەسەن بەناش دوای سەفەری سەید بۆ ئەمریکا چاپیکردووە.

ـ سەید کتێبی (**العدالة الاجتماعية**)ی پێشکەش کردووە بە لاوانی برایانی موسڵمان، ئەوانەی لەوکاتەدا لە زیندانو بەندیخانەکاندا بوون.

ـ دوای گەڕانەوەی لە ئەمریکا لە ساڵی 1950دا بە برایانی موسڵمان گەشتووەو ڕەخنەکانی خۆی لەسەر پرۆگرامی برایان لە کاردا بۆ دەربڕیون، ساڵح عشماویو پاش ئەمیش ڕابەری گشتی حەسەن هوزەیبی ـ بانگیان کردووە بۆ پەیوەندی کردن بە کۆمەڵی برایانو چاککردنی پرۆگرامەکانی لە ناو کۆمەڵی برایان خۆیەوە.

ـ سەید لە ساڵی 1951 بەرەسمی پەیوەندی کردووە بە برایانەوە.

ـ عەبدولناسر وەك نوێنەری ڕاستەقینەی برایانی موسڵمان لە ئیشوکارەکانی شۆڕشدا مامەڵەی لەگەڵدا کردووە.

ـ حەسەن هوزەیبی ناوی سەیدی داوە بە عەبدولناسر تاکو بیکاتە وەزیر وەك نوێنەری برایان لە ئەنجومەنی وەزیراندا.

ـ لە ساڵی 1951ەوە ئەندام بووە لە مەکتەبی ئیرشادی برایانی موسڵماندا، کە بەرزترین دەسەڵاتی سەرکردایەتی برایانە.

ـ لە سڵی 1951ەوە بووە بە سەرۆکی بەشی بڵاوکردنەوەی بانگەواز لە کۆمەڵی برایاندا.

[1] لماذا اعدموني: 11.

ـ نووسینگەی ئیرشاد کردوویەتی بە نوێنەری خۆی لەلای حزبی شیوعی میسری بۆ ڕێکەوتن لە نێوان برایانو شیوعیەکاندا لە بەرنگاری ستەمو سەرکەشیەکانی عەبدولناسرد لە ساڵی 1953و 1954.

دەبینین هەموو ئەوانەی پێشەوە ئاماژەبوون بۆ هەڵەی مێژوویی!!، چونکە بەڵگەیان لەسەر نیە، لەبەر ئەوەی دژایەتی لەگەڵ وتەکانی سەید خۆیدا ئەکەن لە هەنگاونانیدا بەرەو برایانی موسڵمان، لە پەیوەندیکردندا پێوەیان، لە ڕوونکردنەوەی ئەو کارانەدا کە پێیان سپاردبوو.

## سەید پێش ئاراستە ئیخوانیەکەی چاکسازێکی ئیسلامیی بوو

لەپێشدا ئەوەمان زانی کە سەید ڕووی کردە قورئان، قورئانیش بەرەو فیکری ئیسلامی گشتی هەنگاوی پێهەڵگرت.

سەید هەر لە ساڵی 1947ەوە چاکسازێکی ئیسلامی بوو، بانگی خەڵکی دەکرد بۆ چاککردنی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆشنبیری لەسەر بنچینەی ئیسلام، دەینووسیو کتێبی دادەناو وتاری دەدا، بانگی دەکرد بۆ بیرە ئیسلامیە ئیسلاحیەکانی، بەڵام کە بانگی دەکرد بۆ ئیسلاحو هەڵدەستا بە کارە ئیسلاحیەکانی، لە پێگەیەکی تاکی خودییەوە بوو، واتە تەنها خۆی دەجووڵا، بەفیکری خۆیشی، لەوکاتەدا ئینتمای بۆ برایانی موسڵمان نەبوو کە لەوپەڕی گوڕو چالاکیو لوتکەی جوڵەیاندا بوون لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی پێشەوای شەهید حەسەن بەنادا.

هەروەها سەید ئینتمای بۆ هیچ گروپو لایەنێکی سیاسی ترو هیچ کۆمەڵێکی ئیسلاحی نەبوو، نەئیسلامیو نەنائیسلامی!.

## ئایا سەید بۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی ئیسلامی کاری کردووە؟

هەندێك لە نووسەران بۆ ئەوە دەچن کە سەید قوتب ـ دوای نیوەی چلەکان ـ کاری کردووە لەسەر دروستکردنی کۆمەڵێکی ئیسلاحی ئیسلامی، دروستکردنی ڕێکخستنێکی ئیسلامی بانگخوازکار، بە کۆکردنەوەی لاوانی موسڵمان دەستی پێکرد، پاشان کاری نوێی بۆ هاتە پێشەوە، دواتر سەفەری کرد بۆ ئەمریکا، بەڵام پاش ئەوەی لە ئەمریکا گەڕایەوە ونبووی خۆی لە کۆمەڵی برایانی موسڵماندا دیتەوە،ئیتر پاشەکشەی لە ڕێکخستنە ئیسلامیەکەی کردو،پەیوەندی بە ڕێکخستنی برایانەوە کرد!.

مامۆستا یوسف ئەلعەزم لەم بارەیەوە دەڵێت: (بیرکردنەوەکانی هەنگاویان پێ هەڵگرت بۆ ئەوەی هەستێت بە ڕێکخستنی چەند کۆمەڵەیەك لە لاوان،بەپێی بەرنامەیەکی دیاری کراو و پرۆگرامێکی حەرەکی هەمەلایەنە کار بکات،بانگ بکات بۆ هێنانەدی ژیانێکی ئیسلامی نوێ. .

بەڵام قەدەرەکان ڕایانکێشا بەرەو ئاشنا بوون بە بەخشینی فیکری و ئەو نەوە بڕوادارەی کە مامۆستاو پێشەوای شەهید حەسەن بەنا پەروەردەی کردن،لەم نەوەیەدا بەختی خۆی دیتەوە،وە لە لاوانیداو ونبووی خۆی دۆزیەوە. . . ).

تا ئەوە دەڵێت کە: (.. ئەگەر سەید بیویستایە ڕێکخستنێکی نوێ دابمەرزێنێ وجوڵەیەکی تر جیا لە جوڵەی برایانی موسڵمان بونیاد بنێت لە لایەن دەوڵەتەوە پاڵپشتی تەواو دەکرا و لە فەرمانڕەواکانەوە هەموو یارمەتیەك دەدرا. . جگە لەوەی برایان لەو ڕۆژەدا لە بەر دەرگاکانی چەرمەسەریەکی پڕوکێنەر و سەختدا بوون. . ).

بەڵام من لەگەڵ مامۆستا یوسف ئەلعەزم دا نیم لەوەدا کە بۆی چووە، وانابینم کە کارەکە لەلای سەید لەسەر ئەم شێوە بووبێت، بڕوا ناکەم کاری کردبێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی ئیسلامی، لەبەرنەبوونی هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە، نە لە وتەکانی سەیدقوتب دا وە نە لە وتەکانی لاوانی چواردەوریدا.

[1] هەندێك لەم هەڵە مێژووییانە لەو بابەتانەدایە دەربارەی سەید لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا نووسراوە، هەندێکیان مامۆستا یوسف عەزم لە کتێبەکەیدا دەربارەی سەید هێناویەتی، منیش خۆم بێبەش ناکەم لەو هەڵانە بەڵکو لە چاپی یەکەمدا بەناوی (سید قطب الشهيد الحي) هەندێك لەم هەڵانەم هێناوە.

1 الشهيد قطب: ليوسف العظم: 36-37 بە کورتی.

ڕاستە سەید بانگی بۆ چاکسازی ئیسلامی کردووە، ڕاستە لە حەلوان دەرگای خستبووە سەرپشت لە بەرامبەر ئەوانەی سەردانیان دەکرد، ڕاستە زۆرێك لەو لاوانەی کاریگەر بوون بە بابەتەکانی لە ماڵەوە سەردانیان دەکردو سەرسام بوون بە بیروبۆچوونەکانی، ڕاستە لەگەڵ میوانەکانیدا ڕای دەگۆڕیەوە لە بابەتە ئیسلاّحیە ئیسلامیەکاندا.

بەلاّم ئەمانە هەمووی یەك شتن، وە ئەوەی کە بیری کردۆتەوە و کاری کردووە بۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی ئیسلامی شتێکی ترە، پەیوەندیەکانی بەو کەسانەوە کە سەردانیان دەکرد دەلالەت ناکەن لەسەرهەبونی ڕێکخستنێکی تایبەت

## سەید کتێبی (العدالة الاجتماعية)ی پێشکەش بە لاوانی برایان نەکردووە

بەڵگەی تەواو نیە لەسەر ئەوەی کە سەید قوتب بە پێشەوا حەسەت بەنا گەشتبێت، یاخود گوێی لە بابەتو وتاری ئەو بووبێت.

ئەوەش نەسەلمێنراوە کە سەید پێش ڕۆیشتنی بۆ ئەمریکا بە لاوانی برایانی موسڵمان گەشتبێت و هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردبن، بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە پێشەوا حەسەن بەنای نەناسیبێت، یان لە بارەی برایانی موسڵمانەوە زانیاری نەبووبێت.

سەید ئەدیبێکی مەزنو ڕۆشنبیرێکی ڕۆشنبیری فراوانو پیاوێکی کۆمەلاّیەتی بوو، بەردەوام ئامادەیی هەبوو لە ژیانی ڕۆشنبیری‌و کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌و ئیسلاّحی میسردا، ئاگادار بوو بەسەر تەوژمە ئیسلاّحیەکانی میسردا.

برایانی موسڵمان ـ دوای جەنگی جیهانی دووەم ـ لە لوتکەی چالاکی دا بوون، لە گەرمەی کاریگەریاندا بوون لە ژیانی میسری دا، سەید دەربارەی برایانو چالاکیەکانیان ئاگاداری هەبوو. بەلاّم نرخ و بەهای برایانی موسڵمانو کاریگەری پێشەواکەیان حسن ئەلبەنای دەرك نەکردبوو، هێزی برایانی لە ژیانی میسردا هەست پێنەدەکرد!

سەید دان بەم ڕاستیەدا دەنێتو دەڵێت: جگە لە کەمێك هیچم دەربارەی برایانی موسڵمان نەدەزانی، تا ئەو کاتەی لەبەهاری 1948دا سەفەرم کرد بۆ ئەمریکا.[1]

ئەوەبوو پێش سەفەرکردنی بۆ ئەمریکا کتێبەکەی (**العدالة الاجتماعية في الاسلام**)ی تەواو کردو ویستی بە چاپی بگەیەنێت، بەلاّم سەفەرەکەی بوویە ڕێگر لە بە چاپ گەیاندنیدا.

وە ئەوە ڕاست نیە کە گوایە سەید بە چاپ گەیاندنی ئەم کتێبەی سپاردبێت بە حەسەن ئەلبەنا پێش بە چاپ گەیاندنی، وە حەسەن ئەلبەنا بە چاپی گەیاندبێتو فەرمانی بە دابەش کردنی دابێت بەسەر برایانی موسڵماندا. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە سەیدقوتب کتێبەکەی سپارد بە **محەممەد قوتبی** برای، وە **محەممەد** قوتب بە چاپی گەیاندو چاپی یەکەمی لە نیسانی 1949دا دەرچوو.

سەید کتێبەکەی بە پێشکەش کردنێکی وروژێنەر دەرکرد، وەك لە پێشکەش کردنیدا دەڵێت: (بۆ ئەو لاوانەی کە لە خەیاڵمدا هەستیان پێدەکەم وا دێن، ئەم دینە دەگێڕنەوە، تازەو نوێ وەك دەست پێکردنی. . لە پێناوی خوادا دەجەنگن، دەکوژنو دەکوژرێن، لە ناخیاندا بڕوادارن کە عیزەت بۆ خواو پێغەمبەرو موسڵمانانە.

بۆ ئەو لاوانە، ئەوانەی کە یەك چرکە گومانم نیە کە گیانی بەهێزی ئیسلام، لە ڕابوردوی نەوەکان بۆ نەوکانی داهاتوو، لە ڕۆژێکی نزیکدا. . زۆر نزیك دەیان بوژێنێتەوە).[2]

زۆرێك لە خەڵکی وا تێگەیشتوون کە سەید بەم پێشکەشکردنەی مەبەستی لاوانی برایانی موسڵمان بووە. وە برایان لەم کاتەدا لەودیودیوارەکانی زیندان و بەندینخانەکانەوە بوون. لە پاداشتی ئەو جەنگە پاڵەوانییەی کە دژی جولەکە لە فەلەستیندا کردیان، حکومەتی سەعدیەکان دژایەتی برایانی دەکرد، دژایەتی هەر شتێك پەیوەندی بە برایانەوە هەبێت، هەر شتێك بەرەو برایان بڕوات.

[1] لماذا أعدموني10.
[2]لماذا أعدمونى 11.

حکومەت وا تێگەیشت کە سەید ـ کە لەو کاتەدا لە ئەمریکا بوو ـ مەبەستی لاوانی برایانی موسڵمانە لە پێشکەشکردنی کتێبەکەیدا لەبەرئەوە دەستی کرد بە دەستگرتن بەسەر کتێبەکەداو کۆکردنەوەی نوسخەکانی لە بازاڕەکاندا ـ وەك یوسف ئەلعەزم دەگێڕێتەوە ـ.

برایانیش بەهەمان شێوە وا تێگەیشتن کە سەید مەبەستی ئەوانە، هۆگری کتێبەکەی بوونو دەستیان کرد بە ئاڵو گۆڕپێکردنی لە ناوەوەو دەردەوەی زیندان.

پێشەوا حەسەن ئەلبەناش سەرنجی خۆی لەسەر ئەم کتێبە دەربڕی ـ وەك مامۆستا یوسف ئەلعەزم دەگێڕێتەوە ـ دەڵێت: (ئەمانە بیروبۆچوونەکانی ئێمەیە، وە دەشێت خاوەنەکەشی کەسێك بێت لە ئێمە).[1]

ئەوەتە بە دڵنیاییەوە دەڵێت کە مەبەستی ئەوان بووە!

لە گەڵ ئەوەدا ڕاستیەکە پێچەوانەی ئەم ڕاوچۆنەیە کە مامۆستا عەزم بڕوای پێی هەیە!!

لە کاتێکدا بە محەمەد قوتب گەشتم و پرسیارم لێکرد لە بارەی ئەم پێشکەش کردنەوە ئەوەی ڕەد کردەوە کە سەید مەبەستی لاوانی برایان بوو بێت، بەڵکو پێشکەشی کردووە بە لاوانێك کە بە خەیاڵی هەستیان پیێ دەکات وادێن و بەڕێوەن، وە لە جیهانی واقع دا نەیبینیون!!

پاشان شێوازی دەربڕینی پێشکەشکردنە کە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستیە دەکات، ئەو خەیاڵی کۆمەڵێك لاو دەکات کە بەڕێوەن و دێن، بانگ بۆ ئەم دینە دەکەن، ئەو چاوەڕوانی هاتنیان دەکات، وە بە چاوڕونی و زیرەکی خۆی پێشبینی ئەوە دەکات ،وە ئەو وادە بینێت کە بارووودۆخ و ڕووداو و فرمانەکان هاتنی ئەم لاوانە دەخوازێت. . . وە گیانی بەهێزومەزنی زیندوی ئیسلام ئەیان بوژێنێتەوە و دەیانهێنێتە بوون، لەبەرئەوە هەموو ئەوەی لە چواردەوریاندایە بوون و ئامادەبوونی ئەمان فەرز دەکات!

پێویست ناکات لە لێکدانەوەکاندا دوور بڕۆین! چونکە دەقی لێدوانی سەید خۆی هەیە کە بە ڕوونی بەرپەرچدانەوەیەکی ئاشکرایە بۆ بیرو بۆچوونەکەی مامۆستا یوسف ئەلعەزم.

سەید لە دەربڕینێکدا دەڵێت: لە کاتێکدا کتێبی **(العدالة الاجتماعية في الاسلام)**ی من لە ساڵی 1949 دەرچوو، برایان لە میسردا واتیێ گەیشتن کە من بەو پێشکەشکردنە مەبەستم ئەوانە، بەڵام کارەکە وانییە!! بەڵام ئەوان لە لایەن خۆیانەوە کتێبەکەیان بەگرنگ گرت و بە کتێبێکی ئیخوانیان دانا، وە خاوەنەکەیان بە هاوڕێ دایە قەڵەم. . .[2]

بەڵگەیەکی تر لە سەر ئەوەی کە لە چاپی یەکەمی کتێبەکەیدا سەید مەبەستی لە پێشکەش کردنەکەی لاوانی برایانی موسڵمان نەبووە، پێشکەشکردنی چاپی دووەمی هەمان کتێبە ئەم جارەیان پیششکەش کراوە بە لاوانی برایان کە لە ساڵی 1954 بە چاپ گەیەنرایەوە، دوای ئەوەی کە بوو بوو بە برایەکی کارا لە ناو کۆمەڵی برایانی موسڵمان دا، وەك لە پێشکەشکردنی ئەم چاپەیدا دەڵێت(بۆ ئەو لاوانەی کە من بە چاوی خەیاڵ هەستم پیێ دەکردن کە دێن و بەڕێوەن، بەڵام بینیمن کەلە واقعی ژیاندا ڕاوەستاون. . . تێدەکۆشن لە پێناوی خوادا بە سەروەت و سامان و گیانیان، بڕوادارن لە ناو ناخیاندا کە: عیزەت بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانانە). بۆ ئەم لاوانە، ئەوانەی لە خەیاڵمدا ئاوات و خەوبوون، کەچی ئەوان ڕاستی و واقعن، ڕاستییەك گەورەترە لە خەیاڵ واقعێك مەزنترە لە ئاوات.

بۆ ئەو لاوانەی لە ویژدانی غەیبە وە هەڵقوڵاون، وەك چۆن ژیان لەویژدانی عەدەمەوە هەڵدەقوڵێت، وە هەروەك چۆن ڕووناکی لە ناو تاریکیەکانەوە هەڵدەقوڵێت.

بۆ ئەوانەی بە ناوی خواوە، لە پێناوی خوادا، لە سەر بەرەکەتی خوا تێدەکۆشن. ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم.[3]

---

[1] هەمان سەرچاوە:155

[2] لماذا: 10-11 : بەکورتکراوەیی .

[3] العدالە الاجتماعیە:1.

## له ئه‌مریكا دوو ڕووداو سه‌ید له‌برایان نزیك ده‌كاته‌وه‌

ئه‌و ماوه‌یه‌ی كه‌ سه‌ید له‌ ئه‌مریكا مایه‌وه‌ كرۆكی ئه‌مریكای سه‌ركرده‌ی نه‌فامیی هاوچه‌رخی ناسی وه‌ك خۆی، وه‌ ئه‌و پیلان و دوژمنایه‌تی و ڕقه‌ به‌رایه‌تیه‌ی بۆ ڕوونبویه‌وه‌ كه‌ ڕۆژئاواییه‌كان- زایونی و خاچپه‌رست و بێبڕواكان- دژ به‌ موسڵمانان و ئیسلامه‌كه‌یان ئه‌نجامیان ئه‌دا، هه‌روه‌ها دژ به‌ بانگه‌وازی ئیسلامی كه‌ خۆی ده‌بینیه‌وه‌ له‌ برایانی موسڵمان (الاخوان المسلمون)ی پێشه‌نگی بوژانه‌وه‌ی ئیسلامی هاوچه‌رخ دا.

وه‌ به‌و پێ یه‌ی كه‌سه‌ید له‌ ئه‌مریكا خاوه‌نی هه‌ستێكی ئیسلامی و، ئامانجێكی ئیسلامی و، ته‌میزێكی ئیسلامی بوو، له‌ ڕووی ده‌رونیه‌وه‌ وا خۆی ده‌بینیه‌وه‌ كه‌ نزیكه‌ له‌ برایانی موسڵمانه‌وه‌، له‌ ئه‌مریكادا دوو ڕووداوی به‌سه‌ردا هات كه‌ زیاتر له‌ برایانی موسڵمان نزیكی كرده‌وه‌، چونكه‌ به‌ هۆیانه‌وه‌ پله‌وپایه‌ و ڕۆڵی برایانی موسڵمان و كاریگه‌ری ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ی له‌ سه‌ر ته‌وژم و هێزه‌ دژ به‌ ئیسلام و موسڵمانه‌كان بۆ ده‌ركه‌وت، وه‌ بۆی ده‌ركه‌وت كه‌ ڕۆژئاواو هێزه‌ پاشكۆكانی چه‌نده‌ به‌ڕق و قینن به‌رامبه‌ر ئه‌م جوڵه‌ ئیسلامییه‌!

**ڕووداوی یه‌كه‌م:** له‌ كاتێكدا كه‌ پێشه‌وا حه‌سه‌ن به‌نا- دامه‌زرێنه‌ر و ڕابه‌ری برایانی موسڵمان به‌ شێوازێكی تیرۆریستانه‌ له‌ لایه‌ن حكومه‌تی میسری و كۆشكی پاشایه‌تیه‌وه‌ له‌ شوباتی 1949دا تیرۆر كرا.

ئه‌وه‌ بوو سه‌ید تێبینی ئه‌و خۆشی و شادی ده‌ربڕینه‌- ته‌نانه‌ت گاڵته‌جاڕیه‌-ی كرد كه‌ لایه‌ن ئه‌مریكیه‌كانه‌وه‌ به‌بۆنه‌ی شه‌هیدبوونی حه‌سه‌ن به‌ناوه‌ ده‌ریانبڕی، هه‌روه‌ها شادی و دڵخۆشی ڕۆژنامه‌نووس و چاودێرانیشی بۆ ده‌ركه‌وت له‌ كاتێكدا له‌ ڕۆژنامه‌ و گۆڤاره‌كاندا لێكدانه‌وه‌ی خۆیان سه‌باره‌ت به‌ حه‌سه‌ن به‌نا ده‌نوسی و، به‌ مه‌ترسیدارترین پیاو له‌ ڕۆژهه‌ڵاتدا ئه‌یان دایه‌ قه‌ڵه‌م و، تیرۆر كردنی ئه‌م پیاوه‌ مه‌ترسیداره‌یان له‌ لایه‌ن حكومه‌تی میسریه‌وه‌ به‌ هۆكاری ڕزگاربوونی حكومه‌ت له‌ مه‌ترسیه‌كانی ده‌دایه‌ قه‌ڵه‌م!

هه‌روه‌ها كۆمه‌ڵی برایانی موسڵمانیان به‌ مه‌ترسیدارترین كۆمه‌ڵ و ڕێكخستن له‌ وولاتانی موسڵماندا داده‌نا، ئه‌مه‌ش به‌ هۆی هه‌ڵوێستی دژ وه‌ستانیان له‌ ڕووی پیلانه‌ ڕۆژئاوایی و ڕۆژهه‌ڵاتی و زایونیه‌كاندا دژ به‌ ئیسلام و موسڵمانان.

سه‌ید ده‌ڵێت: (ئه‌وه‌ بوو شه‌هید حه‌سه‌ن به‌نا كوژرا، وه‌ من له‌وێ بووم له‌ ساڵی 1949، لێدوانی ڕۆژنامه‌ ئه‌مریكیه‌كان، هه‌روه‌ها ئینگلیزه‌كان ـ كه‌ ده‌گه‌یشتنه‌ ئه‌مریكا ـ زۆر سه‌رنجیان ڕاكێشام سه‌باره‌ت به‌و گرنگیپێدانه‌ی كه‌ به‌ برایانیان ده‌دا، به‌ گاڵته‌ پێكردن و، خۆشحاڵبوونێكی ئاشكرا به‌هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی كۆمه‌ڵه‌كه‌یان وبه‌ لێدانی، وه‌به‌ كوشتنی ڕابه‌ره‌كه‌ی).[1]

**ڕووداوی دووه‌م:** هه‌وڵه‌كانی پیاوی ده‌زگای هه‌واڵگری به‌ریتانی (جون هیو **وورس** دن) له‌ به‌ ئاگا هێنانه‌وه‌ی سه‌ید له‌ مه‌ترسیه‌كانی برایانی موسڵمان.

(جون هیو **ورس** دن) له‌ به‌ریتانیاوه‌ هاتبوو بۆ میسر، له‌وێ له‌ زانكۆكانیدا خوێندی، وه‌شاره‌زایی له‌ موسڵمانان په‌یدا كرد، به‌ ئامانجی كۆكردنه‌وه‌ی زانیاری، پاشان ئیدیعای موسڵمان بوونی خۆی كردو ناوی (جمال الدین دن)ی له‌ خۆی نا، ئافره‌تێكی موسڵمانی میسری خواست به‌ ناوی **(فاطمة)**،پاشان میسری به‌ جێ هێشت و چوو بۆ ئه‌مریكا، وه‌ له‌وێ له‌ زانكۆكانیدا وه‌ك مامۆستا مایه‌وه‌.[2]

**دن** زیاد له‌ جارێك له‌ ئه‌مریكادا له‌گه‌ڵ سه‌ید كۆبویه‌وه‌، وه‌ هه‌وڵی له‌خۆگرتنی سه‌یدی دا بۆ به‌رژه‌وه‌ندی ده‌زگای هه‌واڵگری به‌ریتانی!

پێشنیاری ئه‌وه‌ی بۆ سه‌ید كرد كه‌ كتێبی**(العدالة الاجتماعیة في الاسلام)** وه‌ربگێرێته‌ سه‌ر زمانی ئینگلیزی له‌ به‌رامبه‌ری (10000) ده‌ هه‌زار دۆلاری ئه‌مریكیدا.

---

[1] العدالة الاجتماعیة:1-لماذا عدموني: 10

[2] محمد قوطب ئه‌مه‌ی بۆ گێڕامه‌وه‌

بەڵام سەید پێشنیارەکەی ڕەدکردەوە، کتێبەکەی دا بە ڕۆژهەڵاتناس (هاردی) لە زانکۆی (هالیفاکس) لە کەنەدا کەوەری بگێڕێت بە بێ بەرامبەر!

وە لە بارەی سەرکردەکانی ئەمریکاوە ئەم ڕاستییەی بۆ سەید خستەڕوو : زۆرێك لە فەرمانڕەوایان لە دەوڵەتی ئەمریکیدا، دەرچووی پەیمانگا تەبشیریەکانن.

ئەمەش ڕاستییەکە یەکێك لە مامۆستا ئینگلیزەکان پێی ووتوم، ئەوانەی لە ئەمریکا پێیان گەیشتم، وە دەیان ناوی دیاری بۆ ژماردم لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی و لە بوارە سیاسیەکاندا؟

ئەم ڕاستییانە کە- دن- بەمنی گەیاند لە بەرخوا نەبوو، بەڵکو -وەك لەوەودوا زانیم- دن یەکێك بوو لە پیاوانی قەڵەمی هەواڵگری بەریتانی، ئەوانەی کە زۆر بەلایانەوە گرنگە ڕۆژهەڵاتیەکان زۆر متمانە بەنیاز و مەبەستی ئەمریکا نەکەن.

ئەمەش وای لێکردم گومان پەیدا بکەم لەو شتانەی بۆمنی دەربڕی، ئەوەش بوویە هۆکارێکی تر کە لێکۆڵینەوەم دەربارەیان کرد.[1]

بەڵام سەبارەت بە برایانی موسڵمان (دن) زۆر قسەی بۆ سەید قوتب کردووە، وە ژمارەیەکی زۆر ڕاپۆرتی تێروتەسەل و دوور و درێژی دەربارەی برایان و جموجۆڵ و چالاکیەکانیان و ووتارەکانی ڕابەرەکەی حەسەن ئەلبەنای بۆ خوێندۆتەوە لە کاتی دامەزراندنی کۆمەڵی برایانەوە لە ئیسماعیلیە لە ساڵی 1928 تا کاتی هەڵوەشاندنەوەی لە ساڵی 1948 دا و، تێرور کردنی ڕابەرەکەی لە سەرەتای ساڵی 1949 دا.

**دن** لە سەر ئەم ڕاپۆرت و ڕاستیانەوە سەرنجی خۆی بۆ سەید دەربڕی بە وێنەکێشانی مەترسیەکی چاوەڕوان کراو کە بەسەر میسردا دێت ئەگەر ئەم کۆمەڵەیە -واتە برایان- فەرمانڕەوای میسربن، وە ئەوەی بۆ سەید ڕوون کردەوە کە ئومێدیان ڕاوەستاوە لە سەر دەستی لاوە ڕۆشنبیر و بیریارەکان وەك نموونەی سەید قوتب- تاکو ببنە بەربەست لە نێوان برایان و گرتنە دەستی دەسەڵاتدا!

**دن** ئامۆژگاری سەیدی کرد، کە لە دژایەتی کردنی بەریتانیاو هێرش کردنە سەری دەست بکێشێتەوە، چونکە ئەگەر بەریتانیا لە میسر بکشێتەوە ئەوە ئەمریکا جێگەی دەگرێتەوە، کە دوژمنایەتی لەو زیاترە.[2]

وە لە ساڵی 1950 دا (دن) کتێبێکی ترسناکی دانا بەناوی (**الاتجاهات الدينية و السياسة في مصرالحديثة**)، تیایدا لە بارەی برایانی موسڵمانەوە زۆری نووسیبوو، وە مەترسی برایانی موسڵمانی لە سەر جیهانی ڕۆژئاوا ڕوونکردبووەوە، ئاگاداری دەربارەی دابوو، وە بانگەشەی بۆ بەرهەڵستی ودژایەتی کردنی کردبوو.[3]

سەید ئەم کتێبەی لە ئەمریکا خوێندەوە، وەئەمەشی تۆمار کرد لە دۆسیەی ڕق و قینی ڕۆژئاواییەکان دژ بە برایانی موسڵمان، وەخستیە سەر هەوڵەکانی (دن)ی ڕۆژهەڵاتناس بۆ زیاتر گڕدانی ئەم ڕق و قینە لە لای ڕۆژئاواییەکان.

سەید دەڵێت: (لەقسەکردن لە مەترسی ئەم کۆمەڵەیە، لە سەر بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا لەناوچەکەدا، لە سەر ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا و ژیارەکەی لەوێدا. کتێبی تایبەت بەمە لەساڵی 1950دەرچوو، لە یادمە لەوانە کتێبێکی (جون هیو ورس دن) بوو بەناونیشانی (**التيارات السياسية والدينية في مصر الحديثة**).

هەموو ئەمانە سەرنجی ڕاکێشام بەلای گرنگی ئەم کۆمەڵەدا لەلای زایۆنیەکان و داگیرکەری ڕۆژئاوایی.[4]

---

[1] معركة الاسلام و الرأسمالية: 97-98

[2] محمد قوطب ئەمەی پێ ڕاگەیانم.

[3] الاخوان المسلين متشل :8پەراوێز.

[4] لماذا عدموني:10.

## بەکرێگیراوەکانی ئەمریکا لە میسر دژایەتی برایان دەکەن

سەید لە ساڵی 1950دا لە ئەمریکاوە گەڕایەوە بۆ میسر و زۆرنزیك بوویەوە لە برایانی موسڵمانەوە، وەئەوەش کە نزیکی دەکردەوە لە برایان هەموو ئەو شتانە بوو کە لە ئەمریکادا بینیبوی، سەرەڕای زیاد بوونی هۆشیاری ئیسلامی لەلای سەید و هەوڵە کرداریە ئیسلاحیەکانیشی کە ئەمانیش ڕۆڵیان هەبوو لەم نزیك بوونەوەیەدا.

هەروەها ئەو ڕێزە زۆرەی کە لاوانی برایان لەسەیدیان دەگرتو، سەرسامبوونیان بەبیرو بۆچوونەکانیانەوە، هەروەهازۆری سەردانەکانیان بۆ لای سەید کاریگەریان هەبوو لە زیاتر نزیك کردنەوەی لە برایانی موسڵمان.

بەڵام پێش شۆڕشی تەمووزی 1953 بەشێوەیەکی ڕەسمی نەچووبووە ناو ڕێکخستنی برایانەوە، بەهۆی سەرقاڵبوونی بەکارە ئیسلاحیەکانیەوە لەدژایەتی کردنی پاشایەتیو زەمینە سازکردن بۆ شۆڕش!

کاتێکیش شۆڕش ڕوویدا، لەگەڵ پیاوانی شۆڕشدا چووە گۆڕەپانی چەندین کارەوە، زۆربەی کاتەکانی لەوێدا بەسەردەبرد، بەشێوەیەك ڕۆژانە زیاد لە دوانزە سەعاتی لەگەڵدا بەسەر دەبردن، هەموو ئەم کارانە سەیدی دواخست لە پەیوەندی کردن بەبرایانی موسڵمانەوە. سەید دەربارەی ئەم ماوەیە دەڵێت: (پاش ئەوەی لە کۆتایی ساڵی 1950دا گەڕامەوە، هەندێك لە لاوەکانیان دەستیان کرد بە سەردانم، لەگەڵمدا دەدوان سەبارەت بە کتێبی — **العدالة الاجتماعية في الاسلام**- بەڵام ئەوان بارەگایان نەبوو- چونکە کۆمەڵی برایان تا ئەو کاتەش هەر دەست بە سەر بوو-.[1]

ئەمەش وەك ئەوەی نەبوونی بارەگایەك بۆ برایان و، نەبوونی چالاکی ئاشکرا و ڕەسمییان، هۆکارێکی تر بوو بێت لە هۆکارەکانی دواکەوتنی پەیوەندی کردنی سەید بە برایانەوە.

پاش ئەوەی جیاوازی کەوتە نێوان سەید و پیاوانی شۆڕش،ڕچەندە ئەو جیاوازییە فراوان بوایە، هێندە ماوەی نێوان سەید و برایان کورت دەبوویەوە، بەم شێوەیە هەموو هەنگاوێك کە لە پیاوانی شۆڕش دور دەکەوتەوە لە بەرامبەریدا لە برایان نزیك دەبوویەوە. . ئەوەی زیاتر سەیدی لە برایان نزیك کردەوەو ماوەی بە یەککەیشتنی سەید و برایانی کورت دەکردەوە، ئەوە بوو کە دوای گەڕانەوەی لە ئەمریکا بۆ میسر هەستی بە جەنگی بە کرێگیراوە ئەمریکیەکان کرد بۆ سەر برایان و، ڕێکەوتنیان لە گەڵ دوژمنان لە ناوەوە و دەرەوەی میسر لە سەر لێدانی برایان، بە تایبەتی پاش هەڵگیرسانی شۆڕش!

دیارترین نموونە لە سەر ئەمە ئەوەیە، کە سەید دەربارەی پیاوانی (**جمعية الفلاح**) دەگێڕێتەوە، کە کۆمەڵێك بوون ئەمریکا دایمەزراندبوون و ژمارەیەك لە پیاوانی فیکر و ئەدەب و سیاسەتی لێ کۆبوو بوویەوە، وە دکتۆر ئەحمەد حسەین سەرۆکایەتی دەکرد.

جەمال عەبدولناسر پیاوانی ئەم کۆمەڵەیەی لە خۆی نزیك دەکردەوە و شوێن و پۆست و پیشە گرنگەکانی پێ دەسپاردن، چونکە دژایەتی برایانی موسڵمانیان دەکردو ڕاپۆرتیان سەبارەت بەبرایان پێشکەش بە عەبدولناسر دەکرد و زیاتر ڕق و قینیان دەخستە نێو دڵی عەبدولناسرەوە دژبە برایان و مەترسی برایانیان لەسەر زیاد دەکرد، لێدان و دژایەتی کردنی برایانیان بۆ عەبدولناسر دەرازاندەوە و هانیان دەدا کە لە ناویان بەرێت!

لەسەروی ئەم بەکرێ گیراوانەوە فوئادجەلال وەکیلی کۆمەڵەی ناوبراو بوو. کە وەزیر بوو لە یەکەم حکومەتی دوای شۆڕش دا، کەسێکی نۆکەری عەبدولناسر بوو.

---

[1] لماذا أعدموني:11.

## سەید لەگەڵ برایاندا دوو جۆر پەیوەندی هەیە

لەوەی ڕابوورد ئەوەمان بۆ دەرکەوت سەید دووجۆر پەیوەندی هەبووە لەگەڵ برایاندا:

**یەکەم:** پەیوەندیەکی سۆزداریی، بەو واتایەی کە سەید لایەنگری برایانی موسڵمانی کردوەو متمانەی بەبانگەوازەکەیان هەبووە و لێوەیان نزیك بووە، سۆزو خۆشەویستی سەید بەرامبەر برایان بەجۆش بووە، ئەم پەیوەندیە سۆزداریە لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە سەید لە ئەمریکا بوو، وەلەوێ هەندێ ڕووداوو بەسەرهات لێی ڕوویدا، ئیتر متمانەی بەبرایان زیادی کردو ئەم متمانەیەش لە برایان نزیکی کردەوە.

لە دوای گەڕانەوەی لە ئەمریکا ئەم پەیوەندیە هەر بەردەوام بوو، بگرە زیادی کرد و سەید بەرووی برایاندا کرایەوەو لە نێوان ئەم و ئەواندا پەیوەندی و سەردان و ڕێکەوتن هەبوو، ڕۆژ بەڕۆژ ئەم پەیوەنیەش لە زیاد بووندا بوو.

**کەواتە:** سەید لە ساڵی 1951 دا- کە هەندێك لە نووسەران دایدەنێن بە ساڵی پەیوەندی کردنی بە کۆمەڵی برایانەوە- لایەنگری برایان بوو، پەیوەندیدار بوو لە گەڵیان تەنها پەیوەندیەکی سۆزداریی، هەندێك لە چاودێران سەید لەم قۆناغەدا بە برایەکی کارا لەڕیزی برایانی موسڵماندا بەڕەسمی دادەنێن، وە لە سەر ئەم بنجینەیەش هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن.

وە دەشێت عەبدولناسر لە سەر ئەم بناغەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردبێت و بە ڕەسمی بە ئەندامێکی کۆمەڵی برایانی دانابێت جا پێش شۆڕش یان دوای شۆڕش.

وە دەشێت هەندێك لە ئەندامانی برایانیش هەر لە سەر ئەم بناغەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردبێت.

بەڵام هەموو ئەمانە سەید ناکاتە برایەکی کارا لە برایانی موسڵمان، چونکە لە ڕاستیەکەیدا بەو شێوەیە نەبووە!

**دووەم:** پەیوەندیەکی ڕێکخستنانەی ڕەسمی، ئەمەش دوای ئەوەی سەید ژیانی خۆی تەیکرد لەو ڕێگەیەدا کەبەرەو برایان گرتبوویە بەرو بە شێوەیەکی کرداری پەیوەندی پێوە کردن، بوو بە برایەکی پەیوەست بە پەیڕەوو پرۆگرام و ڕێکخستنی برایانەوە، ئەمەش لە سەرەتای ساڵی 1953بوو، کە لە مەودوا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی لێوە دەکەین.

## دیمەنی سێیەم: سەیدقوتب لەگەڵ برایانی موسڵماندا

گەشتی سەید لە ڕێگەکەیدا بەرەو برایان بە پەیوەندی کردنی تەواوی بە کۆمەڵی برایان و، پەیوەست بوونی بە کۆمەڵە و پرۆگرام و ڕێکخستنەکەیانەوە کۆتایی پێهات.

لێرەدا باس لەوە دەکەین و، گرنگترین کارە ئیخوانیەکانی دەردەخەین و، بەرپەرچی هەندێ پروپاگەندە و هەندێ هەڵە لەم لایەنەوە دەدەینەوە.

### پەیوەندی کردنی بە برایانەوە لە سەرەتای ساڵی (1953)دا

زۆرێك لە خەڵکی بە هەڵەدا ڕۆشتون لە دیاریکردنی ساڵی پەیوەندی کردنی ڕێکخستنانەی سەید بە برایانەوە، هەندێکیان دایدەنێن بە پێش هەڵگیرسانی شۆڕش لە تەموزی 1952دا، وە هەندێکیان دەڵێن ڕاستەوخۆ دوای شۆڕش بووە بە ئەندامی برایان، وە بەم شێوەیە. . .

(جیلس کیبل) دانەری کتێبی (النبي والفرعون: التطرف الاسلامی في مصر) لە (شاهیدێکی زیندوی برایان سالح عشماوی- خاوەن ودامەزرێنەری گۆڤاری "الدعوە"- دەگێڕێتەوە کە ئەو بوو قەناعەتی بە سەید کرد بێتە ناو ڕێکخستنی برایانەوە.

ئەمەش بە لای ئەوەوە وەرچەرخانێکی مەزن بوو، چونکە لە کۆتاییدا قبوڵی کرد کە بچێتە ناو ڕێکخستنەوە، دوای ئەوەی بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك بەرپەرچی هەموو سنوردار کردنێکی ڕێکخستن و ئەحزابەکانی دەدایەوە.

سەید دوای پەیوەندی کردنی ووتوویەتی (لە ساڵی 1951دا سەرلەنوێ لەدایك بوومەوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا :من تەنها ئێستە لە دایك بووم ساڵی 1951).[1]

سەید بە شێوەیەکی ڕەسمی و کرداری لە سەرەتای ساڵی 1953دا پەیوەندی کرد بە کۆمەڵی برایانەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لە پیاوانی شۆڕش دابڕا و لە شوباتی 1953دا وازی لێهێنان.

دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێت(لەو کاتەدا پەیوەندیەکانم بە کۆمەڵی برایانەوە بە هێز دەبوو بەو ئیعتبارەی کە ئەو کۆمەڵە لەدیدی مندا پانتاییەکی باشوگونجاو بوو بۆ کار کردن بۆ ئیسلام لەسنورێکی فراوان لە هەموو ناوچەکەدا، بە جووڵەیەکی زیندووانەو، بوژاندنەوەیەکی هەمەلایەنەوە.

برایان ئەو جووڵەیە بوو کە لەدیدی مندا هیچ بەدیلێکی نەبوو کە هاوشانی بێت، بۆ وەستان لە ڕووی پیلانی زایونی و خاچپەرستی و داگیرکاریەکاندا، ئەوانەی کە لە بارەیانەوە زۆرێکم دەزانی –وە بە تایبەتی لەماوەی مانەوەم لە ئەمریکادا -.
وە لە ئەنجامی هەموو ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا، پەیوەندی کرداری من بۆ بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە لە ساڵی 1953دا بوو).[2]

دیاریکردنی ئەم بەرواره لەلایەن سەید خۆیەوە، بواری بۆ هیچ کەسێك نەهیشتۆتەوە کە شتی جیا لەمە بڵێت، هەروەها ئەم دیاریکردنە هەموو ئەو گێڕانەوەیانە بەرپەرچدەداتەوەکە نووسەرەکان ـ لە برایانی موسڵمان وجگە لەوانیش ـ دیاریان کردووەو دژی دیاری کردنەکەی سەید دەوەستێت. .

## حەسەن ئەلهوزەیبی وەڵامی سەیدقوتب دەداتەوە

مەحمودعەبدولحەلیم لەیاداشتەکانیدا (الأخوان المسلمین: أحداث صنعت التأریخ) باسی پەیوەندی سەیدقوتب بە برایانەوە دەگێڕێتەوە، بەتایبەتی پەیوەندی بە ڕابەری گشتیی حەسەن هوزەیبییەوە لە پێش چوونە ناو ڕێکخستنی برایانەوە لە ساڵی 1953دا.

کرۆکی باسەکە ئەوەیە کە برایانی موسڵمان لە دژی هێزەکانی ئینگلیز لە نۆکەندی سوێس لە کۆتایی ساڵی 1951 جەنگیان دەست پێکرد.

ئینگلیزیش زۆر بە دڵڕەقی و درندانەییەوە بەرپەچی برایانی دایەوە، ماڵەکانی خاپور کردن، کوشتاری لیێ کردن و بریندارییان هەبوو، وە لە ڕۆژانی یەکەمی جەنگەکەدا سێ قوتابی زانکۆ لە برایان شەهید بوون کە عادل غانم و عومەرشاهین و ئەحمەد ئەلنەمیسی بوون.

بیروڕای هەندێك لە برایانی موسڵمان -بەتایبەتی دڵگەرم و جۆشخواردووەکانیان - وابوو کە برایان بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە بچنە ناو جەنگەکەوە دژ بە ئینگلیز!

بەڵام ڕای کۆمەڵێکی تریان ئارامگرتن و چاوەڕوانی و هیواش هەنگاونان بوو، تا ئەو کاتەی هەلدەڕەخسێ، تاکو هێزەکانی ئینگلیز نەتوانن درویێنەی لاوانی برایان لە کەنارەکانی نۆکەندی سوێس بکەن!

ڕۆژنامەی (المصري) بابەتێکی محەممەد تاهیر مونیری بلاوکردەوە کە- بەرپرسی کەرتی برایان بوو لە نۆکەندی سوێس- تیایدا بانگەوازی دەکرد بۆ پشتگیری ڕای دووەم.

بەڵام مامۆستا محەمەد ئەلغەزالی- ئەندامی مەکتەبی ئیرشادی برایانی موسڵمان- لە ڕۆژنامەی(**المصري**)دا بە ووتەیەك لە ژێر ناوی (**لن تبلغ أمة هدفها الا اذا نظفت جبهتها الداخلية —رأي الاخوان المسلمین في الموقف**). تیایدا غەزالی بانگی

[1] سید قطب: عادل حمودة: 100
[2] لماذا أعدموني 11- 12.

دەکرد بۆیەکارهێنانی هێز و کۆبوونەوە و بەرەنگار بوونەوەی ئینگلیز، وە بۆ هاتنە مەیدانو ڕووبەڕووبوونەوەی برایان بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە دژبە ئینگلیز.

سەبارەت بەم دوو هەڵوێستە دژ بە یەکەی غەزالی و مونیر- لە کاتێکدا هەردووکیان لە برایان بوون- هەندێك لە خەڵکی ناڕەحەت بوون بە بەشداری نە کردنی برایان لە جەنگی ئینگلیزدا، وە ترسان لە گۆشەگیرکردنیان لە جیهادو تێکۆشان.

ئیحسان عەبدولقدوسی ڕۆژنامەنووس لە گۆڤاری(روز اليوسف)دا بابەتێکی بڵاوکردەوە تیایدا ناڕەزایی خۆی دەربڕی و ئاواتی خواست کە برایان هەڵوێستی ڕووبەڕوو بوونەوە دژ بە ئینگلیز بگرن و، لە بابەتەکەیدا ستایشی هەوڵە جیهادیەکانی برایانی کرد.

بەڵام چاودێران و دۆستانی برایان پێیان خۆش بوو گوێ بیستی ڕای ڕابەری گشتیی حەسەن ئەلهوزەیبی بن چونکە ڕای ئەو ووتەی یەکلایی کردنەوەیە لە بابەتەکەدا.

مەحمود عەبدولحەلیم دەڵێت: لێرەدا مامۆستا سەیدقوتب هەنگاوی نا- تا ئەو کاتەش لە ڕیزی هۆگر و دۆستانی برایاندابوو- هەنگاوی نا بە داوا کردنی ووتەیەکی یەکلاکەرەوە لە ڕابەری گشتیەوە، وە ڕۆژنامەی (**المصري**) ئەم داوایەی سەیدقوتبی لە ژێر ناونیشانی (رأي الاخوان و رأي الاسلام). لە 1ی کانوونی دووەمی 1952دا بڵاوکردەوە.

سەید لە وتەکەیدا ستایشی (ڕا)کەی ***محەممەد*** غەزالی کرد بوو، لە ووتەکەیدا هاتبوو: (لێرەدا وتەیەکی ڕوون و ئاشکرا هەیە پێویستە بە برایانی موسڵمان بوترێت، وەوا حساب دەکەم من لە هەموو کەس زیاتر بە تواناتر بم بۆ وتنی پێیان، بە حوکمی ئەو هاوڕێیەتی و متمانە و هاوکارییەی لە نێوان من و ئەواندا هەیە!

بە ڕاستی نە حاجی **تاهیر** مونیر سەرۆکی کەرتی برایان لە سوێس و نە مامۆستا ***محەممەد*** غەزالی ئەندامی مەکتەبی ئیرشاد ناتوانن ووتەی ڕەسمی برایان بڵێن. پەیڕەووپرۆگرامی برایان ئەو وتە ڕەسمیە بە مافی ڕابەری گشتی دادەنرێت)

(. . خەڵکی لەم ڕۆژانەدا پێویستیەکی زۆریان بە وتەیەکی ڕاستەوخۆو ڕوونو ڕەسمی لە برایانەوە هەیە ، چوونکە لێرەدا شت هەیە کە دەخوازرێت بوترێت. . . وە هاوەڵانی بزاڤی ئیسلامی وەکومن ئەوانە سورترین کەسانێکن لە سەر بیستنی ئەم ووتەیە، لەوەدا کە وڵات ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە ڕووداوەکان).

سەید کۆتایی بەوتەکەی دێنێت بە بانگکردنی ڕابەری گشتی بۆ وتنی وتەیەکی یەکلایی کەرەوە و چارەنووسساز: (هاوڕێیانی برایان لە پێش مونافیسەکانیانەوە ئەوانن داوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دەکەن. . . ئەمەش کاتی خۆیەتی. . دوای ئەوەی برایان چالاکیەکانیان بۆ گەڕایەوە و دەستیان بە جیهادیان کردەوە و. . . ).

لەم وتەیەی سەیدەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سەید تا نووسینی ئەم بابەتەش- لە سەرەتای 1952دا- بە ڕەسمی ئەندام نەبووە لەکۆمەڵی برایان، بەڵکو دۆستیان بووە، لە نێوان ئەم و ئەواندا خۆشەویستی و متمانە و هاوکاری هەبووە!

حەسەن ئەلهوزەیبی ڕابەری گشتیی برایانیش گومانی چاکەی دەبرد بە سەید قوتب، بە دوو ڕۆژ دوای داواکەی لە 1952/1/3دا لە ڕۆژنامەی (**المصري**)دا بە وتەیەك بە ناونیشانی (الاخوان. الاخوان) وەڵامی دایەوە، تیایدا دوپاتی سوربوونی برایانی کردەوە لە سەر جیهادو ئارەزوومەندیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئینگلیز، هەروەهاچاککردنی لایەنەکانی ژیان لەو گەلەداو، بانگەشەی بۆ کاری بێدەنگ کرد، وە ڕوونکردنەوەی هەڵوێستو جیهادی برایانی واز لێهێنا بۆ کاری برایان خۆیان و بە ئەرکوکاری خۆیانی دایە قەڵەم.

دەربارەی سەیدیش وتی: (نووسەری بەڕێز مامۆستا سەید قوتب: ڕۆڵی ئیسلام لە خەباتی جەماوەریدا بەردەوام ڕۆڵێکی ئیجابی بووە، ئەمڕۆ جەماوەر لە پێناوی دوو ئامانجی پیرۆزدا خەبات دەکات: ڕزگار بوونی ڕەها لە هەموو داگیرکەرێکی بێگانە. دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە هەموو ئیستغلال کردنێك. ڕای ئیسلام ڕوونە. ئەی ڕای برایان چییە؟ ئەگەر ڕای ئیسلام لەمەدا ڕوون بێت، ئەوا پرسیار کردن چ مانایەکی هەیە؟چونکە ڕای برایانیش بە هەمان شێوە ڕوونە). تا ئەوەی هوزەیبی بە سەیدی وت: (بەڵام بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران، ئەگونجێ نوسەر ڕای برایانی موسڵمان بزانێت تێیدا ئەوەی کە جگە لەو

نایزانن، لە پێویستیی دەستەبەر کردنی خانو و جل و بەرگ و خواردن و داو و دەرمان بۆ هەموو تاکێك لە دەوڵەتی ئیسلام دا. دەزانێت کە ئەمە لە کتێب و نامەکانیدا نووسراوەو دارێژراوە.

وە دەزانێت کە لە کتێبەکەی (**العدالة الجتماعية في الاسلام**) دا نووسراوە، ئەو کتێبەی کە برایانی موسڵمان لێی دەکۆڵنەوە و لە ناو کتێبەکاندا بە ووردی و گرنگی پێدانەوە دیراسەی دەکەن. بەڵام ئەوەی نووسەر لە ئێمەی دەوێت کە پرۆگرامێکی دیاری کراو و بەرنامەیەکی ڕوون دابنێین، ئەوە ئەمە لە درێژەی ئەوەدایە کە ئێمە دەمانەوێت کاتێك هۆکاری بلاّوکردنەوە دەستەبەر ببێت. هەروەك هۆکاری قسە کردن بۆمان تیایدا دەستەبەر بووە. دەشگونجێ ئەمە نزیك بێت ئەگەر خوا وویستی لێی بێت).[1]

## دیمەنەکانی سەرسامبوونی سەید بە حەسەن بەنا و برایانەوە

سەید لەسەرەتای ساڵی 1953داو لەپاش سەرسامبوونی بە پێشەوای شەهید حەسەن بەنای دامەزرێنەری برایانەوە بە شێوەیەکی ڕەسمی پەیوەندی کرد بە ڕێکخستنی برایانەوە ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە بونیادی کۆمەڵی برایانی لە سەر بناغەیەکی ڕاست و دروست بونیادنابوو، بونیادنانێکی ڕۆحی و دەروونی لە هەموو تاکێکی ناو کۆمەڵەکەدا، بونیاد نانێکی فیکری هاوسەنگ لە بیر و بۆ چوونی تاکەکان و کۆمەڵدا، وە بونیادی ڕێکخستنانەی پتەوی بەرز لە لای هەموو تاکێك و لای ئۆرگانە ڕێکخستنیەکانی کۆمەڵەکە!

سەید دەربارەی سەرسامبوونی بە حەسەن بەنا لە بابەتێکدا بە ناوی (حسن البنا و**عبقرية البناء**)دا دەڵێت: لە هەندێ کاتدا، ڕێکەوتنێکی تێپەڕیوو دەردەکەوێت، وەك ئەوەی قەدەرێکی نەخشە بۆ کێشراوبێت، وە داناییەکی ڕاپەڕێنراو بێت لە کتێبی دێر کێشراودا. .

(حسن البنا) بە ڕاستی تەنها ڕێکەوت بووە کە ئەمە نازناویەتی، بەڵام کێ دەڵێت ئەمە ڕێکەوتە، لە کاتێکدا ڕاستی هەرەگەورەی ئەم پیاوە بونیادنانە، وەچاك بونیادنانە، بەڵکو عەبقەریەتی بونیادنانە ؟

بانگەوازی ئیسلامیی زۆرێك لەپیاوانی ناسیوە، بەڵام بانگەوازکردن بونیادنان نیە، هەموو بانگخوازێك توانانی ئەوەی نیە ببێتە بونیادنەر، وە هەموو بونیادنەرێك ئەم عەبقەریەتە گەورە و مەزنەی پێ نەبەخشراوە لە بونیادناندا!!

ئەم تەلارە مەزنە. . برایانی موسڵمان. . ئەوە رووکاری ئەم عەبقەریەتە مەزنەیە لە بونیادی کۆمەڵەکاندا، عەبقەریەتی بونیادنان لە هەموو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی ڕێکخستنندا دەردەکەوێت. . لە ئوسرەدا، تا کەرت، تا ناوچە، تا مەڵبەندی کارگێڕی، تا دەزگای دامەزرێنەر، تا مەکتەبی ئیرشاد. ئەمە لە لایەنی شێوەی دەرەکیەوە- کە کەمترین ڕوکاری ئەم عەبقەریەتەیە - بەڵام بونیادنانی ناوەکی بۆ کۆمەڵەکەووردتر و گرنگترە، وە زیاتر بەڵگەیە لە سەر عەبقەریەتی بونیاد و ڕێکخستن. . کە بونیادنانی ڕۆحیە. . ).[2]

بەڵام سەرسام بوونی سەید بەو (بینا) گەورە و مەزنەی کە حەسەن ئەلبەنا دروستی کرد کە (برایانی موسڵمان)ە، لەم وتەیەیدا دەربارەیان دەردەکەوێت:(خوای گەورە تەمەنی برایانی مسوڵمان درێژ بکات. . ئەوەبوو میسر ئاوڕیدایەوە لە کاتێکدا کار گەشتبووە توندیەکەی، وە ئیشوکار ترازابوو، وە ئیتر جیهاد بریتی نەبوولە دروشم وچەپڵەلێدان، بەڵکو کارو قوربانیدان بوو، وەتێکۆشانیش بریتی نەبوو لە پڕوپاگەندەوهەراوهوریا، بەڵکو بانگکردن و شەهیدبون بوو. ئەوەبوو میسر ئاوڕی دایەوە، بەڵام جگە لە برایان کەسی تری نەدۆزیەوە. . کە ئامادەبن بۆکارکردن و، گورجوگۆڵ بن بۆبەخشین و، ئامادبن بۆ قوربانیدان و، ڕاهێنراوبن لە سەر تێکۆشان و، سووربن لەسەر شەهیدبوون. . . وازیان لە خەڵکی هێنا کە وتاربدەن و بنوسن، بەڵام خۆیان

---

[1] الاخوان المسلمون/ ج 2/480-489 درێژەی ئەم بابەتەی تێدایە.
[2] درسات اسلامیە: 225-226 بە کورت کراوەیی.

بەشێوەیەکی کرداری چون بۆ گۆڕەپانەکانی جیهاد، وازیان لە خەڵکی هێنا کە کۆببنەوەو بوروژێن، بەڵام ئەمان چەکەکانیان هەڵگرت و بەبێدەنگی ڕۆشتن). . .[1]

ڕووکارێکی تری سەرسامبوونی سەید بە کۆمەڵی برایان و ڕێزی سەید بۆ برایان- کە پاڵی پێوەنا بچێتە ناویانەوە- ئەمەیە کە لە بارەیانەوە دەڵێت:

(بەو پێیەی کە برایان لە دیدی مندا کێڵگەیەکی چاك و گونجاوە بۆ کارکردن بۆ ئیسلام بە جووڵەیەکی زیندوو کەرەوە و بوژاندنەوەیەکی هەمەلایەنە لە سنورێکی فراوان لە هەموو ناوچەکەدا، .

برایان ئەو بزافەیە کە لە دیدی مندا هیچ بەدیلێکی نیە کە هاوشانی بێت بۆ وەستان لە ڕووی پیلانە زایونی و خاچپەرستی و ئیستعماریەکان دا. . ).[2]

دەربارەی برایان دەڵێت: (ئەو سیاسەتە پیلان بۆ داڕێژراوە لە لایەن زایونیەتو خاچپەرستیو ئیستیعمارەوە بۆ تێکشکاندنی جموجوڵی برایانی موسڵمان داڕێژرا لە ناوچەکەدا، بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیو پیلانەکانی ئەو لایەنانە بە ڕاستی بە سەرکەوتوویی جێبەجێ کرا).[3]

پاش ئەوەی عەبدولناسر کەوتە دژایەتی کردنی برایان و، ئەندامەکانی لە زیندانەکان توند کردن، دەرگای لە سەر ڕکەبەرەکانی برایان ختسەسەر پشت، هێزی خراپەو خراپەکاری کۆمەڵگای میسری گرتەوە: (پاشان ئەم هەستە گەورە بوو، وە من بەرەنجامە واقعییەکان لە ژیانی کۆمەڵگای میسریدا دەبینم، لە بڵاوبوونەوەیەکی بێ شوماری بیروباوەڕە ئیلحادیەکانو لێك هەڵوەشاندنی ئەخلاقی، لە ئەنجامی تێکشکاندنی جموجوڵی برایانی موسڵمان و وەستاندنی چالاکیە پەروەردەییەکانیان، وەك ئەوەی ئەم کۆمەڵەیە بەربەستێك بووبێتو ئێستە هەرەسی هێنابێت، وە لە دوای ئەو تەوژمەکە سەریهەڵدا بێت -تەوژمی خراپەکاری-![4]

(. . مرۆڤ دەتوانێت بە ئاسانی هەست بە پەیوەندی ئەم داڕمانە ئەخلاقیە بە تێکشکاندنی جموجوڵی برایانی موسڵمان و قەدەغە کردنی چالاکیەکانیانەوە بکات.

هەروەك دەتوانێت پەیوەندی لە نێوان ئەم تێکشکاندنە و، لە نێوان نەخشە زایونی و خاچپەرستی و ئیسعماریەکاندا تایبەت بەم کۆمەڵەیە بکات، وە تایبەت بە ناوچەکە هەر هەمووی. . ).[5]

(دەروونم سارێژ بوو بەو قەناعەتەی پێویستە بزوتنەوەیەکی ئیسلامیی لەم ناوچەیەدا هەبێت، وەك بزوتنەوەی برایانی موسڵمان، وە پێویستە نەوەستێنرێت لە هیچ بارێك لە بارەکاندا. . . زایۆنیەت و خاچپەرستی و ئیستعمار ڕقیان لەم بزوتنەوەیە، دەیانەوێت تێکی بشکێنن. . پیلانە ڕوونەکانی- ئەم لایەنە- لە کتێبەکانیدا، هەمووی لە سەر بناغەی لاواز کردنی بیر و باوەڕی ئیسلامی دامەزراوە. . جا وەستاندنی چالاکیەکانی برایان زۆرێك لەم ئامانجانەی هێنایە دی، وە یارمەتی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕە ئیلحادیەکان و لێك هەڵوەشاندنەوەی ئەخلاقیی دا).[6]

## پەیوەندی کردنی سەید بە برایانەوە لە کاتێکدایە برایان ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجەی ترسناك دەبنەوە

ئەو کارە سەیرەی کە سەرنج ڕادەکێشێت و ئاماژە دەکات ئاماژەیەکی ئاشکرا لە سەر نەفسیەت وسروشتی سەیدقوتب، بریتیە لە (کات)ی پەیوەندی کردنی سەید بە برایانی موسڵمانەوە!

[1] دراسات اسلامية: 243.
[2] لماذا أعدموني: 11.
[3] لماذا أعدموني: 15
[4] لماذا أعدموني: 15-16
[5] لماذا أعدموني: 17
[6] لماذا أعدموني: 26

ئەو لە کاتێکی زۆر سەخت و نارەحەتدا پەیوەندی پێوە کردن، بە شێوەیەك برایان لە بەردەرگای تاقیکردنەوەیەکی گەورە و قورسدا بوون. بەڵکو ڕوو بە ڕووی دەرۆشتن!

سەید پێش ئەوەی بچێتە ناو برایانەوە زۆر نزیك بوو لە عەبدولناسرو پیاوانی شۆڕشەوە ئەوانەی کە فەرمان بە دەست بوون ، ئەوانەی پلە و سامان بە دەست ئەوانەوە بوو، لەبەر ئەوە ئاگاداربوو بەسەر ئەو پیلانانەی کە پیلان ڕێژان دژی برایان دەیان هۆنیەوە، وە ئاستی ئەو ڕق و قینە ڕەشەی دەزانی کە دڵ و دەروونیانی گرتبووەوە دژی برایان، وە ئاگادار بوو بەهەموو ئەوپیلانە ناوەکی و دەرەکیانەی لە لایەن دوژمن و بەکرێ گیراوەکانی ناوەوەدا دژ بە برایان ئەنجام دەدرا.

سەید بە هەموو ئەمانە ئاگادار بوو، زانیاری دەربارەیان هەبوو، هەموو شتێکی دەزانی. . لەگەڵ هەموو ئەمانەدا وازی لە دنیا هێناو ئەوەی لە دنیادایە بۆ عەبدولناسر و پیاوانی شۆڕشی بەجێهێشت، وە بە تەمای ئەوە نەبوو کە لە دەستی ئەواندا بوو لە پیشەو پلەو پایەو ماڵ و سامان، چووە ناو برایانی موسڵمان و پەیوەندی پێوە کردن و بووە تاکێك لە وان. . . چاك دەشیزانی بەرەوڕووی چی هەنگاو دەنێت، وەك ئەوەی بە چاوی خۆی ئەو نارەحەتی و ناهەمواریە ببینێ کە چاوەڕوانیان دەکات، وە ئەو جۆگەلە خوێنانەی دەبینی کە ڕێگەکەیانی پڕ کرد بووەوە. . لەگەڵ هەموو ئەوانەدا چووە ناو برایانەوە و پەیوەندی پێوە کردن!

پەیوەندی کردنی سەید لەم قۆناغەدا بە برایانەوە لەگەڵ مەنتیقی بازرگانیکردن بەبیرو باوەڕو بیرو بۆچوونەوە ناگونجێت، هەروەها لەگەڵ مەنتیقی هەڵبژاردنی سەلامەتی و خۆش گوزەرانیدا ناگونجێت!

ئەگەر سەید بازرگانی بیروبۆچوون و بیروباوەڕ بوایە و ئاواتی ماڵ کۆکردنەوە بوایە و پلەو پایە پەرست بوایە، ئەوە هەرگیز هەنگاوی بۆ ئەم کارە نەدەنا!

ئەگەر وەك ئەو بازرگانە دوو ڕووانە بوایە ئەوا ڕووی دەکردە عەبدولناسر و ئەوەی ئەو پێی خۆش بوایە وای دەکرد - وەك زۆرێك لە دوو ڕووەکان کردیان- یان بە لایەنی کەمەوە دوور دەکەوتەوە لە خاڵی مەترسی و گورەپانی ڕووبەڕووبوونەوە، وەپشتی هەڵدەکرد لەبرایانی هەنگاونەر بەرەوناڕەحەتی، وە پارێزراوی و خۆشگوزەرانی ناو ماڵی خۆی هەڵدەبژارد بە سەر ئازار و ئەشکەنجەدا !!

پەیوەندی کردنی سەید بە برایانەوە لە کاتێکی گونجاودا - بە مەنتیقی دوو ڕوو بازرگانەکانی بیر و باوەڕ- دەلالەت لە سرشت و دەروونی سەید دەکات، ئەو دەروونە ڕاستگۆ و توند و تۆڵ و بەوورە و ئازایەی. . ئەمە بەڵگەیە لە سەر ڕاستگۆیی و یەکلایی بوونەوە و دڵسۆزی و وەفاو لێهاتوویی و ئازایەتی و پێشڕەوی کردنی سەید!!

سەید لەم هەڵوێستەیدا ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەرمان وەبیر دێنێتەوە کە بڕوایان هێناو ئارەزومەندی ئەوە بوون کە لە لای خوا بوو، وە لە کاتی زۆر نارەحەتی و ترسناکدا بڕوایان هێنا، لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت) دەرۆشتن‌و چاڵ‌و کۆسپ‌و نارەحەتیەکانی ڕێگاشیان دەزانی، وە هەستیان بە قورسیەکەی دەکرد و دڕکەکانی سەر ڕێگاشیان دەبینی!

ئەم هەڵوێستەی سەید هەڵوێستی ئەو جولەکە ساڵحەمان بیردەخاتەوە کە ناوی (مخیریق) بوو، یەکێك بوو لە جولەکە هەرە دەوڵەمەندەکانی مەدینە و بەرزترین پلە و پایەی هەبوو لە ناویاندا، پاشان بڕوای هێناو موسڵمان بوو، لە کات و ساتێکی زۆر سەخت و نارەحەتدا شوێن پێغەمبەر کەوت، ئەویش کاتی شکانی موسڵمانان بوو لە جەنگی ئوحودا، بە شێوەیەك بینی دەیان موسڵمان شەهید بووە و دەیانی تریان بریندار بووە، وە پێغەمبەری(درودی خوای لەسەربێت) بە برینداری بینی، بینی فڕکان فڕکانی جەنگەکە لە دەستی بێباوەڕاندایە، وە واقعی ڕووداوەکە لە تێڕوانینێکی مادیانەوە هیچ ئاماژەیەکی سەرکەوتنی تیانەبوو بۆ موسڵمانان، لە گەڵ هەموو ئەمانەدا و لەم کاتە نارەحەتەدا (مخیریق) شایەتوومانی هێنا و، هەموو ماڵەکەی

بەخشی بە مووسڵمانان و، چووە مەیدانی گیان فیداکردنەوە، لە پێناوی خواداو لە گەڵ برا موسڵمانەکان دژ بە بێ باوەڕان جەنگا تا ئەوە بوو هێندەی نەبرد شەهید کرا. (مخیریق)ی شەهید گیانی پیرۆزی کەوتە سەر گوڕەپانی جەنگ![1]
بە ڕاستی پەیوەندی کردنی سەید بە برایانی موسڵمانەوە لەو کاتە سەختو نارەحەتدا چیرۆکی موسڵمان بوونی (مخیریق)ی شەهیدمان بیردەخاتەوە لە گۆڕەپانی جەنگی ئوحودا!

## لە کارە ئیخوانیەکانی سەید قوتب

سەید زیاد لەساڵ ونیوێك لەگەڵ براياندا كاريكرد، لە نێوان ئازاری 1953 بۆ تشرينی دووەمی 1954، کارکردنی سەید لەگەڵ برايان بەو شێوەيە بوو كە لەگەڵ ڕۆشنبیریەکەیدا بگونجایە، لە بەر ئەمەش بوو سەرکردایەتی برایان لە چوارچێوەی بەشی بڵاوکردنەوەی بانگەوازدا هەندێك كاری ڕۆشنبیریان پێ سپارد.

سەید دەڵێت: (لەگەڵ پێشوازیاندا بۆ پەیوەندی کردنم بە کۆمەڵەکەیانەوە، لە تێڕوانینیاندا بواری کار کردن بە نسبەت منەوە لە کارە ڕۆشنبیریەکاندابوو لە بەشی بڵاوکردنەوەی بانگەواز و وانەی سێ شەممان، وە ئەو ڕۆژنامەیەی کە وەك سەرنووسەر کارم تیادەکرد، وە نووسینی هەندێك نامەی مانگانە بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی، بەڵام بە گشتی خۆم لەکارە حەرەکیەکان بەدوورگرت).[2]

وە لە گرنگترین ئەو کارانەی پێی هەستا سەرپەرشتی کردنی ڕۆژنامەی (الاخوان المسلمون) بوو.

ئەم ڕۆژنامەیە هەفتانە بوو، هەموو ڕۆژی پێنج شەممەیەك لە مەڵبەندی گشتی برایانی موسڵمانەوە دەردە چوو.

لە بەرواری 17 ڕەمەزانی 1373 بەرامبەر 1954/5/20 سەید یەکەم ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیەی دەرکرد.

ئەم ڕۆژنامەیە دوای دەرچوونی (12) ژمارە، لە 6ی ذی الحجە 1373 بەرامبەر 1954/8/5 دا ڕاوەستا.

ئەو هۆکارانەی وای لە سەید کرد ئەم ڕۆژنامەیە ڕاگرێ دەستێوەردانی ڕاستەوخۆو چاودێری حکومەت بوو، بە تایبەتی دوای ئەو ناکۆکیە توندەی کەوتە نێوان حکومەتی شۆڕش و برایانەوە، بە شێوەیەك دەزگای چاودێری بڵاوکردنەوەی زۆربەیبابەت و لێکدانەوە و هەواڵەکانی قەدەغە کرد. .

سەید لەم ڕۆژنامەیەدا ژمارەیەك بابەتی نووسی، هیچ ژمارەیەکی نەبوو کە زیاد لە بابەتێك یان ڕوونکردنەوە یەکی سەیدی تێدا نەبێت.

سەید لە دادگایی کردنەکەیدا لە بەرامبەر (جەمال سالم) لە 1954/11/22دا بە ئاشکرا ئەوەی دەربڕی کە ئەم بەویستی خۆی ڕۆژنامەی (الإخوان المسليمن)ی داخستووە. چونکە بە هۆی چاودێریەوە نەیدەتوانی هەموو ئەوەی کە دەیویست بیڵێت و بڵاوی بکاتەوە.[3]

وە لە کارە ئیخوانیەکانی تری وتنەوەی وتاری سێ شەممان بوو لە مەڵبەندی گشتی برایان کە تیایدا هەزاران کەس ئامادە دەبوون.

کۆتا (وتاری سێشەممە) کە پێشکەشی کرد پاش گەڕانەوەی ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبی بوو لە وولاتی شام بە هەفتەیەك.[4]

---

[1] بڕوانە چیرۆکی مخيريق لە : الاصابە في تميز الصحابە ئیبن ماجە/3: 393

[2] لماذا أعدموني:

[3] بڕوانە ووتەکانی لە بەردەم دادگادا لە گۆڤاری (المجتمع) ژمارە 539 بەرواری 25 ئابی 1981 لاپەڕە 26

[4] هەمان سەچاوە لاپەڕە27

وه له كاره ئیخوانیه‌كانی له ده‌ره‌وه‌ی میسر، ناردنی بوو بۆ دیمه‌شق له 1953/3/2 تاكو ئاماده‌ی كۆنگره‌ی (**الدراسات الاجتماعية**) بێت له‌وێ، كه تیایدا لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی پێشكه‌ش كرد به ناونیشانی (**التربية الخلقية كوسيلة لتحقيق التكامل الاجتماعي**) له دوای كۆنگره‌كه‌وه كه به سه‌رۆكایه‌تی برایانی موسڵمان له سوریا به‌سترا، سه‌ید له زانكۆی دیمه‌شق بابه‌تێكی زۆر كاریگه‌ری پێشكه‌ش كرد، هاوه‌ڵه‌كه‌ی- مامۆستا محه‌مه‌د ئه‌لیاسین- وه‌صفی ئه‌م بابه‌ته ده‌كات به‌وه‌ی بابه‌تێكی جوان بوو، تیایدا بۆ ماوه‌ی دوو سه‌عات سه‌وڵی لێدا، هه‌ندێك لایه‌نی ڕه‌وانبێژی قورئانی و ئیعجازه‌كانی خسته ڕوو، نه كتێبی له به‌ر ده‌ستدابوو نه لاپه‌ڕه.[1]

هه‌روه‌ها له كاره ده‌ره‌كیه‌كانی تری، دانانی بوو له لایه‌ن برایانه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی به‌شداری بكات له‌و كۆنگره ئیسلاحیانه‌ی كه برایانی موسڵمان ده‌یان به‌ست و ڕابه‌رانی بیرو و فیكرو كاری ئیسلامیان له جیهاندا بۆ بانگ ده‌كرد، كه له به‌یتولمه‌قدیس به‌سترا له كانونی یه‌كه‌می 1953دا.[2]

له‌م كۆنگره‌یه‌دا سه‌ید چاوی به ڕابه‌رانی بیرو و فیكرو كاری ئیسلامیی له جیهانی ئیسلامیدا كه‌وت، وه پێی سه‌رسام بوون!!

## كورتی ماوه ته‌نزیمیه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ برایاندا

ئاشكرایه ماوه ته‌نزیمیه‌كه‌ی سه‌ید له گه‌ڵ برایاندا كورت بوو، بریتی بوو له ماوه‌ی نێوان په‌یوه‌ندی كردنی به كۆمه‌ڵی برایانه‌وه تا ڕوودانی كاره‌ساته ناهه‌مواره‌كه‌ی كه‌به‌سه‌ر برایاندا هات، كه ده‌كاته ماوه‌ی نێوان ئازاری 1953 تا تشرینی دووه‌می 1954.

هه‌ندێك له برایان كه‌می ئه‌م ماوه‌یه داده‌نێن به خاڵێك له سه‌ر باری ڕێكخستنی سه‌یدو دایده‌نێن به به‌ڵگه نامه‌یه‌كی تۆمه‌تبار كردن له دژی، ئه‌م ماوه ته‌نزیمیه كورته داده‌نێن به به‌ربستێك كه ڕێگری له سه‌ید بكات له ڕابه‌رایه‌تی كردنی فیكریی و بانگه‌وازیی و بزاوتن بۆ برایان!

وه –به هۆی كه‌می ئه‌و ماوه‌یه‌وه- سه‌ید به‌شیاو نازانن بۆ سه‌رۆكایه‌تی ڕێكخستنی نهێنی برایان له شه‌سته‌كاندا، وه وایان دانا كه شیاو نیه تاكو بیروباوه‌ڕه بانگه‌وازی و حه‌ره‌كییه‌كانی بۆ برایان پێشكه‌ش بكات، به تایبه‌تی له(**في ظلال القرآن**) و (**معالم في طريق**)دا، وه وا داده‌نێن سه‌ید-به‌هۆی كه‌می ئه‌م ماوه‌یه‌وه زیاتر له جارێك لایداوه له تێگه‌یشتنی برایان له كارو بانگه‌وازداو، ئه‌مه‌ش له چه‌ند جێگه‌یه‌كدا له (**الظلال**)و (**معالم**)داده‌رده‌كه‌وێت!

له‌و كه‌سانه‌ی له چه‌ند شوێنێكدا ئاماژه‌ی به مه‌داوه- به‌ڵام ده‌ری نه‌بڕیوه- به‌ڕێز مامۆستا مسته‌فا مه‌شهور ڕابه‌ری گشتیی برایانه، له كاتێكدا گۆڤاره ئیسلامیه‌كان- به‌تایبه‌تی المجتمع- گفتوگۆی له گه‌ڵ سازداوه، وه پرسیاری لێ كردووه ده‌رباره‌ی بانگه‌واز و بزاوتن، وه له كۆی ئه‌و پرسیارانه‌ی ئاراسته‌ی كراوه‌سه‌باره‌ت به: سه‌یدقوتب و فیكر و مه‌نهه‌جی ئه‌و بووه له بانگه‌وازدا.

له‌م باره‌یه‌وه گۆڤاری (**المجتمع**) پرسیارێك ئاراسته‌ی مامۆستا مه‌شهور و ئاراسته‌ی هه‌ندێك له سه‌ركرده‌كانی كاری ئیسلامی ده‌كات ده‌رباره‌ی (فیكری سه‌ید و مه‌نهه‌جی بزافی ئیسلامی).

له وه‌ڵامی مامۆستا مه‌شهوردا هاتووه كه: (به‌رده‌وامبوونی مامۆستا سه‌یدقوتب- ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت- له سه‌ر ئینتما بۆ برایان و كاركردن له‌گه‌ڵیان پێش زیندانی كردنی زیاد له سێ ساڵی نه‌خایاند- به‌نزیكه‌یی ـ (وه ئه‌لێم به‌ڵكو كه‌متر له دوو ساڵ)، وه له زینداندا هه‌موو ئه‌و جه‌ورو سته‌مانه‌ی بینیی و چه‌شت كه‌دژ به ئیسلام به‌ڕێوه‌ده‌چوو،هه‌ر له‌كوشتنی بانگخوازانی ڕێگه‌ی خواوه تا ئازاردانی نائاسایی، گومانی تیدانیه كه هه‌موو ئه‌مانه كاریگه‌ریان هه‌بوو له بیركردنه‌وه‌ی مامۆستا سه‌یدقوتبدا. وه له بیر و بۆچونیدا بۆ شێوازی گۆڕانكاری).[3]

---

[1] گۆڤاری الشهاب. ساڵی چوارەم. ژمارە:: 15/8/ 1970 لاپەڕە 9

[2] سيد قطب: يوسف العظم: 38 -39

[3] المجتمع: ساڵی هەشتەم- ژمارە 831 تأريخ 16 نيو 1981 ص 21

ڕاستە ماوەی پەیوەندی تەنزیمی سەید لەگەڵ براياندا لە پێش زیندانی کردنی کورت بوو، وە ڕاستە کە بارودۆخی زیندان پەیوەندیە تەنزیمیەکانی پچڕاندبوو لە نێوان سەیدو سەرکردایەتی ڕێکخستنی براياندا، وە سەید هیچ تایبەتمەندیەکی سەرکردایەتیکردنی ڕێکخستنی لە زینداندا نەبوو!! بەڵام هەموو ئەمانە نابنە بەڵگە لە دژی، وە نابنە ڕەخنە لە سەری. ئێمە ئەوە دەزانین کە (بانگەواز بۆ ڕاستگۆترە، نەك ئەو کەسەی زووتر پەیوەندی کردووە).

بەو واتایەی کە پلەوپایەو ڕێزی پیاوانی بانگخواز بۆ لای خوای گەورە، تەنها بە زوو پەیوەندیکردن و پێشکەوتن لە پەیوەندیکردندا دیاری ناکرێت ـ ئەگەرچی پێشکەوتن لە پەیوندیکردندا بەهای خۆی دەدرێتێ ـ بەڵکو پێویستە ڕاستی ئیمانوکرداریش بخرێتە سەر پێشڕەویە زەمەنیەکەوە، ڕەوا نیە دواکەوتنی زەمەنی دابنرێت بە بەربەستێك بۆ ڕێگرتن لە گەشتنی مرۆڤی ڕاستگۆو تەواو بۆ پۆستە گرنگەو پلەبەرزەکان.

ئێمە گەواهی ئەوە دەدەین سەید ڕاستگۆ بوو لە پەیوندی کردنیدا بە برایانەوە، ڕاستگۆ بوو ڕاستگۆی گوفتارو ئیمان، کردارو جیهان، بانگەوازو جوڵەو ڕێکخستن.

پاشان، کاتێك سەید هاتە ناو برایانەوە مادەیەکی خامی سەرەتایی نەبوو تاکو برایان لە سەرەتاوە پێی بگەیەنن، وە لە خاڵی سفرەوە لەگەڵیدا دەست پێی بکەن- وەك هەندێ لەو کەسانەی دێنە ناو ڕێکستنەوە-! بەڵکو سەید دوای ئەوە هاتە ناو برایانەوە، کە هەبوونی کاریگەرانەی خۆی سەلماند لە جیهانی فیکرو جووڵەو جیهاددا، لەکاتێکدا هاتە ناو برایانەوە کە بیریارێکی ئیسلامیی بوو، هەوڵدانی لەبەر چاوی هەبوو لەبانگەوازو چاکسازیو گۆرانکاریدا، بیروبۆچوونێکی ڕوونو ئاشکرای هەبوو بۆ کارو بانگەوازی ئیسلامی.

لە دوای نارەحەتیەکانەوە ڕاستیی ئیمان و ئاستی بانگەواز و تۆکمەیی ڕێکخستنی کرداریسەید دەرکەوتوچەسپا، هەلۆیستی گرت هەلۆێستگرتنێکی پیاوانە، ئەمەکداربوو ئەمەکداریەکی پیاوانە، ڕاستی کرد ڕاستگۆییەکی پیاوانە، لە کاتێکدا زۆرێك لەو کەسانەی لەپێش ئەمەوە پەیوەندیان کردبوو بەڕێکخستنی برایانەوە وازیان هێناو کەنار کەوتن!

لەبەر ئەوە ڕەوانیە کورتی ماوەی پەیوەندیەتەنزیمیەکەی پێش زیندانکردنی بکرێت بە خاڵێك یان ڕەخنەیەك لەسەری، بەڵکو پێویستە ئەوەمان لەبیرنەچێت کە بانگەواز بۆ ڕاستگۆیە، نەك دەستپێشخەر.

## تۆمەتباکردنی سەید بەو کارانەی پێی هەڵنەستاوە!

هەندێك لە نووسەرو لێکۆڵەرەوەکان لەم قۆناغەدا کۆمەڵێك کاری ئیخوانی دەدەنە پاڵ سەید، وە تۆمەتباری دەکەن بەئەنجامدانیان، لەگەڵ ئەوەدا لەڕاستیدا سەید ڕەدیان دەکاتەوە کەئەنجامی دابن.

**لەو تۆمەتانە!**

برایانی موسڵمان سەیدیان دانا بە نوێنەری خۆیان بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ حیزبی شیوعی میسری ـ کە دکتۆر فوئاد مرسی سەرۆکایەتی دەکرد ـ ئەمەش پاش نیوەی دووەمی ساڵی 1954، بۆ تەنسیق کردن لە نێوان برایانو شیوعیەکاندا لە پێناو بەرەنگاربوونەوەی فەرمانڕەوایی عەبدولناسرو لەناوبردنی.

دکتۆر عەبدولعەزیم ڕەمەزان لە کتێبەکەیدا بە ناوی (**الإخوان المسلمون والتنظيم السري**)دا باسی ئەمە دەکات وە دەڵێت کە ئەم هەواڵەی لە ڕۆژنامەی (رايە الشعب)ی حیزبی شیوعی میسریەوە وەرگرتووە.

ڕۆژنامەکە وا ڕادەگەیەنێت کە سەیدقوتب لەگەڵ نوێنەری حیزبی شوعی دووجار کۆبوونەتەوە: یەکەمیان لە 16تەمووزی 1952. دوومیان لە20ئابی 1954!

باس‌و لێکۆڵینەوە لە نێوان سەیدقوتب و وەفدی حیزبی شیوعیدا سەبارەت بە چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی پیاوانی شۆڕش‌و، ڕوخاندنی حکومەت و چۆنیەتی ڕێکەوتنی برایان‌و شیوعیەکان لەم بارەیەوە بەشێوەیەکی تایبەت ڕوویداوە!. بەڵام هیچ پەیوەندیکردنێك لە نێوانیاندا ڕووی نەداوە و هەمووان لەسەر ئەمە هاودەنگن![1]

ئەوەی وامان لێ دەکات ئەم گێڕانەوەیەی شیوعیەکان ڕەد بکەینەوە و بەدرۆیدا بخەینەوە، ئەوەیە کە ئەوان ڕق لە دڵ و شێوێنەری ڕاستیەکانن، وە ئەمیندارنین بە سەر مێژووەوە، لە گێڕانەوە و چیرۆکەکانیاندا زۆر شتیان شێواندوە و هەڵیان بەستووە،

پاشان!

برایان ئاماژەیان بە هیچ شتێك نەکردووە لەم بارەیەوە، وە سەیدقوتب خۆیشی لە کاتێکدا لە لایەن لێکۆڵەرەوەکانەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە و دادگایی کراوە ئاماژەی بە کاری لەو جۆرە نەکردووە، بێگومان سەیدقوتب مرۆڤێکی ڕاستگۆیە و ئەگەر شتێکی لەو شێوەیە ڕوویبدایە باسی دەکرد!

**لەو تۆمەتانە:** ئەوەیە کە سەیدقوتب ئەندامی ڕێکخستنی نهێنی برایان بووە، وە ئەو ڕۆژنامەی (الاخوان المسلمون)ی داخستووە و لە دژی حکومەتی شۆڕش دەستی کردووە بە (جەنگی بلاو کراوەکان) بە نهێنی ، وەسەرپەرشتی کردنی ئەو بلاوکراوە نهێنییەی کە ڕێکخستنی نهێنی بەناوی (الاخوان فی **المعرکة**) دەری دەکرد دراوەتە پاڵ سەید، کە سەید تیایدا عەبدولناسری ڕیسوا کردووە، وە باسی بەکرێگیراوی عەبدولناسری بۆ ئەمریکا و یەهود کردووە، وە ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە عەبدولناسر لەگەڵ جولەکەدا ڕێکەوتووە لە کاتی گەمارۆدانی لە (الفالوجا) لەلایەن جوولەکەکانەوە لە جەنگی فەلەستین دا، وە جولەکە هەر لەو ڕۆژانەدا عەبدولناسریان پرچەك کردووە بۆ بەرژەوەندی خۆیان!

وە سەیدقوتب بەنهێنی لە قاهیرەوە گوێزراوەتەوە بۆ (بنی سویف) تاکو لەوێوەوە جەنگی بلاوکراوە نهێنیەکان ئاراستەی حکومەت بکات!

لە تۆماری دادگاییەکانی برایان لە ساڵی 1954دا کە حکومەت دەری کردووە هەر خۆیشی سەرپەرشتی کردووە هاتووە - ئەمەش وامان لێ دەکات گومان لە ڕاستی ئەم ووتانە پەیدا بکەین، وە لە دەرچوونیدا بە شێوەیەکی کرداری لە پیاوانی برایانەوە- کە دادگا پرسیاری لە شەهید یوسف تەلعەت سەرۆکی (**النظام** الخاص)ی برایان کردووە دەربارەی ئەو کەسەی کە هەستاوە بە تەحریری هەواڵەکان بۆ بلاو کراوەی (الاخوان فی **المعرکة**)؟ ئەویش وتوویەتی: کە ناوی نابات. کاتێك وتراوە: ئایا سەیدقوتب بووە؟ وتوویەتی: بەڵێ.[2]

لە هەمان تۆماردا هاتووە کە دادگا بانگی سەیدقوتبی کردووە تاکو لەکاتی دادگایی کردنی ڕابەری گشتی (حەسەن هوزەیبی)دا شاهید بێت.

وەکیلی جێگری گشتی پرسیاری لێ کردووە: ئایا ڕابەری گشتی داوای لێکردویت کە ئامێرێکی (ڕۆنیو) بکڕیت بۆ چاپ کردنی بلاوکراوەکان؟ سەید وەڵامی داوەتەوە: داوای لێ نەکردوم کە من بیکڕم.

بەڵام کاتێك ڕۆژنامەکەم داخست - وە من بەوویستی خۆم دام خست، چونکە نەمدەتوانی ئەوەی کە دەمەوێت تیایدا بلاوی بکەمەوە بە هۆی چاودێرییەوە- زۆرێك تەعلیقاتم لە لامابویەوە کە چاودێری ڕوخسەتی پێ نەدەدام. شکاتی ئەم حاڵەتەم بردە لای ڕابەری گشتیی و پێموت کە ئێمە ناتوانین دەنگمان بگەیەنین بە جەماوەر، نەلە ڕێگەی ڕۆژنامەوە، نەلە ڕێگەی بلاوکراوەکانەوە.

ئەویش ئاگاداری کردم کە نوسینگەی بەڕێوەبردنی قاهیرە توانای هەیەو بلاوکراوەکانی برایان چاپ دەکات، ئەو دەتوانێت ئەم بابەت و تەعلیقاتانە چاپ بکات کە چاودێریی دەستی پێی ناگات.

---

[1] (سەیدقوتب)ی عادل حمودە/118-119 وەرگێڕاوە لە (الاخوان المسلمون و التنظیم) ی دکتور عبدالعظیم رمضان 199-200

[2] سەیدقوتب: عادل حمودە: 117-118

کاتێك گەڕامەوە بۆ لای سەرۆکی نوسینگەی قاهیرە، ووتی: جگە لە ئامێرێکی بچوك هیچی ترم لانیە.
ئەمەم بەرابەر گەیاند، ئەویش فەرمانی پێکردم کە نرخی ئامێرێکی (رۆنیۆ)ی تازە سەرف بکرێت بۆ ئەم مەبەستە، نەك بۆ بلاوکراوەکان، بەڵکو بۆ کاروباری چاپەمەنی لە نوسینگەی قاهیرە![1]
کە ئەم وتانە دێنین لە رێگەی ئەمانەتەوەیە، چونکە ئاگادارین بەسەریدا، بەلام بێدەنگ دەبین لەسەری‌و تیایدا دەوەستین، چونکە ئامێری یەقین پەیداکردنمان لە لا نییە بۆ فەرمان دان بە سەریدا، یان فەرمان دان بۆی، خوای گەورە خۆی زاناترە کە ئەمانە کامەیان بووەو چۆن بووە.
دەربڕینێکی سەید لەبەردەماندا هەیە، کە هەڵگری ئاماژەیەکی ڕوونە لەسەر ئەم بابەتە، لە ساڵی 1965دا بە لێکۆڵەرەوەکانی وتووە ( بەلام کارە حەرەکیەکان هەر هەمووی ئەوە من لێیانەوە دووربووم. پاشان ڕووداوەکانی ساڵی 1954 ڕوویدا، زیندانی کرام لەگەڵ هەموو ئەوانەی زیندانی کران لە کانوونی دووەمداو لە مارس دا ئازاد کراین، پاشان دوای ڕووداوی **المنشیة** دەستگیر کراموە، لە 26ی تشرینی یەکەمدا بە هەمان شێوە تۆمەتبار کرام بەوەی لە دەزگای نهێنیدام، سەرۆکی بەشی بلاوکراوەکانم لەو بەشەدا، بەلام هیچ یەکێك لە مانە ڕاست نەبون.
ئومێد دەکەم تێبینی ئەوە بکرێت کە من مەبەستم پاکانە کردن نییە بۆ خۆم، لە کارێك کە لە پێناویدا (10) ساڵ زیندانی کرام، تەواو بوو بەسەرچوو، ئێستا پاکانە کردنم لێی هیچ نرخێکی نییە، بەڵکو ئەمە لایەنێکە لەو وێنەیەی کە کاریگەری بەهێزی هەیە لە ڕووداوە نوێکاندا. )[2]

## سەید پشتگیری لە هوزەیبی دەکات لە دژی هەندێك لە برا سەرپێچیکارەکان

لە ساڵی 1953 دا ڕووداوێکی ترسناك لە نێو برایانی موسڵماندا ڕوویدا کە سەری کێشا بۆ ئاژاوەیەکی توند لە نێوان ڕیزەکانی برایاندا. لە دیاردەکانی ئەم ئاژاوەیە، ئەو لە سنوور دەرچوونە زۆرانە بوو کە عەبدولڕەحمان سندی سەرۆکی دەزگای تایبەتی برایانی موسڵمان ئەنجامی ئەدان.
ئەمەش گەیشتە ئاستێك کە مەکتەبی ئیرشاد بڕیار دەرکات بە دەرکردنی عەبدولڕەحمان سندی و ـ سێ کەس لە گەورە یاریدەدەرەکانی لە ڕیزی برایاندا ـ کە بریتیی بوون لە: ئەحمەد زەکی‌و ئەحمەد عادل‌و مەحمود سەباغ ـ ئەم بڕیارەش لە ڕۆژنامەکاندا بلاوکرانەوە، بڕیارەکە لە ئێوارەی ڕۆژی یەکشەمە 1953/11/22 دا دەرچوو.
ئەم چوار برا دەرکراوە هەوڵی ئەوەیان دەدا کە تەشویش دروست بکەن و پەشێوی بلاوبکەنەوە، ژمارەیەك لە برایان ـ کە لایەنگریان بوون ـ هەستان بە هێرش کردنە سەرماڵی ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبی تاکو ناچاری بکەن وازبهێنێت لە پۆستەکەی.
لە لایەکەوە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لە نێوان ئەم چوار برا دەرکراوەو سێ برای تر لە گەورە پیاوانی برایاندا هەبوو کە ئەندامی دامەزرێنەر بوون، کە بریتی بوون لە: ساڵح عشماوی، محەمەدئەلغەزالی، ئەحمەد عبدولعەزیز جەلال.
هەروەها لەلایەکی ترەوە پەیوەندیەکی بەهێز هەبوو لە نێوان ئەم برا هەڵگەڕانەوەدا کە لە فەرمانی سەرکردایەتی‌و مەکتەبی ئیرشاد دەرچوون و لە نێوان عەبدولناسردا، پەیوەندیەکە بەشێوەیەك بوو کە لەگەڵ عەبدولناسردا هەنگاویان ڕێك

[1] گۆڤاری المجتمع، ژمارە 539 -25 اغسطس 1981 لاپەڕە:37
[2] لماذا أعدموني، 12.

دەخست، لەگەڵیدا پیلانی لابردنی ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبیان ڕێکخست بۆ دانانی ڕابەرێکی نوێ لە لایەن خۆیانو عەبدولناسرەوە، وە دانانی مەکتەب ئیرشادێکی نوێ لە برا هەڵگەڕاوەکان کە لە لای عەبدولناسر پەسەند کراوبێت.

ژمارەی ئەم برا هەڵگەڕاوانە زۆر نەبوو، بەڵام تەمومژ دروست کردنیان لە ئاستێکی باڵادا بوو، لە لایەن حکومەتەوە بە سەرۆکایەتی عەبدولناسر پاڵپشتی دەکران.

ئەوەبوو کۆمەڵێك لە هەڵگەڕاوەکان لە ئێوارەی ڕۆژی هەینی 1953/11/27 دا مەڵبەندی گشتی برایانیان داگیر کرد . ئەم سێ بەڕێزەیان لەگەڵدا بوو، عەشماویو غەزالیو جەلال، لەوێوە ئیعلانی هەڵوەشاندنەوەی مەکتەبی ئیرشادو لابردنی ڕابەرەکەی حەسەن ئەلهوزەیبیو پێکهێنانی مەکتەب ئیرشادێکی نوێیان کرد، ئیعلانی دانانی شێخ (سەیدسابق) یان کرد وەك ڕابەری تازە، ساڵح عشماوی دانرا بە وەکیلی ڕابەرە گشتیەکە، لەو کاتەدا لەناو ئەو جەماوەرە کۆبوەوەدا لە مەڵبەندی گشتی دوو کەس لە یاریدەدرانی عەبدولڕەحمان سندی لەوێ بوون کە سەلاح ئەلعەتارو سەیدعید بوون، ئەم دووانە لەگەڵ پشتگیریان بۆ سەرکردایەتی شەرعی برایان بە سەرۆکایەتی هوزەیبی، کاریان بە دانایيو لێزانیو وردەکاریەوە دەکرد بۆ لاوازکردنی هەڵوێستی هەڵگەڕاوەکان ئەوانەی دەستیان گرتبوو بەسەر مەڵبەندی گشتییدا بۆ بڵاوەپێکردنی زۆربەیانو ناردنەوەیان بۆ ماڵەوە، تا کاتێك سەلاّح **شادی** کۆمەڵێکی زۆر لە برایانی لایەنگری سەرکردایەتی شەرعی هێنا، ئەو کاتە کۆتایی بە داگیرکردنی مەڵبەندی گشتی لە لایەن کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکانەوە هێنرا.

ئێمە لێرەداو لەم ئاشوبە مەترسیدارەدا هەڵوێستی سەیدقوتبمان بە لاوە مەبەستە، کە بە ڕاستی ئاشوبەیەك بوو دڵی هەموو برایەکی لە برایانی موسڵمان بریندار کرد، کاریگەریەکی خراپی بەجێهێشت لەسەر کاروانەکەیان بۆ ساڵەکانی داهاتوو.[1]

سەیدقوتب هەستی بەو هێڵە وردە دەکرد کە لە نێوان هەڵگەڕاوە پیلانگێڕەکانو لە نێوان عەبدولناسردا هەبوو، مەحمود عەبدولحەلیم ـ لە درێژەی ئەم بەسەرهاتە پڕ لە ناسۆرەدا ـ دەربارەی سەیدعید دەگێڕێتەوە کە ئەوو سەلاح ئەلعەتار فەزڵێکی گەورەیان هەبوو لە کۆتایی پێهێنانی داگیرکردنی مەڵبەندی گشتیدا ـ وەك دەڵێت:

لە کاتی چاوەڕوانی کردنماندا لە ئێوارەیەدا لە نزیك ماڵی ڕابەری گشتی، گەیشتین بە برا مامۆستا سەیدقوتب، کە زۆر توڕەو بوو، ئەم ڕستەیەی دەوتەوە: خۆشی لە خاچپەرستیو زایۆنیزمی جیهانی! سەید عید دەڵێت: دوای ئەوەی هەلم بۆ ڕەخسا کە بە مامۆستا سەیدقوتب بگەم لە زینداندا پرسیارم لێکرد: پەیوەندی خاچپەرستیو زایۆنیەتی جیهانی چیە بە جیاوازی ناووخۆی برایانەوە ؟

پێی وتم: مامۆستا عەلی ئەمین لە کاتژمێردووی دوانیوەڕۆی ڕۆژی ڕووداوەکە هەینی 1953/11/27 پەیوەندی پێوە کردم، پێی وتم: کوا هەستی ڕۆژنامەگەری لەلای تۆ؟ برایان بەچەك بۆ یەکتر هەستاونەتەوە ، تۆش لە ماڵەوە دانیشتووی؟

لە هەمان کاتدا هەستام ئۆتۆمبیلێکی تاکسیم گرتو یەکسەر ڕۆیشتم بۆ ماڵی ڕابەری گشتی، هیچ شتێکی نائاساییم بەدی نەکرد، ڕۆیشتم بۆ مەڵبەندی گشتی، هیچ شتێکم نەبینی کە سەرنج ڕاکێش بێت. هەروەها . . پاشان دوای ئەوە هەموو ئەو ڕووداوانە ڕوویاندا کە ڕوویاندا. ئەمەیە وام لێ دەکات کە دڵنیا بم ئەم کارە لە زیاد لە لایەنێکەوە پیلانی بۆ داڕێژراوە.[2]

سەیدقوتب وەك زۆربەی برایانی موسڵمان لەگەڵ سەرکردایەتی شەرعیدا بوو، لە ڕۆژی یەکشەممە 1953/11/29دا وەفدێکی گەورە لە کەرتە جیاجیاکانی برایان لە میسر هاتن بۆ مەڵبەندی گشتی، بۆ ئاشکرا کردنی پشتگیرییان لە ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبی. مەکتەبی ئیرشاد لە مەڵبەندی گشتی کۆبوویەوە و وەك ڕۆژنامەی (المصری) دەڵێت: ئەم برایانە

---

[1]

[2] الإخوان المسلمون: عبدالحليم / 3- 214.

وتاریان بۆ ئامادەبوان خوێندەوە: عەبدولحەلیم عابدین، پاشان بە دوایدا سەیدقوتب، پاشان حەسەن دوح و عیزەدین ئیبراهیم و سەعیدرەمەزان و خەمیس حەمودە، پاشان ڕابەری گشتی قسەی کردو سوپاسی قسەکەرانو ئامادەبوانی کرد.[1]

## دیمەنی چوارەم: یەکەم ناهەمواریەکانی سەید قوتب لە زینداندا( 1954 ـ 1964 )

### دەستگیرکردنی یەکەمجاری سەید لە سەرەتای ساڵی 1954دا

جیاوازی نێوان برایانی موسڵمان و عەبدولناسر قووڵ بوویەوە، عەبدولناسر لە دژی برایان نیەتی گۆڕی.

لە 15ی کانوونی دووەمی 1954دا کاتژمێر 12:45 سەرلەبەیانی سەرکردایەتی شۆڕش فەرمانی دەرکرد بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمان، وە داینا بە حزبێکی سیاسی و هەموو ئەوەی بەسەر حیزبە سیاسیە هەڵوەشێنراوەکاندا هاتووە، ئەبێت بەسەر ئەمانیشدا بێت.

ئەنجومەن بەیانێکی دوورودرێژی ڕاگەیاندو لە ئێزگەو لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردەوە، تیایدا هەستان بە کاری مەترسیدار درابووە پاڵ برایان گوایە میللەت بەش بەش دەکەن، هەڕەشە لە ئاسایش دەکەن، هەروەك چۆن بوونی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزو پیلان گێڕی لەگەڵیان دژ بە نیشتمان درابووە پاڵیان.[2] لەبەرەبەیانی ئەم ڕۆژەدا دەستگیرکردنی سەرکردەکانی برایانی موسڵمان تەواو بوو، لە سەرووهەموویانەوە ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبی، سەیدقوتب لە پێشەوەی برا دەستگیرکراوەکاندا بوو.

ئەمەش یەکەم دەستگیرکردنی سەید بوو، یەکەمجار بوو کە بچێتە زیندانەوە، چونکە لە ژیانی ڕابردوویدا شتی وای بۆ نەهاتبووە پێش و ڕووی نەدابوو لێی.

ئەوەی جێگەی ڕێزو سەربەرزیە بۆ سەید ئەوەیە کە ئەم زیندانی کردنەی لە پێناوی خوادا بوو، ئەو لەگەڵ هەزاران برا لە کۆمەڵی برایان توندکران لە زیندان لەبەرئەوەی کە دەیان وت (الله) پەروەردگاری ئێمەیە، ئەوانەی کە دەسگیریان کردن ئەوانە دژی دینو میللەت بوون، پاڵپشتو هاوڕێی شەیتانو دوژمنان و بێباوەڕان بوون.

ڕووداوەکانی زۆرانبازی لەگەڵ عەبدولناسردا پەرەی سەند، لە کاتێکدا سەرکردەکانی برایان لە زیندانەکاندا بوون عەبدولناسر محەمەدنەجیبی لە هەموو پۆستەکان دابڕی. لە 25 و28 ی شوباتی 1954دا برایانی موسڵمان خۆپیشاندانێکی گەورەی بەرفراوانیان ڕێکخست، کە ئەنجامەکەی سەردانەواندنی عەبدولناسر بوو بۆ داواکاریەکانیانو گێڕانەوەی محەممەد نەجیب بوو بۆسەرکورسی سەرۆکایەتی،هەروەها ئازادکردنی سەرجەم برا زیندانیەکانی لێ کەوتەوە.

ئازادکردنی برازیندانیەکان لەسەرەتای مانگی مارسەوە بە دوای یەکدا دەستی پێکرد، وە کۆتا کۆمەڵە کە ئازادکران لە لە 25ی مارس دا بوو کە ڕابەری گشتی برایانیان لەناوئەم کۆمەڵەیەدا بوو.

بەهەرحاڵ سەید لەم مانگەدا ئازاد کرا، بەڵام نازانین لە چ ڕۆژێکی ئەم مانگەو لەگەڵ چ کۆمەڵەیەکدا ئازاد کرا.[3]

### دەستگیرکردنەوەی سەید بۆ جاری دووەم لە تشرینی یەکەمی 1954دا

---

[1] الإخوان المسلمين : عبدالحليم، 3- 217.

[2] بڕوانە: البيان في الإخوان المسلمون. محمود عبدالحليم. 259- 167.

[3] بڕوانە: تطورات الأحداث، لەهەمان سەرچاوەدا، 3، 385- 398.

برایان دوای ڕزگاربوونیان لە زیندانەکان لە مانگی مارسدا دەستیان کردەوە بەکاری خۆیان، کارە ئیخوانیەکانی سەیدقوتب لە دوای ئەم ئازادکردنەوە زیادی کرد، ئەوە بوو ڕۆژنامەی (**الاخوان** المسلمون)ی دەرکرد، سەرپەرشتی ئامادەکردنی نامە و پەیامە ئیسلامیەکانی دەکرد کە لەمەڵبەندیگشتی و بەشی بڵاوکردنەوەوبانگەوازەوە لەو مەڵبەندەدا دەردەچوو.

پاش ئەوەی بۆشایی جیاوازیەکانی نێوان عەبدولناسر و برایان زیادی کرد، برایان دەستیان کرد بە دەرکردنی بڵاوکراوەی نهێنی، تیایدا هەواڵە نهێنیەکانی تایبەت بەو جیاوازیە و پێك گرژیەکانیان لەگەڵ عەبدولناسر تۆمار دەکرد، لە گەڵ زۆرێك لەشی کردنەوە و بیربۆچۆن و تەعلیقات، سەیدقوتبیش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە نووسینی ئەو شیکردنەوە و تەعلیقاتانەدا!

سەید لە سەر ئەم کارانەی لە سەرەتای مانگی نیسانەوە تا کاتی ڕووداوەکەی (**المنشية**) لە1954/10/26دا بەردەوام بوو!

ئەوەبوو لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا هەواڵێك ڕاگەیەنرا، کە گوایە عەبدولناسر لە کاتێکدا کە ووتاری خوێندۆتەوە لە بنکەی (هیئه التحریر)دا لە مەنشیە لە ئەنسکەندەریە لە هەولێك بۆ تیرۆرکردنی ڕزگاری بووە کاتێك تاوانبارێك بە گوللە هێرشی کردۆتە سەری.

جا ئەم پیلانە درایە پاڵ برایانی موسڵمان و، تیایدا مەحمودعەبدوللەتیف ئەندامی ئوسرەیەك لە ئوسرەکانی (**النظام** الخاص) لە قاهیرە تۆمەتبار کرا بەئەنجامدانی ئەم کارە، سەرپەرشتیاری ئوسرەکەش مافناس هەنداوی دویر بوو.

ئیتر حکومەت هەستا بە هێرشێکی بەرفراوان ،تیایدا هەزارەها لە برایانی موسڵمان دەستگیر کران و توند کران لە زیندانەکان![1]

سەیدقوتب لەم جارەشدا لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمەوە لە پێشەوەی زیندانی کراوەکاندا بوو، وە بە دەستگیر کردنی سەید و زیندانی کردنی نەهامەتی و ناڕەحەتیە ڕاستەقینەکانی سەید دەستی پێکرد، کە تا شەهید کردنی لە گەڵیدا ڕۆیشت و ئەو بەشە تەمەنەی کەمابووی تیایدا بەسەری برد.

لەم بارەیەوە دەڵێت: (پاشان ڕووداوەکانی 1952 ڕوویدا، دەستگیر کرام لە گەڵ ئەوانەی دەستگیرکران لە کانوونی دووەمدا و لە مارس دا ئازاد کران. پاش ئەمەش لە ڕووداوی مەنشیە لە 26 تشرینی یەکەمدا بە هەمان شێوە دەستگیر کرامەوە).[2]

## لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەید قوتب

دوای تێپەڕبوونی کەمتر لە مانگێك بەسەر دەستگیر کردنی سەید و سەرکردە و ئەندامانی برایانی موسڵماندا، دادگایەکی سەربازیان بۆ پێك هێنان کە ناونرا **بە دادگای شۆڕش**، سەرۆك و دادوەرەکانی هەموویان لە ئەفسەرانی سوپا بوون.

لە زیندانەکانەدا بە جۆرێك لە ئازاروئەشکەنجەدانو کوشتنوبرینێ بەربوونە گیانی برایان کەباس ناکرێت، برایانی موسڵمانیش بە ئیمانو ئارامگرتنو دامەزراویو عیزەتەوە ڕووبەڕووی ئەم ئازارو ئەشکەنجەدانە بوونەوە.

پشکی سەید لە ئازارو ئەشکەنجەدان گەورەتر بوو، بوو بە هۆی چەند جارەکردنەوەی ئەونەخۆشیانەی کەلەجەستەیدا هەبوون، وە چەندین نەخۆشی تریشی لێ کەوتەوە.

لەو دادگاییانەی بۆ دادگایی کردنی برایان پێك هێنرا بوو، دادگایی یەکەم بوو، کە جەمال سالم سەرۆکایەتی دەکرد لەگەڵ دوو ئەندامی تر: ئەنوەر ساداتو حسەین شافعی، هەرسێکیشیان ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوون.

لە مانگی تشرینی دووەمی 1954 دادگا ڕابەری گشتیی حەسەن ئەلهوزەیبی دادگایی کرد و، لە ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە 22 تشرینی دووەمدا دادگا بانگی سەیدقوتبی کرد بۆ ئەوەی شاهید بێت لە دادگاییەکەی ڕابەری گشتی دا.

---

[1] بڕوانە تطورات الاحداث لە هەمان سەرچاوەدا 3, 398/385

[2] لماذا أعدموني12

دادگا چەند پرسیارێکی ئاراستەی سەید کرد دەربارەی پەیوەندیەکانی بە مامۆستا هوزەیبییەوە، ئەویش بەڕاشکاوی و چاونەترسی و ئازایانە وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە، قسە و باس لە سەر پلانی برایان بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی عەبدولناسر لە هەردوو ساڵی 1953و1954دا، وە دەربارەی ڕێکەوتنی نێوان برایان و سوپابوو، وە ئەو بلاّو کراوانەی کە دەریان دەکرد و ڕۆڵی سەید تیایدا، وە دەربارەی بۆ چونی سەید لەو ڕووداوانەدا![1]

## سەید کاریگەری ئەشکە نجەدان لە سەر لاشەی نیشانی دادوەران دەدات

لە دادگایی کردنێکی برایاندا، لە بەردەم دادگای جەمال سالم ولە ساڵی 1954داو دوای دوومانگ لە ئامادەبوونی سەید لە زیندانەوە بۆ دادگا تا شاهید بێت لە دادگایی کردنی حەسەن ئەلهوزەیبی دا، جارێکی تر سەید بۆ شاهێدی بانگ کرایەوە.

سەید لە ماوەی دوو مانگدا ڕووبەڕووی ئەشکەنجەدانێکی بێ وێنە بوویەوە، بەشێوەیەك تووشی خوێن بەربوونێکی بە هێز بوو لە سییەکانیدا.

پاش ئەوەی چووە هۆڵی دادگاوە، لە نێوان ئەم و سەرۆکی دادگاکەدا ئەم دایەلۆکە ڕویدا:

**جەمال سالم:** ماندوێتیت پێوە دەردەکەوێت ئەی مامۆستا سەید. ئایا تۆشەکەتیت؟

**سیدقوتب:** بەڵێ، چونکە من پێش هاتنە ژوورەوەم بۆ دادگا شەش سەعات لەسەرپێی خۆم ڕاوەستاوم!!

**جەمال سالم:** ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئێمە هەموومان بۆماوەی دوورودرێژ ڕادەوەستین!

**سەیدقوتب:** بەلاّم ئێمەی برایانی موسلّمان لە زیندانەکاندا یاساکانی شۆڕشمان بە سەردا جێبەجێ دەکەن !!

پاشان سەیدقوتب لە بەرامبەر ئامادەبواندا کراسەکەی لەبەرخۆی داکەند و، لە سەر لاشەی سەید کاریگەری ئازارو ئەشکەنجەیەکی توند و تیژ دەرکەوت !!

زۆر بەپەلە جەمال سالم داوای هەڵگرتنی دانیشتنەکەی کرد بە بێ دواکەوتن !![2]

ئەم جولّە سەر سوڕهێنەرە کتوپڕە لە سەیدەوە بەلّگەیە لە سەر چاونەترسی و ئازایەتی سەید، ئەو لە دادگای سەربازی نەدەترسا، وە لە دادوەرە خوێن ڕێژەکانی نەدەترسا.

هەروەك ویستی هەندێك لەو ئازار و ئەشکەنجانەی لە زیندانەکاندا بە سەریاندا دێت بۆ خەلّکی بخاتەڕوو!

مەبەستی بوو لە جیاتی برایان دادوەرو حاکمەکان شەرمەزار بکات و، ڕاستی خوێنڕێژی و ستەمکاریان بخاتە ڕوو، ئەوەش بزانین کە هەرکەسێك بیوێرایە تەنها یەك ئاماژەی بۆ لێدان و ئەشکەنجەی ناو زیندان بکردایە لە بەردەم دادوەرە خوێنڕێژەکاندا ئەوا دەیانگێڕایەوە بۆ بەردەستی جەلادەکان تاکو ئازار و ئەشکەنجەی زیاتری بدەن.

کەواتە دەتوانین ئەو ئازار و ئەشکەنجەدانە بهێنینە پێش چاوی خۆمان کە بە سەر سەید قوتبیاندا هێناوە دوای ئەوەی گێڕاویانەتەوە بۆ زیندان لە دوای هەڵگرتنی دانیشتنەکە.

[1] گۆڤاری المجتمع، ژمارە 25/539 أغسطس 1981ص27و بڕوانە مذابح الاخوان: جابر رزق 113.

[2] گۆڤاری المجتمع ژمارە /25 أغسطس 1981ص27 /و بڕوانە مذابح الاخوان : جابر رزق 113 .

## دادگاییە نهێنییەکەی و حوکمدان بە سەریدا

دادگایی کردنی سەید لە بەردەم دادگای جەمال سالم دا کەمێك دواکەوت، وەبەهۆی ئەو نەخۆشیانەوەی کە توشی هاتبون ئازاردانە چەند جارە و چەندبارەکەی زیاتر لە سەر سەخت و گران بوو.

لە ڕۆژی سێیەم لە مانگی ئایاری ساڵی 1955دا گوێزرایەوە بۆ نەخۆشخانەی سەربازی بۆ چارەسەری ئەوەی بە سەریدا هاتبوو لە ئەنجامی ئازار و ئەشکەنجەدان، وە ئەو نەخۆشیە جۆراوجۆرانەی لەجەستە پاکەکەیدا بەزیندانی کردنە ترسناکەکەی بە سەریداهات، کە بریتی بوون لەنەخۆشی سنگ و فشاری خوێن و ڕۆماتیزم لە زۆربەی ئەندامەکانی لاشە ئازاردراوو داخکراوەکەیدا.

لە سیانزەی تەمووزی ساڵی 1955 دا، دادگای گەل، یان بڵێ (گاڵتەجاڕی گەل) حوکمی بە سەر ئەم پیاوە گرفتار و، زانا خواناسەدا دا بە زیندانی کردنی بۆ ماوەی پانزە ساڵ لە گەڵ کاری قورس دا!

وە حوکمەکەشی بەبێ ئامادە بوونی سەید بوو واتە (غیابی) بوو، چونکە نەیدەتوانی ئامادەی کۆبوونەوەکە بێت بە هۆی ئەوەی بە سەریدا هاتبوو لە ئەنجامی ناڕەحەتی و نەخۆشی و ئەشکەنجەدان"[1].

ئەم دادگایی کردنە بە نهێنی بوو، چونکە دەترسان لە ئازایەتی و چاونەترسی سەید کە خوێنڕێژیەکانیان لە بەرامبەر خەڵکیدا شەرمەزار و سەرشۆڕش بکات.

گۆڤاری (الشهاب) دەگێڕێتەوە کە لەو ڕۆژەدا بڕیاری دادگایی سەید درا بەڕێوەبەری زیندان حەمزە ئەلبسیونی هات بۆ لای سەید و پێ ی ووت :- دادگایت ناکەین چونکە دەستبەسەرکراویت !

دوای ئەمە هۆی ئامادەنەکردنی سەید زانرا، چونکە لەو کاتەدا بڕیار وابوو لیژنەیەك لە نوێنەرانی مافی مرۆڤی نێودەوڵەتی ئامادەی دادگایی کردنەکەی بن، لە بەر ئەوە ترسان کە سەید لە بەرامبەر ئەو لیژنەیەدا دەربارەی ئازارو ئەشکەنجەدان قسە بکات !

دوای ڕۆیشتنی نوێنەرەکەی مافی مرۆڤ سەید هێنرایە هۆڵی دادگایی کردنەوە کاتێك پرسیاریان لێ کرد، ئەویش کراسەکەی لابرد تاکو دادوەر و مافناس و ئامادەبوان جێگای ئەو ئەشکەنجە دڕندانەیە ببینن.

وە دوای بیستنی ئەوەی کە حوکمی پانزە ساڵ زیندانی بە سەردا دراوە، بە گاڵتە جاریەوە ڕەخنەی لێگرت و ووتی : ئەو ماوەیە کەمە، ئەی کوا حوکمی لە سێدارەدان؟[2]

سەید لە ڕاپۆرتەکەیدا دەربارەی نەخۆشیەکەی لەپێش دادگایی کردن دەگێڕێتەوە کە ئەو کاتێك لە زیندانی جەنگی دا بوو نەخۆش کەوت، وەك ئامادەکردنێك بۆ دادگایی گوێزرایەوە بۆ نەخۆشخانەی زیندانی توڕڕە، وە پاش ئەوەی نە خۆشیەکەی سووك تر بوو دووبارە گێڕایانەوە بۆ زیندانی جەنگی تاکو لە بەردەم جەمال سالم دا دادگایی بکرێت: (لەو کاتەدا من لە توڕڕە زیندانی بووم، تاکو ئەو کاتە حوکمم بە سەردا نەدرابوو، وەحوکمیشم بە سەردا نەدەدرا، ئەمەش بەهۆی پەرێشانی سێیەکانم وخوێن بەربوونێکی توندەوە.

پێویستی دەکرد بگوێزرێمەوە لە زیندانی جەنگیەوە لە 25 کانونی دووەمی 1955 دا بۆ بنکەی تەندروستی لیمان توڕڕە بۆ چارەسەر کردن. . . وەلە نیسان دا تەندروستیم کەمێك بەرەو باشی ڕۆیشت و بڕیاری گێڕانەوەم درا بۆ زیندانی جەنگی، تا پێشکەش بکرێم بۆ دادگایی کردن. . .)[3]

---

[1] سيد قطب : يوسف العظم 39 .

[2] گۆڤاری (الشهاب البنانیە)، ساڵی شەشەم، ژمارە 9 أیلول 1972 ص2 .

[3] لماذا أعدموني؟

## سەید لە زیندانی لیمان توررە

دوای ئەوەی حوکمی پانزە ساڵ زیندانی لەگەڵ کاری قورس بە سەر سەیددا سەپێنرا، گوێزرایەوە بۆ زیندانی لیمان توررە تاماوەی زیندانیەکەی لەوێ بە سەر بەرێت.

زیندانی لیمان توررە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دروستکراوە، هەر لەو کاتەوە ئامادە کراوە بۆ ئەوەی ببێتە زیندان، وە لە خراپترین زیندانەکانی میسرەو پیسترین و قیزەونترین و ئازاروئەشکەنجەدارترین زیندانە، برایانی موسڵمان گوێزرانەوە بۆ ئەوێ تاکو دەروونیان تیایدا شکست بخوات و، هیوا و ئومێدەکانیان تێیدا بمرێت، وە تاکو نەخۆشیەکان ببنە خۆرەی جەستەکانیان ![1]

سەید دەگێڕێتەوە کە برا زیندانیەکان دابەش کرابوون بە سەر سێ زیندانی سەرەکیدا: زیندانی توررە 400 برای تێدا بوو، کە زۆربەی سەرکردە ناودارەکانیان لە گەڵدا بوو.

زیندانی میسر: ئەمیش نزیکەی هەمان ژمارەی تێدا بوو.

زیندانی جەنگی: نزیکەی دووهەزار لە برایانی تێدا بوو.

لە ڕیزی برایانی زیندانی توررە هەندێك لە برا ئەفسەرەکانی تێدا بوو وەك: حسێن حەمودە، فوئاد جاسر، جەمال ڕەبیع. هەروەهامنیر ئەلدەللە و ساڵح ئەبو رەقیق هەبوون کە دووسەرکردەی برایان بوون.[2]

## سەید هەوڵدانێکی جەمال ڕەبیع دەگێڕێتەوە بۆ ڕزگارکردنی برایان لە زیندان

سەید لە ڕاپۆرتەکەیدا هەوڵدانێکی ئەفسەری زیندانی (جەمال ربیع) دەگێڕێتەوە بۆ هەلاتنی برایان لە هەرسێ زیندانەکەدا: **توررە** و **میسر** و **جەنگی**. وە دەستگرتنیان بەسەر چەکی پاسەوانەکەداو پاشان گەیشتنیان بۆ قاهیرە، دواتر ڕێکەوتنیان لەگەڵ یەکەکانی سوپادا، پاشان کاری کودەتاکردن، جەمال ڕەبیع لە بەهاری ساڵی 1955دەستی کرد بە کێشانی وێنەی ئەم پلانە و بۆ فوئاد جاسیرو حسەین حەمودەی باسکرد، بەڵام ئەوان ڕەزامەندییان لەسەری نەنواند، پاشان خستیە بەردەمی ساڵح ئەبوو ڕەقیق ئەویش ڕەخنەی لێگرتو بە توندی بەرپەرچی دایەوە.

پاشان جەمال ڕەبیع پلانەکەی خستە بەردەم سەید قوتبو پێی وت: (بەڕاستی لەناو برایاندا پەنجا پیاوی تیانیە دڵەکانیان ئاسن بێت، بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەی). سەیدیش تەعلیقی لەسەر داو وتی: (لەگەڵ نەبوونی شارەزاییم بەکاروبارە سەربازیە هونەریەکان، بەڕاستی هەستم کردووە کە ئەمە هەوڵێکی خۆکوژی شێتانەیە و بیرکردنەوە تیایدا ڕەوا نیە).

هەروەها سەید دەگێڕێتەوە کە جەمال ڕەبیع ئەیویست ڕەزامەندی ئەفسەری ئیخوانی مەعروف ئەلحەزری بەدەست بهێنێت کە زیندانی بوو لە زیندانی جەنگیدا، جا پاش ئەوە سەید گوازرایەوە بۆ زیندانی جەنگی تا دادگایی بکرێت لە نیسانی 1955دا، جەمال ڕەبیع زۆر داکۆکی لە سەید کرد کە پەیوەندی بکات بە ئەلحەزریەوە تایبەت بە پلانەکەی سەبارەت بە ڕاکردن لە زیندان، وە لە بەرامبەر ئەم پێداگرتنەی جەمال ڕەبیع، سەید هەواڵەکەی گەیاند پێی. پێش ئەوەی ئەلحەزری بزانێت کە خاوەنی ئەم پلانە کێیە، بە تووڕەییەوە بە سەیدی وت: ئەمە پلانێکە بۆ سازدانی قەسابخانەیەکی گەورە بۆ برایان پێکەوە

---

[1] بڕوانە وەصفی (سجن طرة) لە کتێبی الاخوان المسلمون لمحمود عبدالحلیم 3/ 494- 497 و کتێبی (عندما غابت الشمس)ی عبد الحلیم خفجی 181- 200.

[2] لماذا أعدمونی 19

چ ئەوانەی کە لە زینداندانو چ ئەوانەی لە دەرەوەی زینداندان. پاش ئەوەی زانی کە جەمال ڕەبیع خاوەنی پلانەکەیە داوای لە سەید کرد کە پێی بڵێت. **ئەوە کردارێکی خۆ کوژییە نابێ هەرگیز بیری لێ بکرێتەوە.**

سەید سەبارەت بە پلانەکەی جەمال ڕەبیع درێژە بە وتەکانی دەدات، کە چۆن ڕەبیع لە زیندانی توڕڕەوە گوێزرایەوە بۆ ئەلواحات لەگەڵ سەرکردەکانی برایاندا، وە چۆن لە ئەلواحات بەردەوام بوو لەسەر پلانەکەی بۆ هەڵاتنی برایان لە زیندان.

لە گێڕانەوەی سەید بۆ ڕووداوەکە، تێدەگەین کە سەید جەمال ڕەبیع تۆمەتبار دەکات بەوەی کە پلانەکەی پلانێك بووە لە حکومەتەوە بۆ سازدانی قەسابخانەیەك بۆ برایان، ئەمەش ئەوە ناسەپێنێت کە جەمال ڕەبیع پیلان گێڕبووە لەگەڵ حکومەت لەم کارەدا، بەڵکو دەگونجێت نیەتی چاك بوو بێت، بەڵام حکومەت ئیستغلالی کردووە بۆ جێبەجێ کردنی ئەوەی دەیەوێت، بەمەبەستی ڕێکخستنی قەسابخانەیەك بۆ برایان.[1]

لە هەمان کاتدا سەید پیلانێکی تر دەگێڕێتەوە کە حکومەت ڕێکیخستبوو بۆ دروستکردنی قەسابخانەیەك بۆ برایان لە زیندانەکاندا، کەسی پەیوەندیدار لەم کارەدا ئەفسەر عەبدولباسیت بەنای برای پێشەوای شەهید حەسەن بەنا بوو. کە سەرکردەی کەتیبەی زیندانی توڕڕە بوو.

سەید لە نەخۆشخانەی زیندانی توڕڕەدا نەخۆش بوو، دەگێڕێتەوە کە عەبدولباسیتی ئەفسەر سێ جار هاتووە بۆ لای بۆ نەخۆشخانە و قسەی لە گەڵدا کردووە دەربارەی پێویستی ڕزگاربوونی برایان لەوەی پێوەی گرفتارن لە زینداندا!

سەید دەربارەی عەبدولباسیت دەڵێت: (لەگەڵ زانیاریدا بەوەی کە ئەو ڕۆژێك لە ڕۆژان لە سەردەمی شەهید حەسەن بەنای برایدا لە برایان نەبووە. من پرسیارم لێ کرد: ئەم دەرباز بوونە چۆن دەبێت؟ ووتی: ئەو وەك سەرکردەیەکی کەتیبەکە، خۆی و چەکی کەتیبەکەی دەخاتە ژێر تەسەڕوفاتمانەوە، چونکە ئیدی لە توانایدا نەماوە دیمەنی تابوری برایان لە شاخەکەدا). -مەبەست ئەو ئەشکەنجەو کارە قورسانە بوو کە لەو شاخە پێیان دەکردن-بیبینێت.

سەیدیش بەرپەرچی پێشنیارەکەی دایەوە بە سوپاسکردنی لە سەر هاوسۆزیەکەی- ئەوەی کە ئاشکرا بوو- بەرامبەر برایان، پێی وت: (ئێمە وادەبینین ئەرکی خۆمان جێبەجێ کردووە، وە کاری خۆمان بە چوونە زیندان کۆتایی پێ هێناوە، ئێمە توانای ئەنجامدانی هیچ شتێکمان لە دەستدا نەماوە، جا هەرکەسێك جگە لە ئێمە ئەیەوێت کاربکات با کاربکات).

کاتێ سەید پێشنیارەکەی عەبدولباستی بەرپەرچ دایەوە سەردانی ئەویش بۆ سەید لە نەخۆشخانە پچڕا، پاشان حکومەت لەم جێگەیەوە گواستیەوە بۆ جێگەیەکی تر!.

## حسەین حەمودە و جەمال ڕەبیع گێڕانەوەکەی سەید پشتڕاست دەکەنەوە

ئەفسەری ئیخوانی حسەین حەمودە لە چاپی دووەمی کتێبەکەیدا (**أسرار حركة الضباط الحرار و الاخوان المسلمون**)دا هەندێك ڕاستکردنەوەی هێناوە بۆ گێڕانەوەکەی سەید دەربارەی پلانە ئاماژە بۆ کراوەکەی جەمال ڕەبیع، وە ئەم ڕاست کردنەوانە حەمودە و جەمال ڕەبیع گێڕاویانەتەوە و هێناویانە.

حسەین حەمودە بوونی پلانێك بە درۆ دەخاتەوە بۆ هەڵاتنی برایان لە هەر سێ زیندانەکەدا، وە پلانەکە بە سەرنەکەوتوو دادەنێت و، بیرکردنەوە تیایدا بە جۆرێك لە شێتی دەداتە قەڵەم.

حەمودە دەڵێت: (بۆ ڕاستی وبۆمێژوو، جەمال ڕەبیع بە هیچ جۆرێك لەو ماوەی لە لیمان توڕڕە بووم هیچ پرۆژەیەکی بۆ هەڵهاتن نەخستۆتە بەردەمم بە هیچ جۆرێك).

حەمودە دان بەوەدا دەنێت کە جەمال ڕەبیع ئەندامێك نەبووە لە برایانی موسڵمان، وە هەموو توانای ئەو- کە لە پێناویدا ئازار و ئەشکەنجە دراو حوکمی پانزە ساڵ زیندانی بە سەردا درا- ئەوە بوو کە وەك (أركان حرب) لە کەتیبەی فەلەستینی دا کاری کردووە، جا عەبدولناسر ویستی جەمال ڕەبیع بکاتە شاهیدێك دژی سەرکردەکەی کە عەبدولڕەئوف بوو، بەڵام ئیمان و ڕاستگۆیی و ڕەوشت و پیاوەتی و دینەکەی ڕێی لێگرت لەم کارە ناشرینە، وە وەفادر و بەئەمەك بوو بۆ عەبدولڕەئوفی سەرکردەی، وە نرخی وەفاکەشی بە گران دا!

[1] بروانە گێڕانەوەی سەید بۆ پێشنیاری عبدالباسط البنا . لە : لماذا أعدموني، ل21.

لە کاتێکدا حسەین حەمودە بەرپەرچی چیرۆکی بیرکردنەوە لە ڕاکردن و هەڵهاتن دەداتەوە لە هەرسێ زیندانەکەدا، ئەو دان دەنێت بە پلانەکەی جەمال ڕەبیع دا، لە هەوڵدان بۆ هەڵهاتنی برا زیندانیەکان لە زیندانی ئەلواحات دا.

حەمودە درێژەی پلانەکەی جەمال ڕەبیع بۆ هەڵهاتن دەگێڕێتەوە کە هەندێ دەست بە سەریشیان لەگەڵدا بووە لە میسرەوە بۆ سودان ویستویەتی- لە ڕێگەی (درب الاربعین)ی وشکانیەوە -هەڵبێن بۆ سودان و لەوێ داوای مافی پەناگیری سیاسی بکەن، یاسای عەبدولناسر شەرمەزار بکەن و لە ناوەوە و دەرەوەی میسر ڕایتەکێنن ڕاتەکاندنێکی توند، حەمودە دان بەوەدا دەنێت کە پلانەکە زۆری نەمابوو پێ بنێتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە لە زیندانی ئەلواحات ئەگەر بهاتایەو عەبدولناسر نامەی بۆ برای ئەفسەر حسەین حەمودە نەناردایە کە با برایان ئەوەی کە ڕوویداوە لە بیری خۆیانی بەرنەوەو لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەنەوە، ئەوان لە کەناری ڕزگاربوون و ئازاد کردندان، پاشان ڕووداوەکان بەدوای یەکدا هاتن هەرلە خۆمالّی کردنی نۆکەندی سوێس تا هێرشە سێ قۆڵیەکە بۆ سەرمیسر لەساڵی 1956دا، لەم کاتەدا جەمال ڕەبیع پلانەکەی پشتگوێخستو وازی لێ هێنا.

حسەین حەمودە دەربارەی گێڕانەوەکەی سەید بۆ پلانەکەی دەڵێت: شەهید سەیدقوتب پێش لە سێدارەدانی ئەشکەنجە درا ئەشکەنجەدانێکی توند، ستەمکاران ئەوانەی ئەشکەنجەیان دەدا چاوپۆشی ئەوەیان لێنەدەکرد کە نەخۆشی دڵو سییەکانی هەیە.

لە ووتە بڵاوەکانیەوە، ئەوە دەبەخشێت کە سەید لە سالّح ئەبو ڕەقیقەوە زانیاری پێگەیشتووە بە هەوڵەکانی جەمال ڕەبیع بۆ قەناعەت پێکردنی برایان تا لە زیندانی ئەلواحات هەڵبێنو ڕابکەن، ئەو کارەی کە مامۆستا سالّح ئەبو ڕەقیقی پێ ڕازی نەبوو. ئەم بەشە لەوتەکانی شەهید سەیدقوتب بە تەواوی ڕاستە.

بەڵام ئەو بەشەی تایبەتە بە هەوڵدانی جەمال ڕەبیع بۆ دەربازبوون لە هەر سێ زیندانەکە بە زەبری هێز، ئەوە من بە تەواوی ئەوە بە دوور ئەگرم کە شەهید سەیدقوتب دانی بەمەدا نابێت. بەڕاستی ئەوە لێکۆڵەرەوەیەك بۆی هەڵبەستووە. چونکە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکانی سەردەمی عەبدولناسر لە بێویژدانەکان بوون، ئەوانەی تەزوویری قسەو دانپیانانەکانیان دەکرد بۆ خزمەتی گەورە فەرمانڕەواکانیان.

کاتێکیش حسەین حەمودە وتەکەی سەیدقوتبی بۆ کەمال ڕەبیع باس کرد، زەردەخەنە گرتیو وتی: خوا لێیان ببورێت، بەهەرحالّ تۆ ڕاستییەکان دەزانیت.

بەڵام من هەر لە سەرتاوە مامۆستاکەم سەیدقوتب بە پاك دەگرم لەوەی کە لە لێکۆڵینەوەدا ئەمە بەسەر زمانیدا هاتبێت، یان لە هەر جێگەیەکی تردا، هەر شتێك دەربارەی ئەم خەیاڵە تایبەتیە کە ناویان ناوە هەڵاتن لە زیندانەکانی قاهیرە، کە ئەوە کارێکی گاڵتەجارِیە.

هەروەها ئەوانیش هەردووکیان نەفی ئەوە دەکەن سەیدقوتب ئەو لێدوانەی دابێت بۆ لێکۆڵەرەوەکە لە ساڵی 1965دا، هەردووکیان دووپاتی ئەکەنەوە، کە ئەم بڕگەیە بۆ سەید هەڵبەستراوە، لێکۆڵەرەوەکان خستویانەتە ناو دان پێدانانەکەیەوەو بۆیان زیاد کردووە.

خوای گەورە زاناترە بە ڕاستی کارەکە کە چۆن بووە، ئێمە بڕوامان بە ڕاستگۆیی هەردوو برا حسەین حەمودەو جەمال ڕەبیع هەیە، وەدەست تێوەردانو یاری پێکردنی لێکۆڵەروەکانیش بۆ دان پیانانو ڕاپۆرتەکەی سەید بەدور نازانین، وە نەفی ئەگەری زیاد کردنی وتە ناکەین لەلای ئەوانەوە بۆ سەر وتەکانی سەید کە بە دەستی خۆی نوسیویەتی.[1]

[1] أسرار حركة الضباط الأحرار والإخوان المسلمون. چاپی دووەم، 211ـ 218.

## سەید کورتەی قەسابخانەکەی برایان لە زیندانی توڕرە دەخاتە ڕوو

قەسابخانەیەك بۆ برا زیندانیەکانی زیندانی توڕرە دروستکرا، ئەنجامدانی ئەم قەسابخانەیەش بەڕەزامەندی زەکەریا محێدین وەزیری ناوخۆی ئەو کاتە و عەبدولناسری سەرۆکی بوو.

پێنج گێڕانەوە هەیە کە لەلایەن پێنج برا لە برایانی موسڵمان ئەوانەی کە لە زینداندا بوون گێڕاونەتەوە، ئەوپێنج برایە چاودێری ڕووداوەکانی قەسابخانەکەیان کرووەو بە دوورودرێژی بەسەرهاتەکەیان گێڕاوەتەوە، جابر رزق -بە ڕەحمەت بێت- ئەم پێنج گێڕانەوەیەی لە کتێبەکەیدا (**مذبحة الإخوان في ليمان طرة**)دا گێڕاوەتەوە:

ژماری برا زیندانییەکان لە زیندانی توڕرە سەدو هەشتاو سێ برا بوون کە بەسەر ژوورەکانی زیندانەکەدا دابەش کرابوون.

بەڕێوەبەری زیندان ـ لە کاتی قەسابخانەکەدا ـ ئەفسەر سەیدوالی بوو، ئەفسەرانی زیندانیش: عەبدولعال سەلومە، عەبدوللەتیف ڕوشدی و، عەبدوڵڵا ماهر بوون.

لە پێش قەسابخانەکەوە سوکایەتی کردنی زۆر دەرهەق بە برا زیندانیەکان لە لایەن ئەفسەرانی زیندانەوە یەك لە دوای یەك ڕوویدەدا ، کۆتا سوکایەتی لە لایەن ئەفسەری زیندان عەبدوڵڵا ماهرەوە بوو بۆ یەکێك لە برا زیندانیەکان بە ناوی عەبدولغەفار سەید کاتێك خێزانەکەی سەری لێدا، بەرگری سەردانەکەی لێ کردو لەگەڵ براکانیدا ناردی بۆ ئەوەی ئەشکەنجە بدرێت.

برایانی زیندانیکراو تەواو دڵنیا بوون لەوەی کە لە لایەن ئەفسەرانی زیندانەوە پیلانێك بەڕێوەیە ـ بە تەنسیق لەگەڵ عەبدولناسر و وەزارەتی ناوخۆ ـ بۆ قەتڵو عام کردنی زیندانیەکانی توڕرە، پیلانەکەش بەمشێوەیەدەبێت کە زیندانیەکان دەچن بۆ شاخێك کە سێ کیلۆمەتر لە زیندانەکەوە دوورە ـ پاشان لەوێ بگیرێن وەك ئەوەی هەوڵی ڕاکردنیان داوە!

کەمێك پێش قەسابخانەکە ئەفسەرانی زیندان کاریان لەسەر برایان کرد بە کەلەپچە کردنیان بە زنجیری ئاسنین تاکو بە زۆرەملێ بەرەو شاخ بڕۆن، تا لەوێ فیشەك باران بکرێن.

برایانیش ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە نەڕۆن بۆ شاخ، وە داوای ئامادەبوونی نوێنەرایەتی لێکۆڵینەوەیان کرد، چونکە ژیانیان جێگەی مەترسی بوو لە لایەن بەڕێوەبرایەتی زیندانەوە، لەبەرئەوەی تەقەیان لێ دەکردن بەو بیانووەوە کە ئەمانە ڕاکردووی هەڵگەڕاوەن.

لە بەیانی ڕۆژی شەممە 1957/6/1 لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی زیندانو لە نێوان برایاندا مشتومڕ سەبارەت بەڕۆشتن بەرەو شاخەکە ڕوویدا، تیایدا برایان سوربوون لەسەر داواکردنی نوێنەرایەتی لێکۆڵینەوە بۆ پاراستنیان.

لە نیوەڕۆدا لیوا ئیسماعیل هیمەت جێگری بەڕێوەبەری مەسڵەحەی زیندانەکان لەگەڵ کەتیبەیەکی چەکدار لە سوپاوە ئامادەبوو، لە کاتێکدا برایان لە هۆڵو ڕێڕەوەکاندا بوون سەربازەکان شوێنەکانی خۆیان گرت لە بینایەی زیندانەکەداو پاشان ئیسماعیل هیمەت فەرمانی بۆ سەربازەکان دەرکرد بە دەستپێکردنی جەنگ، بە وتەی **لێدەن** یان **بوەشێنە**.. ئیتر هەر فیشەك بوو بەروە هۆڵو مەمەڕەکان دەهات، یەکێك لە برایان گومانی وابوو کە فیشەکی پووچەو تەنها بۆ ترساندنە وتی: ئەوە پوچە ـ واتە بەتاڵە ـ هەر ئەوەندە بوو فیشەکێك هاتوو ناوچەوانی پێکاو ئەو برایە بوویە یەکەم شەهید. یەکێك لە برایان هاواری کرد ئەوە لێدانی پڕاوپڕە، بچنە ناو ژوورەکانو دایان بخەن.

فیشەك باران بەردەوام بوو، برایان ژمارەیەك شەهیدو بریندباریان لە مەمەڕەکاندا دا، پاشان سەربازەکان هێرشیان بردە سەر ژوورە کراوەکانو چەند برای تێدا بوو شەهیدیان کردن، بەڵام خوای گەورە برایانی ژوورە داخراوەکانی ڕزگار کرد.

وە لە داوی کۆتایی هاتنی قەسابخانەکە ئەنجامەکەی شەهید بوونی بیستو یەك براو بریندار بوونی بیستو سێی برای تربوو.

لە دواییدا سەلاح دەسوقی ئەلشەتاوی کەسکرتێری ئەنجومەنی وەزیرانی ئەو کاتەو کەسێکی نزیکبوو لە عەبدولناسرەوە هات بۆ لێکۆڵینەوە، سەرباز و ئەفسەرەکان ترسان لەوەی بەرپرسیاربن ـ هەروەك یەکێك لە ئەفسەرەکان بەناوی محەمەد

سوبحیەوە دەگێڕێتەوە ـ بەڵام سەلاح دەسوقی بە پیرۆزباییەوە بە بەڕێوەبەری زیندان سەید والی گوت: خۆزگە ڕزگاریشت بکردینایە لەولانەی کە ماونەتەوە. !

بەوتەکەی سەلاح دەسوقی لێکۆڵینەوەکە وەرچەرخا بە ڕوویەکی تردا، لە بری ئەوەی وەك زیندانی بۆ برایان بڕوانن، کە مافیان هەیە بە سەریانەوە، وەك تاوانبار هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردنو سزایان دەدان.

ئەفسەری لێکۆڵینەوە ئەحمەدسالح داود لە دوای قەسابخانەکە بە یەکێك لە برا زیندانیەکانی وتبوو: کە هۆکەی ئەوەیە برایانی موسڵمان لە ئوردون یارمەتی پوچەڵ کردنەوەی کودەتایەکی سەرزبایییان دابوو کە عەلی ئەبو نواری بەکرێگیراوی عەبدولناسر سەرۆکایەتی دەکرد، عەبدولناسریش تۆڵەی لە برایان سەندەوە لە میسر، وە ئەم قەسابخانەیەی لە زیندانی توڕڕە بۆ سازدان.

دوای ئەم پوختەوکورتکراوەیە کە زۆر کورت کراوەتەوە دەربارەی قەسابخانەکە، ئێستا گێڕانەوەکەی سەیدقوتب دەربارەی هەمان قەسابخانە دەهێنین.

## گێڕانەوەکەی سەید بۆهەمان قەسابخانە

ئەفسەرێك هەبوو ناوی عەبدوڵلا ماهر بوو، پەیوەندیەکی ئاشکرای بەو پێنج لاوە یەهودیە زیندانیەوە هەبوو کە لە ڕووداوێکی سیخوڕیدا زیندانی کرابوون. . وە سوکایەتیەکی ئاشکرای بە خوشکی یەکێکیان کرد!

ئەم ئەفسەرە دەستی کرد بە سیخورمە لێدان و بێزار کردنی برایان بە شێوەیەکی ئاشکرا، تا ووردە ووردە سەری کێشا بۆ دروست کردنی کەشێکی گرسەندو ئالۆز لە نێوان بە ڕێوەبەرایەتی لیمان توڕڕە و لە نێوان برایاندا.

ئەم ئەفسەرە بەڕووی کۆمەڵێك لە برایانی لاوی خوێن گەرمدا تەقیەوە، لە نێوان ئەم و ئەواندا دەستەویەخە بوونەوە ڕوویدا، کارەکە بە خستنەژێر ئەشکەنجەی ئەو کۆمەڵە برایە کۆتایی هات.

پیلانی ئیستفزازکردن و گەرمکردنی بارودۆخەکەو ئالۆزکردنی لەلایەن عەبدوڵلا ماهرەوە بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژە هات برایان زانیان کە نەخشەیەك لە ئارادایە بۆ لێدانی ئەوانەی دەچن بۆ شاخەکە بە فیشەك بەوبیانووەی گوایە هەوڵی هەڵگەڕانەوە و هەڵهاتنیان داوە، برایان بیروڕایان وابوو-بە چاکیان زانی-بۆ لە ناو بردنی ئەو نەخشەیە-لە ڕۆژی داهاتوودا لە زیندانەکاندا بمێننەوە، وە داوای ئامادەبوونی نوێنەرایەتیان کرد بۆ ئاگادارکردنەوەی لەوەی بەرگوێیان کەوتبووسەبارەت بەوپیلانەی کە بۆیان دارێژرا بوو.

ئا لێرەدا فەرمان کرا بە کەتیبەکە بە گوللەبارانکردنی برایان لە ناو ڕێڕەوەکاندا، بەڵکو هەرلە ناو زیندانەکاندا سەبارەت بە ژمارەیەکی زۆریان، وە (21) کەسیان لێ کوژراو، نزیکەی هەمان ژمارەش بریندار بوو. . .

ئەم ئیجرائاتەی لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی زیندانەوە گیرایە بەر ـ لە سێبەری ئەو هێڵە یەك بە دوای یەکەدایە لەڕووداوەکان ـ کە بە ئاشکرا دەلالەت لەوە دەکات ئەمە نەخشەی قەسابخانەیەکی پەیوەستە، لە دوایەوە دەستێکی هەڵسوڕێنەر هەیە، بەلامەوە گرنگ نیە کە ئێستە دەستنیشانی ئەو دەستە بکەم.

بە هەمان شێوە دەگونجێت ئەوە بە ڕێکەوت نەبووبێت کە بەرێز سەلاح دەسوقی خۆی سەرپەرشتیار بووە بەسەر لێکۆڵینەوەکەدا لە قەسابخانەی توڕڕەدا.

لەو کاتەدا لە نێو براکاندا ئەوەبلاوبوویەوە کە ئەو لێکۆڵینەوەیەی نوێنەرایەتی ئەنجامی ئەدات لە سەرەتای کارەکەدا ئاڕاستەیەکە بۆ ئەوەی وەك زیندانی لێیان بڕوانن و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، بەلاّم پاش ئامادەبوونی سەلاح و ئامادەبوونی لێکۆڵەرەوەیەکی تر، لێکۆڵینەوەکە بەرەو ئەوە ئەرۆیشت کە بە تاوانبار ئەژماریان کردن و بەو پێیە حسابیان بۆ کردن.

سەید ئەوەی دەرخست کە قەسابخانەکەی برایان لەتوڕڕە وهەوڵدانەکانی تری پێشوی حکومەت بۆکوشتنیان ـ وای لێکردوە بگات بەم ئەنجامە:

(ئەوەی ئەم زنجیرەیە بە قوڵی لە دەروونمدا بەجێیهێشت ئەوەیە کە بزوتنەوەی برایانی موسڵمان، بە تایبەتی مەبەست بووە کە لەناو ببرێن، بۆ بەرژەوەندی لایەنە بێگانەکان، وە بە ڕاستی هەموو پیلانێك و هەموو هۆکارێك بۆ ڕوخاندنی کەسەکانی

بە ئەشکەنجەدان، یان سەربڕینیان، یان خاپور کردنی خانوەکانیان دەگیرایە بەر، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا ئاڕاستەکە لە بنچینەوە لەناوبەرن)[1].

### سەید هەوڵی چارەسەر ئەدات بۆ کردنەوەی گرێی ڕووداوی ئەلمەنشیە

ڕووداوی ئەلمەنشیە ئەو ڕووداوەیە کە تیایدا برایانی موسڵمان تۆمەتبار کران بە هەوڵدان بۆ تیرۆر کردنی عەبدولناسر، تەقەکردن لە عەبدولناسر درایە پاڵ مەحمود عەبدولەتیف،گوایە لە کاتێکدا کە عەبدولناسر وتاری داوە لە باڵەخانەی دەزگای تەحریر لە مەنشیە لە ئەسکەندەرییەئەم بە دەمانچەکەی تەقەی لێکردووە لە ئێوارەی 26ی تشرینی یەکەمی 1954دا، وە لەرێگەی دروستکردنی ئەم ڕوداوەوە چەپۆکە ئاسنینەکانو ئازارو ئەشکەنجەکانی عەبدولناسر بۆ برایان هاتە گۆڕێ.

پاش جێگیر کردنی سەید لە زیندانی تورڕەدا، بەردەوام هەوڵی ئەدا بۆ کردنەوەی گرێی ڕووداوەکەی ئەلمەنشیە، بیری ئەکردەوەو درێژەی بە بیرکردنەوە ئەدا، بە بەردەوام پرسیاری دەکرد، بە هەر برایەکی سەرکردایەتی بگەشتایە یان بیبینایە پرسیاری لێدەکرد، هەروەها لە برایانی ڕێکخستنی تایبەت، بەڵام وەڵامێکی سارێژکەری تەواویان نەدایەوە کە ڕازیکەر بێت، هیچ لایەك حەقیقەتی ئەوڕوداوەیان نەدەزانی کە ڕووی دا بوو.

سەید بە ئەنجامێکەوە دەرچوو: ئەویش ئەوەیە کە ڕووداوەکە دروستکراوو پیلان بۆ دارێژراو بوو، برایان ئەو کەسانە نەبوون کە هەوڵی تیرۆری سەرۆکیان داوە، وە دەستی بێگانە لە پشتی ئەم کارەوەیە، کە ئیش‌وکارەکانی ڕێکخستووە تا گەشتە ئەوەی کە پێی گەیشت.

سەید ڕووداوەکەی مەنشیەی بەراورد کرد لەگەڵ ڕۆڵی کۆمەڵەی جووتیارانی میسری، کە هەر لە سەرەتاوە لە لایەن ئەمریکاوە بەکرێگیرابوون بۆ فراوانکردنی بۆشایی نێوان برایانی موسڵمانو عەبدولناسر.

لە ڕاپۆرتەکەیدا دەربارەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵەی جوتیارانو نێوان ڕووداوی مەنشیەو ،هەروەها دەربارەی هەوڵەکانی بۆ کردنەوەی گرێکە دەڵێت: (لەو کاتەوەی کە ڕووداوەکە ڕوویداوە، من گومانم کرد لە هەڵسوڕاندنیدا، شتێکی ڕاستو دروستم دەربارەی نەدەزانی. بەڵام هەموو ئەو بارودۆخەی چواردەوری دابوو، وای لێنەکردم کە گومانم هەبێت لەوەدا کە ئەو کارە سروشتی نیە، شتێك دەهات بە بیرمدا کە ئەوە پیلان بۆ دارێژراوە، بۆ تەواو کردنی ئەو پیلانەی کە کۆتایی دێت بە پێکدادانێکی گەورە لە نێوان شۆڕش‌و برایاندا، بۆ هێنانەدی ئامانجێکی بێگانە، ئەوە بە ڕاستتر دەزانم لە خوێندنەوەی بارودۆخ‌و لە پیلانەکەی مامۆستا فوئاد جەلالی وەکیلی جەمعیەی جوتیاران کە ئەو پیلانە ئەمریکی بوو.

لە کاتێکدا سەلاح دەسوقی لێرە لە زیندانی جەنگیدا ساڵی 1954 وەڵامی دامەوە، ڕاشکاوانە ڕای خۆم لە ڕێکخستنی ڕووداوەکە دەربڕی. بەڵام ئەو لەو کاتەدا بە توندی هەڵچوو و پێی گوتم: ئایا تۆش هەروای ـ بە هەموو ڕۆشنبیرییەکتەوە ـ لەوانەیت کە دەڵێن: ئەو ڕووداوە شانۆگەریە؟!

پێم وت: من ناڵێم ئەوە شانگەریە، بەڵام دەڵێم ئەوە پیلان بۆ دارێژراوە بۆ ئامانجێکی دیاری کراو! وە پەنجەیەکی بێگانە دەستی هەیە تیایدا!

لەو کاتەدا - هەڵچونەکەی دامرکایەوە- پێی ووتم: ئەگونجێ! بەڵام کەسێك لە برایانی موسڵمان هەستاوە بە ڕووداوەکە! هەستکردن و مەزندەکردنم بەوەی کە ڕووداوی مەنشیە پیلان بۆ دارێژراو بوو، وای لێ کردم ئارەزوویەکی زۆر لە دەروونمدا پەیدا بێت بۆ زانینی ڕاستیەکەی!

بەڵام لە هەموو ئەوانەی کە لە زیندانی تورڕەدا لە ساڵی 1955 پێیان گەیشتم کە ئەوان پێش ڕاگوێزانیان بۆ ئەلواحات ژمارەیان زۆر بوو- کەسێکم تیا نەبینین کە ئەم ڕاستیەم بۆ ڕوون بکاتەوە!

[1] لماذا أعدموني. 23-25.

هەموو ئەوانەی کە پرسیارم لێ کردن- لە نێوانیاندا کەسانی زۆر نزیك هەبوون لە مەحمودعەبدوللەتیفە وە کە فیشەکەکە لە دەمانچەکەی ئەوەوە دەرچوو بوو، وە بە هەمان شێوە لە هنداوی دویرەوە، پێیان ووتم: بابەتەکە لێڵ و نادیارە و نازانین چی ڕوویداوە.

هەندێکیان ووتیان : بابەتەکە نهێنیەکی تێدایە کە ئێستە ناتوانرێت بزانرێت. .

وە هەموو وەڵامەکان نەیانتوانی ڕاستیم پێ ببەخشن!!).[1]

لێرەدا پێم خۆشە ئەوە دووپات بکەمەوە کە ئەوەدەرکەوت و سەلمێنلرا کە ڕووداوەکە پیلان بۆ داڕێژراو بوو، وە دەزگای سیخوڕی ئەمریکی دەستی هەبوو لە ڕووداوەکەو ڕێکخستنیدا، عەبدولناسر و پیاوە تایبەتەکانیشی دەستێکی ڕاستە و خۆیان هەبوو لەم ڕووداوەدا، وە ئەو کەسەی گوللەکانی تەقاند مەحمودعەبدوللەتیف نەبوو، بەڵکو یەکێك لە ئەفسەرانی پۆلیس بوو، بە ڕێکخستنێك لە لایەن پیاوانی عەبدولناسرەوە! مەبەست لە هەموو ئەمانەشدا لێدانی برایانی موسڵمان و زیان پێگەیاندنیان و، لە ڕەگوڕیشە دەرهێنانی بانگەوازەکەیان بوو.

ڕێکەوتننامە هەبوو لە نێوانی عەبدولناسر و موخابەڕاتی ئەمریکی دا بۆ لێدانی برایان و، بۆ وەستاندنی حاڵەتی جەنگ لە نێوان عەبدولناسر و ئیسرائیل دا بۆ ماوەی دە ساڵ!![2]

ئەوە بوو دوای ئەوەی بێ دەنگەکان قسەیان کرد ڕاستیەکە دەرکەوت، محەمد نەجیب و حەسەن ئەلتوهامی و سەرکردەکانی تری برایان بە وێنەی سەلاح شادی و محەمەدحامدئەبونەسر ئەم ڕاستیانەیان بەڕاشکاوی دەربڕی.

وە ئەم ڕاستیە بە چەسپاوی و شاهید و گێڕانەوە و لێکۆڵینەوەو چاوپێکەوتنەکانی مامۆستا ئەحمەد ڕائف لە کتێبە بڕوا پێ کراوەکەیدا دەرکەوت بەناوی (**سراديب الشيطان: صفحات من تأريخ الاخوان المسلمين**) کە لەم دواییەدا چاپ کرا.[3]

## سەید لە نەخۆشخانەی زیندانی تووڕەدا

نەخۆشیە جەستییەکانی سەیدقوتب زیادیان کرد، زۆربەشیان هەر لەلاوێتیەوە و پێش ئەوەی زیندانی بکرێت لە گەڵیدا بوون، بەڵام کەش و هەواو ژینگەی زیندان یارمەتی دەربوون بۆ زیادکردن و کاریگەرتر کردنیان، وە هەندێکیشان نەخۆشی تازە بوون بەهۆی سروشت و ئاوو هەوای زیندانەوە ڕوویان لە جەستەی سەید کرد بوو.

لە بەرامبەر ڕووخانی باری تەندروستیدا پێویست بوو سەید بگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشخانە، وە لەبەرئەوەی حوکم درابوو بە پانزە ساڵ، حاڵ و وەزعێکی جیا و تایبەتیان بۆ دروست کرد بوو، ئەویش ئەوە بوو بمێنێتەوە لە نەخۆشخانەی زیندانی تووڕە یان (بنکەی تەندروستی تووڕە) هەروەك سەید ئەو ناوەی لێ نابوو، چوونکە بە واتای تەواو نەخۆشخانە نەبوو، بەڵکو بینایەکی لاواز لەناو شواریەکی فراواندا چواردەوری زیندانی دا بوو.

قەدەری خوای گەورە وابوو کە سەید لە نەخۆشخانەی زینداندا نزیکەی نۆ ساڵ بمێنێتەوە.

سەید لە نەخۆشخانەی زینداندا ماوەی حوکمەکەی بەسەر دەبرد، لە بەرئەوەی ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجە نەئەبوویەوە- چونکە ئازاردانی جەستەیی سەید لە دوای حوکم دانی و دادگایی کردنی ڕاوەستێنرا- هەربۆیە مانەوەی لە نەخۆشخانەدا باشتر بوو لەوەی لە کونجی زیندانەکاندا بمێنێتەوە.

کارمەندانی زیندان ڕێزی سەیدقوتبیان دەگرت، لە بەرئەوەی سەید بە هێزی کەسایەتی و ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خۆی فەرزی کرد بەسەریاندا- لە ڕووی دەروونی یەوە —کە ڕێزی بگرن و تەقدیری بکەن، لەبەر ئەوە سانسۆریان لە سەر سووك کرد بوو، وە لە هەڵس و کەوت کردن لە گەڵیدا لێبوردنیان هەبوو.

---

[1] بڕوانە بۆ بەڵگەنامەی عمر الاميری لە گۆڤاری "المجتمع"، ژمارە 758.

[2] بڕوانە بۆ کتێبی (محمود رائف (سراديب الشيطان)، بەشی شەشەم تا دەیەم.

[3] بڕوانە بۆ کتێبی (محمد رائف (سراديب الشيطان)، بەشی شەسەم تا دەیەم).

هەندێك كتێب و سەرچاوەی لە لابوو، هەر لە نەخۆشخانەی زینداندا كتێبێكی ئیسلامی پێشكەوتووی دانا، بنەماكانی ئەو دانراوانە لە زیندان دەرچوون بۆ چاپخانە![1]

دوای ئەم ماوەیە سەید ماوەیەكی زەمەنی بەسەردا هات كە نەلەزیندانی توورِە و نە لە نەخۆشخانەی زینداندا جگە لە خۆیی و دوو كەس لە برایانی نەخۆش نەبێت كەسی تری لێ نەبوو، چونكە هەموو براكان گوێزرابوونەوە بۆ زیندانی ئەلواحات و زیندانی ئەلقەناترو جگە لەوان: (وە لە دوای قەسابخانەكەی توررەلە ئەللیمان هیچ كەسێك لە برایان لە گەڵ مندا نەمایەوە، جگە لە برا محەمەد یوسف هەواش و، برا محەمەد زوهدی سەلمان نەبێت.

وە ئەمەی دواییان بە حوكمی ڕۆشنبیریە سنورداركەی —نەیدەتوانی بەشداری بكات لە هەر بیر كردنەوەیەك لەم جۆرە. لە بەر ئەوە جگە لەهەواش هیچ كەسی ترم لە گەڵدا نەما).[2]

## لە نەخۆشیەكانی سەید قوتب

لەبەر قسەكردنمان دەربارەی مانەوەی سەید لە نەخۆشخانەی زیندانی توورِەدا بە هۆی نەخۆشیەكانیەوە، پێمان باشە ئاماژە بۆ گرنگترین نەخۆشیەكانی بكەین:

هەندێك نەخۆشی هەبوو كەهەر لە لاوێتی وە لە گەڵیدا بوون، وەك نەخۆشی گەدە و ڕیخۆڵەكان.

وە هەروەها نەخۆشی هەر دووسیەكانی، كە هەموو جارێك دەبوونە هۆی ئازار پێ گەیاندنی لە كۆئەندامی هەناسەدانیداو بە هۆیانەوە چەندین ڕۆژوهەفتە لەسەر جێگا ئەكەوت. لەو ماوەیەدا جموجوڵو هەستان بە هەر كارێك كە پێویستی بە هێزو توانای ماسولكەیی یان بیری ببوایە پزیشك لێی قەدەغە كرد.

ئەمەش نموونەیەكە لەسەر نەخۆشییەكانی كۆئەندامی هەناسەدانی، كە سەید خۆی بۆمان باس دەكات لە كاتێكدا لە تەمەنی چلساڵیدایە: (بۆ ئەسكەندەرییە. . پێویستە لەم ساڵدا هەوا بگۆڕێت. . ئەوەتە ئەعسابم شۆڕش ڕادەگەیەنێ، ڕایدەگەیەنێو ڕایدەگەیەنێ، پاشان بێ زاردەبێت لەم ڕاگەیاندنە، ماندەگرێت و مانگرتنێكی تەواو دەنوێنێت. . ئا ئەمەش پزیشكە، وە پزیشك و پزشك، لە هەگبەكەیاندا ـ دوای ئەوەی نیوەی ئەو داوودەرمانەی لە دەرمانخانانەكانی حەلوان دا بوو خواردم ـ دەرزییەكو شروبێكو حەبێك نابینن ـ جگە لەوەی كە بڵێین: ئاوو هەوا بگۆڕە).[3]

پاش ئەوەی لە كۆتایی ساڵی 1954دا دەستگیر كرا، ئازارو ئەشكەنجەیەكی دڕندانە و كەم وێنە و ترسناك درا، كە نەخۆشیەكانی سیو بەشەكانی تری جەستەی توندتر كرد، محەممەد قوتب دەربارەی دەڵێت: (سەید لە یەكەم دەستگیركردنیدا ڕووبەڕووی ئازارێكی زۆر توندو بەهێز بوویەوە، ئەشكەنجەدانەكانی بوونە هۆی خوێنبەربوونی سییەكانی بە توندی، بەشێوەیەك پەنای بە دەسەڵاتداران برد بۆ دواخستنی دادگایی كردنەكەی بۆماوەی دوو مانگی تەواو، وە ڕۆژنامە میسریەكان ئەمەیان باسكرد، پاشان حوكمی بەسەردا درا لە دادگایەكی نهێنیدا كە كەس ئامادەنەبوو. )[4]

لە دوای نزیكەی پێنج ساڵ مانەوەی لە نەخۆشخانەی زینداندا، نەخۆشیەكان چەند قات بوونەوە، باری تەندروستی خراپتر بوو، نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو لە ڕووی جەستەیی و تەندروستی یەوە تێك شكا.

عادل حەمودە دەربارەی نەخۆشیەكانی لەم قۆناغەدا دەڵێت: لە كۆتایی ساڵی 1960 دا باری تەندروستی سەید قوتب تا ئاستێكی زۆر خراپ بوو.

توانای چارەسەركردن لە نەخۆشخانەی لیمان توررِە لەگەڵ نەخۆشیەكانی سەیددا نەدەگونجا، وە توانای وەستاندی بارە جەستەییە شكست خواردوەكەی سەیدیان نەبوو. . سییەكانی ڕووبەڕووی باری خوێن بەربوونی كتوپڕ دەبوونەوە. . گەدەو

---

[1] سەید قطب : عادل حمودة (3)

[2] ليماذا أعدموني : 27

[3] گۆڤاری الرسالة، ژمارە 681ل796، بەرگی دووەم، ساڵی چواردە.

[4] گۆڤاری الغرباء، ساڵی 14، ژمارە 3/ 1975 ل 11.

ڕیخۆڵەکانی ڕووبەڕووی گرژبوونی چەندین جارەی بێوچان دەبوونەوە. . دڵیشی لە لێدانەکانیدا بەرەو لاوازی ڕۆیشت تا گەشتە ئاستی تەنگژە. .

ئەوەبوو لە دەرەوەی زیندان چەندین هەوڵدان ئەنجامدارا بۆ گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە مەبەستی چارە سەر. . . بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە سەرکەوتنیان بۆ نەنووسرا.

ئەوەبوو- دوای ئاستێك لە تێکشکاندنی جەستەیی سەید — لیژنەی باڵای پزیشکی بۆ بەرژەوەندی زیندانیەکان بڕیاری گواستنەوەی دا بۆ نەخۆشخانەی ئەلمەنیلی جامعی.

وە لەم نەخۆشخانەیەدا، دەزگا پزیشکیە نوێیەکان دەریانخست کە سەید نزیك بووەتەوە لە گرفتاربوون بە نەخۆشی سنگە درە.

لە پاش بە سەر بردنی شەش مانگ لەم نەخۆشخانەیەدا، گەڕایەوە بۆ نەخۆشخانەی لیمان توڕڕە، وە لە ساڵی دواییدا سەر لە نوێ باری تەندروستی بەرەو داڕمان چوویەوە، بۆ جارێکی تر گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی (ئەلمەنیل)ی جامعی بۆ ماوەی شەش مانگی تر. . پاشان گەڕایەوە بۆ زیندانی توڕڕە. .[1]

وە لە ساڵی 1964دا سەیدقوتب ڕووبەڕووی داڕمانێکی توندی تەندروستی نوێ بوویەوە، کە دەیخوازی بۆ چارەسەری سێیەم بگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشخانەی ئەلمەنیلی جامعی. . . بەڵام ئەمجارە نە گوازرایەوە، چونکە ئازاد کرا بە ئازاد کردنێکی تەندروستی. . . ).[2]

سەید لە زیندانەکەی دەرچوو بە لێبوردنێکی تەندروستی، پاش تووش بوونی بە سنگەدرە، لەگەڵ ژمارەیەك لە نەخۆشی تر لە گورچیلەو گەدەو ڕیخۆڵەکانیدا.

سەیدقوتب دوای دەرچوونی لە زیندان لە لایەن پزیشکانی پسپۆڕەوە چارەسەری بۆ دانرا، بەڵام ڕزگاری نەبوولە نەخۆشیەکانی.

لە دوای چەند مانگێك لە ئازاد کردنی هێنرایەوە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدانێکی ترسێنەر، بە هۆی ئەم ئازارو ئەشکەنجە توندو دڵڕەقانەیەوە نەخۆشیەکانی زیادیان کرد، جەللادە ستەمکارەکان ئەم نەخۆشیانەی سەیدیان قۆستەوە بۆ ئەوەی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زیاتری پێبگەیەنن!

جابر ڕزق ستەمە نامرۆڤانەییەکانیان دەگێڕێتەوە لەگەڵیداو دەڵێت: (گەشتبووە تەمەنی شەست ساڵی. . وە توش هاتبوو بەسنگەدرە. . ئەمە جگە لە نەخۆشی گورچیلەو. . نەخۆشیەکانی گەدەو. . .

بەڵام تەمەنەکەی شەفاعەتی بۆ نەکرد، وەنەخۆشیەکەی شەفاعەتی بۆ نەکرد. . . بەڵکو هەموو ئەم نەخۆشیانەیان قۆستەوە لە جۆرێکی ئەشکەنجەداندا کە ڕووبەڕووی بوویەوە. بە کورسیەکەوە بەستیانەوە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، تیایدا خواردن و خواردنەوەی لێ قەدەغە کرا، تەنانەت ئاویشیان لێ قەدەغە کرد. . وە خۆیان ئاویان لە بەردەمیدا دەرشت و پەرداخیان پڕ دەکرد. . . ئاشکرایە کە نەخۆشی گورچیلە پێویستی بە ڕێژەیەکی زۆر لە ئاو هەیە، بەڵام ئەوان ئەم کارەیان لەگەڵ سەید دریژە پێدا تا گەیشتە ئاستێك ترسا چاوی لە دەست بدات. . ).[3]

بە لەبەرچاوگرتنی باری تێکشکاوی تەندروستی سەید خستبویانە ـ زیندانێکی دەرگا دانەخراوەوە تاکو هەوای بۆ بچێت. . بەڵام بەتانیەکیان دابوو بە دەرگای ژوورەکەیدا تاکو کەس ئەم نەبینێت و ئەمیش کەس نەبینێت. وە لە سەرو توشبوونیەوە بە نەخۆشیە ترسناکەکانی، ئەوان فەرمانیان پێدەکرد بەهاتوچۆ بە ڕێڕەوی زیندانەکەداو بە قامچیەکانیشیان پشتی سەیدیان دادەگرتەوە. . زەینەب غەزالی دەربارەی ئەمە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (پزیشکی زیندان لەبەر ترسناکی نەخۆشیەکەی سەیدقوتب ـ پاسەوانەکانی ئاگادار کردەوە، هەر کاتێك بانگ کرا بۆ نووسینگەکانی لێکۆڵینەوە وازی لێ بهێنن کەبە ئیسراحەتی خۆی

[1] سيد قطب حمودة : 159
[2] سيد قطب 60/ لماذا أعدموني 84-85
[3] لماذا أعدموني : 37.

هەنگاو بنێت لەبەر نەخۆشیەکەی. . بەڵام هەردوو خوێنڕێژ سەفوەت ئەلرِوبی و حەمزە ئەلبسیونی فەرمانیان بە پاسەوانەکان دا کە سەیدقوتب بە هەنگاوی خێرا بهێنن !!

پاسەوانەکانیش لە پێش خۆیانەوە پاڵیان بە سەیدەوە دەنا، وە بە قامچی لێیان دەدا لە سەر زەوی، تا ناچاریان کرد بە خێرایی بڕوات، دڵی تەنگەژەی بۆ هات، بەهۆیەوە پزیشك پاسەوانەکانی بانگ کردو پرسیاری لێکردن، ئەوانیش هەواڵیان دایە کە سەفوەت ئەلرِوبی وحەمزە ئەلبسیونی فەرمانیان پێکردوون بەمە. . ئەمە کە ڕوویدا من لە زیندانەکەی خۆمدا بووم و وتوێژەکانم دەبیست)[1]. هەموو ئەم نەخۆشیانەی سەید ڕێگەی لە جەلادەکان نەگرت کە حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا نەدەن، و حوکمە بەسەریدا جێبەجێ نەکەن.

بەڕاستی کاری سەرسوڕهێنەر ئەوەبوو کە تەمەنی سەید چووبووە پێشەوە، بەڵام جەستە نەخۆشەکەی و تەندروستیە تێکشکاوەکەی ڕێگەیان لێ نەگرت لە کارو جوڵەو بانگەوازو جیهاد، بەڵکو ڕێکخستنی برایانی دەبرد بەڕێوەو نەخشەی بۆ دەکێشاو، سەرپەرشتی دەکرد.

بە هەمان شێوە خراپی باری تەندروستی سەید نەبووە هۆکارێکی فشارخستنە سەری لەلایەن دەستدرێژکارە جەللادەکانەوە، ئەوەبوو بە ئارامگری‌و دامەزراوی‌و توندوتۆڵی‌و ئازایەتیەوە ڕووبەڕوویان بوویەوە، دامەزراو بوو لەسەر بانگەوازەکەی و زاڵ بوو لەسەر بانگەوازەکەیدا، وە زاڵ بوو بە سەر ئازارو نەخۆشیەکانیدا، وە ئەوەی هەڵبژارد کە لە لای پەروەردگارەکەی بوو، وە دامەزراو بوو دامەزراویەکی پیاوانە، وە مرد مردنێکی پیاوانە، وتەی شاعیر تیایدا دێتە دی کە دەڵێت:

ئەگەر دەروونەکان گەورەو مەزن بن

جەستەکان لە هێنانەدی ئامانجەکانیدا ماندوو دەبن

### کەسایەتی سەید لە زیندانەکەیدا

خوای گەورە کەسایەتیەکی بەهێزو کاریگەری بەخشیبوو بە سەید، بەشێوەیەك بە هۆی ئەو سیفەتو تایبەتمەندیە کەسایەتیانەوەکە هەیبوو ڕێزگرتن‌و تەقدیری خۆی فەرز دەکرد بەسەر کەسانی تردا.

سەید لە زیندانەکەیدا جێگەی ڕێزی زیندانیەکان بوو ـ لە برایان‌و جگە لەوانیش ـ تەنانەت زیندانە ئاساییەکان ڕێزیان دەگرت‌و پرس‌و ڕایان پێ دەکردو ڕاوبۆچوون‌و فەرمانەکانیان وەردەگرت.

وە ئەگەر گرفتێك لە زیندانیە ئاساییەکان ڕووی بدایە، ئەوا گرفتەکەیان دەبرد بۆ لای سەیدو هەندێ جار چاوپۆشییان لێدەکردو تەعلیمات‌و لائیحەی زیندانیان دەقاودەق بە توندی بەسەردا جێبەجێ نەدەکرد.

بەڕێوەبەرو پزیشکی زیندانەکە سەیدیان خۆش دەویست، لەبەرئەوخۆشەویستیە بوو کەبەچاکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد، وە ئەوەی لە توانایاندا بوایە لە هۆیەکانی پشوودان بۆیان فەراهەم دەهێناو، لە چواردەوریدا کۆمەڵێك لە برایان هەبوون کە خزمەتیان دەکردو وە بە دڵی ئەو کاریان دەکرد.

سەید لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە زینداندا ـ ئەگەرچی کارمەندی زیندانیش بوانایە ـ بە ڕەوشتێکی ئیسلامیانەی گەورەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، دڵو دەروونیانی داگیرکردبوو، زۆر خۆیان دەدایە پاڵی.

نازناوی (قازی زیندان)یان بەسەر سەیدقوتب دابڕی، بەڵکو ـ بەڕێوەبەری زیندان ـ ئەلحەلوانی دەڵێت: (بەڕێوەبەری ڕاستەقینەی زیندان سەیدقوتبە)[2].

سەید بە بەخشندەییەکی فراوانەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ برا زیندانیەکانیدا دەکرد، وە لە کاتێکدا کەس و کاری سەریان لێدەداو مریشك یان مراویەکی برژاو یان سورەوەکراویان بۆ دەهێنا کە لە کاغەزدا بۆیان پێچا بوویەوە، ئەویش لە دەستیدا هەڵی دەگرت وەك خۆی، نەیدەکردەوە چێژی نەدەکرد، بەڵکو لە سەر سوچی ژورەکەیدا دەوەستا و بانگی براکانی دەکرد لە قاتی خوارەوە، دیاریەکەی پێشکەش دەکردن تاکو لە نێوان خۆیاندا بەشی بکەن!

---

[1] لماذا أعدموني 116

[2] مامۆستا محەمەد قوطب ئەمەی پێ ڕاگەیاندم.

له کاتێکدا سەید لە ساڵی 1954دا خرایە ناو زیندانەوە، هاوڕێی لە زینداندا مستەفائەلعالم بوو کە لە زینداندا تووشی داخورانی کڕکڕاگەی بڕبڕەی پشت بوو بوو، وە تاکە هۆکاری چارەسەریش بریتی بوو لەوەی کە لە سەر گازی پشتی ڕابکشێ بۆ ماوەیەك کە لە شەش مانگ کەمتر نەبێت. هەروەك مستەفائەلعالم خۆی دەگێڕێتەوە -.[1]

بە خشندەیی سەید لە زینداندا گیانلەبەرانیشی گرتبووەوە، دەگێڕنەوە لە زیندان پشیلەیەکی پیری لە لابووە کە خواردنی پێداوە و گرنگی پێداوە، وە کاتێك دەربارەی نهێنی ئەم گرنگی پێدانە پرسیاری لێکراوە - کە پشیلەیەکی پیرو خاوەن دیمەنێکی بێزراو بووە - وتویەتی: بۆ ئێمە جوان نیە کە لاوێتی لێ وەربگرین و پاشان لە پیریەتیەکەیدا ڕەحمی پێ نەکەین!!

## سەید لە زینداندا کتێب دادەنێت

بە ڕاستی سەید لە زینداندا دیاردەیەکی سەر سوڕهێنەری ڕاستەقینە بوو، ئەو نەکەوتبوو بە سەر دەروونی خۆیداو، پەژارەو ماندوێتی و نەخۆشی و ئازارەکانی جەنجاڵی نەدەکرد، هەرگیز بە تەنها دانەدەنیشت تاکو نائومێدو گیان بە ئازارو دەرون پەشێو بێت!

بەڵکو بە ئیمانەکەی سەرکەوت بە سەر هەموو ئەوشتانەدا کە ڕووبەڕووی دەبونەوە، ئارامی گرت لە سەر ئەم بەڵایەو، ڕازی بوو بەم قەزایە!

سەید هەموو ئەم کارانەی لە زینداندا پێکەوە کۆکردبووەوەو گرێ دابوو: **هۆشیاری و ڕێکخستن، لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە، کارکردن و بانگەواز.**

وای لێهات لە زیندانەکەیدا کتێبی دادەنا، باسی زۆر گرنگی ئامادە دەکرد، لە زینداندا گرنگترین کتێبی خۆی دەرکرد کە زۆرترین جدیەت و حەرەکیەت و ئیلتزام و مەنهەجیەتی تێدا بوو، هەر بە هۆی ئەم کتێبەوە سەید بوو بە پێشەنگی بیری ئیسلامیی هاوچەرخ.

لە زینداندا ئەم کتێبانەی دەرکرد: تەفسیری (**في ظلال القرآن**)ی تەواو کرد، پاشان لە چاپێکی پوختەکراودا دووبارەی کردەوە، ئەوە بوو لە پوختە کردنیدا گەیشتە جوزئی سیانزەهەم. . وە دانانی کتێبی (**هذا** الدین) و (**المستقبل لهذا الدين**) و (**الاسلام و مشكلات الحضارة**) و (**خصائص التصور الاسلامي**) و (مقومات التصور الاسلامی) و (**المعالم في الطريق**).

خوای گەورە بڕیاری وابوو کە فیکری سەید بڵاوبێتەوە، هۆکاری ئەم بڵاوبوونەوەیەشی بۆ ئاسان کرد، گرفتەکانی بۆ تەختکرد و، ڕێگەی بۆ ئامادە کرد.

لەو هۆکارانەی کە خوای گەورە بۆ سەیدی سازاندبوو ئەوە بوو! سەید - پێش زیندانی کردنی - بەڵێننامەیەکی کردبوو لەگەڵ (**دار الكتب العربية**) بۆ بڵاوکردنەوەی (**الظلال**) بە شێوەیەك هەموو دوو مانگێك جوزئێکیان پێشکەش بکات.

کاتێك سەید زیندانی کرا ئیتر توانای بە سەر ئەم کارەدا نەما، وە تا ئەو کاتە هەژدە جوزئی لە (**في الظلال**) تەواوکردبوو.

(**دار أحياء الكتب العربية**)ش دەعوایەکی لە سەر حکومەت بەرز کردەوە تیایدا داوای هەژدە هەزار جونەیهی کردبوو کە حکومەت پێی بدات، بە بیانووەی کە(**دار الاحياء**) لە زیندنی کردنی سەیدقوتب دا زیانی کردووە.

حکومەتیش لە ژێر فشاری ئەم دەعوایەدا ڕێگەی بە سەید دا بۆ تەواوکردنی (**الظلال**) لە زینداندا، وە شێخ محەمەد ئەلغەزالی دانرا بە چاودێرێکی ئاینی بە سەر (**ظلال**)ەوە کە پێش چاپکردنی بیخوێنێتەوە!

حکومەت ئەم ڕێپێدانەی سەیدی قۆستەوە کە ڕێی پێدابوو بنووسێتەو بڵاوبکاتەوە بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو شتانەی برایانی موسڵمان بڵاویان کردبوەوە - لە ناوەوە و دەرەوە - دەربارەی ئەو ئازار و ئەشکەنجە ترسناکەی ڕووبەڕووی برایانی زیندانیکراو دەبێتەوە!

[1] گۆڤاری "الشهاب"، ساڵی شەشەم، ژمارە 9، أيلول 1972ل 8.

محەممەدقوتب ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەری لەم بارەیەوە بۆ باسکردم، وتی: عەبدولناسر لە پەنجاکاندا سەردانی پاکستانی کرد - لەو کاتەدا سەید لە زیندانی توورەدا بوو- وە زانایانی پاکستان هاتن بۆ لای عەبدولناسرو سەرزەنشتیان کرد لە سەر زیندانی کردنی بیریارێکی ئیسلامیی وەك سەید، وە داوایان لیّ دەکرد ئازار و ئەشکەنجە لە سەری هەڵگرێت و، و ئازادی بکات!

عەبدولناسر ئینکاری ئەشکەنجەدانی سەیدقوتبی کرد و، بەرپەرچی ئەوەی دایەوە کە لە زینداندا بێت.

وە هەواڵی پێدان کە سەید لە ماڵی خۆیدایە و، هەموو ئازادیەکی خۆی وەرگرتووە !

بەو بەڵگەیەی کە کتێبە ئیسلامیەکانی لە قاهیرە لە چاپ دەدرێن، وە دەگاتە ئەوان لە پاکستان!!

ژێریش ئەوە قبوڵ ناکات کە ئەو زیندانی بێت و کتێبەکانی بلاّوبکرێتەوە!

هەندێکیان بڕوایان بە عەبدولناسر کرد، بەلاّم یەکێکیان ویستی دڵنیا بێت لە وتەکەی سەرۆك عەبدولناسر، پەیوەندیەکی کرد بە محەممەد قوتبی برایەوە و پرسیاری لێکرد دەربارەی سەید، ئایا لە ماڵەوەیە، یان زینداندا؟

بەلاّم محەممەد قوتب نەیدەتوانی لەو بارەیەوە وەلاّمی بداتەوە - وەك خۆی پێی ڕاگەیاندم -!!!

حکومەت ئامۆژگاری دیبلۆماسیەکانی خۆی دەکرد لە دەرەوەی وولاّت کە هەمان ڕێگەی عەبدولناسر بگرنە بەر لە وەلاّمدانەوەدا ئەگەر لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرا!

سەید لە زینداندا هەندێك کتێبی کۆنو نوێی لەلابوو وەك سەرچاوە، هەندێکیان لە کتێبخانەی ڕەسمی زیندانەوە وەری دەگرت، وە هەندێکیان کەسوکاری کە سەریان لێدەدا بۆیان دەهێنا، داوای لە برا زیندانیەکان دەکرد کە هەندێك لەو کتێبانە بخوێننەوە.

### ئاماژەکانی سەید لە (الظلال)دا بۆ ژیانی نێو زیندا ن

بێگومان ژیانی زیندان، ژیانێکی قورسو سەختە بە تایبەتی بۆ کەسێك بە ستەم زیندان کرابێت، وە تیایدا ئازارو ئەشکەنجە بدرێت.

بەلاّم سەیدقوتب زانی چۆن سوود لە ژیانی زیندان وەربگرێت، وە چۆن لەگەڵیدا بژیو مامەڵەی لەگەڵ بکات، وە چۆن بیکاتە هۆکاریك بۆ زیادکردنی ئیمانو زانیاریەکانی.

زیندانەکەی کردبوو بە خەڵوەیەكو تیایدا قورئانی دەخوێند، دەیخوێندەوەو بیری لێدەکردەوە، لە ماناکی تێدەگەیشت، لە سێبەرەکەیدا دەژیا.

هەر لە زیندان تەفسیرە پێشەنگەکەی (**في ظلال القران**)ی دانا، ئەو تەفسیرەی کە بە هەموو جەستەو ڕۆحیەوە لەگەڵیدا دەژیا ـ وەك محەممەد قوتب دەڵێت ـ وشە بە وشە ـ ڕستە بە ڕستە، فیکرە بە فیکرە.

لە زینداناو لە ژێر سێبەری قورئاندا تامی ژیانی چەشت، وە لە پێشەکی (**في ظلال**)دا دەربیریوەو دەڵێت: (ژیان لە ژێر سێبەری قورئاندا نیعمەتە، نیعمەتێکە کەس نایزانێ تەنها ئەو کەسە نەبێت کە چەشتوویەتی، نیعمەتێك تەمەن بەرز دەکاتەوەو پیرۆزی دەکاتو پاکی دەکاتەوە.

سوپاس بۆ خوا، بە ڕاستی خوای گەورە پیرۆزی ڕژاند بەسەرما بە ژیان بۆ ماوەیەك لە زەمەن لە ژێر سێبەری قورئاندا، لەو زەمەنەدا لە نیعمەتی قورئان ئەوەم چەشت کە هەرگیز لە ژیانمدا لەوەوپێش نەمچەشتبوو، تیایدا ئەو نیعمەتەم چەشت کە تەمەن بەرز دەکاتەوەو پیرۆزی دەکاتو چاکسازیی تێدا دەکات).[1]

---

[1] الظلال1، 11 پێشەکی.

ڕاستە سەید لە زیندانەکەیدا تەنها بوو، دابڕاوبوو لە خەڵکی، پەیوەندی کردن بە دەرەوەی لێ قەدەغە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها نەبوو، لەگەڵ هەموو ئازارو گرنگیدانەکانیدا غەمبارو دڵتەنگ نەبوو، وە هەرگیز بە گریی دەروونیەوە گرفتار نەدەبوو، دووربوو لە نەخۆشیە دەروونیەکان ـ هەروەك هەندێك لە خەڵکی گومانی ئەوەی پێ دەبەن، وا حساب دەکەن بەرهەمە فیکریەکانی لە (في ظلال)و جگە لەویش بەرەنجامی هەڵچوونو گرێی دەرونی و کرژبوون بووبێت ـ بەڵام لە ڕاستیدا وانیە، سەید لە زینداندا لە لوتکەی کامەرانیو ئاسودەییو دڵنیاییدا بووە، چونکە لەگەڵ قورئاندا ژیاوە، هاوڕێیەتی سورەتەکانی قورئانی کردووە، لەگەڵیدا ژیاوە، هەروەك سەید خۆی لە (في ظلال) بەرگی (3) لاپەڕە (1243) بەڕوونی ئەمەی باس کردووە کە چۆن ژیان لەگەڵ قورئانو سورەتەکانیدا سەراپا شادیو خۆشیو ئارامیە، سورەتەکانی ئاسودەییو زانیاریو ڕەحمەتی بەخشن بە دڵو دەروونی مرۆڤ، چونکە قورئان ناهێڵێت مرۆڤی موسڵمان هەرگیز هەست بە تەنهاییو بێکەسی بکات.

## سەید لە هەندێ جێگەی(الظلال)دا ئاماژە بۆ ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە زینداندا بووە

1- خەو بردنەوەی لە ساتێکی تەنگ ونارەحەتدا:

کاتێك تەفسیری ئەم ئایەتەی کرد: (إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ. . ) (الانفال: 11). باسی خەوبردنەوەی کرد وەك سەربازێك لە سەربازەکانی خوای گەورە کەخوا لە جەنگی (بەدر)دا ناردی بۆ موسڵمانان، وە کاریگەری ئەو خەو بردنەوەیە ـخەوەنۆچکەیە- لە بڵاوکردنەوەی ئاسایش و دڵئارامی لە دەروونی موسڵماناندا.

پاشان ئاماژە دەکات بە کاریگەری خەوبردنەوە لە سەر خۆی لە زیندانەکەیداو دەڵێت : (ئەوە بوو من بەسەر ئەم ئایەتانەدا ڕادەبورام و هەواڵەکانی ئەم خەوبردنەوەیەم دەخوێندەوە، وەك ڕووداوێك کە ڕوویداوە هەستم پێ ئەکرد کە خوای گەورە هەواڵەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە خۆی نهێنیەکەی دەزانێ. پاشان کاتی وادەبوو دەکەوتمە ناو نارەحەتیەوەو ساتانێك لە تەنگژەی شاراوەو ڕەشەبای نائارامیدا دەبووم لە کاتی ڕۆژئاوابووندا. پاشان خەوەنۆچکە دەیبردمەوە، کە چەند خولەکێك زیاتری نەدەخایاند، کە هەڵدەستام مرۆڤێکی نوێ بووم جیا لەوەی پێشوو، دەروون دامەزراو، دڵئارام، نوقمبوو لە دڵنیاییەکی پڕ لە متمانەی قوڵدا، چۆن ئەمە هاتە دی؟ چۆن ئەو وەرچەرخانە کتوپڕە ڕوویدا؟ نازانم. بەڵام لە دوای ئەوەوە چیرۆکی بەدر و ئوحودم بە تەواوی دەرك پێکرد. )[1]

## هەست کردن بە نرخی خۆر پاش ماوەیەکی زۆر لە نەبینینی

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (. . . وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ) (سبأ: 13). سەید قسە لەسەر لەبیرچونەوەو بێئاگایی زۆرێك لە خەڵکی لە نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەریانەوە دەکات، باس لە بێ وەفاییو سوپاس نەکردنی خوای گەورە لەلایەن ئەو کەسانەوە دەکات.

پاشان ئاماژە بە ڕووداوێك دەکات کە لە سەید و براکانی ڕوویدا، کاتێك ئەوان بێبەشکران لە تیشکی خۆر لە زینداندا: (ئێمە ماوەیەکی دوورو درێژ بێبەشبووین لە بینینی خۆر، ئەو تیشکەی بە ئێمە ئەگەیشت قەبارەکەی لە قەبارەی قرشێك زیاتر نەبوو. هەندێ جار دەگەیشتە لامان، لەو کاتەدا تیشکەکە دەهاتە ژوورەکەوە کەسێك لە ئێمە لەبەردەمیدا ڕادەوەستاو هێندەی لە توانادا بوایە تیشکەکەی بەسەر دەمو چاویودەستەکانیو سنگیو پشتیو سکیو قاچەکانیدا دەهێناو دەیگێڕا، پاشان جێگەکەی بۆ براکەی چۆڵ دەکرد تاکو ئەویش هێندەی بۆی دەکرێت لەو نیعمەتە دەست بخات.

من لە دوای ئەمەوە ئەو ڕۆژەم لەبیرناچێتەوە کە ڕۆژم تێدا بینی. من ئەو دەرفەتە بە دەستهاتووەو ئەو خۆشیە ئاشکراو دیارەم لەبیرناچێتەوە کە بە سەر دەمو چاوی یەکێکماندا هات، بە هەموو ئەندامەکانی لاشەیدا هات، ئەو کەسەمان لە

[1] الظلال 3، 1243.

ئاوازێکی قوڵی درێژدا دەیوت: الله. . ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئا ئەمە ڕۆژە، تا ئێستەش هەر پرشنگ دەداتو هەڵدێت، سوپاس بۆ خوا.

ئای لە هەموو ڕۆژێکدا چەندە لەم ژیانبەخشەمان دەستدەکەوێت، وە ئێمە لەبەر ڕووناکی و گەرمیەکەیدا مەلە دەکەین، مەلەدەکەینو نوقم دەبین لە نیعمەتی خوادا، چەند سوپاسی ئەم فەیزە فراوانو بەردەستو مەباحە دەکەین کە بێبەرامبەرو بێ ماندووبوونو کێشە دەستمان دەکەوێت).

## ئازادکردنی سەید بە هۆی عەبدولسەلام عارفەوە

لە ساڵی 1964دا سەید تووشی نەخۆشی سنگەدڕەیەکی توند بوو، ئاستی تەندروستی دابەزی تا ئاستێکی مەترسیدار، بەشێوەیەك ژیانی لە زینداندا کەوتە مەترسیەکی گەورەوە ،و ئەگەر تیایدا بمایەتەوە مەترسی مردنی لێدەکرا.

لە ساڵی 1964دا سەید زیاد لە نۆ ساڵی لە زینداندا بەڕێکردبوو، وە لە ماوەی حوکمەکەی نزیکەی شەش ساڵی مابوو.

حکومەت وای بەباش دەزانی بە لێبووردنێکی تەندروستی سەید لە زیندان دەربکات، لەم کاتەدا برایانی موسڵمان لە عێراق پەیوەندییان کرد بە سەرۆکی عێراقی ئەوکاتە عەبدولسەلام عارفەوە کە کەسێکی نزیك بوو لە عەبدولناسرەوەو زۆر کات وتەکانی لای عەبدولناسر وەرگیراوبوون ـ برایان داوایان لێکرد کە بە کارێکی چاك هەستێت، تاکو مێژوو بۆی بنووسێت و خوای گەورە لەسەر ئەو کارەی پاداشتی بداتەوە. ئەم هەواڵەش یەکێك لە برا عێراقیەکان پێگەیاندم ـ

کارەکەش ئەوەبوو کە عەبدولسەلام عارف داوای ئازادکردنی سەیدقوتب بکات لەلای عەبدولناسر تاکو لە زینداندا نەمێنێتەوە ـ.

بەهەمان شێوە زانایانی عێراقی هەمان داواکاریان ئاڕاستەی عەبدولسەلام عارف کرد لە سەروو هەموویانەوە موجاهیدو زانای بەناوبانگ ئەمجەد زەهاوی.

عەبدولسەلام ڕەزامەندی دەربڕی لەسەرئەوەی هەستێت بە واسیتە لای عەبدولناسر. وە سەرکەوتووش بوو. دەربارەی ئەم واسیتەیە سەیدقوتب دەڵێت: (مامۆستای پایە بەرز ئەمجەد زەهاوی سەبارەت بە من قسەی لەگەڵ سەرۆکی بەرێز عەبدولسەلام عارف کرد. وە هەموو ئامادەییەکی لە عەبدولسەلام عارفدا بینی بۆ واسیتە کردن لای عەبدولناسر. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکوعەبدولسەلام خۆی بیری لەوە کردبوەوەوە. چونکە لەماوەی دوورخستنەوەکەیدا لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا کتێبەکەم (**في ظلال القران**)هاوڕێو هاودەمی ئەو بوو. وە بە کردار هەستا بەم پەیوەندی کردنەو سوپاس بۆ خوا سەرکەوتووش بوو)[1].

لە ئایاری ساڵی 1964 دا بە لێبوردنێکی تەندروستی سەید لە زیندان ئازاد کرا. وە لە دوای دەرچوونی سەید لە زیندان، عەبدولسەلام عارف داوای لە باڵوێزی عێراق لە قاهیرە کرد سەردانی سەیدقوتب بکات لە ماڵی خۆی و سڵاووڕێزی سەرۆك عەبدولسەلامی پێبگەیەنێت، پێی بڵێ کە دڵخۆشە بە سەرکەوتنی واسیتەکەیو ئازادکردنی سەید لە زیندان، وە ئامادەیە بۆ وەڵامدانەوەی هەر داواکاریەك کە لەلایەن سەیدەوە بێت.

سەیدقوتب سوپاسی سەرۆکی عێراقی لەسەر هەوڵەکانی کرد و بە باڵیۆزی عێراقی وت: (بە ڕاستی من هیچ داواکاریەکم نیە، جگە لەوەی ئەگەر بەڕێزیان بە باشیان بینی باهەوڵە پیرۆزەکانیان درێژە پێبدەن بۆ کۆتایی هێنانی کێشەی برایان بە گشتی، بەڵکو خوای گەورە هاوکاری بکات بۆ ئەوە).

---

[1] الظلال 2 ، 2899.

وه له کاتی بەستنی کۆنگرەی یەکەمی لوتەکەی عەرەبی لە قاهیرە ساڵی 1964 عەبدولسەلام عارف هات بۆ قاهیرە، دیاریەکی لەگەڵ باڵیۆزی عێراقیدا نارد بۆ سەید، سەیدیش بە بروسکەیەکی سوپاس کردن وەڵامی دایەوە، وە هەموو کتێبەکانی خۆی بۆ تەجلید کرد بە شێوەیەکی زۆر نایابو بە دیاری بۆی نارد.[1]

له دوای ماوەیەك باڵیۆزی عێراقی لە قاهیرە بوو بە وەزیری پەروەردەو فێرکردن لە عێراق، لەو ماوەیەدا سەردانی سەیدی کرد لە قاهیرەو پێشنیاری وەزیفەی لە عێراقدا بۆ کرد ـ پێشنیارەکەش ئەوەبوو کە وەك پسپۆڕێك لە پەروەردەو فێرکردن و پرۆگرامەکانیدا کار بکات ـ وە پێی ڕاگەیاند کە سەید لە عێراقدا جێگەی ڕێزو شکۆو تەقدیر دەبێت.

بەڵام سەید داوای لێبوردنی کرد لە وەرگرتنی پلەو پایە، وەبۆ وەزیری روونکردەوە کە شوێنە سروشتیەکەی لە میسردایە، چونکە لەوێدا بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵدەستێ.[2]

## دیمەنی پێنجەم: سەرکردایەتیی ڕێکخستنی نوێی برایان

### هەوڵەکانی بۆ کۆکردنەوەی برایانی موسڵمان

برایانی موسڵمان لەساڵی 1954 دا تەسلیم نەبوون بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکەیان، تەنها لەبەرئەوەی کە لقەکان داخراون و سەرکردەکانیان زیندان کراون. بەڵکو کۆمەڵی برایانیان بە کۆمەڵەیەکی شەرعی و واقعی دانا کە بونێکی کرداری هەیە لە گۆڕەپانەکەدا، وە گەمارۆ ڕەسمیەکەی حکومەتیان بە بیانوو نەدەزانی بۆئەوەی تاکەکانیان پێکەوە کۆنەبنەوەو ڕێکخستنەکانیان پێکەوە پەیوەست نەبن!! وە ئەم کارەساتەیان بە لێك هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەکەیان حساب نەدەکرد. هەر ئەمەشە زیندوێتی و ژیان بە کۆمەڵ دەبەخشێت و بەردەوامیەکی بەهێزی پێدەدات، وەبوونێکی کرداری و ئامادەبوونێکی کاریگەری لەسەر گۆڕپان پێدەبەخشێت.

ئەم ڕفتارەی برایان لە لایەن حکومەتەوە بەسەرپێچی درایە قەڵەم و، عەبدولناسر ئەم سەرپێچیەی تری برایانی کردە بیانویەکی تر بۆ لێدان و قەتڵوعام کردنیان. هەروەها ئەم کارە بویە یەکێکی تر لە هۆیەکانی بەهێزتر بونی برایان و زیاتر توندوتۆڵکردنیان لە بەرامبەر گرفت و کۆسپەکاندا.

پاش ئەوەی کۆمەڵێك لە سەرکردەکانی برایان ئازادکران، ئارەزوی ئەوەیان نەدەکرد کە هەستن بە کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی برایان، وەئەم کۆمەڵەیە وایان دادەنا کە برایان لەو کاتەدا لەحاڵەتی متبوون و بێدەنگیدایە، لەبەرئەوە هەندێك لەو بانگەوازانەیان بەرپەرچدایەوە کە لە ئارادا بوون بۆ کۆکردنەوەو سەرلە نوێ ڕێکخستنەوەی برایان. وە ئەو کەسانەی خاوەنی ئەم بیروبۆچونە بوون بریتی بوون لە برایان: فەرید عەبدولخالق و مونیر دەللە!

بەڵام هەندێکی تر لە برایان بیروبۆچونێکی جیا لەمانیان هەبوو، وا بیریان دەکردەوە کە پێویستە کارو جوڵەو ڕێکخستن بەردەوام بێت و نەوەستێت، وەبۆ ئەم مەبەستە هەستان بە کۆمەڵێك هەوڵ و کۆششی جیاجیا بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی برایان.

دەگونجێت یەکەم هەوڵی ڕێکخستنەوەی لەم جۆرە ئەو هەوڵە بوبێت کە محەمەدیوسف هەواش ڕاستەوخۆ پاش کارەساتەکەی ساڵی 1954 پێی هەستا، کە بریتی بوو لە ڕێکخستنی ژمارەیەك لە برایانی مسوڵمان بۆ سەرپەرشتی کردن و هاوکاری کردنی کەسوکاری برا زیندانیەکان. بەڵام ڕێکخستنە بچوکەکەی لەلایەن ئاسایشەوە ئاشکرا کراو، هەواش و ئەوانەی لەگەڵیدابوون ڕاپێچی زینان کران!

هەر لەم جۆرە هەوڵدانانە، هەوڵدانەکەی برای ئەندازیار ئەحمەد عادل کەمال بوو کە کۆمەڵێك لە برایانی کۆکردەوەو ڕێکخستنەکەی نزیکەی دوو ساڵی خایاند. پاشان ساڵی 1959 دوای ئەوەی هەستی بەوە کرد لەژێر چاودێری ئاسایش

---

[1] گێڕانەوی سەید بۆ هەوڵەکانی عبدالسلام عارف لە لماذا اعدمونیدا ، 72- 74.
[2] سید قطب، عادل حمودة، 161.

دایەو هەنگاو بە هەنگاو بەشوێنیەوەن ڕێکخستنەکەی وەستاند. هەر لەو جۆرە هەوڵانە ڕێکخستنی عەبدولفەتاح حسەین بوو لە شبرا، هەروەها کۆکردنەوەی ئەحمەد ڕائف بوو بۆ هەندێ لە برایان لەسەر پرۆگرامێکی فیکری زانستی ڕۆشنبیری. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەم هەوڵانە کە ئەو کەسانە پێی هەستاون هەموویان هەوڵی تاکە کەسی بوون، بە ئیجتهادێکی تایبەت لە خۆیانەوە، وە بینیویانە کە هەندێك لە برایان وەڵامیان دەدەنەوە !

هەروەها ئەوەش تێبینی دەکرێت کە ئەم ڕێکخستنە پارەچەپی‌و ناوچەییانە هەموویان ڕەنگی ئیجتهادی تاکە کەسییان وەرگرت، وە هیچ یەکێکیان سیفەتی (شەرعیەتی ڕێکخستنی) بە دەست نەهێنا، چونکە خاوەنەکانیان لە دروست کردنی ئەو ڕێکخستنانەدا مۆڵەتیان لە ڕابەری گشتیی یان لە مەکتەبی ئیرشاد وەرنەگرتبوو! وە تێبینی ئەوەش دەکرێت کە ئەم ڕێکخستنە بچووکانە بە تەسکی و سنوورداری مانەوە و زۆر بەردەوام نەبوون، بەڵکو هەر بە زوویی لێك هەڵوەشان، یان لە ڕێکخستنی تردا توانەوە.

ئەندامانی ئەم ڕێکخستنانەش کە سەرکەوتووترینیان ڕێکخستنەکەی عەبدولفەتاح ئیسماعیل بوو لە قەسابخانەکەی ساڵی 1965دا ڕاپێچی زیندان کران و بە هۆی هەستانیان بەو کارەوە حوکم دران![1]

هەوڵەکەی شەهید عەبدولفەتاح ئیسماعیل سەرکەوتووترین ئەو هەوڵە ئیخوانیانە بوو بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنی برایان، وە ڕێکخستنی عەبدولفەتاح ئیسماعیل بناغەی ئەو ڕێکخستنە ئیخوانیە بوو کەلە ساڵی 1965دا ئاشکرا کرا.

برای شەهید عەبدولفەتاح ئیسماعیل لە دڵسۆزترین قوتابیەکانی پێشەوای شەهید حەسەن بەنا بوو، وە زۆر لە دڵی پێشەوا بەناوە نزیك بوو، ئەوە بوو ساڵی 1954 دەستگیر کرا.

پاش ئەوەی لە ساڵی 1956دا لە زیندان ئازاد کرا سوور بوو لە سەر کارکردن و گێڕانەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمان بۆ جیهانی بوونێکی کرداری زیندوی کاریگەر!

شەهید عەبدولفەتاح ئیسماعیل بە ڕاستی ئومەتێك بوو لە پیاوێکدا، وە پیاوێك بوو نوێنەری کۆمەڵی دەکرد، هەستا بە هەوڵدانێکی مەزن و چڕوپڕ بۆ پەیوەندی کردن بە برایانەوە، بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ڕێکخستن. هەموو میسر گەڕا هەر لە ئەسکەندەریەوە تا باشوری سەعید، ئەم پیاوە لە دڵسۆزی و یەکلایی بوونەوە و بەندایەتی و چالاکی و جوڵەدا بە نموونە دەهێنرێتەوە.[2]

## زەینەب غەزالی دەگێڕێتەوە!

زەینەب غەزالی لە کتێبە متمانە پێکراوەکەیدا (أيام من حياتي) دەربارەی ڕێکخستنەکەی عەبدولفەتاح ئیسماعیل ڕاستیەکانی گێڕاوەتەوە بۆ برایان!

محەمەد غەزالی ئەم ڕاستیانەی بۆ زەینەب غەزالی باسکردووە لە کاتێکدا سەرگەرمی سوار بوونی کەشتی بووە بۆ حەج لە ساڵی 1957دا.

دواترلە لای کەعبەو لە دوای زەمزەمەوە، نزیك گۆڕی ئیبراهیم(درودی خوای لەسەربێت)، لەدوای دوو ڕکات نوێژی تەواف پێی گەشتۆتەوە، لەوێدا ڕێکەوتوون لە سەر پێویستی ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی برایان و گێڕانەوەی چالاکیەکانی، وەپەیوەندی کردن بە ڕابەری گشتیی حەسەن هوزەیبیەوە بە مەبەستی وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەو لەسەر کارکردن، تاکو هەوڵەکان سیفەتی شەرعیەتی ڕێکخستن وەربگرێت!

بڕیارەکەی عەبدولناسر بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانیان دانا بە بڕیارێکی پووچ، چونکە دژایەتی دەکات لەگەڵ دەقەکانی قورئانو فەرموودەو لە سەر واجب بوونی بانگەواز بۆ لای خوای گەورە.

---

70 الموتى يتكلمون : سامي جوهره 49-50

[2] مذابح الاخوان في سجون ناصر . جابر رزق 127-131

زەینەب غەزالی چاوی کەوت بە ڕابەری گشتی تاکو مۆڵەتی کاری لێ وەربگرێت و ڕەزامەندی بە دەست بهێنێ، وە لە دوای چەندجارێك یەکتر ببینن کە تیایدا ئامانجی ڕێکخستن و پرۆگرامە پەروەردەییەکان ڕوون کرایەوە و باس کرا، ڕابەری گشتی ڕەزامەندی بۆ دەربڕین لەسەر کارکردن و ڕێکخستن. وە بەم شێوەیە کار دەستی پێ کردەوە.[1]

## عەبدولفەتاح ئیسماعیل و نەیارەکانی لە بەردەم ڕابەری گشتیدا

ژمارەیەکی زۆر لە برایان ڕەزامەندیان نەبوو لە سەر شێوازەکەی عەبدولفەتاح ئیسماعیل لە کارکردندا، وە هاوڕای نەبوون لە سەر سەرلەنوێ کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی برایان و، پێیان وابوو کە لەو بارودۆخەدا چاکترین شت بۆ کۆمەڵی برایان ئەوەبوو کە لە باری بێدەنگی و ڕاوەستاوی دا بمێنێتەوە. ! وە بڕوایان وابووکە **چاکترین جۆری ڕێکخستن لەو قۆناغەدا بریتیە لە نەبوونی ڕێکخستن!**

ئەم کۆمەڵە هەوڵەکانی عەبدولفەتاح ئیسماعیل و هاوڕێکانیان بە هۆیەك دائەنا بۆ ڕووبەڕووکردنەوەی برایان لە گەڵ ئازاردا، وە بۆزیادکردنی دەستدرێژی لە سەر برایان و سازدانی قەسابخانەیەکی نوێ بۆیان.

لەو برایانەی کە دەترسان لە کارەکانی عەبدولفەتاح، محەمەد فەریدعەبدولخالق و مونیردەللە بوون، وە هەردووکیان ڕۆشتن بۆ لای ڕابەری گشتی و ڕاو بۆ چون و مەترسی خۆیان خستە بەردەمی و، مەترسی خۆیان دەربڕی لەو زیانەی کە بە هۆی ڕێکخستنەکەی عەبدولفەتاحەوە بە کۆمەڵ دەگات، وە مەترسی چەپۆکە بەهێزەکانی حکومەتیان بۆ ڕوونکردەوە، ئەوەشیان خستەڕوو کە حکومەت لەگەڵ دوژمنەکانیدا لێبوردە نیەو لێنابورێ.

بۆیان باس کرد کە کۆکردنەوەی برایان سوودیان پێ ناگەیەنێ، حکومەتیش ئەم ڕێکخستن و کۆبوونەوەیە دەردەخات و دەدات بە سەر ئەندامەکانیدا و بەسەر هەموو ئەوانەش کە پەیوەندییەکیان بە برایانی موسڵمانەوە هەبێت! ڕابەریش دڵنیای کردن و بە چاکە پەیمانی پێدان!

پاشان عەبدولفەتاح ئیسماعیل بە ڕابەری گشتی گەیشت و دیدو بۆچوونەکانی خۆی بە گەرمیەوە خستە بەردەمی و ماوەیەکی درێژ قسەی لەگەڵ کردو، لادانی ڕەوشتی خەڵکی بە هۆی نادیاری کۆمەڵی برایانەوە بۆ ڕوونکردەوە ، وە ئاگاداری کردەوە لە مەترسی گەیشتنە حوکمی شیوعیەکان. هەموو ئەمانەی باس کردو ڕابەری گشتیی هەر بێدەنگ بوو!

وە لە کۆتایی چاوپێکەوتن و دانیشتنەکەدا ڕابەر پێی ووت: گوێگرە ئەی شێخ عەبدولفەتاح:

لە سەر ڕووناکی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە هەڵسوکەوت بکە، ئەو بڕیارەی کە حکومەت لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکاندا دەری کرد !

شێخ عەبدولفەتاح ئەم دەستەواژەیەی ڕابەری دانا بە ڕێ پێدانێك پێی بۆ کارکردن و کۆکردنەوە و ڕێکخستن! وە بە براکانی دەووت: (لە لایەن ڕابەری گشتیەوە سپاردنم لایە بۆ کۆکردنەوەی برایان).[2]

---

[1] أيام من حياتي: زينب غزالي :30-33

[2] درێژەی ئەم باسە لە کتێبی (البوابة السوداء)ی أحمد رائف دا سەیر بکە : 235-239

## سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکە بۆ ڕێکخستنی نوێ

عەبدولفەتاح ئیسماعیل بۆ بانگەوازەکەی چالاك بوویەوە و برایانی لە ڕێکخستنێکی نوێدا کۆکردەوە و ئوسرە و چاوپێکەوتنەکانی بۆ ڕێکخستنەوە.

عەبدولفەتاح لەگەڵ کۆمەڵێك لەوبرایانەی کەلەشارەکانی میسردا هەوڵی کۆکردنەوەی برایانیان دەدا کۆبوویەوە، لە گەڵیاندا پێك هات و هەموویانی کۆکردەوە.

چاوی کەوت بە عەبدولفەتاح شەریف کە لە تەنتا برایانی کۆدەکردەوە، وە عەبدولمەجید ئەلشازلی لە ئەسکەندەریە و، عەلی عشماوی لە قاهیرە.

برایان لە ساڵی 1963دا کۆبوونەوە و ڕێکەوتن لە سەر هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکی پێنج کەسی بۆ ڕێکخستن، ئەو سەرکردایەتیە پێنج کەسیەش لەمانە پێك هاتبوون :

1- عەبدولفەتاح ئیسماعیل: بەرپرسی بەشی ئاینی و دارایی و پەیوەندیە دەرەکیەکان و، ڕێکخستنەکانی ناوچەی ڕۆژهەلآت بوو.

2- عەلی عشماوی: بەرپرسی ڕێکخستنەکانی قاهیرە بوو.

3- مەجدی عەبدولعەزیز: بەرپرسی ئەسکەندەریە و بەحیرەبوو.

4- ئەحمەد عەبدولمەجید: بەرپرس بوو لە سەعید.

5:سەبری عەرەفە.[1]

## لیژنەی سەرکردایەتی بەدوای سەرکردەیەکدا دەگەڕێن بۆ ڕێکخستن

بەو پێیەی کەهەر پێنج سەرکردەکەی ئەم ڕێکخستنە نوێیە لەلاوە بێ ئەزمونەکان بوون، بیریان کردەوە لە دۆزینەوەی پیاوێکی بە تەمەنی خاوەن ئەزموون تا سەرۆکایەتی ئەنجوومەن بکات و سەرکردایەتی ڕێکخستنیش بگرێتە ئەستۆ، بەو مەرجەی ئەو کەسە کەسایەتیەکی گەورەو ناوێکی دیار بێت.

لە یەکەم هەڵبژاردنیاندا عەبدولعەزیز عەلییان هەڵبژارد کە پیاوێکی چاك بوو، بەلآم لە برایان نەبوو، یەکێك بوو لە پالەوانانی شۆڕشی 1919 و، ئەندامی حیزبی نیشتمانی بوو. لە پێش شۆڕش ـ وەزیر بوو لە یەکەم حکومەتدا، بەلآم لە پاش شۆڕش لەگەڵ عەبدولناسر جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە- وە عەبدولفەتاح چاوی پێ کەوت لە ماڵی زەینەب غەزالی، دواتریش لەگەڵ چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی گفتوگۆیان کرد بەلآم بیروبۆچونەکانیان بە یەك نەگەیشتن و، ئەوەی کە دەیان ویست لە لای ئەو دەستیان نەدەکەوت. وازیان لێ هێنا تا بگەڕێن بە دوای سەرکردەیەکی تردا.[2]

ئەوەبوو بیریان لە محەمەد فەرید عەبدولخالق کردەوە، عەبدولفەتاح ئیسماعیل پەیوەندی پێوە کرد تاکو سەرکردایەتیان بکات، بەلآم ئەو بەرپەرچی ئەم فیکرەیەی دایەوەو بە موئامەرەی دایە قەڵەم، وە پێیوابوو کۆکردنەوەی برایان هۆیەکە بۆ سازکردنی قەسابخانەیەك لە دژی برایان، وە پێی وابوو کە باشترین بار بۆ ڕێکخستن لەو قۆناغەدا بریتیە لە نەبوونی ڕێکخستن.[3]

---

[1] لماذا أعدموني : 46

[2] الموتى يتكلمون : 104-105

[3] لماذا أعدموني :46

فەرید عەبدولخالق هەر بەوەندە ڕازی نەبوو کە پێشنیارو داواکاریەکانی ڕەدکردنەوە، بەڵکو بڕیاریدا لە لای ڕابەری گشتی شکاتیان لێ بکات، بەڵام عەبدولفەتاح لە پێش ئەوەوەو لە دوای ئەم دانیشتنە چاوی کەوت بە ڕابەری گشتی و ڕەزامەندی لێ وەرگرت!

لە کۆتاییدا ڕاوبۆچوونیان لە سەر سەیدقوتب جێگیر بوو کە بیکەنە سەرکردەی ڕێکخستن، ئەویش پێشوازیی لە بانگەوازەکەیان کردو ڕازی بوو.

## سەید قوتب لە زینداندا بیر لە لێکدانەوەی ڕووداوەکان دەکاتەوە

پاش ئەوەی سەید لە زیندانی تورڕە جێگر بوو، دەستی کرد بە بیرکردنەوە و هێنانە پێش چاوی شریتی ڕووداوە تاڵو پشت شکێنەکان، ئەو ڕوداوانەی کە بە سەر ئەوو برایانی موسڵماندا تێپەڕیو ئەوەی کە بە سەری هات لەگەڵ براکانی لە چەوسانەوە و دەربەدەرکردن و ئەشکەنجەدان.

سەید وای دەبینی کە هێزە دژە ئیسلامیە جیهانیەکان —لە خاچپەرستان و زایۆنیەت و بێباوەڕان و ئیستیعمار- دەستیان هەبووە لە هەموو ئەوکێشانەدا کە ڕوویداوە.

بۆچونی وابوو کە ئەو هێزانە لەجێبەجێ کردنی پیلانەکانیاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا،ئەمەش بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمان و ئەشکەنجەدانی ئەندامەکانی و حوکم دان بە سەریاندا بە تۆمەتی ساختەو هەڵبەستراو!

پێی وابوو کە وەستاندنی چالاکیەکانی کۆمەڵ و ئەشکەنجەدانی ئەندامەکانی لە زینداندا، کردنەوەی دەرگایە لە بەردەم لاواندا بەڕووی فەساد و خراپەکاریدا.

ئەو پێی وابوو کە بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەمانە بریتیە لە گێڕانەوەی چالاکی و بوژاندنەوەی بزاڤی ئیسلامی، تەنانەت ئەگەر دەوڵەتیش —بۆ هۆیەك یان زیاتر- ئەمەی نەوێت !

بیرکردنەوەی سەید لە ڕووداوەکان نزیکەی حەوت ساڵ بەردەوام بوو- لە ساڵی 1955- تا ساڵی 1962.

وە لە ئەنجامی ئەو بیرکردنەوە درێژخایەنەوە بەم ئەنجامە گەشت :(بە ئاسانی مرۆڤ دەتوانێ تێبینی پەیوەندی ئەم داڕمانە -ئەخلاقیە- بکات بە تێکشکاندنی بزاڤی برایانی موسڵمان و قەدەغە کردنی چالاکیەکانیانەوە، هەروەك دەتوانێت پەیوەندی بکات لە نێوان ئەم تێکشکانەو، لە نێوان پیلانە زایۆنی و خاچپەرستی و ئیستیعماریەکاندا کە تایبەتن بەم کۆمەڵەیەوە، وە تایبەتن بە هەموو ناوچەکەوە.

ئەوە دیدو بۆ چونی منە بۆ هەڵوێست، کە لێوەی سوربوون و داکۆکی کردن لە سەر زەرورەتی کارکردن بۆ بزاڤی ئیسلامی سەرچاوە دەگرێ، وەك درێژە پێدانێك بۆ بزاڤی برایانی موسڵمانی ڕاوەستێنراوی دەست بەسەرا گیراو، لە گەڵ سود وەرگرتن لە ئەزموون و ئەو ئەزموونانەی کە پێشترگوزەراون.

وە لە نێوان ساڵی 1955و ساڵی 1962دا بیرکردنەوە لە پرۆگرامی بزاڤەکە بریتی بوو لە شێوازی دەستپێکردنەوەی).[1]

لەگەڵ ئەوەی کە حکومەت دژایەتی برایانی دەکردو چالاکیەکانی قەدەغە کردبوون، حوکمی دا بە سەر هەموو ئەو کەسانەشدا کە دەیزانی هەوڵیان داوە بۆ سەرلەنوێ کۆکردنەوەی برایان و هەوڵی گێڕانەوەی کارو ڕێکخستنیان داوە، بەڵام سەید بڕیارێکی توندوتۆڵی دا: **بزاڤی ئیسلامی پێویستە بەردەوام بێت.**

لە ناوبردنی ـ جوڵەو ڕێکخستن ـ لە بارودۆخێکی وەك ئەم بارودۆخەدا، دادەنرێت بە کارێکی تەواو بێ ماناو نابەجێ و دەگاتە ئاستی تاوان، دەتوانرێت هەڵەکان دوربخرێنەوە، وە دەشتوانرێت سود وەربگیرێت لە ئەزموونەکە بۆ دوورخستنەوەی لە مەترسی).[2]

[1] لماذا أعدموني :17
[2] لماذا أعدموني :27

## **دیدو بۆ چونی سەید بۆ پرۆگرامی کاری ئیسلامی**

دوای هەڵوێستەیەك‌و پێداچونەوەیەك سەید بیری كردەوە پێویستە بزاڤێكی ئیسلامی وەك بزاڤی برایانی موسڵمان لە گۆڕەپانەكەداهەبێت و نەوەستێنرێت!

وە لە زیندانی توررە دا جگە لەم دوو برا محەمەد یوسف هەواش، محەمەد زوهدی سەلمان كەسی تری لە گەڵ نەبوو، چونكە براكانی تر ڕاگوێزی زیندانی ئەلقەناترو زیندانی ئەلواحات كرا بوون.

ڕۆشنبیری محەممەد زوهدی سنوردار بوو، لە بەرئەوە لێكۆڵینەوەی دوورو درێژی سەید لە گەڵ هەواش ئەو حەوت ساڵەی خایاند و لە ئەنجامی ئەو باس و خواسانە گەشتنە ئەنجامێكی دیاری كراو.

سەید لە ڕاپۆرتەكەیدا لەوبارەیەوە دەڵێت: **(وە لە دوای پێدا چوونەوەو و لێكۆڵینەوەیەكی درێژ خایەن بۆ بزاڤی برایانی موسڵمان و پێچواندنی بە بزاڤی ئیسلامی یەكەم بۆ ئیسلام، وای لێهات لە بیرمدا ڕوون بوویەوە- هەروەها لە بیری ئەویشدا - كە بزاڤی ئیسلامی ئەمڕۆ ڕووبەڕوی بارودۆخێك دەبێتەوە هاوشێوەیە بەو بارودۆخەی كە كۆمەڵگاكانی مرۆڤایەتی لە سەری بوون لەو ڕۆژەدا كە بۆ یەكەم جار ئیسلام هات، لە لایەنی نەفامیانەوە بەڕاستیەكانی عەقیدەی ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامی- وە لە هەمان كاتدا، سەربازگەی زایۆنی و خاچپەرستی و ئیستعماری بە هێز دەبینرێن، كە دژایەتی هەموو هەوڵێكی بانگەشەكردن بۆ ئیسلام دەكەن، وە كار لە سەر تێكشكاندنی دەكەن لە ڕێگەی ڕێكخراوو دەزگا ناوخۆییەكانەوە، بە ڕێكخستنی فرۆفێڵ و ئاراستە كردنێك كە بەرەو ئەم مەبەستە بیانبات.**

**ئەمە لە كاتێدا كە بزاڤە ئیسلامیەكە لە زۆر كاتدا خۆی سەرقاڵ دەكات بە ڕۆچوون لە بزاڤە سیاسیە سنوردارە ناوچەییەكاندا.**

**هەروەها خۆی سەرقاڵ دەكات بە داواكردن لە حكومەتەكان بە پەیڕەو كردنی یاسای ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامی، لە كاتێكدا كە كۆمەڵگاكان خۆیان بە گشتی دوركەوتوونەتەوە لە تێگەیشتنی واتای عەقیدە و بیروباوەڕ. . . كەواتە پێویستە بزاڤی ئیسلامی لە جەماوەرەوە دەست پێ بكات. كە ئەویش زیندوو كردنەوەی واتای عەقیدەی ئیسلامیە لە دڵ و ژیریەكاندا.**

**هەروەها پەروەردەكردنی ئەو كەسەی ئەم بانگەوازە قبوڵ دەكات و ئەم واتا ڕاستانە وەردەگرێت، بە پەروەردەیەكی ئیسلامی دروست و، كات لە دەست نەدان لە ڕووداوە سیاسیە هەنوكەییەكاندا.**

**هەروەها هەوڵ نەدان بۆ سەپاندنی یاسای ئیسلامی لە ڕێگەی دەست گرتن بە سەر حوكمدا، لە پێش ئەوەی كە جەماوەری موسڵمان لە كۆمەڵگاكاندا خۆیان داوای یاسای ئیسلامی بكەن، لەبەرئەوەی بە ڕاستی ناسیویانەو كۆمەڵگاخۆی دەیەوێت بەئیسلام فەرمانڕەوایی بكرێت!**

**لە هەمان كاتدا و لەگەڵ ڕێكردن لەگەڵ پرۆگرامێكی پەروەردەیی بەم شێوەیەدا، پێویستە پارێزگاری بزاڤەكە بكرێت لە دەست درێژی كردنە سەری لە دەرەوە.**

**وەك ئەو كارەسارەتەی كەبەسەر برایاندا هات لە ساڵی 1948و ساڵی 1957دا. وە ئەو كارەساتەی كە بەسەر (جماعة الاسلامیة)ی پاكستاندا هات!**

**ئەم پارێزگاریكردنە لە ڕێگەی بوونی چەند كۆمەڵێكی ڕاهێنراوەوە دەبێت بە ڕاهێنانێكی فیداكارانە، دوای تەواو كردنی پەروەردە ئیسلامیەكان، لە بنەمای عەقیدەوە پاشان ڕەوشت. . .**

**ئەم كۆمەڵانە، دەست درێژی ناكەن، هەوڵی ڕوخاندنی یاسای فەرمانڕەوایی نادەن، وە بەشداریی لە ڕووداوە سیاسیە ناوچەییەكاندا ناكەن.**

**جا ئەگەر بزاڤەكە پارێزراو بوو، وە لە ڕێگەی فێركردن و تێگەیاندن و پەروەردە و ڕاستكردنەوەدا دامەزراو بوو، بانگەوازیش گونجاوو دووربوو لە ڕووبەڕووبوونەوە. ئەوا ئەم كۆمەڵانە خۆتێوە ناگلێنن لە ڕووداوە هەنوكەییەكانەوە.**

ئەم کۆمەڵانە لە کاتێکدا دێنە ناوەوە کە دەست درێژی بکرێتە سەر بزاڤ و بانگەواز و کۆمەڵەکە، دێنە ناوەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی و لێدانی هێزی دەستدرێژیکەر، بەو ئەندازەیەی کە مۆڵەت بە بزاڤەکە بدات تاکو لە ڕێگەکەی خۆیدا بەردەوامی هەبێت.

جێبەجێ کردنی یاسای ئیسلامی ئامانجێکی خێرا نیە و، لە دوای گواستنەوەی کۆمەڵگاکان خۆیانەوە نەبێت بۆ تێگەیشتنی ڕاست و دروست لە ئیسلام و پەروەردەکردنیان بە پەروەردەیەکی دروست ناتوانرێت جێبەجێ بکرێت، ئەگەرچی کاتێکی دوورو درێژیش بخوازێت و قۆناغی هێواشی بوێت!

ئەم وێنەیە بۆ بزاڤی ئیسلامی لە هەستمدا بە تەواوی ڕوون و ئاشکرا بووەتەوە- هەروەك چۆن لە هەستی برا هەواشدا ڕوونە.

ئەوەی ماوە ئەرکی گواستنەوەی ئەم بیروبۆچوونەیە بۆ تاك وكۆمەڵەكانی تر لە برايان بە هەر هۆكارێك بووە، بۆ دەستكردن بە جولّە و بزاوتن لە سەر ئەم بناغەیە)[1]

دیدو بۆچوونی سەید بۆ پرۆگرامی جوڵەی بزاڤی ئیسلامی، لە ڕووی دیدو بۆچوونی فیکریەوە لەو پەڕی پلەی ڕوونی و ئاشکرایی دایە، لە میانەی دەست پێکردن بە عەقیدە و ڕوونکردنەوەی، هەروەها کە گرنگیەکی تەواوی بە لایەنی پەروەردەیی داوە و، دامەزراوە لە سەر تێکۆشان و توندوتۆڵی و پەیوەست بوون بە ڕفتار و مومارەسەی کرداریەوە.

سەید لە بۆچوونیدا بۆ کار سەرقاڵبوونی سیاسی و سەندیکایی و پیشەیی دووردەخاتەوە، تاکو کات و توانای زۆر بمێنێتەوە، هەروەها پەنابردنە بەر ئیرهاب و توندوتیژی ڕەد دەکاتەوەو، خزانە نێو سوپاو دەزگا حکومیەکانیش بەرپەرچ دەداتەوە، تاکو کۆمەڵەکە تاوانبار نەکرێت بە توندوتیژی و ئیرهاب و پیلان گێران دژ بە دەسەڵات.

سەید قەناعەتی تەوای بە پێویست بوونی گواستنەوەی کۆمەڵگاکان بۆ تێگەیشتنی ڕاست لە ئیسلام و، داواکردنی گەرموگوڕ بۆ حوکمی ئیسلامی هەبوو، وە دەیزانی کە ئەمە ڕێگەیەکی دوورودرێژە، بەڵام بڕوای وابوو کە ئەمە تەنها ڕێگەیە!

## نامەکەی سەید بۆ مامۆستا عومەر ئەلئەمیری

دوای شارەزابوونمان لە بۆچوونی سەید بۆ پرۆگرامی کاری بزاڤی ئیسلامی، کەمێك دەوەستین تا ئاگاداربین بە سەر بەڵگەنامەیەکدا لە سەید قوتبەوە کە مامۆستا عومەر بەهائەدین ئەلئەمیری لە چاوپێکەوتنێکدا ئاماژەی بۆ کردووە کە لەگەڵ گۆڤاری (المجتمع) لەساڵی 1968 دا ئەنجامدراوە.

ئەوەبوو دوای قەسابخانەکەی برایان لە ساڵی 1965لە زیندانەکانی ناسردا، سەید قوتب تاکۆتا چرکە هەوڵی دا ئەم قەسابخانەیە ڕابگرێ، وە لاوانی برایان —ئەوانەی ئەو سەرکردایەتی دەکردن لە ڕێکخستنی نوێدا —ڕزگار بکات لە تیاچوون و بیانگێڕێتەوە ناو کۆمەڵگا بۆ مومارەسەی ئەرکە پەروەردەیی و فێرکاری و ڕۆشنبیریەکانیان.

لەبەرئەوە لە ڕێگەی واسیتەیەکەوە ئەوەی بۆ عەبدولناسر دەربڕی کە بەرەنگاری دەسەڵاتی عەبدولناسر نابێتەوە لە بەرامبەر ئازادکردنو گێڕانەوەی کۆتا برا لە برایان بۆ چاکسازیی و پەروەردەکردن لەناو کۆمەڵگادا! مامۆستا عومەر ئەلئەمیری دەڵێت: "لە کاتێکدا سەید قوتب —بە ڕەحمەت بێت — لە زینداندا بوو، دوو نامەی بۆ ناردین —بۆ برایان لە سوریا- نامەیەکیان کە بە دکتۆر حەمدی مەسعود مێردی حەمیدە قوتب دا ناردبووی بە دەستمان نەگەیشت.

بەڵام ئەو نامەیەی کە بەدەستمان گەشت تیایدا دەڵێت: داوا دەکەین کە ببن بە واسیتە بۆ گفتوگۆ لەنێوان ئێمەو جەمال عەبدولناسردا، وە ئێمە ئامادەین بۆ ئەوەی پەیمان بدەین کە ڕووبەڕووی نەوەستینەوە و بە هیچ شتێك بەرەنگاری نەبینەوە، هەموو ئەوانەی دراوەتە پاڵمان لە تۆمەتەکان درۆو پوچو هەڵبەستراون.

---

[1] لماذا أعدموني : 26-29 بە کورت کراوەیی هەوەها بڕوانە بۆ شەش یاساکەی پرۆگرامی سەید لە هەمان سەرچاوەدا ل42-45

ئێمە لەبەرامبەر ئەمەدا تەنها یەك شت لە عەبدولناسر داوا دەكەین، ئەویش ئەوەیە: ڕێگەمان بۆ چۆڵ بكات و گرفت نەخاتە كارو هەوڵەكانمانەوە لە بەدواداچوونی چالاكی شیوعیەت لە ڕفاندنی لاوانی زانكۆو لاوانی وڵات و بەماركسی كردنیان، وە هەر شتێكی جگە لەمە ئێمە كاتمان نیە بۆی، لەبەر ئەوەی ئێمە كاتێك ئەركی خۆمان كۆتایی پێ هێنا ئەوە بەسروشتی حاڵ وادەبێت كە كۆتایی دێت، وە وادەبێت ئەوانەی ئەو كاریان بۆ دەكات بەسەر شانیدا سەركەوتن، وە بەشێوەیەكی ئاسایی كۆتایی پێ دێت، ئێمە دەمانەوێ كە كۆسپ دروست نەكات و ڕێگر نەبێت لە نێوان ئێمە و نێوان كار كردن لەسەر ڕزگاركردنی گەنجانی ئەم ئوممەتە لە شیوعیەت".

دوای گەیشتنی نامەكە بە مامۆستا ئەمیری، ئەمیری سەركردەكانی برایانی لە سوریا بۆ ئەم مەبەستە كۆكردەوە، ئەوان پێیان باش بوو كەسایەتیەكی گەورەی عەرەبی هەڵبژێرێت بۆ واسیتە لەلای عەبدولناسر، ئەویش هەواری بومدین بوو، ئەمیان ڕاسپارد بە گەیاندنی نامەكە بە دەستی بومدین، ئەمەش لە كاتی بەستنی كۆنگرەی لوتكەی عەرەبی بوو لە (**الدار البيضاء**) لەساڵی 1965دا.

مامۆستا ئەمیری چاوی بە شەریف بلقاسم كەوت ـ چونكە بومدین سەرقاڵ بوو لە كۆنگرەكەدا ـ وە پوختەی پێشنیارەكەی سەیدقوتبی بۆ نووسی تا ببێتە واسیتە لای عەبدولناسر، بلقاسم نامەكەی گەیاندە بومدین، بومدینیش چاوپێكەوتنی لەگەڵ عەبدولناسر كردو كارەكەی خستە بەردەمی، عەبدولناسریش پێشنیارەكەی سەیدقوتبی بەرپەرچدایەوە.

بومدین بە بلقاسمی ووت: (بەڕاستی عەبدولناسر ڕاپەریو هەڵچوو، وە ووتی: هەموو شتێك قبوڵ دەكەم كە باسی لێوە بكرێت تەنها قەزیەی برایانی موسڵمان نەبێت، ئەمەیان قەزیەیەكە لێبووەتەوە، كۆتایی پێهاتووە بەشێوەیەكی براوە، وە ناتوانرێت ئاسان كاریان لەگەڵ بكرێت).[1]

هەندێكیان گومانیان پەیدا كرد لە ڕاستی قسەكەی ئەمیری، وە پێیان دائەگرت لەسەر ئەوەی كە سەید ئەم پێشنیارەی پێشكەش نەكردووەو، تۆمەتی شێواندنی فیكرو هەڵوێستی سەید قوتبیان دایە پاڵ ئەمیری! بەڵام لە ڕاستیدا ـ دوای زانینی پرۆگرامی بزاڤی ئیسلامی وەك ئەوەی سەید بۆی دەچوو ـ ئەوە بەدوور نازانین كە ئەمە لە سەیدەوە پێشنیاركرابێت، بەڵكو ئەوە بە ڕاستتر دەزانین كە سەید تا ئەوپەڕی تواناى هەوڵی داوە بۆ گێڕانەوەی گەنجانی برایان بۆ چاكسازیی و پەروەردەكردن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی بێ باوەڕی و فەساد لە كۆمەڵگادا !

بەڵام عەبدولناسر سور بوو لەسەر لەناوبردنی برایان و شەكەت كردنی گیانی سەید، سەرۆكەكانی عەبدولناسرو دوژمنەكانی ئیسلام ئەوەیان دەویست لە عەبدولناسر كە دژایەتی ئیسلام و سەربازەكانی بكات، وە دەرگا لەسەر بێ باوەڕی و خراپەكاری بكاتەوە، لەبەرئەوە واسیتەكەی ڕەدكردنەوە و، سەیدی لە سێدارەدا.

## سەید و ڕێكخستنی برایان لە زیندانی ئەلقەناتردا

دوای ئەوەی شێوازی كاركردنی بزاڤی ئیسلامی بۆ سەیدقوتب ڕوون بوویەوە، ویستی ئەم شێوازە بەبرایانیش بگەیەنێت تاكو لەسەر بەرقەرار كردنی ئەو پرۆگرامە لە جیهانی بانگەوازدا لەگەڵیدا كاربكەن![2]

سەرەتای پەیوەندی كردنی بەبرایانەوە سەبارەت بەم پرۆگرامە ساڵی 1962 بوو.

دەتوانین دوو قۆناغ تێبینی بكەین لە سەركردایەتی كردنی سەید بۆ ڕێكخستنی برایان:

**قۆناغی یەكەم:** سەركردایەتی سەید بۆ چەند كۆمەڵێك لە برایانی زیندانی ئەلقەناتر كە پرۆگرامەكەیان پەسەند كردو بوونە هاوبیروڕای. وە ئەم قۆناغە لە نێوان ساڵانی 1962 و 1964 دابوو تا كاتێك ئازاد كرا.

**قۆناغی دووەم:** سەركردایەتی برایان لە دەرەوەی زیندان، كە عەبدولفەتاح ئیسماعیل و براكانی دایانمەزراند بوو، ئەم ڕێكخستنە بە ڕوخسەتو ڕەزامەندی ڕابەری گشتیی بوو، سەركردایەتی سەید بۆ ئەم ڕێكخستنە سەركردایەتیەكی ئاراستەكردنی فیكریی بوو. ئەم قۆناغە لە مایسی 1964 بۆ ئابی 1965 بەردەوام بوو.

---

[1] گۆڤاری المجتمع، ژمارە 758 /11ئازاری 1986، لاپەرە 14-15

[2] لماذا اعدمونی ..29

کورتەیەك دەربارەی قۆناغی یەکەم:

سەید لە نەخۆشخانەی توڕڕەدا چاوی دەکەوت بەو برا زیندانیانەی کە لە زیندانەکانی ترەوە دەهاتن بۆ چارەسەر، کەزۆربەیان لە زیندانیانی توڕڕە بوون، وە چاوپێکەوتنەکان بەپێی ئەو سروشتەی زیندان هەیەتی خێراو تیژ بوون.

سەید باری ڕێکخستنانەی خۆی لەم قۆناغەدا لەگەڵ تێروانینی برا زیندانیەکان بۆ سەیدو بیرو بۆچوونەکانی ڕوون کردۆتەوەو دەڵێت: (من تا ئەو کاتە لە نێوەندی برایانی موسوڵماندا تەنها برایەکی موسڵمان بووم)!

لە ڕاستیدا سەید بەوپێیەی کە نووسەرو بیریارێکی ئیسلامی بوو، وە شارەزایی و ئەزموونی لە بوارە گشتییەکاندا هەبوو لە دەروونی برایاندا بەهاو پلەوپایەو کەسایەتیەکی تایبەتی هەبوو.

بەڵام ئەو لەگەڵ هەموو ئەمانەدا هیچ سیفەتێکی حەرەکیو ئیداری لەکۆمەڵی برایاندا نەبوو، کە مافی شەرعی پێ ببەخشێ لە ڕەنگ ڕشتنی پلانی حەرەکی و، لەئاراستە کردنی برایاندا بۆی. چونکە ئەمە بە تەنها مافی مەکتەبی ئیرشادو ئەو کەسەیە کەمەکتەب ئەم کارەی پێ بسپێرێت. وە من لە ئەندامانی مەکتەب نەبووم، وە لەلای مەکتەبەوە داوای هیچ شتێکم لێ نەکرابوو. . ).

سەید بەخوێندنەوەی چەند کتێبێکی دیاریکراوو موناقەشەی چەند بیرێکی دیاری کراو ئامۆژگاری برا زیندانیەکانی دەکرد ئەوانەی لە زیندانی ئەلقەناترەوە هاتبوون.

لە زیندانی ئەلقەناترداو لەساڵی 1962دا یەکەم ئوسرەی ئیخوانی دروست بوو کە بە پرۆگرامی سەید کار بکەن، کە لەم برایانە پێك هاتبوون: مستەفاکامیل، یوسف کەمال، سەید عید، ژمارەی لایەنگرانی سەید لە زیندانی ئەلقەناتر زیادی کرد، وە لە هەمان زینداندا کۆمەڵێك لە برایانی لێبوو کە دژی تێگەیشتنی سەید بوونو دووپاتی ئیخوانی بوونیان دەکردەوەو تۆمەتباریان دەکرد بە سەرپێچی کردنی هێڵی جوڵەی برایان، هەروەها بەوەی کە فیکرەکەی لە ڕویەکی نایاساییەوە دەرچووە. وە لە ماوەی نێوان 1962 و 1964دا باری برایان لە زیندانی ئەلقەناتر بەم شێوەیە بوو:

نزیکەی بیست و پێنج برا لە کۆمەڵی برایاندا لەسەر پرۆگرامی سەید دەڕۆشتن. نزیکەی بیست و سێ برا دژایەتی ئەم پرۆگرامەیان دەکرد بەتوندی، وە نزیکەی پەنجا برا لە ڕێگەیاندا بوون بۆ پەیوەست بوون بە پرۆگرامەکەی سەیدەوە.

لەو کەسانەی لایەنگریان نەدەکرد: ئەمین سدقی، عەبدولڕحمان ئەلبەنا، لوتفی سەلیم، عەبدولعەزیزجەلال بوون، لایەنگرەکانیشی: مستەفاکامیل، سەیدعید، ڕەفعەت ئەلعیاد، فەوزی نەجم بوون.

## ئەندامانی مەکتەبی ئیرشاد پشتگیری لە سەید دەکەن

جیاوازی نێوان سەید و ئەوانەی لەدژی وەستان لەزینداندا پەرەی سەند، نەیارەکانی پەیوەنیان کرد بە ئەندامانی مەکتەبی ئیرشادەوە ئەوانەی کەزیندان بوون لەزیندانی ئەلواحات و شکاتی سەیدقوتبیان لەلا کردن لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵی بوون، وە ئەفکارەکانی سەیدیان بەشێوەیەکی ناڕاست بۆ خستنە ڕوو.

سەید لەم بارەیەوە دەڵێت: (هەندێك لەوانە وێنەیەکی شێوێنراوو گەورەکراویان گەیاندە مامۆستا عەبدولعەزیز عەتییە و کەسانی تر لە ئەلواحات دەربارەی کەرت بوونە مەترسی دارەکان کە لەکۆمەڵەی ئەلقەناتردا ڕوویداوە. . . وە هەروەها وێنەیەکی شێوێنراو دەربارەی بنەڕەتی فیکرەکان و ئەو پرۆگرامەی کە جیاوازیەکە بە دەوریدا دەخولایەوە

ئەمەش وای لێکردن لە ئەلواحات هەراسان بن هەراسانێکی توند، لەفیکرەکە خۆی، یاخود لەو جیاوازییەی بەدەوریدا بوو ).

---

[1] هەمان سەرچاوە ::29-31

[2] لماذا اعدمونی ::31

[3] هەمان سەرچاوە ::31 -36

سەید لەنەخۆشخانەی زیندانی توڕڕە چاوی کەوت بەبرا عەبدولڕەئوف ئەبولوەفا کە لەلایەن مەکتەبی ئیشرادەوە لەزیندانی ئەلواحاتەوە هاتبوو، بێزاری ئەندامانی مەکتەبی سەبارەت بە بیروبۆچونەکانی پێڕاگەیاند. ئەوەبوو پێیان ووترابوو کە سەید لەفیکرە تازەکانیدا خەڵکی بە بێ بڕوا دەردەکات.

سەید ڕاستی فیکرەکەی بۆ عەبدولڕەئوف ئەبولوەفا ڕوونکردەوە، کە هیچ یەکێك لەموسڵمانانی بەبێ بڕوا نەداوەتە قەڵەم و پێی ووت: (**ئێمە خەڵکی بەکافر ناکەین!. وە ئەمە گواستنەوەیەکی شێوێنراوە، بەڵکو ئێمە دەڵێین: ئەوان لەڕووی بێئاگاییان بەڕاستیەکانی عەقیدە و تەسەوەرکردنی واتا دروستەکەی و دوری لەژیانی ئیسلامیەوە گەیشتوونەتە حاڵێك کە وەك حاڵی کۆمەڵگاکان وایە لەسەردەمی نەفامیدا.**

**لەپێناوی ئەمەدا، نابێت خاڵی دەست پێکردن لەجوڵەدا بریتی بێت لەقەزیەی دروستکردنی دەسەڵاتو دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵکو دەبێت: سەرلەنوێ چاندنەوەی تۆوی عەقیدە و پەروەردە و ڕەوشتی ئیسلامی بێت.**

**بابەتەکە پەیوەستە بە پرۆگرامی بزاڤی ئیسلامیەوە زیاتر لەوەی پەیوەست بێت بە حوکم دان بەسەر خەڵکیدا**).[1]

ئەبولوەفا ڕوونکردنەوەکەی سەیدی گەیاند بە ئەندامانی مەکتەب لە ئەلواحات، بەڵام ئەوانەی کە دژی بوون بەردەوام داکۆکیان دەکرد لەسەر پێویستی وەستاندنی- ئەوەی ناویان نابوو- فیتنە لەڕیزەکانی کۆمەڵەدا.

لەپێش ئازاد کردنی سەید لەزیندانی توڕڕە گوێزرایەوە بۆ نەخۆشخانەی زیندان:(مامۆستا عەبدولعەزیز عەتییە و عومەر تەلمەسانی لەئەندامانی مەکتەبی ئیرشاد کە لەزینداندا مابوونەوە، پێم گەیشتن و منیش ڕاستی مەسەلەکەم تێ گەیاندن، پێی دڵئارام بوون).[2]

دوای ئازاد کردنی سەید، سەردانی هەردوو ئەندامی مەکتەب ئەمین سدقی و عەبدولڕەحمان ئەلبەنای کرد کەدوو سەرکردەی نەیاری بیروبۆچونەکانی سەیدبوون لە نەخۆشخانەی توڕڕە وە هەردوو برا عەتییەو و تەلمسانی هەوڵیاندا:(تێیان بگەیەنن کارەکە بەو شێوەیە نیە کەئەوان تێی گەشتوون، بەڵام ئەوان دوای گەڕانەویان بۆ ئەلقەناتر، لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەی کە لەگەڵیان بوون هەر سوربوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان).[3]

ئەوەی لێرەدا بەلای ئێمەوە گرنگە قسەکەی سەیدقوتب خۆیەتی کە دەڵێت هیچ موسڵمانێکمان بەکافر دەرنەکردووە، وەقسە دەربارەی پرۆگرامی بزاڤی ئیسلامیە لەکارکردندا، نەك حوکم دان بەسەر خەڵکیدا. خەڵکی واتای عەقیدەی ئیسلامیی دروست نازانن- و ئەمەش کافر بوونیان ناگەیەنێت- وە داواکراو ئەوەیە کە ئەم ڕاستیانە لە موسڵمانان بگەیەنرێت و موسڵمانانی فێر بکرێت. . ئەمە بەلامانەوە گرنگە چونکە ئەم مەسەلەیە دوای شەهید کردنی سەید گەشەی کرد، ئەوەبوو چەند کۆمەڵێك لەلاوانی موسڵمان بەدەرکەوتن کە موسڵمانانی دیکەیان بە کافر دەدایە قەڵەم و ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە ئەمە فیکری سەید قوتب بووە.

هەروەهاهەڵوێستی هەردووبرا عەتییەو تەلمەسانیمان مەبەستە لە بەرامبەر فیکرەکانی سەید و پرۆگرامەکەیدا، وە ڕەزامەندی دەربڕینیان بۆ سەید لەسەر هەموو ئەو بیرانە.

---

[1] لماذا أعدموني :36

[2] هەمان سەرچاوە: 36-37

[3] هەمان سەرچاوە: 37

[4] هەمان سەرچاوە : 37

## تەلمەسانی ڕابەر ستایشی سەید دەکات

عومەر تەلمسانی ڕابەری سێیەمی برایانی موسڵمان لەساڵی 1958دا ستایشی سەیدی کرد و، بە ویژدانەوە لەبارەیەوە دوا، وە بەدووری گرت لەتۆمەتی بەکافر کردنی موسڵمانان، ئاماژەی بەوە کرد کە سەید پێش کەمێك گیرایەوە - - دەربارەی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ تەلمەسانی لەنەخۆشخانەی زیندانی تورڕەدا بۆ دەرخستن و ڕوونکردنەوە سەبارەت بەو تۆمەتانەی کە ئەو کەسانەی دژی سەید بوون دابویانە پاڵ سەید.

ئەوەی کە لەستایشەکەیدا لەسەر سەیدهاتووە ئەمەیە : یادی ئەوە دەکەم کە شەهید سەیدقوتب دانراوی سودمەندی زۆری هەیە و لەسەر ئاستێکی بەرزیش، لەوانە **"في ظلال القران"** و **"العدالة الاجتماعية"** و **"معالم في الطريق"**.

وە ئەم دانراوانە جیا ئەکرێنەوە بە تورەیی لەستەم لەهەمووشێوەکانیدا، وە سور بوون لەسەر هەڵگرتنی ئێش و ئازار و گرفت لەسەر هەموو چینەکان، وە ئەوەی کە ئازادی باڵ بەسەر میسردا بکێشێ.

**"معالم في الطريق"** تازەیەکی تیا نییە لە فیکری سەید قوتب، بەڵام بەو پێیەی کە شەهید لە زینداناو دوای ئەوەی جۆرەها ئەشکەنجەی چەشت بە هەموو شێوەکانیەوەو بە دلڕەقانەترین و وەحشیانەترین شێوە ئەشکەنجەدرا نووسیویەتی، لەبەرئەوە تورەبوونی لە وانەی دژی شەرع وەستاونەتەوە ڕوونترو دیارتر بە دەرکەوت. مامۆستای شەهید سەیدقوتب رۆژێك لەرۆژان نەیویستوە موسڵمانێك بە کافر بکات.

چونکە لە زاناترین کەسان بوو بەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەزیاد لەفەرموودەیەکدا فەرموویەتی: ئەوەی کە ووتی: (لااله الاالله)، وە بەدڵ بڕوای پێی هەبوو، بە هەتا هەتایی لەئاگردا نامێنێتەوە، ئێمەش دەزانین کە جگە لە کافران هیچ کەس بە هەتا هەتایی لەئاگردا نامێنێتەوە.

ئەمە یەکەم شت، دووەمیان، زۆر دووبارە کردنەوەی دەستەواژەی (کۆمەڵگای نەفامی) مەبەستی پێی کافر کردنی کۆمەڵگا نەبووە، بەڵکومەبەستی دژایەتیکردنی توندی ستەمکاران و ملهوڕان و گومان دروست کەران بووە. ئەوەش شێوازێکە زمانی عەرەبی دەیناسێت.

وە ئەوانەی شەهید سەیدقوتب دەناسن و پاکی ڕەوشتی و، فراوانی ئەدەبی و، خۆبەکەم زانینی و، ناسکی هەستی دەناسن، دەزانن کە سەید کەس بە کافر دەرناکات.

سەید بانگخوازێکی ئیسلامیە، لە چاوانەی بانگخوازە موسڵمانەکانە، جا ئەوکەسەی وتەکانی سەیدی بەکارهێناوە دوور لەمەبەستی خۆی، ئەوە ستەمی لەسەید کردووە. وە ئەوانەی شێتانە هێرشیان کردۆتە سەری، لەکاتێکدا کاریگەری وشەکانی و نووسینەکانی سەیدیان لەسەر لاوانی پاکوخاوێن هەستپێکردووە، ئەوانەش ستەمیان لێکردووە.

ئەمە کورتەیەکی کۆکراوەیە بۆ ئەو بناغانەی (**معالم في الطريق**)ی لەسەر وەستاوە، وە من شەرەفی ئاگادار بوونم بە سەریدا هەیە پێش لەچاپدانی، کاتێك ئێمە لەنەخۆشخانەی لیمان تورڕە بووین.

وە کاتێك سەیدقوتب ئازاد کرا، ناردی بۆ من- من لە زینداندا بووم- هەواڵی پێدام کە کۆماری عێراق داوایان لێکردوە تا بچێت بۆعێراق و لەبواری پەروەردە و فێرکردندا کاربکات.

سەید لەڕەدکردنەوە و قبوڵ کردندا پرس و ڕای پێکردم. ڕای من وابوو کە قبوڵی بکات! بە هۆی مەترسیمەوە لەوەی چاوەڕێم دەکرد لەلایەن پیاوانی کودەتاچییەوە بەرامبەری بکرێت ، بەڵام ئەو مانەوەی لەمیسردا هەڵبژارد، تاکو پارێزگاری لە بۆچوونی خۆی بکات، وە ئەوە قەدەری خوایە کەنەخۆپاراستن و نەخۆلادان لەگەڵ قەدەردا سودی نیە.[1]

---

[1] ذكريات لا مذكرات, عمر التلمساني : 280-281

## سەرئە نجامی لایەنگرانی سەید دوای دەرچوونی لەزیندان

دوای ئەوەی سەید لە مایسی 1964دا لە زیندان ئازادکرا، پەیوەندی نەکرد بەو کۆمەڵەوە کەلایەنگری فیکرەکانی بوون لە ناو زینداندا بەکەمی نەبێت، ئەم پەیوەندیەش پەیوەندیەکی ڕێکخستنانە نەبوو.

سەید بیری کردەوە لەوەی لە ڕووی ڕێکخستنەوە پەیوەندی بکەن بەشەهید محەمەد یوسف هەواش و، لەدەروونی خۆیدا ئەوی هەڵبژاردبوو بۆ ئەم کارە، بەڵام نەپێی وت و نەکردیشی، وە ئیتر برایانی لایەنگری سەید لە دەرەوەی زیندان بەبێ پەیوەندی ڕێکخستنی مایەوە.

بەڵام سەید قوتب خۆی لەگەڵ دەرچوونیدا لە زیندان ڕاستەوخۆ پەیوەندی کرد بە ڕێکخستنی ڕەسمی تازەی برایانەوە، کە عەبدولفەتاح ئیسماعیل و براکانی دایان مەزراند بوو. سەید هۆی ڕێکنەخستنەوەی لایەنگرەکانی خۆی لە دەرەوەی زیندان لەم چەند خاڵەدا ڕوون دەکاتەوە:

1ـ ئەم کۆمەڵە لە برایان وەك هەموو برایانی تر حسابیان بۆ دەکرێت لە ڕوی نەجولاَن و وەستان لەجولە لەبارودۆخە هەنوکەییەکەدا، وە ئەم کۆمەڵەیە جگە لە جۆری بیرکردنەوە بارودۆخێکی سەربەخۆی نەبوو کە بیبەستێتەوە بە منەوە، وە منیش نەمدەویست بچمە ناو هیچ گرفتێکەوە وەك ئەوەی کە کۆمەڵی ئۆپۆزسیۆن لە ئەلقەناتر وروژاندیان.

2ـ من دوای دە ساڵ لە زیندان هاتمە دەرەوە. مرۆڤێکیش پاش دەساڵ لەزیندان بێتە دەرەوە وەك کوێر وایەو، لە لایەنی دیدی کۆمەڵایەتیەوە پێویستە هەلی بۆ بەجێ بهێڵرێت تا ئاشنایی بەسەر کۆمەڵگەدا پەیدا بکاتەوە بۆ چارەسەری حاڵو وەزعە کۆمەڵایەتیەکانی، جگە لەوەی کە جولەکانی بە توندی چاودێری دەکران.

3ـ بارودۆخ لە دەرەوەی زیندان جیایە لە زیندان. لە زینداندا تواناکان زیندانیو چڕو پڕو کۆ دەبن، وە بە ئاراستەی ئەوەی کە خاوەن عەقیدەکە لە پێناویدا چۆتە زیندانەوە دەردەچن. بەڵام کە ئەو لە دەرەوە بێت ئەوا سەرقاڵی و گرفتو گرنگی پێدانی جۆراوجۆر کاتەکانی داگیر دەکەن. . وە نابێت هەرگیز ماوەیەك وازیان لێبهێنرێت تاکولەماوەیەدا دەربکەوێت کێ بە ژیانی دنیادا ڕۆچوەو، کێ ماوەتەوە بۆ عەقیدەو بانگەوازەکەی.[1]

لەم برایانە کەسی تری نەبینی، جگە لە ئەلتوخی—کاتێك لە ئیسماعیلیە بانگی کرد تا ئاگادار بێت بەسەر حاڵی براکاندا لە دەرەوەی زیندان.

## سەرکردەی ڕێکخستنی نوێ لە زینداندا پەیوەندی دەکات بە سەیدەوە

سەرکردەکانی ڕێکخستنی نوێ توانیان دەستیان بگاتە سەیدو لە زینداندا پەیوەندی پێوە بکەن. ئەحمەد ڕائف لە (**البوابة السوداء**)دا دەگێڕێتەوە کە شەهید عەبدولفەتاح ئیسماعیل گەیشتە سەید قوتب لە نەخۆشخانەی زیندان، وە داوای لێکرد (کە ببێتە باوکی ڕۆحی بۆ کۆمەڵێك لە برایان لە دەرەوەی زیندان، کە پێویستیان بە کەسێك هەیە تێگەشتنەکانیان بۆ ڕاست بکاتەوەو، ڕێنماییان بکات بۆ ڕێگای ڕاستو ئەوان ئەم توانایە لەودا دەبینن.

سەید لەسەر ئەمە ڕەزامەندی دەربڕی و کتێبەکانی بە ئاڕاستەی ڕێکخستنەکە کەوتنە سەر ڕێگەی خۆیان چ لە پێش لە چاپدان و چ دوای لە چاپ دانیان).[2]

لە کاتێکدا خوشکی تێکۆشەر زەینەب ئەلغەزالی دەربارەی پەیوەندی سەرکردەی ڕێکخستن بە سەیدەوە لە زینداندا شتێکی تر دەگێڕێتەوە کە سەرکردایەتی ڕێکخستنی نوێ ڕوخسەتیان لە ڕابەری گشتی پێشەوا هوزەیبی وەرگرت بۆ پەیوندی کردن بە

[1] لماذا اعدموني ، 38- 39.
[2] أيام من حياتي 35- 36.

سەیدەوە، تا ڕاو بۆچوونی لە هەندێك ڕووداودا وەربگرن، و ە ئاشنا ببن بە ئاراستەكردنو ڕێنماییەكانی، ئەویش ڕێگەی پێدان.
عەبدولقادر ئیسماعیلیش داوای كارەكەی لە زەینەب ئەلغەزالی كردو لە ڕێگەی حەمیدە قوتبەوە ئەنجامدرا.

زەینەب غەزالی دەگێڕێتەوە كە حەمیدە قوتب لەلایەن سەیدی برایەوە مەلزەمەی كتێبێكی بۆ دەست خستن و وتی: سەید ئامادەی كردووە بۆ چاپكردن كە ناوی (**معالم في الطريق**) بوو، وتی: ئەگەر لە خوێندنەوەی ئەم لاپەرانە لێبوونەوە ئەوا هی ترتان بۆ دەهێنم)[1].

ئەم پەیوەندی كردنە لە ساڵی 1962 دا بوو واتە بە دوو ساڵ پێش دەرچوونی لە زیندان. هیچ دژایەتیەك لە نێوان هەردوو چیرۆكەكەدا نیە، دەشێت سەرەتای پەیوەندیكردن لە ڕێگەی عەبدولفەتاح ئیسماعیلەوە بووبێت، وە ئەو ڕوخسەتی لە ڕابەری گشتی وەرگرتبێ، پاشان ئەڵقەی پەیوەندی كردن لە نێوان سەیدو ڕێكخستندا حەمیدەی خوشكی سەیدو حاجی زەینەب غەزالی بووبێت.

هەروەهاسەید لە زینداندا بەردەوام بوو لە یارمەتی دانو هاوكاریكردنی ڕێكخستن بە نووسینەكانی لە (**الظلال**)و بەشەكانی (معالم).

## سەید سەركردایەتی ڕێكخستنی نوێ دەكات

دوای دەرچوونی لە زیندان هەر پێنج براكە ـ سەركردایەتی ڕێكخستنی نوێ ـ چاویان بە سەید كەوت لە ساڵی 1964و داوایان لێكرد سەركردایەتی ڕێكخستنی نوێ بگرێتە ئەستۆ، سەید دوای ئەوەی لە لایەن سەرۆكەكەیەوە داوای لێكرا زانیاریەكانی دەربارەی ڕێكخستنی نوێ تۆمار دەكرد ، (دوای چەند یەكتر بینینێكی یەك لە دوای یەك ،لەوانەوە بۆم دەركەوت كە بە شێوەیەكی كرداری ئەوان ڕێكخستنیان پێكهێناوە، مێژووی كار تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ نزیكەی چوار ساڵ یان زیاتر، وە كەمینەیان لەوانە بوون كە پێشتر دەستگیر كراوبونو زۆرینەیان لەوانە بوون كە دەستگیر نەكرابوون یان هەر پێشتر لە برایان نەبووبوون.

ئەم ڕێكخستنە دروست كرا، بەوەی هەر یەكێك لەو كۆمەڵە ـ بە جیا ـ لە كاتێك لە كاتە ڕابردووەكاندا بیری كردبووەوە لە پێویستی كاركردن بۆ گێڕانەوەی برایانی موسڵمانو ڕازی نەبوون بەو بارەی كە لەو كاتەدا كۆمەڵی برایانی تێیدا بوو.

وە ئەو لەكاتی جموجوڵیاندا ـ هەریەك بەجیا بۆ ڕێكخستنی هەر ژمارەیەك لەبرایانی ئارەزومەند لەجوڵە، یان بزواندنیان، هەندێكیان بە هەندێكیان دەگەیشتن، وە دوای ئەوەی هەندێكیان متمانەیان بە هەندێكیان پەیدا كردوو دڵنیا دەبوون لەیەكتر، ئەوا هەموویان پەیوەندیان دەكرد بەو كۆمەڵەوە كەپێشتر پەیوەندیان پێوە كردبوو، وە تەنها ئەم ڕێكخستنەیان پێك هێنا.

ئەوان- كە هەموویان لاوانی كەم ئەزمون بوون- بەردەوام دەگەڕان بەدوای سەركردەیەكدا بۆ خۆیان لە گەورە ئەزموندارە بیریارەكان- وەك مامۆستا فەرید عەبدولخالق- بەڵام نەیان دۆزیەوە)[2].

پاشان پێنج براكە ئاماژەیان بەسەیدقوتب كرد- دوای ئەوەی داوایان لێكرد سەركردایەتیان بكات- ئەوان پێش ئەوەی نووسینەكانی بخوێننەوە و گوێ لە قسەكانی بگرن (ئەوان لەسەر ئەو بناغەیە بیریان دەكردەوە كە مەسەلەكە مەسەلەی ڕێكخستنی كۆمەڵێكی گیان بەخشە، بۆ لابردنی بارودۆخ ولەناوبردنی ئەو كەسانەی كە لەكۆمەڵی موسڵمانیان دابوو، وە بانگەوازەكەیانیان وەستاند بوو، وە هەروەها دروست كردنەوەی كۆمەڵ و بونیادنانی دەستوری ئیسلامی لەو ڕێگەیەوە.

بەڵام ئێستە تێگەشتن كە مەسەلەكە زۆر لەوە گەورەترە، وە ڕێگەی كاركردن دوورودرێژترە. . . ).

---

[1] أيام من حياتي 35-36
[2] لماذا أعدموني :45-46

وە پێویستی خۆیان بۆ سەرکردایەتیەك بۆ ڕوون کردەوە کەزیاتریان پێ ببەخشێت و، لە بزاوتندا ڕێنومایییان بکات، تائەمان بتوانن کار بکەنە سەر ئەوانەی دوای خۆیان، وە تێگەیشتنیان فراوان بکەن و بیروبۆچونیان بگۆڕن. . .

پاش ئەوەی سەید وتەکانی بیستن، لەگەڵ پێشنیارەکەیان کە سەید سەرکردایەتیان بکات، سەید کەوتە نێوان دوو هەڵبژاردنەوە:

(یان کارکردن ڕەدبکەمەوە لەگەڵیان. . وە ئەوانیش لەسەر ئەو شێوەیەی کە من قەناعەتم پێی هەبوو پێك نەهاتبوون. وە یان کارکردن قبوڵ بکەم، لەسەر بناغەی پڕکردنەوە و تەواوکردنی ئەوەی لە دەستیان چووو بوو لەو پڕۆگرامەی کە بە بیرمدا دەهات بۆ جوڵەو بزاوتن، وە لەسەر بناغەی توانای ڕێککردنی جوڵەکانیان، بەشێوەیەك هەڵچوونی بێ جێو ڕێ دروست نەبێت و ڕوونەدات- بەتایبەتی کە هەندێکیان ئەوە لە نیەتیاندا هەبوو.

ڕێگەی دووەمم بڕیاردا بۆ کارکردن لەگەڵیان وبۆ سەرکردایەتی کردنیان. . . ).[1]

## سەرکردایەتی کردنەکەی بە ڕوخسەتێك بوو لە ڕابەری گشتی پێشەوا هوزەیبییەوە

هەندێك لە برایان - هەندێك لە لێکۆڵەرەوانیش- وای بۆ دەچن کە کاتێ سەید دەستی بە کارکرد- لە ناوەوە دەرەوەی زیندان- بە تەنها بوو دور لەبرایان، وە ڕێبازەکەی دابڕابوو لە برایان، بەڵکو پەیوەست بوو تەنها بە خۆیەوە، وە گوایە سەید کاری کردبێت بۆ دامەزراندنی بزوتنەوەیەکی ئیسلامی نوێ جیا لە بزووتنەوەی برایان !

بەڵام ئەم بۆچونانە هەڵەن و لە سەر گومان و خەیاڵ ڕاوەستاون!

ئەو برایانەی کە لەگەڵ سەید کاریان دەکرد دوپاتی ئەوە دەکەنەوە کە سەرکردایەتی سەیدقوتب بە ڕوخسەت بووە لە ڕابەرەوە، سەیدیش ڕەزامەندی ڕابەری گشتی وەرگرتووە لە سەر جموجۆڵ کردنەکەی. زەینەب ئەلغەزالی تێکۆشەر دەگێڕێتەوە ـ بێگومان ڕاستگۆیە لە گێڕانەوەکەشیدا ـ کە ڕابەر (ئاگاداربوو بەسەر مەلزەمەکانی کتێبی (معالم) دا، وە مۆڵەتی شەهید سەیدقوتبی دا کە بە چاپی بگەیەنێت) هەروەك دەگێڕێتەوە کە چاوی بە ڕابەری گشتی کەوتووەو پرسیاری لێکردووە دەربارەی سەیدو (معالم)، ئەویش پێی وتووە: (لەسەر بەرەکەتی خوا. . . بەڕاستی ئەم کتێبە هەموو ئاواتەکانە منی کورت کردۆتەوە لە سەید دا، خوای پەروەردگارمان بیپارێزێ، من خوێندمەوە، وە خوێندنەوەکەیم دووبارە کردەوە، بەڕاستی سەیدقوتب هیواو ئومێدی چاوەڕوان کراوە بۆ بانگەوازی خواویستی ئێستە. وە ڕابەر مەلزەمەکانی کتێبەکەی پێدام، منیش خوێندمەوە ـ کە لەو کاتەدا لە لای ڕابەری گشتی بوو. بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی چاپکردنی ـ منیش لە ژورەکەی ڕابەری گشتی نەچومە دەرەوە تا بە تەواوی **(معالم في الطريق)**م خوێندنەوە.[2]

خوشکە زەینب دووپاتی دەکاتەوە کە سەید بە ڕوخسەتێك لە ڕابەری گشتی مامۆستا هوزەیبییەوە سەرکردایەتی ڕێکخستنی نوێی برایانی دەکرد: (ئەوەبوو هوزەیبی هەموو بەرپرسیارێتیەکانی سپارد بە سەیدقوتب، وە هەموو پەیوەندیەکانی ئێمە بە سەیدەوە بەپێی فەرمانی هوزەیبی بوو. وە پێویست بوو لە سەرمان لە دوای دەستگیرکردنیەوە بگەڕێینەوە بۆ لای ڕابەری گشتی و پرسی پێ بکەین بۆ ئەوکەسەی لە جیاتی سەید بەرپرسیاری ئەگرێتە ئەستۆ) زەینەب غەزالی ئەم ڕاستییەی لە زیاد لە شوێن و جێیەکدا دووپات کردۆتەوە، بە تایبەت کاتێك بۆ پەیامنێری گۆڤارە ئیسلامیەکان دواوە.

---

[1] لماذا أعدموني : 46-47

[2] أيام في حياتي : 36 ـ 37

### سروشتی سەرکردایەتی کردنی سەید بۆ ڕێکخستنی نوێ

سەرکردایەتی کردارێکی جێبەجێکردن بوو بۆ ڕێکخستنی نوێی لیژنە پێنج کەسیەکە: عەلی عشماوی و عەبدولفەتاح ئیسماعیل و ئەحمەد عەبدولمەجید و موبارەك عەبدولعەزمی و سەبری عەرەفە. وە سەید جێبەجێ کردنی ئیش و کارە کرداریەکانی ڕێکخستنی بەجێهێشتبوو بۆ ئەم پێنج برایە. بەڵام سەرکردایەتی سەید، سەرکردایەتیەکی فیکری ڕۆشنبیری زانستی پەروەردەیی بوو.

هەر لەبەرئەمەش بوو لە کاتێکدا داوایان لێکرد ببێتە سەرکردە پێی ووتن: (بەڵام من وەك دەزانن پیاوێکی نەخۆشم، لەژێر دەستی پزیشکەوانی مەترسیدار بە نەخۆش دەرچووم، وە ئەجەلەکانیش ـ بە دەستی خوایە، بەڵام قەدەری خوا بەکۆمەڵەهۆکارێك دێنە دی کە خوای گەورە خۆی بەدی هێناون. .

لەبەرئەوە پێویستە پشت بە خوا ببەستن، وە هەوڵ بدەن ئێوە خۆتان سەرکردەبن. وە ئەرکی ڕاستەقینەی من لەگەڵ ئێوە بریتیە لە هەوڵدانی ئەوەی کە لە توانامدا هەیە بۆ هۆشیار کردنەوە و پێگەیاندنتان لە ڕووی ژیریەوە، تاکو ببن بە سەرکردە. . . ) **ئاڕاستەکردنەکانیشی بۆیان پەروەردەیی و ڕۆشنبیری و سیاسی گشتیی بووە !**

کۆبوونەوەکانیشی لەگەڵیان(هەندێ جار لە هەفتەیەکدا جارێك، هەندێ جار دوو هەفتە جارێك. . وە لە ماوەی سەرقاڵ بوونیدا لە هەر سێ هەفتەیەکدا جارێك، یان هەموو مانگێك یەکجار. . ).

ماوەی سەرکردایەتی بۆ ڕێکخستن (لە شەش مانگ تێپەڕی نەکرد، دانیشتنەکانیش لە نێوانی زیاتر لە دە یادوانزە دانیشتن زیاتر هەڵناگرێ. . ).

سەید سەرکەوتوو بوو لە لادانی ئەندامانی ڕێکخستن لە فیکرەی بەکارهێنانی هێز دژ بەوانەی کە لە کۆمەڵی برایانی موسڵمانیان دا (**ئێمە ڕێککەوتین لە سەر دورخستنەوەو وەلانانی بەکارهێنانی هێز وەك هۆکارێك بۆ گۆڕینی سیستمی فەرمانڕەوایی، یا دروستکردنی سیستمی ئیسلامیی).**

## هەڵە لە پرۆگرامی سید قوتب دایە بۆ بزاڤی ئیسلامیی لە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیدا

پێشتر ئاماژەمان بۆ پرۆگرامی سەید لە جوڵەو کارو بانگەوازدا کرد، وە ڕوونمان کردەوە کە لە سەر شەش خاڵ ڕاوەستاوە، لێرەدا کوورتی دەکەینەوە تاکو بزانین هەڵە لە چ خاڵێکی پرۆگرامەکەدایە:

1ـ پێویستە بە لاوان دەست پێبکرێت ـ وە لەگەڵ خەڵکانی تریشدا ـ بە عەقیدەو، بەڕوونکردنەوەی واتای ئیمان و ئیسلام و بەندایەتی و گێڕانەوەی حوکم بۆ خوا.

2 ـ پەروەردەکردنی لاوانی تێگەیشتوو لە سەر بنچینەی پێشوو، لە سەر ڕەوشتی ئیسلامیی، وە هۆشیار کردنەوەیان بەو شتانەی ڕوو ئەدات لە دەوروبەریاندا لە سەربازگە ناوخۆیی و دەرەکیە دژەکاندا.

3 ـ دەست پێنەکردن بە ڕێکخستنی ئەندامان، مەگەر دوای گەیشتنیان بۆ ئاستێکی بەرز لە تێگەیشتنی عەقیدەو ڕەوشت و سلوك و، هۆشیاری بە هەموو ئەوەی کە دەبێت و ڕوو دەدات.

4 ـ خاڵی دەست پێ کردن لە بزاڤی ئیسلامیدا خۆی نابینێتەوە لە داواکردنی جێبەجێ کردنی یاسای ئیسلامیدا، بەڵکو بە گواستنەوەی کۆمەڵگاکان ـ یان بەشە کاریگەرەکان تیایدا ـ بۆ ئیسلام ـ بە پێی خاڵەکانی پێشوو ـ تاکو ئەو کۆمەڵگایە خۆی داوای جێبەجێ کردنی ئیسلام بکات.

5 ـ ڕێگای گەیشتنە پیادەکردنی یاسای ئیسلام نابێت لە ڕێگەی کودەتاوە بێت لە فەرمانڕەواییدا، کە لە سەرەوە بێت، بەڵکو لە ڕێگەی گۆڕینی ڕاوبۆچونی کۆمەڵگا ـ یان بەشە کاریگەرەکانی ـوەگۆڕینی بەهای ڕەوشتی و پەیوەستی بە ئیسلامەوە دەبێت، بە جۆرێك ئەندامانی ئەوە بزانن کە پیادە کردن و جێبەجێ کردنی ئیسلام ئەرکێکە پێویستە بێتەدی.

6 ـ له هه‌مان كاتدا، پێویسته بزاڤی ئیسلامی بپارێزرێت و به‌رده‌وام ئه‌ندامه‌كانی به‌رپه‌رچی ده‌ست درێژی بداته‌وه. وه له به‌رئه‌وه‌ی ئه‌و نایه‌وێت ده‌ستدرێژی بكاته سه‌ر جگه له خۆی، وه نایه‌وێ یاسای خوا له ڕێگه‌ی هێزه‌وه له‌سه‌ره‌وه فه‌رزبكات، كه‌واته پێویست ده‌كات وازی لێبهێنرێت ئه‌ركی خۆی جێبه‌جێ بكات و ده‌ستدرێژی نه‌كرێته سه‌ر ئه‌ندامانی، جا ئه‌گه‌ر ده‌ستدرێژی ڕوویدا بۆ سه‌ری،ئه‌وا به‌ته‌نیشتیه‌وه به‌رپه‌رچی ده‌درێته‌وه، به لێدانی هێزی ده‌ست درێژی كه‌ر، به‌و بڕه‌ی كه ڕێگه به بزاڤی ئیسلامی بدات به‌رده‌وام بێت له ڕێگه‌كه‌یدا".

ده‌بینین پێنج خاڵی یه‌كه‌م هیچ قسه‌یه‌كان له سه‌ر نیه، وه هه‌موویان ڕاست و به‌جێن، به‌ڵام ده‌بینین هه‌ڵه له خاڵی شه‌شه‌مدایه، كه به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی بزاڤی ئیسلامیه بۆ هه‌ر ده‌ستدریژیه‌ك بكرێته سه‌ری.

## ئایا وازدێنن له بزاڤی ئیسلامیی له‌گه‌ڵ پرۆگرامه په‌روه‌رده‌ییه‌كانیدا بڕوات؟

هه‌ڵه له بیرو بۆچوونی سه‌یددایه سه‌باره‌ت به ئه‌گه‌ری وازهێنانی نه‌فامان له بزاڤی ئیسلامی كه پرۆگرامه په‌روه‌رده‌ییه فێركارییه‌كانی پێشووی جێبه‌جێ بكات، هه‌رچه‌نده بزاڤی ئیسلامی نه‌یه‌وێت یاسای فه‌رمانڕه‌وایی له‌سه‌ره‌وه له‌رێگه‌ی به‌كارهێنانی هێزه‌وه بگۆڕێت. به‌ڵام نه‌فامان توانستی بینینی ئیسلامیه‌كان و بانگخوازانی حه‌ق و ڕاستیان نیه، ئه‌وانه بوونی ئیسلامیه‌كان به تاكه مه‌ترسی ڕاسته‌وخۆی سه‌ر خۆیان ده‌زانن، ئه‌گه‌رچی ئیسلامیه‌كان ده‌ستیش نه‌خه‌نه كاروباریانه‌وه‌و ته‌نها سه‌رگه‌رمی په‌روه‌رده‌ی خۆیان بن و نه‌وه‌ی نوێ و داهاتوو پێبگه‌یه‌نن بۆ ئه‌وه‌ی له داهاتوودا گۆڕانكاری بكه‌ن، له به‌ر ئه‌مه نه‌فامان پێیان سه‌خڵه‌ت و قه‌ڵس ده‌بن، ده‌ستدرێژی ده‌كه‌نه سه‌ریان ! وه سه‌ید خۆی ته‌ئكیدی له سه‌ر ئه‌م واتایه كردۆته‌وه له زیاتر له چه‌ند شوێنێكی (في ظلال) دا. لێره‌دا سه‌رنجه‌كه‌ی خۆی له (ظلال)دا ته‌واو به شیاو ده‌زانم له سه‌ر وته‌كه‌ی شوعه‌یب پێغه‌مبه‌ر (علیه‌السلام) له‌گه‌ڵ گه‌له‌كه‌ی: **(وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ * قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ)** (الأعراف: 87، 88).

سه‌ید ئه‌ڵێت: (به‌ڕاستی شوعه‌یب (علیه السلام) بانگی كردن بۆ ڕێكوپێكترین پلانی بانگكردن، له كۆتا خاڵدا وه‌ستا، نه‌یده‌توانی ته‌نها هه‌نگاوێك لێی پاشه‌كشه بكات، خاڵی چاوه‌ڕوان كردن و پێكه‌وه ژیان دوور له ئازارو، وازهێنان له هه‌ر كه‌سێك كه بووبێته هه‌ڵگری ئاین، تا خوای گه‌وره فه‌رمان ده‌كات، وه خوای گه‌وره چاكترین فه‌رمانڕه‌وایه، به‌ڵام تاغوته‌كان به‌وه ڕازی نابن كه ئیمان له سه‌ر زه‌ویدا بوونی هه‌بێت و له كۆمه‌ڵێكدا ده‌ربكه‌وێت كه خه‌ڵكی به‌ندایه‌تی بۆ تاغوت نه‌كه‌ن. بوونی كۆمه‌ڵێكی موسڵمان له سه‌ر زه‌ویدا كه هیچ دینێكی نه‌وێت جگه له دینی خوا، وه دان به هیچ ده‌سته‌ڵاتێكدا نه‌نێت جگه له ده‌سه‌ڵاتی خوا، وه هیچ یاسایه‌ك له ژیانیدا فه‌رمانڕه‌وا نه‌بێت جگه له یاسای خوا، وه له ژیانیدا شوێن هیچ پرۆگرامێك نه‌كه‌وێت جگه له پرۆگرامه‌كه‌ی خوا. . . به‌ڕاستی بوونی كۆمه‌ڵێكی موسڵمانی به‌م شێوه‌یه هه‌ڕه‌شه له ده‌سه‌ڵاتی تاغوته‌كان ده‌كات، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ئه‌و كۆمه‌ڵه گۆشه‌گیریش بێت له خۆیدا، وه تاغوته‌كان بداته ده‌ست حوكمی خوای گه‌وره تا كاتێك واده‌كه‌ی دێت. تاغوت به فه‌رز كردن جه‌نگ فه‌رزده‌كات به‌سه‌ر كۆمه‌ڵی موسڵماندا ـ ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ركۆمه‌ڵی مسوڵمانیش نه‌خوازێت جه‌نگی له‌گه‌ڵدا به‌رپا بكات ـ ! بوونی حه‌ق خۆی له خۆیدا ناحه‌ق سه‌غڵه‌ت ده‌كات، وه ئه‌م بوونه خۆی له خۆیدا ئه‌وه‌یه كه جه‌نگ له‌گه‌ڵ ناحه‌قدا له سه‌ری فه‌رز ده‌كات. . ئه‌وه سونه‌تی خوایه‌و ئه‌بێت به‌رده‌وام بێت)[1].

ئه‌مه سروشتی ململانێی نێوان بزاڤی ئیسلامی و نێوان دوژمنه‌كانیه‌تی، وه ئه‌مه ڕاستیه له‌م بواره‌دا، ئیتر چۆن سه‌ید ـ له خاڵی شه‌شه‌مدا ـ وای بۆ ده‌چێت كه ئه‌گونجێت ناڕه‌واخوازان واز له بزاڤی ئیسلامی بهێنن تا ئه‌ركه په‌روه‌رده‌یی و فێركاریه‌كانی به ئه‌نجام بگه‌یه‌نێت، وه ده‌ستدرێژی نه‌كه‌نه سه‌ری!؟

---

1

## هەڵە لە دانپیانانی بیروڕای بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیدایە

ئەو بۆچوونەی سەید کە هەیبوو سەبارەت بە وەی کە دەستدرێژی ناکرێتەسەر بزاڤە ئیسلامیەکەی‌و پرۆگرامە پەروەردەییە فیکریەکەی وای لیکرد کە دەستدرێژی کردنە سەری لە لایەن ڕژێمەوە بە دوور بزانێت، لەگەڵ ئەوەدا یەکێك لە شەش خاڵە مەنهەجیەکەی تایبەت کردووە بە بڕیاردانی بەپەرچدانەوەی دەستدرێژیکردنە سەری ئەگەر لە لایەن ڕژێمەوە بۆ سەری ڕوویدا، بڕوامان وایە ئەمە کرۆکی هەڵەیە لە پرۆگرامەکەی پێشوویدا. سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکەش هەموویان هاوڕای سەید بوون و، بەڵگە هێناوەکانیشیان بۆ شەرعیەتی پشت بەستن بەم مەبدەئەو چۆنیەتی جێبەجێ کردنی لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:

1 ـ ئەوە مافێکە خوای گەورە بۆ بڕوادارانی بڕیار داوە: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُم) البقرة : 194.

2ـ ئەو دەستدرێژییە وەحشیگەرانەی کە لە لایەن حکومەتەوە بۆ سەر برایانی موسڵمان لە ساڵی 1954دا بە ئەشکەنجەدان و ئەتککردنی هەموو کەرامەتێکی مرۆڤانە لە کاتی ئەشکەنجەدانیاندا ئەنجامدرا، پاشان کوشتن و تێکدانی ماڵەکانیان و دەربەدەرکردنی منداڵ و ئافرەتەکانیان.

3ـ بیرکردنەوە لە دەستدرێژی پێش وەخت لەلایەن حکومەتەوە بۆ سەر برایان، وە دووربوون لە لێدانیان، وە بە تەنها نەخشەیەك بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیەك کە ڕوو ئەدات.

4- بەرپەرچ نەدانەوەی هاوشێوەو پڕاو پڕ، ئەمەش لەبەر ئامۆژگاری و ئاراستە کردنە ئیسلامیە ئەخلاقیەکان، چونکە خودی ئیسلام ڕێنادات بە موسڵمان ئەشکەنجەی هیچ کەسێك بدات و، ئەتکی کەرامەتی مرۆڤانەی بکات، وە ڕێنادات منداڵ و ئافرەتەکان بەبرسێتی واز لێ بهێنرێت.

5- پەیوەست بوون بەو هۆکارانەوە کە ئیسلام حەڵاڵی کردوون لەکاتی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی دەستدرێژکاراندا: کەبریتیە لە جەنگان و کوشتاری دەست درێژی کاران بە تەنها.

6- ئامانج لە بەرپەرچدانەوەی دەست درێژیدا، وادەردەکەوێت لە دوو لایەنەوە بووبێت:

أ- تاکو دەستدرێژی کردنە سەر بزاڤی ئیسلامی و شوێن کەوتووەکانی هەروا شتێکی ئاسان نەبێت، کە دەستدرێژکاران لە هەر کاتێکدا ویستیان ئەنجامی بدەن.

ب- بۆ هەوڵی ڕزگارکردن و دەربازکردنی زۆرترین ژمارەی گونجاو لە لاوانی موسڵمانی پاك. . .).[1]

دەبینین پشت بەستن بەم مەبدەئە هەڵەیە، چونکە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی سەردەکێشێ بۆ دەست درێژی گەورەترو ترسناکتر، بەڵکو سەردەکێشێ بۆ قەسابخانەی هەپرونکەر.

ئەوەبوو ئەم قەسابخانەیەش لەساڵی 1965و1966دا ڕوویداو، حکومەت ئەم مەبدەئەی قۆستەوە کە ڕێکخستن پشتی پێبەستبوو، بیری لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی دەکردەوە بۆ لێدانی ڕێکخستنی برایان بەپیسترین شێوە، کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوشێوەی ئەو لێدان و دەستدرێژیە نابینین !

هەروەها کۆمەڵێك لەبرایانی موسڵمان لە سوریا لەحەفتاکاندا پشتیان بە هەمان ڕاوبۆچوون بەستبوو ، کاریان لەسەر دەکرد لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمی نەسیریەکاندا، وە سەرکردایەتی برایانیان لەوکاتەدا ناچار کرد دان بەو مەبدەئەدا بنێت و کاری لەسەر بکات تا ئەوەبوو ڕوبەڕوبونەوەیەکی توندو تیژ ڕوویدا لەنێوان برایان و ڕژێمی سوریدا، وە برایان تیایدا توشی بەڵایەکی گەورە هاتن و، کۆتاییەکەشی زاڵبوونی ڕژێم بوو بەسەر بارودۆخەکەدا، ڕژێم قەسابخانەیەکی خوێناوی بۆ برایانی موسڵمان و گەلی هەژاری سوری نایەوە و، سەدەها شەهیدو هەزارەها بریندارو زیندانی کراو بوونە قوربانی ئەو قەسابخانەیە.

ئەم ئەزموونە لەجەستەی بزاڤی ئیسلامی و کاری ئیسلامیدا برینێکی هێندە قوڵی جێهێشتووە کە پڕنابێتەوە، وە کاریگەری لەسەر ساڵانی دوای کارەساتەکە لە ڕێوڕەسمی بانگەوازی ئیسلامی لە سوریاو لەووڵاتانی دیکەشدا هەبوو.

[1] لماذا أعدموني : 53-54

ڕوبەڕوبوونەوەی بزاڤی ئیسلامیی لەگەڵ ڕژێمدا، بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چەکدارانەو بە ئەندامانی لێهاتوو و بەهێزەوە، یارییەکە ئەنجامەکەی شکستخواردن دەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەندامانیش سەدەها هەزار ئەندام بن، چونکە ڕژێمی فەرمانڕەوا خاوەنی سوپایەکی نیزامی پڕچەکی ئامادەیە، توانای لەنابردنی تەواوی ئەو ئەندامانەی هەیە، وە سەرکردەکانی ڕژێم دەست ناگێڕنەوە لەلەناوبردنی هیچ هێز و توانایەك کە لەبەردەمیاندا ڕابوەستێ، وە خۆلانادەن لەپاکتاو کردن و لەناوبردنی گەلی هەژار.

چاکتر و باشتر بۆ بزاڤی ئیسلامیی ئەوەیە کە لەسەر ڕێبازە پەروەردەییەکەی خۆی بەردەوام بێت- هەروەك سەیدقوتب لە پێنج خاڵەکەیدا دەری خستبوو- بەڵام ئەگەر ڕژێم لەبەردەمیدا ڕاوەستاو دەست درێژی کردە سەری- کە ئەمەش ڕوودەدات، بەڵکو لەگەڵێدایە- ئەوە پێویستە لەسەر بزاڤی ئیسلامی کە بەئارام گرتن و خۆراگری، بە دامەزراوی و ئازایەتیەوە، بە پشت بەستن بەخوای گەورەوە ڕووبەڕوی ببێتەوە، وە ئیتر هیچ گرنگ نیە کە بچێتە زیندان و بەندیخانەکانەوە، یان ئەشکەنجەو ئازار بڕژێ بەسەریاندا بەشێوەیەك خەڵکی تر بەرگەی نەگرن، شەهیدیش بدرێت و جۆگەلەی خوێن هەستێت.

بەڵکو پێویستە لەسەری کە ئارامگر و خۆڕاگربێت، چاوەڕوانی ڕزگاربوون و هەڵگێرانی نارەحەتی لەخوای گەورە بکات، وە داوا لەخوای گەورە بکات کە لەنێوان ئەوو دوژمنەکانیدا بەحەق دەرگا بکاتەوە، وە خوای گەورە چاکترین دەروکەرەوەیە، وە خوای گەورە لە نێوان ئەم و ئەواندا بە حەق فەرمان بکات، وە خوای گەورە چاکترین فەرمانڕەوایە.[1]

پاشان یەکێك لە ڕوکارەکانی تری هەڵەی ئەم مەبدەئە لە پشتبەستنی سەیدقوتب دا بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی، خۆی دەبینیەوە لەکردنەوەی دەرگا بەسەر بەکرێگیراوانی دەسەڵاتداراندا تاکو دزە بکەنە ناو ڕێکخستنەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمیفەرمانڕەوای بۆ بسازێنن، وە ڕێکخستن پەلکێش بکەن بۆ چوونە ناو باسی گەڕان بەدوای چەك کڕین و کۆکردنەوە و شاردنەوەیدا، لەم بازنەیەدا نەخشەی پیلانێکی وورد دەکێشن و پاشان ڕێکخستن ڕووبەڕووی ڕژێم دەکەنەوە ولەبەردەمیدا دەوەستێ و، پاشان ڕژێم بە تۆمەتی توندوتیژی و تیرۆر و گێرە شێواندن و کوشتن هێرش دەکاتە سەر ڕێکخستن و ئەندامەکانی و، دواتر وێنەی ڕێکخستنەکە ناشرین دەکات و لەبەرچاوی خەڵکیدا دەیشێوێنێ. ڕای بەهێزیش سەبارەت بەکارەساتی 1964 کە بەسەر ڕێکخستنی برایاندا هات هەرئەم خاڵەیە.

## عەلی عشماوی ڕێکخستن ڕادەکێشێتە ناو بابەتی چەکەوە

عەلی عشماوی ئەندامێکی لیژنە پێنج کەسەیەکە بوو، بەرپرسی ڕێکخستنی قاهیرەی برایان بوو.

عەلی عشماوی تێبینی ئەوەی کرد کە سەید و هاوەڵەکانی لەسەرکردایەتی پشتیان بە مەبدەئی بەرپەرچدانەوەی چاوەڕوانکراو بەستووە، وە لێکۆڵینەوەیان لە ( بابەتی ڕاهێنانی کۆمەڵەکان، کە هەڵدەستن بە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیو پاراستنی ڕێکخستن لە دەستدرێژیەکان، وە بابەتی چەکی پێویست بۆ ئەم مەبەستە و هەروەها بابەتی پارەوپولی پێویست)کردووە.[2]

عەلی عشماوی کاری لەسەر ئەم خاڵە کرد بۆ سەرقاڵکردنی ڕێکخستن بە بابەتی چەکەوەو گەڕان بە دوای سەرچاوەکانیدا، وە چۆنیەتی دابینکردنی بۆ ڕێکخستن، ئەوەی ڕاگەیاند کەئەم توانای بەسەر ئەو کارەدا دەشکێت، خۆی فیداکرد بۆخزمەتکردن بەڕێکخستن لەم کارەدا، لیژنەی سەرکردایەتیش هەوڵو چیرۆکی جۆراوجۆریان لە عشماویەوە سەبارەت بە چەك دەبیست.

چیرۆکەکانی عەلی عشماوی لەگەڵ چەکدا کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر چەپۆکی ناوەختی حکومەت بۆ ڕێکخستنی برایان هەبوو ، پێش ئەوەی ڕێکخستن پەیامە پەروەردەییە حەرەکیەکەی تەواو بکات بە وشێوەیەی سەید دەیبینی، تەنانەت پێش ئەوەی دەستی بگاتە چەكو هەوڵی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی حکومەت بدات لە کاتێکدا دەستدرێژی دەکاتە سەری.

## عەلی عشماوی کێیەو چی لە پشتییەوە بوو

[1] سەیری نامەی (مذهب أبن أدم الاول : أو العنف في العمل الاسلامي) مامۆستا جودت سعيد بکە .

[2] لماذا أعدموني49.

بەشێك لە برایان وا دەبینن عەلی عشماویگرێیەكی سەرسوڕهێنەرە ژمارەیەكی زۆر پرسیاری سەرسوڕهێنەرو گوماناوی بەرامبەری هەیە، بەرامبەر پەیوەندیەكانی لەگەڵ برایاندا و، سەبارەت بەدانپیانانەكانی لە بەردەم لێكۆڵەرەوەكان لە دادگاكردنەكانداو جگە لەمانەش. لەم بارەیەوە ئەم بڕگەیە لە كتێبی (الموتى يتكلمون) دەگێڕمەوە:

(حكومەت هیچ شتێكی نەدەزانی دەربارەی ڕێكخستن تا ساڵی 1965، دوای ئەوە یەكێك لەسەركردەكانی دەریخست، كە ئەویش عەلی عشماوی بوو، كە تۆماركەری حسابات بوو لە كۆمپانیای گشتی میسری بۆ كەلوپەلی ناوماڵ).[1]

## وتەكان دژی یەك دەوەستن لە ڕاستیی عەلی عشماویدا

هەندێك دووپاتی دەكەنەوە كە یەكێك بووە لە دڵسۆزانو خەمخۆرانی بیری زیندووكردنەوەی كۆمەڵی برایانی موسڵمان، وە هەر بە وشێوەیە مایەوە تا دەستگیر كراو فەرمانی بەسەردا دراو فەرمانی لە سێدارەدان لە دژی دەرچوو، پاشان حوكمەكە لە سەری سووك كرا بۆ زیندانی هەمیشەیی.

هەندێكی تر دووپاتی ئەوە دەكەنەوە كە (بەكرێگیراوی دەزگای لێكۆڵینەوەی تاوانی سەربازی بووەو،كاتێك هەستی بەوە كردوە حكومەت نیەتی لێدانی برایانی هەیە پەلەی كردوە بۆ پێشكەشكردنی خزمەتەكانی بۆ پیاوانی لێكۆڵینەوەی تاوانی سەربازی، دانپیانانێكی دەركرد كە لە نۆ لاپەڕە پێكهاتبوو، هەموو ئەو زانیاریانەی لە خۆگرتبوو كە لە بارەی ڕێكخستنەوە دەیزانی. ئەوانەی ئەمە دەڵێن دووپاتی ئەوە دەكەنەوە، كە عەلی عشماوی زۆر لە زینداندا نەمایەوەو پاشان ئازاد كراو دواتر سەفەری كرد بۆ ئەمریكاو ئێستا لەوێ دادەنیشێت).[2]

ئێمە دڵنیانین لە ڕاستی عەلی عشماوی وە بە تەواوی ئامانجو پێناسی ئەوكەسە نازانین، بەڵام مەیلمان بەلای بۆچوونی دووەمدایە، ئەو ڕایە هەڵدەبژێرین كە بە كرێگیراو ـ یان دروستكراوی دەزگای لێكۆڵینەوە ـ بووە، كاری كردووە لەسەر سەرقاڵكردنی ڕێكخستن بە دەنگو باسی چەكەوە ـ خوای گەورە خۆیشی دەزانێت ـ.

ئەوەی وا دەكات ئەم بیروبۆچوونەمان هەبێت، ئەوەیە كە فوئاد ئەلدەجەوی كاتێك لە ساڵی 1965دا فەرمانی بەسەر سەید قوتبدا دەركرد، بە قسەكانی عەلی عشماوی ڕووبەڕووی سەید دەبوویەوە كە لە بارەی سەیدەوە كردبووی، وە سەید عەلی عشماوی بە درۆدا دەخستەوە لە زیاد لە بابەتێكدا، وە سەید داوای لە دەجەوی كرد كە گێڕانەوەكانی عشماوی سەبارەت بە سەید وەرنەگرێت، مەگەر كاتێك باسی ئامادەبوونی هەر چوار برا سەركردەكەی تری لەگەڵدا بكات).[3]

هەروەها ئەوەی پاڵپشتی ئەم ڕایە دەكات دەربارەی عشماوی، ئەو چیرۆكەیە كە زەینەب غەزالی گێڕاویەتیەوە دەربارەی ئەوەی كە قامچی بە دەست و جەللادەكان لە كاتی ئەشكەنجەدانی ئەمدا لە لێكۆڵینەوەدا عەلی عشماویان هێناوە: (عەلی عشماوی هات، بیجامەیەكی لەبەردابوو كە لە حەریرێكی ناسك بوو، پاك، جوان قژی شانەكراو بوو، هیچ كاریگەریەكی ئەشكەنجەدانی پێوە دەرنەئەكەوت).

كاتێك بینیم، وە لە زیهنمدا حاڵی ئەوانی ترم هێنایەوە بەرچاوم، هەروەها حاڵی خۆم، زانیم ـ بەڵكو دڵنیا بووم ـ ئەم مەخلوقە خیانەتی لە ڕاسپاردەی خوا كردووە، وە شاهیدی درۆی لەسەر براكانی داوە. . ).

وە لە جێگەیەكی ترداو لە كاتی لێكۆڵینەوەدا لەگەڵ زەینەب غەزالی و لەكاتی ئەشكەنجەدانیدا، دەگێڕێتەوە كە چۆن جەللادەكان عەلی عشماویان هێناو، - لەهەمان حاڵەتی پێشویدا - تا لەبەردەم شەمس بەدراندا شایەتی لەسەر بدات، وە لەكاتێكدا چوون بۆ هێنانی ئەمیش پێی ووتن : (عەلی عشماوی درۆزنێكی خراپە كارە، تف ئەكەمە ناو چاوی لەبەر ئەوەی درۆزن و بەكرێ گیراوە. ).

---

[1] الموتى يتكلمون 50.
[2] الموتى يتكلمون 180ـ 182.
[3] أيام من حياتي 118.

هەروەها دەگێڕێتەوە کە شەمس بەدران بەو پەڕی ناسکی لەگەڵ عشماویدا قسەی کردووە، وە عەلی عشماوی شاهێدی لەسەر ئەم و مامۆستا هوزەیبی داوە، دەنگم بەڕوودا بەرز کردەوە و پێم ووت : (تۆ درۆزنێکی خراپەکار و شەڕانیت، دەموچاوت بەدرۆت ئەخاتەوە، برایان بەسەر شیشەکانەوە قامچی جەستەیان پارچە پارچە دەکات، سەگەکان قەپاڵیان لێ ئەگرن و، تەپوتل دەکەن لە جۆرەها ئەشکەنجەداندا، تۆش لەسەر ئەم شکڵ و شێوەیەیت، تۆ بەکرێگیراوێکی بێ نرخی!).[1]

## عەلی عشماوی هەواڵی چەك بە تەنها بە سەید قوتب ئەدات

ئەوەی گومانەکان لەسەر عەلی عشماوی زیاتر بە هێزو بە تین دەکات، وە دەری دەخات کە دروستکراوێك بووە لە دروستکراوەکانی موخابەرات بۆ زەرەروزیان گەیاندن بە ڕێکخستنی نوێی برایان، ئەوەبوو کە بابەت و دەنگ و باسی چەك تەنها لەلای خۆی بوو.

هیچ یەکێکی تر لەئەندامانی سەرکردایەتی زانیاری بە مەسەلەی چەك نەبوو، وە زانیاری بە داواکردن و کردەی کڕین و ئامادەو سازکردنی نەبوو.

ئەندامانی تر قسەکانی عەلی عشماویان دەربارەی چەك بەلاوە شتێکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو بوو، هەروەها سەید قوتب خۆیشی بە لایەوە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو.

عەلی عشماوی لەکاتێکی نائاساییدا - هات بۆ لای سەیدو بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕووی مەسەلەی چەکی کردەوە، وە تەنها هەواڵەکەی بەسەیدقوتبدا دوور لەئامادەبوونی برایانی تر !

با گوێ بگرین لەسەید بزانین چۆن ئەم دەنگ و باسەمان بۆ دەگێڕێتەوە :(عەلی عشماوی بەبێ دیاریکردنی وادە سەردانی کردم، هەواڵی پێدام کە ئەو بۆ نزیکەی دوو ساڵ لەپێش بە یەك گەیشتنمانەوە - داوای کردووە لەبرایەك لە وڵاتێکی عەرەبییەوە بۆ چەند پارچە چەکێك، بەڕوونی دیاری کردووە پاشان لەو کاتەدا مەسەلەکەی واز لێ هێناوە.

بەڵام ئێستا هەواڵی بۆ هاتووە لەو برایەوە کە ئەم چەکانە بەم زووانە دەنێردرێن- کە ژمارەیەکی گەورەیەو نزیکەی عەرەبانەیەکی گواستنەوەیە- وە ئەم چەکانە لە ڕێگەی سودانەوە ڕەوانە دەکرێن، لەگەڵ ئەگەری گەیشتنیدا لەماوەی دوو مانگدا. . وە ئەمەش لە پێش دەستگیر کردنەوە بوو بەماوەیەك، بارودۆخەکەش شتێکی تێدا نەبوو کە ئاماژە بە مەترسیەکی نزیك بدات.

ئەگەرچی هەواڵەکە چاوەڕوان نەکراو نەبوو، بەڵام هەرگیز چوونە ناو ئەو باسەوە گونجاو نەبوو تا لەگەڵ ئەوانی تردا باسمان نەکردایە، لەبەرئەوە ڕێکەوتین لەسەر مەوعیدێك بۆ باسکردنی لەگەڵ برایانی تردا.

لە ڕۆژی داهاتوودا - وەك لە بیرم بێت- لە پێش کاتی دیایکراودا، شێخ عەبدولفەتاح ئیسماعیل هات بۆ لام و دەربارەی ئەو کارە قسەی لەگەڵ کردم، وە تێگەشتم کە ـ ئاسایی ـ لە عەلییەوە بیستویەتی، وادیار بوو ترسی لێی هەیە و ڕەزامەندی لەسەری نیە).[2]

لە تێڕوانینمانەوە بۆ گێڕانەوەکەی سەید، دەبینیت کۆمەڵێك پرسیاری ترسناك بە دەوری عەلی عشماویدا دەورژێن و، هەمووشیان سەرسوڕهێنەرن. بۆچی هیچ کەس زانیاری نەبوو بە چەکەکان و، داواکردنەوەکەی ڕێك نەخست جگە لە عەلی عشماوی؟ بۆچی عەبدولفەتاح ئیسماعیل هەواڵەکەی بەلاوە شتێکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراوبوو؟ ئەگەر سەرچاوەی چەکەکان ئیخوانی بوایە و ڕێکخستنی ئیخوانی بوایە، نە ئەبوایە عەبدولفەتاح ئیسماعیل زانیاری پێی هەبوایە کەئەو ئەندازیاری ڕێکخستنی نوێی برایان و دامەزرێنەری بوو؟ بۆچی ئەندامانی سەرکردایەتی ترسان لە چەك؟ پاشان بۆچی بە تەنها عەلی

---

[1] هەمان سەرچاوە : 149-150

[2] لماذا أعدموني : 49-50

عشماوی داواکاری چەك بوو- پێش دوو ساڵ-؟ چاوگەی چەکەکە کوێیە؟ ئایا ئەوە بەسە بۆ ناساندنی ئەو کەسەی چەکەکان ئامادە دەکات، کە (برایەکە لە وڵاتێکی عەرەبییەوە)؟

چۆن پارەی ئەم چەکە دەدات؟ لە کوێوە دەیدات؟ وە ئەم ژمارە زۆرە لە چەك کە عارەبانەیەکی گواستنەوەیە بۆچی؟ لە کاتێکدا عەلی عشماوی خۆی داوای نەکردووە.

ئەم پرسیارە ترسناك و سەر سوڕهێنەرانە سەبارەت بە مەسەلەی چەکی عەلی عشماوی گومان بەرامبەری دەوروژێنێت، وە بەرەو ئەوە ڕامان دەکێشێ کە عەلی عشماوی تاوانبار بکەین وبڵێین ئەو چەکانە لە ڕێگەی برایانەوە نەبووە-نە لە دەرەوەی میسر و لە ناوەوەیدا-. بەڵکو دەیبینین چیرۆکی ئەم چەکە فرِوفێڵ و پیلانێکی نەخشە بۆ داڕێژراو بووە لەموخابەرات و لێکۆڵینەوەی میسریەوە بۆ لێدانی ڕێکخستنی نوێی برایان لە ڕێگەی ڕێکخستنی پیلانێکەوە بۆی، تا ببێتە بیانوو بۆ لێدان و لەناوبردنی، وە موخابەرات عەلی عشماوی-دروستکراوەکەی خۆیان بە کارهێنا- ئەویش سەرکەوتوو بوولە گەشتنی بە چەقی سەرکردایەتی لە ڕێکخستنی برایاندا- بۆئەوەی برایان بخەنە ناو بۆسەوە. هەموو چیرۆکەکە لە ئامادەکردن و نەخشەکێشان و سازکردنی موخابەراتەوەیە.

## سەرکردایەتی ڕێکخستن لەبەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی دەکۆڵێتەوە

عەلی عشماوی سەرکەوتوو بوو لە گەیاندنی دەنگو باسی چەك بە لیژنەی سەرکردایەتی، وە سەرکەوتوو بوو لەسەرقاڵ کردنیان پێوەی، وە بە چۆنیەتی ناردن و ڕێکخستن و گەیاندنی و تەئمین کردنی و مەشق کردن لەسەری و پلاندانان بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەستدرێژیەکی چاوەڕوانکراو بۆ سەربرایان، بە لێدانی سەرانی ڕژێمی دەستدرێژکەر.

ئەم دەنگو باسو ئیش و کارانە کاتێکی زۆری لیژنەی سەرکردایەتی گرت و، عەلی عشماوی خۆی ئامادەی هەموو ئەو مشت ومڕو پلان دانانە بوو، ئەوە بە دوور نازانین کە دەزگای لێکۆڵینەوەی میسری لە یەکە بە یەکەی دانیشتن و وتووێژەکان ئاگادار کردبێت. بەمشێوەیەفرِوفێڵ سەرکردایەتی برایانی گەمارۆدا و کەوتنە داوی عەلی عشماویەوە.

بەڵام برایان- دەبێت ڕاستی بوترێت -نارەزا بوون لە بابەتی چەك و مەترسیان لێدەکرد و هەر کاتێك دەگەشتنە سەرباسی هەڵوەشاندنەوەی ئەوبابەتە، عەلی عشماوی لە بەردەمیاندا چەندین گرفت و کۆسپ و قەزیەی بە دەوردا دروست دەکرد، وە سەرکەوتوو بوو لە ڕازیکردنیاندابۆ پشتبەستن بە چەك و، نەخشەی پلانی بەکارهێنان و مەشق کردن لەسەری و، لێدانی حکومەت پێی.

سەیدقوتب دەگێڕێتەوە کە برایانی لەسەرکردایەتی کاتێك- هەموویان- ڕووبەڕووی چیرۆکی کتوپڕی چەك بوونەوە و لە بابەتەکە کۆڵینەوە، ویستیان هەڵی بوەشێننەوەو چاوی لێ بخلافێنن، ڕێگەیەکیان گرتە بەر بۆ ئەم مەبەستە: (لە مەوعیدێکی تردا هەر پێنجیان لای من بوون، بڕیاردرا داوا لە عەلی بکرێت کە ناردنی چەکەکان لەوێوە ڕابگرێت، تا زانیاری پەیدا دەکرێت لە سەرچاوەکەی، وە لە سەرچاوەی ئەو پارەیەی کە پێی کڕاوەو ڕێگەی کڕینەکەی و ڕێگەی ناردنی، ئینجا لە دوای ئەمەشەوە بە وبرایەی چەکەکان دەنێرێت دەوترێت کە ڕەوانەی نەکات تا ئاگاداردەکرێتەوە بە ڕەوانە کردنی).

برایان داوایان لەعەلی عشماوی کرد کە خۆی پرسیار بکات و زانیاریەکان وەربگرێت و تەئکید بکاتەوە و گومانیشیان هە بوو لە عشماوی و لە پەیوەندییە گومان لێکراوەکانی بە دەزگای لێکۆڵینەوەوە.

لە دوای زیاتر لە مانگێك عەلی عشماوی بە وەڵامی ئەو پرسیارانەوەکە برایان دەربارەی چەك هەیانبووگەڕایەوە، بەڵام وادیارە سەرکردەکانی بۆیان ڕێکخستبێت تا پیلانی لێدانی برایان پڕاو پڕ بێت- ئەوەبوو دڵنیای کردن کە چەکەکانی کڕیوە بە (سەروەت و سامانی برایان لە ماڵی تایبەتی خۆیان، وە برایان ئەوەیان بەخشیوە- بۆئەم مەسەلەیە- کە پێویستی ژیانی خۆیان بووە).

بەم شێوەیە عەلی عشماوی ڕێگەی لە بەرامبەر هەوڵەکانی سەرکردایەتیدا بەست بۆ وەستاندنی چەك یان هەڵوەشاندنەوەی، تەنانەت دواخستنیشی، بە شێوەیەك هەواڵی پێدان کە برا نەناسراوەکە - هەواڵی بۆ ناردوون کە وەجبەکە بە تەواوی نێراوە، وە ناتوانرێت ڕەوانە کردنەکەی بوەستێنرێت.[1]

[1] لماذا أعدموني : 50-52

بەم جۆرە عەلی عشماوی برایانی خستە بەردەم ئەمری واقعەوە، ناچاری کردن بە لێکۆڵینەوەلەچەك ئەگەرچی پێیان ناخۆش بووە و لێشی دەترسان.

ئیتر برایان چوونە ناو باسی لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی چاوەڕوان کراو بۆ سەریان، پشت ئەستور بەو چەکانەی کە نەگەشتبووە دەستیان و عەلی عشماوی دڵنیایی کردبوون لێی.

پێشنیاریان کرد، کە دەبێت: (بەرپەرچدانەوەی دەست درێژی لە کاتی ڕودانیدا بە لێدانێکی جەرگبڕ بێت، دەست درێژیەکە بوەستێنێت و، زەمانەتی پارێزگاری گەورەترین ژمارە لە لاوانی موسڵمان بکات).[1]

لەبەر ئەمە پێشنیاریان کرد کە کارەکانیان (بریتیە لەبەرپەرچدانەوە لەگەڵ ڕوودانی دەستگیرکردنی ئەندامانی ڕێکخستن، بە لە ناوبردنی سەرەکان، لە پێشەوەیاندا سەرۆکی کۆمارو سەرۆکی وەزیران و بەڕێوەبەری نووسینگەی (المشیر)، وە بەڕێوەبەری موخابەرات و بەڕێوەبەری پۆلیسی جەنگی. . ).[2]

لەگەڵ ئەوەدا کە تواناو ئیمکانیاتی پێویستیان نەبوو، ڕێکەوتن لەسەر پەلەکردن لەمەشق دا! سەید بەپێناخۆش بوونەوە دەنگی خستە پاڵ دەنگیان: (دوای ئەوەی من لە پێشدا داخستنیم بە باش دەزانی، وە بەجۆش نەبووم بۆی، بەو پێیەی کە ئەم کارە کۆتا هەنگاوە لە جوڵەدا، نەك هەنگاوی یەکەم).[3]

لە بەرامبەر زۆر بوونی پڕوپاگەندەکان لە وڵاتدا بە نزیکبوونەوەی لێدانی برایان لە لایەن حکومەتەوە، وە لە بەرامبەر ئاگادارکردنەوەی هەندێك لە سەرکردەکانی برایان بۆ سەید لە کاری ڕێکخستنی نوێی برایان- بە تایبەتی هەردوو برا مونیر دەللەو فەرید عەبدولخالق- لە بەردەم مەترسی باردۆخەکەو ئاڵۆزوتوندوتیژبوونی کەش و هەوادا، لیژنەی سەرکردایەتی بڕیاری دەرکرد بە پەلەکردن لە مەشقدا، لەگەڵ کەمی ئیمکانیاتدا، ئەمە کۆتا بڕیار بوو کە دەری کرد، چونکە دوای ئەوە تەنها یەك کۆبوونەوەی کرد کە هەموو ئەندامانی تیایدا ئامادەبن:(گرنگ ئەوەیە هەموو ئەمانە هەواڵ دەدەن بە نزیکبوونەوەی لێدان، بەوەی دەستدرێژی دەکرێتە سەربرایان- وە بۆ سەرئەم ڕێکخستنە بە شێوەیەکی تایبەت - بڕیارمان دا بەپێی توانا پەلەبکرێت لە مەشق کردندا، وە بڵاوەمان لێکرد لەسەر ئەوەی کە ئێستە ئیمکانیاتمان لە بەردەستدانیە.

دێتەوە بیرم کە ئەمە کۆتا دانیشتنی کۆمەڵە بوو، دوای ئەوە کەسم نەبینی جگە لە شێخ عەبدولفەتاح و عەلی عشماوی نەبێت لە رأس البر).[4]

## سەید ئامۆژگاری دەکات بە هەڵوەشاندنەوەی پلانی بەرپەرچدانەوە

دوای ئەوەی لە هاوینی ساڵی 1965دا ڕاپێچ کردن و زیندانی کردنی برایان دەستی پێ کرد، وە پێش ئەوەی چەك بگاتە برایان و، پێش ئەوەی مەشقی ڕاستەقینەی بەرپەرچدانەوە دەست پێ بکەن. . . سەید ئامۆژگاری سەرکردەکانی ڕێکخستنی کرد بە هەوڵوەشاندنەوەی ئەوەی پێشتر دەستیان پێکرد بوو لەسەری ڕێکەوتبوون، ئەم ڕاسپاردەیەی سەید گەیشتە عەلی عشماوی و داوای لێکرا بە براکانی تری سەرکردایەتی بگەیەنێت. . . بەڵام عەلی عشماوی لە بری ئەوەی ئەم وەسێتە بگەیەنێتە براکانی، گەڕایەوە بۆ لای سەید و ڕوونکردنەوەی لێ داوا کرد، ئایا ئەمە بڕیاری کۆتاییە یان دەشێت گۆڕانی تیدا بکرێت؟ ئەمەش وای کرد سەید بەوەسێتەکەیدا بچێتەوە.

---

[1] هەمان سەرچاوە : 54

[2] هەمان سەرچاوە

[3] هەمان سەرچاوە : 55

[4] لماذا أعدموني : 55

سەید دەربارەی ئەم خاڵە دەڵێت: (-لە ڕێگەی حاجی زینەبەوە-لە چەند دەبڕینێکی پێچراوەی ناڕووندا ئاراستەم کردن، کە بەتەواوی کردەی سۆدان "ئەوەی تایبەتە بە چەکەوە" بە هەموو جۆرێك بوەستێنن، وە هەموو کردەیەکی تر هەڵبوەشێننەوە واتە تایبەت بە بەرپەرچدانەوەی دەست درێژی، کەچی لە لایەن عەلیەوە - لە هەمان ڕێگەی حاجی زەینەبەوە- نیشانەی پرسیارم بۆ هات کە ئایا ئەمانە زانیاری کۆتایین ئەگەرهاتو ڕێکخستنیش کەوتە بەر هێرش و شالاو؟ منیش وەڵامم دایەوە کە- بە تەنها- لەم حاڵەتەدا وەلەکاتی دڵنیا بوون لە توانای ئەوەی کە لێدانەکە هەمە لایەن و جەرگبڕ بێت، جێبەجێکردن دەگیرێتەبەر. ئەگینا دەبێت چاو لە هەموو شتێك بپۆشرێت! وە من دەمزانی کە بە فیعلی نیازیان نیە، لەبەرئەوە هیچ شتێك ڕوونادات).

سەید دەیزانی براکانی هیچ شتێك لەوانەی کەبە تیۆری بیریان لێکردەوەو لە پێشدا ئاماژەیان پێکردئەنجام نادەن، چونکە چەکەکانی عەلی عشماوی نەگەیشتبووە دەستیان، لەبەرئەوەی مەشقی کرداری دەستی پێنەکردبوو، لەبەرئەوە پێی ڕاگەیاندن کە هەموو شتێك ڕابگرن.

هەڵوێستە کردنی بۆ عشماوی ـ سەبارەت بە بڕیارەکەی ـ هەڵوێستەیەکی نەزەری بوو، سەید دەیزانی کە نایەتە دی، چونکە ئەوان هیچیان لە دەستو تواناد نیە. وە بەڕاستی هیچ بەرپەرچدانەوەوتۆڵەسەندنەوەیەك ڕووی نەدا.

## چەکی عەلی عشماوی لە کوێیە؟

لە دوای ئەمە ڕووداوەکان خێرابوون، دەستگیرکردنو ڕاپێچکردنی برایان زیادی کرد، سەرکردەکانی ڕێکخستنی نوێ ڕاپێچکران، ڕێکخستنیش هەڵنەئەستا بە هیچ بەرپەرچدانەوەیەکی ئەو دەستدرێژییانەی لە لایەن دەوڵەتەوە کرایە سەر ئەندامەکانی.

ئەو چەکەی عەلی عشماوی هەواڵی پێدابوون کە بەڕێوەیە نەگەیشت، حکومەت ئیعلانی ئاشکراکردنی هیچ شتێکی نەکرد ـ دوای دەستگیرکردنی برایان ـ دەربارەی ئەو چەکانە یان دەست بەسەرا گرتنی.

لە ڕاستیدا ئەمە کەندەڵانێکی گەورەیە لە مەسەلەی چەكو، لە ڕاستی عەلی عشماوی و پەیوەندی بە موخابەراتەوە.

عەلی عشماوی هەواڵی دا بە برایان کە بە دڵنیاییەوە ئەو چەکانە بارکراون لە سودان و بەرەو گوندی دارو بردوویانە لە نزیك ئەسوان، ئەمەش پێش ماوەیەکی زۆر بوو لە دەست پێکردنی ڕاپێچکردن کە چەند مانگێك تێدەپەڕی.

جا ئەگەر قسەکەی عەلی عشماوی ڕاست بوایە دەبوایە چەکەکان بگەشتایە، وە ئەگەر بگەشتایە دەبوایە برایان وەریان بگرتایە، وە هەوڵی ئەوەیان بدایە شتێکی پێبکەن. بەڵام ئەمە ڕووی نەداو نەهاتە دی.

خۆ ئەگەر بگەیشتایەتە دەستی حکومەت و دەستی بەسەردا بگیرایە ئەوە حکومەت ئیعلانی دەکرد، وە دەهۆڵی بۆ برایان دەکوتا، وێنەی چەکەکان لەسەر لاپەڕەی هەموو ڕۆژنامەکانو لە هەموو هۆکارێکی ڕاگەیاندنەوە بە دەردەخران، ئەمەش ڕووی نەدا.

## ئەی كەواتە چەكەكانی عەلی عشماوی چی بەسەر هات؟!

ئەمە بەڵگەیەكە لەسەر ئەوەی كە چیرۆكی چەك، دەهۆڵ یان تۆڕ، یان بۆسە بووە، موخابەرات لە ڕێگەی عەلی عشماویەوە ڕێكیان خستووە بۆ لێدانی برایان.

دوای ئەوەی كە موخابەرات ئامانجی بوو، هەموو شت كۆتایی هات، برایان هەموویان دەستگیركرانو ڕاپێچی زیندانەكان كران، ئیدی حكومەت بێدەنگ بوو لە چارەنووسی ئەو چەكانە.

ئامادەكەری شانۆگەری چەك عەلی عشماوی لە دەستی دەرچوو كە شانۆگەریەكەی بە شێوەیەكی گشتی تەواو بكات لەسەر شێوازو بنەمایەكی هونەری بۆ ئەوەی هەنگاوەكانی یاریەكە تەواو بێت.

## سەید كۆتایی بە گێڕانەوەی چیرۆكی ڕێكخستن دەهێنێت

چیرۆكی ڕێكخستنی نوێی برایان بە ڕاپێچكردنو دەستگیركردنی ئەندامانی لە هاوینی ساڵی 1965داو بە پێشكەشكردنی هەموو زانیارییەك دەربارەی ڕێكخستنو ئەندامانی و نهێنییەكانی لە لایەن عەلی عشمایەوە ـ كە یەكەم دەستگیركراو بوو ـ كۆتایی پێهات.

سەید كۆتایی گێڕانەوەی چیرۆكەكەی لەگەڵ ڕێكخستندا بە وتەكەی دەربارەی پلانی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی دێنێت، كە بیریان لێكردەوەو پاشان لێی پاشگەز بوونەوە.

(هەموو شتێك لەم مەسەلەیەدا ـ چ دەستگرتن بەسەر ئەنداماندا یان دەزگاكانی ـ لە بیركردنەوەی نەزەری تێنەپەڕی ـ هەروەك لە پێشدا ئاگاداریان كردبووم ـ زانیاریو ڕێنومایییەكانی من بۆیان ئەوەبوو كە هیچ شتێك نەكەن، مەگەر لە كاتێكدا كە توانای فراوانیان لە دەستدا بێت.

ئەمە بوو وێنەی ئەوهەڵوێستە تا ڕۆژی ڕاپێچكردنم، بە سروشتی حاڵ ئاگادارنیم كە دوای ئەوە چی ڕوویداوە، بەڵام ئەوە ڕوونە كە لە بنەڕەتەوە هیچ شتێك ڕووی نەداوە.

ئەوان ئەگەر بیانویستایە بەهەر كارێك هەستن بەلایەنی كەمەوە مۆڵەتی سێ هەفتەیان لە بەردەمدا بوو.

ئەمەش هەڵهێنجانێكی دروستە لەلایەن سەیدەوە، كە دەلالەت لەوە دەكات ڕێكخستن بە جددی بیری لە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی و لەناوبردنی سەرانی حكومەت لە میسردانەكردۆتەوە، خۆ ئەگەر بەشێوەیەكی كرادریو جدی ئەمەیان مەبەست بوایە، ئەوە هەوڵیان بدایە سەركەوتوو ئەبوون.

هەوڵنەدانی جدیان بۆ لەناوبردنی بەرپرسان، بەڵگەیەكە لەسەرئەوەی كارەكە لە بیركردنەوەیەكی نەزەری تێنەڕیوە، كە برایان لە لیژنەی سەركردایەتیدا وەڵامی پێشنیارەكانی عەلی عشماویان پێداوەتەوە. یان بڵێ وەڵامدانەوەیەك بوو لە برایانەوە بۆ باڵا دەست بوونی موخابەرات كە لە پشنیارەكانی عەلی عشماویدا خۆی دەبینیەوە.

لەگەڵ ئەمەدا حكومەت بە شێوەیەك هەڵسوكەوتی لەگەڵ كردن وەك ئەوەی لە بیركردنەوەیەكی نەزەری خێرایی ناجدیەوە گوێزرابنەوە بۆ هەنگاوی كرداری جێبەجێ كردن، وەك ئەوەی بە كرداری بەرهەڵستی حكومەتیان كردبێتو بەرپرسانی حكومەتیان كوشتبێت.

## سەردانەكانی سەید لە دەرەوەی بازنەی ڕێكخستن

لەگەڵ ئەم ئەڵقەیەی تر لە ژیانی سەید قوتب لە دەرەوەی زیندان بۆ ماوەیەكی كورت دەمێنینەوە تا ئاشنا بین بەو كەسانەی سەردانیان كردووە.

سەید لەو چەند مانگە كەمەی لەدوای ئازادكردنیەوە بە هۆی لێبوردنی تەندروستییەوە تیایدا ژیا ئاوازی دڵو ڕووناكی چاوی لاوانی موسڵمان بوو، پڕ بە دڵیان خۆشیان دەویستو بە پەرۆشەوە ئەو كتێبانەیان دەخوێندەوە كە دەری دەكردنو پشتگیری ڕاو بۆچوونەكانیان دەكرد، ئەوانەیان توانایان هەبوو بگەنە لای زۆر هەوڵیان دەدا سەردانی بكەنو لەگەڵی دابنیشنو ڕاوبۆچوون لە نێوانیاندا بگۆڕنەوە، سوود لە ئەزمونەكانی وەربگرن.

بە ڕاستی ماڵەکەی باخچەیەك بوو بۆ ئەو کەسانەی سەردانیان دەکرد، بە چەشنێك کە لە میوانەکانی چۆڵ نەدەبوو.

سەید لە هەموو ڕۆژی هەینیەکدا نەدوەیەکی هەفتانەی کراوەی لە ماڵەکەیدا ساز دەکرد: (لەبەر زۆری ژمارەی میوانەکان لە ڕۆژی هەینی دا کە وەك نەدوەیەکی گشتی کراوە بوو بۆسەردان، زیاتر شێویان لە زیهنمدا ماوەتەوە نەك ناوەکانیان. . ).[1]

چەند ئەندامێك لە برایانی دەرەوەی میسر سەردانیان دەکرد، جایان بە سیفەتی ڕەسمی ئیخوانی، یان بە سیفەتی تاکەکەسی، وە کەسانی ئیسلامیی جگە لە برایان لە دەرەوەولەناوەوەی میسریش سەردانیان دەکرد.

برایەك بە ناوی حازم ـ یا عاسم ـ بە نوێنەری برایانی موسڵمان لە عێراق سەردانی کردو لە چەند بابەتێکی ڕێکخستنانەدا مشتومڕی لەگەڵ کرد، وە بۆی دەرخست کە برایانی موسڵمان لە عێراق پشتگیری دەکەن لەسەر پرۆگرامەکەی لە جوڵەو بانگەزادا.[2]

برایەکی تر کە ـ ناوی دکتۆر عەبدولڕەحمان بوو ـ نوێنەری برایانی موسڵمان بوو لە ئوردن سەردانی کردو پرسو ڕای پێکرد لە مەسەلەی پەیوەندی برایان لە ئوردن بە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیو بە ئەحمەد ئەلشەقیریەوە، سەید ڕەخنەی خۆی لەسەر برایانی ئورودن دەربڕی (لەبەرئەوە لە ساڵی 1953دا، کاتێك لە ئوردن بووم من دەزانم کە برایانی ئوردن بە ڕۆژوون–خۆیان بەدوورگرتووە – لە جموجوڵە سیاسیە ناوخۆییەکاندا، گونجاو نیە ئامۆژگاریان بکەم بە پاشەکشە لێی، ئەوانیش بە پێی ئەو بارودۆخو مێژووەی کە لە جوڵەداهەیانە وەڵامی ئەمە نادەنەوە).[3]

هەروەها نوێنەری برایانی موسڵمان لە سودان سەردانی کرد، سەیدیش ئامۆژگاری کرد بە پشتبەستن بە "بناغەی پتەو" لەگەڵ نەبەستنەوەی ئاواتو هیواکان بە هەڵبژاردنو جەماوەرەوە.[4]

هەروەها نوێنەری برایانی موسڵمان لیبیاش سەردانی کرد.[5]

نوێنەری برایانی موسڵمان لە سوریا سەردانی کرد، سەید ڕەخنەی خۆی سەبارەت بە ڕۆچوونی برایان لە سوریا لە سیاسەتو لاوازی لاکردنەوەیان بۆ پەروەردە دەربڕی.[6]

بەڵام میوانانی لە دەرەوەی میسر کە لە برایان نەبوون، ناوی هەندێکیانی بردووە لەوانە کچی برای –برازی- شێخی عێراق ئەمجەد زەهاوی، باڵیۆزی عێراق لە قاهیرە بەوەفد لەلایەن سەرۆکی عێراق عەبدولسەلام عارفەوە، هەروەها زیات شیت خەتاب ڕاوێژکار لە دادگای تەمیزی عێراق کە برای نووسەر مەحمود شیت خەتاب بوو.

کاتێکیش لە قاهیرە کۆنگرەیەك بەسترا بۆ زانایانی موسڵمانان لە (**مجمع البحوث الاسلامية**) هەندێك لە زانایانی موسڵمان سەردانیان کردو لە هەندێك مەسەلەدا ئامۆژگاری کردن. نوێنەری زانایانی موسڵمان لە جەزائیر لە کۆنگرەیەکەدا سەردانی کرد، شێخ محەمەد عەلی ئەلجوز موفتی شاخی لبنان سەردانی کرد. کۆنگرەی زانایان لە هیند ـ کە ئەبوحەسەنی نەدەوی سەرۆکایەتی دەکرد ـ نامەیەکی پیرۆزبایی ناسکیان بۆ نارد بە بۆنەی ئازادکردنیەوە. هەروەها کۆمەڵی ئیسلامی لە پاکستان نامەیەکی هاوشێوەی پیرۆزباییان بۆ نارد.[7]

بەڵام دەربارەی سەردانی ئیسلامیەکان لە ناوەوەی میسرو، سەردانی سەید بۆ ئەوان:

محەمەد عەبدولعەزیز عەتیە سەردانی کردو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد سەبارەت بە هەوڵەکانی شیوعیەت بۆ کارکردنە سەر بیروبۆچونی لاوان و تێکدانی ئاراستەی بیرکردنەوەو ڕەفتاریان.

هەروەها یەکێك لە مامۆستایانی پەیمانگای مامۆستایان لە ئەسیوت بۆ هەمان مەبەست سەردانی کرد.

---

[1] الموتى يتكلمون 141.
[2] لماذا اعدموني 61- 62.
[3] لماذا اعدموني 64- 66.
[4] لماذا اعدموني 66- 67.
[5] لماذا اعدموني 67- 68.
[6] لماذا اعدموني 60- 70.
[7] لماذا اعدموني 71- 79.

سەید پەیوەندی خۆی بە حاجی حسەین سدقیەوە ڕوون دەکاتەوە لەگەڵ ئەو سەردانانەی کە لە نێوانیانو لە نێوان خێزانەکانیاندا هەبووە.

پاشان سەرەتای ئاشنابوونی بە زەینەب غەزالی لە ماڵی حاجی حسێن صدقیدا ڕوندەکاتەوە و، ئاماژە بە سەردانەکانی بۆ لای شێخی موجاهید محەمەدئەلئەودەن دەکات کەجارێك لەگەڵ حسێن سدقیو ماڵو منداڵەکانیدا، کە محەمەدقوتب و زەینەب غەزالیان لەگەڵ بوو، وە چەند جارێك بە تەنها سەری لێداوەو، گوێی گرتووە لە خەفەتو ناسۆر چەشتنەکانی شێخی ئەودەن بۆ لەناوچونی لاوان لە میسردا، بەڵام سەید دڵنیای کردووە لەهە بوونی لاوانی چاكو ساڵح.[1]

وە چەندین سەردانی بەرامبەر لە نێوان سەیدو ڕابەری گشتی حەسەن ئەلهوزەیبیدا ڕویدا.[2]

جا هەموو ئەم سەردانە چروپڕانە وێنەی هیمەت بەرزیو، ئەو ووزە لە بن نەهاتوو و جوڵە بەردەوامو توانا گرێدراوەی سەیدمان بۆ دەردەخات کە چۆن نەخۆشیە سەختەکەی دای نەنیشاندووەو، تەمەنە زۆرەکەی لە کارکردن بۆ خواو لە پێناوی خوادا نەیوەستاندوە.

## دیمەنی شەشەم: ناهەمواریەکانی سەید قوتب

### دەسگیرکردن و لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەید

هێزی دژ بە ئیسلام و برایانی موسڵمان قەسابخانەیەکی دڕاندانەو خوێناویان لە ساڵی 1965دا بۆ برایانی موسڵمان ئامادە کرد، کە دڵڕەقانەترین و توندوتیژترین و مەترسیدارترین مەرگەسات بوو ڕووبەڕووی برایان کرایەوە لە میسردا، بەڵکو ئەشکەنجەدان تیایدا لە ناشیرینترینو دڵڕەقانەترین وێنەی ئەشکەنجەدان بوو لە مێژوودا.

هەندێك لەو برایانە کە لەم قەسابخانەیەدا ئەشکەنجە درابوون، زۆریان نووسیوە سەبارەت بەو ئەشکەنجە ناڕەحەت و مەترسیدارانەی کە بەسەریاندا هاتووە.

لە گرنتگرین ئەو کتێبانە: (**البوابة السوداء**)ی ئەحمەد ڕائف، (سراديب الشيطان)ی ئەحمەد ڕەئفەت، هەروەها (أيام من حياتي)ی زەینەب غەزالی، (يوميات سجين في السجن الحربي)ی کەمال فرمادی، (**مذابح إخوان في سجون ناصر**)ی جابر رزق.

سەیدیش ـ خۆیو خێزانەکی ـ لەم میحنەتەدا ئەشکەنجە دران ئەشکەنجەدانێکی ترسناك، ئەوەبوو دەستگیرکراو لێکۆڵینەویەکی دوروودرێژی لەگەڵدا کرا، ئەشکەنجەیەکی ترسناك درا، فەرمانی بەسەردا دراو فەرمانکەشی بەسەردا جێبەجێ کرا.

---

[1] لماذا اعدموني 80- 90.
[2] الموتى يتكلمون 124.

## بارودۆخی گشتی کەمێك پێش قەسابخانەکە

### دەسەڵاتی شیوعیەت

شیوعیەکان ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆیان لە قەسابخانەکەی برایاندا هەبوو لەساڵی 1965، شیوعیەکان لە زۆربەی وەزارەتو دەزگا ڕەسمیەکاندا بڵاوبوونەوە، دەستیان گرتبوو بەسەر (الإتحاد الإشتراکی العربی) و ڕێکخراوەکانیدا، هەروەها بەسەر هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژنامەو گۆڤارو ئێزگەو تەلەفزیۆنەکان.

دەسەڵات بە دەستی کەسایەتی شیوعی عەلی سەبری سەرەك وەزیرانەوە بوو. وە (الإتحاد الاشتراکی العربی) بە دەستی شیوعی کەمال ڕەفعەتەوە بوو.

کەمێك پێش قەسابخانەکە لە 25ی نیسانی 1960دا ڕۆژنامە میسریەکان بەیانێکی کتوپڕوچاوەڕوان نەکراوی حزبی شیوعی میسرییان بڵاوکردەوە، تیایدا ئیعلانی سەرسامی خۆیان بە ئەزمونەکانی عەبدولناسر ڕاگەیاند، لەگەڵ ڕۆڵی (الإتحاد الاشتراکی العربی)، هەروەها ئیعلانی ئەوەی تیا کرابوو، کە حزبەکەیان دەزگاو ڕێکخستنەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو بە ئەندامەکانیەوە خۆی تواندۆتەوە لە دەزگای (الإتحاد الإشتراکی العربی)دا، تا پەلە بکات لە پرۆسەی وەرچەرخانی ئیشتراکی لە میسردا.

وە بەم کارە شیوعیەکان زاڵ بوون بەسەر (**التنظیم الطلیعی**)یەی (الإتحاد الإشتراکی)دا. [1]

## ململانێ لە نێوان ناوەندەکانی دەسەڵات لە دەوڵەتدا

سەرەڕای پەلهاویشتنی شیوعیەت بە سەردامو دەزگاکانی دەوڵەتدا، ململانێیەکی قووڵ هەبوو لە نێوان ئەو هێزانەی فەرمانڕەوایی وڵاتیان دەکرد. هەر مەڵبەندێکی دەسەڵات دەیویست خۆیو هێزەکەی بچەسپێنێت لەسەر حسابی مەڵبەندەکانی تر، تەنانەت مەڵبەندێك پیلانی بۆ مەڵبەندەکانی تر دادەناو بە ماستاو کردنو درۆو ساختە کردن خۆی لە عەبدولناسر نزیك دەکردەوە.

ململانێی نێوان لێکۆڵینەوەی گشتیی و موخابەراتی گشتیی لە پێش قەسابخانەکە پەرەی سەندو گەرمتر بوو، لێکۆڵینەوەی سەربازیی پیلانی بۆ موخابەراتی گشتی داڕشت، وە گومانی بۆ عەبدولناسر دروست کرد سەبارەت بەوەی کە دەزگای موخابەراتی گشتی هەڵناسێت بە ئەرکەکانی، وە چەند ڕاپۆرتێکی تەزویری هەڵبەستراوی پێشکەش بە عەبدولناسر کرد دەربارەی ئەو پیلانانەی برایان دایان ڕشتبوو دژ بە ئەمنی وڵات، وە داوای لە عەبدولناسر کرد کە ڕێگری لێنەکات بۆ دەستوەشاندن لە برایانو ئیسلامیەکان لە پێناوی پاراستنی ئەمنو یاسادا، عەبدولناسر ئەوەی کە دەزگای لێکۆڵینەوە مەبەستی بوو پێی بەخشیو ڕێگەی پێدا بۆ ئەوەی چی دەوێت بیکات.

بەم شێوەیە دەزگای لێکۆڵینەوەی سەربازی بە ئامانجی خۆی گەشتو، هەمەوو ئەو ڕقو قینو ئەشکەنجەی لە هەگبەیدا هەبوو ڕژاندی بەسەر برایانی موسڵماندا.

وەزیری ناوخۆی ئەوکاتە عەبدولعەزیم فەهمی لایەنێك لەو ململانێیە لە ساڵی 1965 دەگێڕێتەوە، وە ڕوونی دەکاتەوە چۆن دەزگای لێکۆڵینەوەی سەربازیو ئەندامانی نووسینگەی عەبدولحەکیم ناسر پیلانیان لە دژی گێڕاوە، بەڵکو چۆن عەبدولحەکیم ناسر خۆی پیلانی پێگێڕاوە.

لە ئابی 1965دا عەبدولعەزیم فەهمی لەگەڵ وەزیرەکانی تردا لە ئەسکەندەریە ئامادەبوون بۆ خواحافیزی کردن لە عەبدولناسر کە بۆ سبەینێ سەفەری دەکرد بۆ (جدە) بە مەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ.

---

[1] الموتی یتکلمون 30.

عەبدولعەزیم فەهمی ئەو وتەیەی عەبدولحەکیم ناسر دەگێڕێتەوە کە لە ئەسکەندەریە پێی وت: (چی دەکەیت لە ئەسکەندەریە، لە کاتێکدا نزیکە قاهیرە بکەوێتە بەر کودەتایەك، کە برایانی موسڵمان ڕێکی دەخەن؟) وە فەرمانی پێکرد کە خێرا بچێت بۆ قاهیرە بۆ پاکسازیی ئەو پیلانە.

پاش ئەوەی عەبدولعەزیم فەهمی بوونی پیلانێکی ئیخوانی بە ناڕاست دایە قەڵەم، وە ویستی لە ئەسکەندەریە بمێنێتەوە بۆ پارێزگاری کردن لە ئاسایشی عەبدولناسر، عەبدولحەکیم ناسر فەرمانی پێکرد کە خێرا سەفەر بکات بۆ قاهیرە. کاتێك فەرمانەکەی جێبەجێ کردو سەفەری کرد، عەبدولحەکیم بە عەبدولناسری وت: وەزیری ناوخۆکەت ئەسکەندەریەی چۆڵ کردووە تا پڕ بێت لە شانەکانی برایانی موسڵمان، ئەوانەی لە سەنگەردان بۆ تیرۆرکردنت، ئەوەتە سەفەری کردوە بۆ قاهیرە!).[1]

لێکۆڵینەوەی سەربازی وابردیە مێشکی عەبدولناسرەوە کە ڕزگاریان کردووە لە پیلانێکی ترسناك لە لایەن برایانەوە بۆ تیرۆرکردنی، بەمە لە عەبدولناسر نزیك بوونەوەو، تێیان گەیاند عەبدولناسر ناتوانێت پێویستی بەوان نەبێت.

ئەوەبوو زیندانەکانی لێکۆڵینەوەی گشتیان بە ڕووی برایاندا کردەوەو برایان تیایاندا نارەحەتی زۆریان چەشت، وە لە بەناوبانگترین ئەو زیندانانە: زیندانی جەنگی ترسناك، زیندانی ئەلقەلعە، زیندانی ئەبی زەعبەل بوون.

لە ناودارترین ئەفسەرە قامچی بە دەست و ستەمکارەکانیش، ئەوانەی سەرپەرشتی قەسابخانەکەی برایانی ساڵی 1965یان دەکرد لە زیندانی جەنگی و لە زیندانی قەلعەو جگە لەوانیشدا ئەمانە بوون: شەمس بەدرانی بەڕێوەبەری نووسینگەی عەبدواحەلیم ناسر. حەمزە ئەلبەسیونی بەڕێوەبەری زیندانی جەنگی.

ئەفسەرانی ئەشکەنجەدانیش لە زیندانی جەنگیدا ئەمانەبوون سەفوەت ئەلڕوبی، موختار ساڵح، جەلال دەبیب، ڕیاز ئیبراهیم، حەسەن کەفاخیو حەسەن خەلیل.[2]

## بڵاوکراوەو پڕوپاگەندەکان دژی برایان

لە پێش قەسابخانەکەی 1965 وە کۆمەڵێك پڕوپاگەندەی پیلان ئامێز لە لایەن شیوعیی و گاورو هێزە دژەئیسلامیەکانی ترەوە بڵاوکرایەوە.

سەید لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاماژە بە هەندێك لەم پڕوپاگەندانە دەکاتو دەڵێت: (شیوعیەکان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە هەمو شوێنێکدا، بەوەی کە برایان خۆیان ڕێك دەخەنەوە، سەرکردەیەکی تازە بۆ خۆیان هەڵدەبژێرنەوە، ئەو پڕوپاگەیەندەیەمان پێگەیشت کە شیوعیەکان کۆمەڵێك بڵاوکراوەیان خستۆتە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانەوە، کە سیمای ئیخوانی پێوە دیار بووە، بۆ وروژاندنی ڕقی ڕۆژنامەنوسانی دژ بە برایان. ئەمەش نامۆ نیە، ئەوەبوو لەمەوپێش بیستمان کە کۆمەڵێك بڵاوکراوە ڕێکخراوە و ئامادەکراوە بۆ بڵاوکردنەوە کە لە جانتای دوو پیاوی ئایینی مەسیحی دا بوون کە هەردووکیان لە ڕووداێکدا چەند ساڵێك لەمەوپێش مردن، وە ئەم بڵاوکراوانە ئیمزای برایانی موسڵمانی لەسەر بووە بە مەبەستی زیان پێگەیاندنیان).[3]

هەروەها شیوعیەکان کۆمەڵێك مادەی تەقینەوەیان لەسەر ڕێگەی سەرۆکی چین (شو ان لای) لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ئەسکەندەریەوە بۆ قاهیرە دانا لە 28ی حوزەیرانی 1951، پاشان هەر شیوعیەکان خۆیان پێش تێپەڕبوونی سەرۆکی چین دەزگای مەباحسیان لێ ئاگادار کردەوە،بەشێوەیەکی ئاسایی ئەم کارەیان دایە پاڵ برایانو تۆمەتباریان کردن بەوکارە تاکو بتوانن لێیان بدەن.[4]

---

[1] مذابیح الاخوان في سجون عبدالناصر : 29ـ 31، گواستنەوە لە وتەکانی فەهمییەوە.
[2] الموتی یتکلمون، 31.
[3] لماذا اعدموني 31.
[4] الموتی یتکلمون 31.

## محەممەد قوتب سەرەتای کارەساتەکەی برایانی موسڵمان دەگێڕێتەوە

ئەو کارەساتەی لە ساڵی 1965دا بەسەر برایاندا هات چنراوی حکومەتی میسری بوو، بەڵکو بەرهەمی پیلان و نەخشەیەکی جیهانی دەرەکی فرۆفێڵاوی بوو، کە بە دەستێکی میسری ناوخۆیی جێبەجێ کرا، شیوعیەتی جیهانی بەشداری دارشتنی ئەم نەخشەیەی کرد، لەگەڵ خاچپەرستی جیهانی کە خۆی لە ئەمریکاو دەزگا جاسوسیەکانیدا دەبینێتەوە، هەروەها زایۆنیەتی جیهانی بێلایەن نەبوو لەم پیلانەدا.

مامۆستا محەممەد قوتب لایەنێکی ئەم پیلانە دەگێڕێتەوە کە دادەنرێت بە خاڵی دەست پێکردنی نەهامەتیەکانی برایانی موسڵمان، جابر رزق دەڵێت: لە کاتی گەرمەی ئەشکەنجەدانی کۆمەڵی برایان لە زیندانی جەنگیدا: (یەکەم ئاماژە بۆ دەست پێکردن لە کارەساتی برایانی موسڵماندا، بریتی بوو لەوەی کە یەکێك لە گۆڤارە ئەمریکیەکان بلاّوی کردبووەوە دەربارەی کتێبی (**جاهلیة القرن العشرین**)ی **محەممەد** قوتبو کتێبی (**معالم فی الطریق**)ی سەید قوتب. وە گۆڤارە ئەمریکیەکە باسی حەزەرکردنی کردبوو لەو دوو کتێبەو لەهەردوو نووسەرەکەی، وە بە رەگەزپەرستی وەسفی کردبوون).

## سەید پێشبینی لە سێدارەدان دەکات

چیرۆکی مارە سورەکەو هەموو ئەوەی لە ئارادا بوو ئاماژە بوون بۆ کارەساتێکی نوێ بۆ برایانی موسڵمان، وە نیگای ئەوەی دەدا کە هاوینی 1965 هاوینێکی زۆر گەرم دەبێت بۆ برایان.

برایانی موسڵمان پێشبینی رووداوی مەترسیداریان دەکرد بۆ خۆیان، وە چاوەڕوانی نارەحەتیەکی ترسناکیان دەکرد کە بەرەو روویان دێت. لەو رۆژانەدا لیژنەی سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکە بە ئاگایی و چاودێریەوە دەژیان، سەید قوتب رۆشت بۆ هاوینەهەواری رەئس ئەلبیر لە ئەسکەندەریە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی، لەوێدا لەپێش دەستپێکردنی دەستگیرکردنەکەیان چەند رۆژێکی بردە سەر.

سەید چاوەڕوانی نارەحەتیەکەی دەکردو چاوەڕوانی ئەوەشی دەکرد کە پشکی گەورەی بەربکەوێ، چاوەڕوانی زیندان و ئەشکەنجەدانی دەکرد، تەنانەت مردنیش، رۆژنامەنووس محەمەد ئەلرکابی گفتوگۆیەکی نێوان خۆی و سەید دەگێرێتەوە، کە پێش دەستگیر کردنی لە ماڵی سەیدئەنجامی دابوو.

ئەلرکابی دەڵێت: پێم وت: سوپاس بۆ خوا لەسەر سەلامەتی، (إن **شاء** الله) تەندروستیشت باشە، هیچت نەماوە تەنها بووکێك نەبێت (شایی نەبێت).

سەید زۆر بە جدی پێکەنی، پاشان وتی: چ بوکێکت مەبەستە ؟

وتم: بۆ هەردووکیان بەدیهێنراوین.

ماوەیەکی کورت قسەمان کرد، پاشان پرسیارێکی کوتوپڕی لێ کردم، ئایا هیچ دەزانی لە لێکدانەوەی خەو؟ دوێنێ لە خەومدا مارێکی سورم بینی بە چواردەرمدا پێچی دەخوارد پاشان نزیك دەکەوتەوە، لەوکاتەدا بەخەبەر هاتم و ئیتر نەنوستمەوە.

وتم: گوێ بگرە ئەی گەورەم، ئەمە دیاریەکە کە یەکێك لە ئیمانداران پێشکەشی تۆی دەکات، من ئێستە بۆتی ئامادە دەکەم، هابیگرە، ئەوە خەوەکە هاتەدی.

وتی: ئەی بۆچی لێکدانەوەکی ئەوە نەبێت کە من ببمە دیاریەکی پێشکەش کراو بۆ ئیمانداران.

وتم: ئایا مانەوەی پیاوچاکان سودبەخش تر نییە بۆ بانگەوازی ئیسلامی.

[1] مذابح الاخوان في سجون 26.

وتی: بە بەردەوامی نە، بەڵکو دەبێت دامەزراوی مەبەستمان بێت، لەگەڵ زانیاریمان بەوەی کە لە دامەزراویدا تیاچون هەیە.

وتم: ئەی پیاو بەم شێوە ڕەشبین مەبە، میللەت بەرەو ڕاست بوونەوە هەنگاو دەنێت.

وتی: لەمەودا دەزانیت.[1]

## دەستگیرکردنی محەممەد قوتب و نارەزایی سەید قوتب

ڕووداوە کرداریەکانی کارەساتەکەی برایانی موسڵمان بە دەستگیرکردنی محەممەد قوتب دەستی پێکرد، کە لە 29 یان 30ی تەمموزی 1965دا دەستگیر کرا.

سەید قوتب نامەیەکی نارەزایی ئاراستەی ئەفسەری مەباحسی گشتیی ئەحمەد رائف کرد، کە ڕەفعەت بەکری خوشکەزای "بەڕەحمەت بێت" ـ بۆی برد، تیایدا سەید نارەزایی دەربڕیبوو سەبارەت بە شێوازی دەسگیرکردنی محەممەدو، ئەوەی کە کەس و کارەکەی نازانن لە کوێ دەست بەسەرە. سەید لە نامەی نارەزاییەکەیدا بەراوردی لە نێوان دەستگیرکردنی محەممەد قوتب لە لایەن حکومەتو دەستگیرکردنی فەیلەسوفی ئینگلیزی (برتراند رسل) لەلایەن حکومەتی بەریتانیەوەکردبوو لە کاتێکدا ڕوبەڕوی سیاسەتی بەریتانیا بووبوویەوە، ئەوەبوو ئەویش کەس و کارەکەی نەیان دەزانی لە کوێ دەست بەسەرە.[2]

سەرەتای دەستگیرکردنەکە بە محەممەد قوتب دەستی پێ دەکات لە کاتێکدا محەممەد قوتب بە ڕەسمی لە ڕێکخستنی برایاندا نیە، ئەمەش دوو شت دەگەیەنێ:

یەکەم: دەزگای ئەمنی دەوڵەت تا ئەو بەرواره هیچ شتێکی نەدەزانی دەربارەی ڕێکخستنی برایان، وە ئوسرەو شانەکانی ئاشکرا نەکردبوون، لەبەرئەوە بە پیاوێك کەئەندام نیە لە ڕێکخستنی برایاندا دەست پێ دەکات.

دووەم: کاتێ محەممەد قوتب دەستگیر کرا لەبەر بیروبۆچوونە ئیسلامیەکانی بوو، کە لە کتێبو دانراوەکانیدا باسی کردبوون، ئەو لەگەڵ ڕێکخستنی برایاندا بەیەکنەگەیشتبوو، لەگەڵیدا پلانی دانەنابوو، وە بیری نەکردبوویەوە لە دژی ڕژێم هەستێت بەکار. لەگەڵ ئەوەشدا دەسگیرکراو ئەشکەنجەدرا. بەڵام نەدرا بە دادگا. ئەمەش دەلالەت دەکات لەسەر هۆکارە فیکریەکانی کارەساتی برایان لە ساڵی 1965، وە ئەو کارەساتە سازدرابوو بۆ لەناوبردنی بیرە ئیخوانیەکانو بیریارەکانیان، نەك هەر ئەوە، بەڵکو بە ئامانجی خەفەکردنی بیری ئیسلامی بوو بە گشتی.

ئەمەش ئەو دەستە نهێنیە دەردەخات ـ شیوعییەتو خاچپەرستیو زایونیەت ـ کە لە پشتی کارەساتەکەوە بوون.

## دەستگیر کردنی سەید قوتب لە 1965/8/9دا

سەید کۆبوونەوە تەنزیمیەکانی لەگەڵ سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکەدا لە مایسی 1965دا ڕێکخست.

وە لە 5ی حوزەیراندا سەفەری کرد بۆ هاوینەهەواری (ڕەئس ئەلبیر) لە سەر قەراغی ئەسکەندەریە، لەوێ خانوویەکی بەکرێ گرت تیایدا بمێنێتەوە، چونکە هەڵاتووی گەرماو ئاوو هەوای گەرمی قاهیرە بوو کە نەخۆشی سنگەدرە کەی زیاتر دەکرد.

لە حوزەیراندا لەگەڵ خێزانەکەیدا ڕۆیشتن بۆ ڕەئس ئەلبیر، وە لە تەموزدا عەلی عشماوی هات بۆلای سێ ڕۆژ لەلای مایەوە، چونکە ئەو مانگی هەنگوینی بەسەر دەبرد.

---

[1] الشهید سید قطب 64ـ 65 وەرگیراوە لە پاشکۆی ڕۆژنامەی (الثمار)ی بەیروتییەوە 69/6/8.

[2] الموتی یتکلمون: 120- 121.

هەروەها عەبدولفەتاح ئیسماعیل سەردانی کردو هەرسێکیان لە ماڵی سەید بەیەککگەیشتن، پاش ئەوەی محەمەد قوتب لە 29ی تەمموزدا دەستگیر کرا مەباحسی میسری ماڵی سەیدیان لە حەلوان ومالەکەی ڕەئس ئەلبیرِیشیان پشکنی پشکنینێکی وورد، سەیدیش سەبارەت بەو شێوازە نارەزاییی دەربڕی.

بە دوو ڕۆژ دوای پشکنین عەبدولفەتاح ئیسماعیل لە ڕەئس ئەلبیرِ سەردانی سەیدی کرد، سەیدیش ئامۆژگاری کرد کە ئەو ناوە بەجێ بێڵێت لە ترسی دەستگیرکردنی.

لە 2ی ئابدا سەید کۆی زانیاریەکانی نارد بۆ لیژنەی سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکە، تیادا داوای ڕاوەستاندنی کردەی ئامادەکردنی چەکی کرد لێیان، وە داوای هەڵوەشاندنەوەی بیرکردنەوە لە پلانی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیو لێدانی سەرانی ڕژێمی لێ کردن. وە ئەم نارِەزاییە زارەکییەی سەید لەلایەن حەمیدەی خوشکیەوە گەشت بە زەینەب غەزالی، ئەویش گەیاندی بە عەلی عشماوی، وە ئیتر نازانین ئەو نامەیە چی کرد لەگەڵ براکانیدا.

لە 6ی ئابدا جارێکی تر سەید ڕۆشتەوە بۆ ڕەئس ئەلبیرِ وە لە شەوی 1960/8/9 دا مەباحسی میسری پێش نوێژی بەیانی دایان بەسەر ماڵی سەیدقوتبدا ، دەستگیریان کردو ڕاپێچی زیندانی جەنگیان کرد، ئەوەبوو تیادا ژیانی لەگەڵ ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەو دادگایی کردندا بەسەربرد، تا ئەو کاتەی لە سێدارە درا لە دوای دوو ساڵ لەم دەستگیر کردنەی.

حکومەت تا بەرواری دەستگیرکردنی سەید لە 8/9 دا ڕێکخستنی برایانی ئاشکرانەکردبوو، وە هیچ ئەندامێکیشی دەستگیر نەکردبوون.

## حکومەت بە (قەدەر) ڕێکخستن ئاشکرا دەکات

ئاشکراکردنی ڕێکخستنی برایان لەلایەن حکومەتەوە ـ قەدەر بوو ـ نالێین ڕێکەوت بوو، چونکە ڕێکەوت لە ڕووداوەکانی ئەم دونیایەدا نیە، هەموو ڕوداوێك ڕوودەدات بە قەدەری خوایە.

دەزگا ئەمنیەکانی حکومەت پێش کارەساتەکەی برایان سەرگەرم بوون بە قەزیەی حسەین تۆفیق و کۆمەڵەکەیەوە، ئەندازیار سامی عەبدولقادر لە لایەن دەزگاوە دەستگیرکراو دانی نا بە سەردانێکدا بۆ لای یوسف ئەلقرش کە یەکێك بوو لە برا دێرینەکان لە گوندی سنفا، بەڵام ئەو لە گوندەکەیدا نەبوو وە لەوێ چاوی پێی نەکەوت، بەڵکو لەلای حەبیب عوسمان لە قاهیرە بینی کە ئەویش یەکێك بوو لە برایان، بەم شێوەیە یوسف ئەلقرشو حەبیب عوسمان پێکەوە دەستگیر کران.

بە دەستگیرکردنی حەبیب عوسمان دەزگای ئەمنی دەستی گەشتە یەکەم سەرەداو کە بیگەیەنێت بە برایان، چونکە حەبیب عوسمان ئەندامی ئوسرەیەکی برایان بوو کە سەر بە ڕێکخستنی نوێ بوو.

حەبیب عوسمان ـ لە ژێر فشاری ئەشکەنجەدا ـ ئیعترافی کرد لەسەر ئەندامانی ئوسرە ڕێکخستنیەکەی، هەموو ئەندامانی ئوسرەکەی گیران، هەندێکیان ئیعترافیان کرد لەسەر کەسانی تر، بەم شێوەیە دەستگیر کردن زیادی کرد.

لەگەڵ ڕوودانی هەموو ئەمەدا، تا ڕۆژی هەینی 1965/8/20 هیچ ئەندامێکی لیژنەی سەرکردایەتی نەگیرا. لە نێوان گیراوەکاندا مەحمود فەخری هەبوو، کە ئیعترافی کرد لەسەر مەرسی مستەفا مەرسی، لێکۆڵینەوەی میسریش دایان بەسەر شوقەکەی مەرسیدا لە ئەمبابەو کردیان بە تۆڕێك بۆ ڕاوکردنی برایان.

لە شەوی هەینی 1965/8/20دا ئەفسەرریاز ئیبراهیم ـ کە لە دلڕەقترین و درِەندەترین ئەفسەرەکانی پۆلیسی سەربازی بوو ـ لەگەڵ پیاوەکانیدا لە شوقەکەدا بوون، لە نیوەی شەودا سێ نەفەر لە ئەندامانی لیژنە پێنج کەسیەکە دایان لە دەرگا،

[1] الموتی یتکلمون: 120ـ 121.

ئەوانیش: عەبدولفەتاح ئیسماعیلو عەلی عشماویو موبارەك عەبدولعەزیم بوون، ڕیازئیبراهیمی ئەفسەریش بە شانازی کردنەوە نێچیرە قەڵەوەکانی ڕاپێچی زیندانی جەنگی کرد.

لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی 1965/8/20دا دوو ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو لە زیندانی جەنگیدا ڕوویدا:

**یــەکــەم:** بەخشینی یەکەم شەهیدی ئیخوانی کە لە ئەنجامی سەختیو ناڕەحەتی ئەشکەنجەداندا گیانی سپارد، ئەویش برای شەهید محەممەد عەواد بوو، کە شەمس بەدران خۆی سەرپەرشتی ئەشکەنجەدانەکەی دەکرد، وە سەفوەت ڕۆبی خوێنڕێژ لە بەردەم بەدراندا سەری محەممەدی پانکردەوە، وە محەممەد عەواد مردنی هەڵبژارد بەسەر دەرخستنی نهێنی ڕێکخستندا.

دووەم: دانپیانانی ئەندامێکی لیژنە پێنج کەسیەکە عەلی عشماوی بە نهێنیو شاراوەکانی ڕێکخستندا، وە پێشکەش کردنی بە دەزگای لێکۆڵینەوە. . ئای چەندە جیاوازیی لە نێوان ئەم دوو هەڵوێستەدا هەیە، هەڵوێستی شەهید محەممەد عەواد و هەڵوێستی عەلی عشماوی؟![1]

## عەلی عشماوی پەڕەکانی ڕێکخستن ئاشکرادەکات

عەلی عشماوی دانپێنانە هەمەلایەنەکەی خۆی لە سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی 1965/8/20دا نووسی، تیایدا هەموو پەڕەکانی ڕێکخستنی نوێی برایانی ئاشکراکرد، دەربارەی مەسەلەی چەكو درێژەی ئەو باسە، هەروەها دەربارەی هێڵەکانی ڕێکخستنو نهێنیو شاراوەکانی، لیستێکی چڕوپڕو تەواوی پێشکەشکرد لە ناوی کۆمەڵەکانو ئوسرەکان، بە ئەندامانو سەرەك ئوسەرەکانەوە.

عەلی عشماوی گرنگترین کەس بوو، کە نهێنیەکانی ڕێکخستنی دەزانی لەسەر ئاستی کۆماردا، خاوەنی بیرو هۆشێکی ئاسنین بوو زیاد لەوەی کە هەر کەسێکی تر بتوانێت بیڵێت، ئەوەبوو ئەو شەوە جەژن بوو بۆ ئەفسەرانی پۆلیسی سەربازی.[2]

دانپیانانەکەی عەلی عشماوی دوورودرێژ بوو، زیاتر لە هەشت لاپەڕە بوو.[3] پۆلیسی سەربازی لیستی ناوەکانی عەلی عشماوی وەرگرت، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەموو ئەندامانی دەسگیر کرد.

ئیتر زیندان بە هەزارەها ئەندام لە برایان پڕبوویەوە، بە پیسترین و ناڕەحەتترین شێواز ئەشکەنجەیان دەڕژاند بەسەریاندا.

## عەبدولناسر لە مۆسکۆوە ڕایدەگەیەنێت

عەبدولناسر لە 7ی ئابی 1965دا سەفەری کرد بۆ ڕوسیا، لە 1965/8/29دا کۆبوونەوەیەکی بەو قوتابییە عەرەبانە کرد کە لە مۆسکۆ دەیانخوێندو لە بەردەمیاندا ئیعلانی دەرخستنی پیلانێکی کرد، کە برایانی موسڵمان لە میسردا گێڕاویانە بۆ هەڵگێڕانەوەی ڕژێمی فەرمانڕەواییو تێکدانی دەزگاکانی.[4]

هەڵبژاردنی عەبدولناسر بۆ مۆسکۆ ـ پایتەختی بێباوەڕی ـ تاکو لەوێوە ئیعلانی دەرخستنی پیلانی برایان بکات بەڵگەیەکی گرنگ ئەدات بە دەستەوە لەسەر نەخشەکێشانو فرۆفێڵی شیوعیەت ـ لە ناوەوە دەرەوەی میسردا ـ کە لە پشت ئەم پیلانە هەڵبەستراوەوەبوون.

[1] سەیری ئەم چیرۆکە لە (مذابح الإخوان في سجون ناصر)دا بکە، ل31ـ 39.

[2] بڕوانە (مذابح الإخوان) 36ـ 37.

[3] بڕوانە دەقی تەواوی ڕاپۆرتەکەی عەلی عشماوی لە (الموتى يتكلمون)دا ل50ـ 59.

[4] بڕوانە وتەکەی عبدالناصر لە (الموتى يتكلمون) ل39.

هەروەها هەڵبژاردنی مۆسکۆ لەلایەن عەبدولناسرەوە هۆکارێکی گرنگی عەبدولناسر بۆ بۆ نزیك بوونەوە لە سۆڤیەت‌و بەدەستخستنی زۆرێك لە یارمەتیەکانیان، تێگەیاندنیان لەوەی کە ئەم لەگەڵ ئەواندایە، لەگەڵ شیوعیەکاندایە لە میسر، ئەوەتە دژایەتی ئەو ئیسلامە دەکات کە ئەوان دوژمنانیەتی دەکەن، دژایەتی برایان دەکات ئەو برایانەی کە شیوعیەت دژایەتیان دەکەن.

ئەوەی ئاماژە بە دەستی شیوعیەت دەکات لە مەسەلەکەدا ئەوەیە کە شیوعیەکانی میسر خۆپیشاندنێکی هاودەنگی و پشتگیرییان بۆ عەبدولناسر سازدا ـ لە ڕێگەی (**التنظيم الطليعي للأتحاد الإشتراكي العربي**) یەوە کە ئەوان دەسەڵاتداربوون بەسەریدا ـ وە ڕیزیان بەستبوو بەسەر هەردوولای شەقامەکەدا هەر لە فرۆکەخانە تا ماڵی عەبدولناسر، کاتێك عەبدولناسر لە شەقامەکەوە بەڕێکەوت، بەم دوو هوتافە هوتافیان بۆ دەکێشا: **"سەربڕە، سەربڕە ئەی جەماڵ، نەکۆنەپەرستی‌و نەئیخوان"**، **"لە سێدارە بە، لە سێدارە بە ئەی جەماڵ، نە کۆنەپەرستی‌و نەئیسلام"**.[1]

یەکەم ڕاگەیاندن دەربارەی پیلانی برایانی هەڵبەستراو لە ڕۆژنامە میسریەکاندا، ڕۆژی سێشەممە 1965/9/7 بوو، واتە بە مانگێك دوای دەستگیرکردنی سەیدقوتب، مانشێتی سەرەکی ڕۆژنامەی (**الأهرام**)ی ڕۆژی سێشەممە 9/7 ئەمە بوو:

(یەکەم دریژە دەربارەی کۆتا پیلان گێڕانی برایانی مسوڵمان، ڕۆژنامەکان لە ڕۆژانی داهاتوودا بەردەوام دەبن لەسەر قسەکردن دەربارەی ئەم پیلانەو بڵاوکردنەوەی تۆمەت‌و پڕوپاگەندە بە دەوریدا).[2]

## ڕاپۆرتی لیژنەی یاسایی ئەنجوومەنی گەل

عەبدولناسر یاسایەکی جیای بۆ دادگایی کردنی برایانی موسڵمان دەرکرد، ناوی نا (یاسای فیرعەون) چونکە پڕ بوو لە ستەم‌و دەستدرێژی‌و دوژمنکاری. ئەمەش لە 1965/11/9دا، ئەوە بوو قەزیەی برایان بە دادگا سەربازیەکان سپێردرا تاکو تیایدا لێکۆڵینەوە لە قەزیەکە بکات و، تۆمەتبارەیان بکات‌و حوکمیان بە سەردا بدات، فەرمانی حوکمەکانیانی بە بڕاوەو یەکلایی بووەوە دانا، کە بە هیچ جۆرێك جێگەی توانج لێدانی تیا نەبێت.[3]

بەمەش دەستی لێکۆڵینەوەی سەربازی بە ڕووی برایانی موسڵماندا کرایەوە، وە خوێنرێژەکان هونەریان دەنواند لە ئەشکەنجەدانی برایاندا، لەسەروبانەوە شەمس بەدران وحەمزەئەلبەسیونی وسەفوەت ئەلڕوبی و جگە لەوانیش لە دەزگای نواندن‌و فیڵبازیەوە، عەبدولناسر ویستی بەرگی دیموکراسیەت بکات بەسەر یاساکەی‌و جێبەجێ کردنەکانیداو، سەربڕینی برایان بە ناوی دیموکراسیەت‌و نوێنەری گەلەوە ئەنجامبدات، ئەوەبوو قەزیەی برایانی نارد بۆ لیژنەی یاسایی ئەنجومەنی گەل لە بەرواری 1965/12/14 و لیژنەکەش ڕاپۆرتی خۆی نووسی بە بەرواری 1965/12/20، ڕاپۆرتەکەی پڕکردبووەوە بە درۆو دەلەسەو شت بۆ هەڵبەستن، ئیدانەی خۆی بۆ برایانی موسڵمان دەرکرد، هەموو ئەوەی دەزگای ئەمنی وتبووی ئەویش دایە پاڵ برایان.[4]

ڕاپۆرتی لیژنەکە تۆمەتی ئەوەیان دابوویە پاڵ سەید، کە ئیدعای پێغەمبەرایەتی دەکات: (قوتبی ئەم کۆمەڵەیە ئیدعای پێغەمبەرایەتی دەکات‌و کۆمەڵەکەش ئیدعاکەیان قبوڵ کردووە، لەسەر بناغەی پێغەمبەرایەتی مەعسوم ئەم جەماعەیە خۆی خستۆتە شوێنی واسیتەکار لەنێوان خواو بەندەدا.

---

[1] الموتی یتکلمون ل40.

[2] هەمان سەرچاوە، 73ـ 77.

[3] بڕوانە دەقی یاساکە لە (الموتی یتکلمون)دا، ل82ـ 93.

[4] بڕوانە دەقی بەلاغی یەکەم لە (الموتی یتکلمون) 103 - 107.

هەر لە سەر بناغەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، ئەم کۆمەڵەیە ڕێکخراوە بۆ نانەوەی ئاشوبەیەکی خوێناوی خاپورکەری شێوێنەری کوێرانە لە نێوان موسڵماناندا.

هەر لە سەر بناغەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتیو توانای وەرگرتنی ڕاستەوخۆ لە خواوە، ئەم کۆمەڵەیە ڕەدی کردەوە کە ئامانجەکانی لە کودەتا ڕوون بکاتەوە. . )[1].

ئایا لیژنەی یاسایی هیچ تۆمەتێکی هێشتۆتەوە نەیداتە پاڵ برایان، دوای ئەوەی تۆمەتی بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی دایە پاڵ سەیدقوتب. ؟!

## سیانزە ڕاگەیەنراوی لێکۆڵینەوەی سەربازی بۆ نوێنەرایەتی گشتیی

دوای ئەشکەنجەدانێکی دڕندانەی برایان لە زیندانی جەنگی و زیندانی ئەلقەلعەو زیندانەکانی تردا، دوای مانگو نیوێك لە دەستگیرکردنیان، لێکۆڵینەوەی گشتیی سەربازی دەستی کرد بە ناردنی بەلاغی یەك لە دوای یەك بۆ نوێنەرایەتی گشتی **(النيابة العامة)** و لەم بەلاغانەدا بە درێژی باسی ئوسرەو شانەو ڕێکخستنەکانی برایانی تێدا کردبوو، هەروەها پیلانە هەڵبەستراوەکان بۆ هەڵگێڕانەوەی ڕژێمی فەرمانڕەوایی، زانیاری ناوئەم بەلاغانە لەگەڵ تۆمەتبارەکاندا بۆ نوێنەرایەتی گشتیی کۆکراوەتەوە.

بەلاغەکان بە ئیمزای بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەی تاوانی سەربازی سەعد زەغلول عەبدولکەریم بوو. گرنگترین بەلاغیان بەلاغی یەکەم بوو، کە قەبارەکەی دە پەڕە بوو، وە ژمارەکەی 7/25/غ/1 بەبەرواری 1965/10/3 بوو.

لەم بەلاغەدا ناوی ئەندامانی ئوسرە ئیخوانیەکانی تێدا بوو، ناوی سەرەك ئوسرەکانو بەرپرسی کۆمەڵەکان لە ناوچەکاندا ، وە ئەرکی لیژنە پێنج کەسیەکە بۆ سەرکردایەتی[2].

ئەم بەلاغە لەسەر بنچینەی ئەو ڕاپۆرتەی علی عشماوی نوسرابوو کە تیایدا دانی نابوو بە هەموو شتێکدا. وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

بەلاغەکە سەرۆکایەتی ڕێکخستنی برایانی دابویە پاڵ سەیدقوتب، **محەممەد** یوسف هەواش بە جێگری سەرۆك، پاشان باسی پێنج ئەندامەکەی سەرکردایەتی کردبوو.

وە بەلاغەکانی دەزگای لێکۆڵینەوە بۆ نوێنەرایەتی گشتی بەردەوام بوو، کۆتا بەلاغ بەلاغی سیانزەهەم بوو ـ کە بە بەرواری 1965/12/20 نووسرا[3].

## دوو ڕاپۆرتی سەید

سەید دوو ڕاپۆرتی نووسی دەربارەی پەیوەندی خۆی بە برایانەوە بە گشتی، وە پەیوەندی بە ڕێکخستنی نوێی برایانەوە بە تایبەتی، ئەمەش لەسەر داوای لێکۆڵینەوەی سەربازی لە زیندانی جەنگیدا، وە ئەمەش پێش دەستپێکردنی لێکۆڵینەوە بوو لەگەڵیدا.

* **ڕاپۆرتی یەکەم:** دوای دەستگیرکردنی نوسی، کە زۆر کورت و چڕوپڕ بوو، وە هۆی کورت کردنەوەو چڕکردنەوەی سووربوونی بوو لەسەر پارێزگاریکردنی لەبرایان تاکو ڕوبەڕوی ئەشکەنجەدان نەبنەوە، چونکە وا گومانی دەبرد کە ئەوان دەستگیرنەکراون.

---

[1] سەیری ئەم دەستەواژانە بکە لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا. 93.

[2] سەیری ئەم دەستەواژانە بکە لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا. 93.

[3] کورتەی ئەو بەلاغانە لە (الموتى يتكلمون)، 108ـ 109.

* **ڕاپۆرتی دووەم:** کە دووروردرێژو فراوان بوو، دوای ئەوە نووسی کە بۆی دەرکەوت برایان دەستگیر کراون، وە دانیان بە هەموو شتێکدا ناوە، تیایدا دواووتەی خۆی بۆ لێکۆڵەرەوانو مێژوو وتبوو.

سەید لە زیندانی جەنگیداو لە 1965/10/22دا نووسینی ڕاپۆرتەکەی کۆتایی پێهێنا، لە ڕاپۆرتەکەیدا باسی سەرەتای دەستپێکردنی پەیوەندی بە برایانی موسڵمانەوە، دوای هەڵگیرسانی شۆڕشو دەربارەی زیندانی کردنی و، شایەتیەکانی لەسەر قەسابخانەی ئەلتورڕە و، ڕاوبۆچوونی دەربارەی پرۆگرامی کاری بزاڤی ئیسلامیو دەست پێکردنی لە بنچینەوە لە عەقیدەو پەروەردەو ئەخلاقەوە خستبووەڕوو.

دەربارەی پەیوەندی بە ڕێکخستنی نوێی برایانەوەو لیژنە پێنج کەسیەکەو، دەربارەی چیرۆکی عەلی عشماوی و چەك و، دەربارەی پلانی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی کردنە سەر بزاڤی ئیسلامی، وە هەڵوەشاندنەوەو ئیلغاکردنەوەی لە پێش کارەساتەکەدا، هەروەها تیاتیدا سەبارەت بە سەردانی ئەوبرایانەی کە میسری نەبوون بۆ لای ئەم دووا بوو ، وە دەربارەی پەیوەندیەکانی بە ئیسلامیەکانەوە ئەوانەی کە برایان نەبوون. ئەوەبوو ئێمەش لە بەشەکانی پێشوودا گەڕاینەوە بۆ ئەم ڕاپۆرتەو، ئەوەی کە پێویستمان بوو لێمان وەرگرت.

ئەم ڕاپۆرتە دوورودرێژە لە چەند ئەڵقەیەکی دوایەکدا لە گۆڤاری (المسلمون)ی دەولیدا بلاوکراوەتەوە، پاشان بلاوکەرەوەکانی گۆڤارەکە لە کتێبێکی تایبەتدا بلاویان کردەوە، وە ناونیشانی (**لماذا** أعدمونی)یان بۆ دانا.

سەرەڕای بلاوکردنەوەیان بۆ ئەم ڕاپۆرتە، دووپاتی ئەوەیان کردۆتەوە کە ئەوەی بە دەستیان گەشتووە بە دەستو خەتی سەیدقوتب خۆیەتی، هەروەها دوپاتی ئەوەیان کردۆتەوە کە ڕاپۆرتەکە ناتەواوە، چونکە ئەڵقە لە گوێکانی ڕژێم لاپەڕەی زۆریان لێشاردۆتەوە، کە سەید دەربارەی ئەو ئەشکەنجەو ئازارە دڕندانەیەی کە دژیان ئەنجامدرابوو نوسیبووی، ماوەی نێوان دەستگیرکردنیو نووسینی ڕاپۆرتەکە ـ لە مانگی ئاب تا تشرینی یەکەمی 1965 بوو ـ.[1]

ئەوەی لە نامەی (**لماذا اعدموني**)دا بلاوکراوەتەوە هەمووی بە دەستو خەتی سەیدقوتب خۆی بووە، بەڵام هەموو ئەوە نیە کە سەید بۆ لێکۆڵەرەوەکانی نووسیوە.

## پێشەکی ڕا پۆرتی دووەمی

سەید بەرپرسیارێتی ڕووداوەکانی 1965ی بە تەواوی گرتە ئەستۆی خۆی، لە کاتێکدا دەیزانی کە سەروگیانی دەبەخشێ لە بەهای ئەو ڕێکخستنە ئیخوانیەدا، وە هۆی بەکورتی نووسینی ڕاپۆرتی یەکەمی ڕوونکردۆتەوە.

(پێم باشە ئەم پێشەکیە باس بکەم، بەهۆی ئەو تیشکە ڕووناك کەرەوانەی تێیدایە. وە لە پێش ئەمەوە ڕونکردنەوەیەکی کورتم نوسیبوو، کە لە زۆر درێژەو شیکردنەوەدا ناتەواو بوو، هەروەها لە ژمارەیەك ڕووداوو ڕوونکردنەوەدا ناتەواو بوو.

بە هەڵە لە هەڵوێستی من تێگەیشتوونو تەقدیری ئەو هۆکارانە نەکراوە کە پاڵی پێوە ناوم لە نووسینی ئەو ڕاپۆرتەدا بەو شێوەیە، خوازیارم لەم ڕاپۆرتە دووردێژە نوێیەدا ئەوەی پێویستە بیدات بە دەستەوە. وە ئەوەی وا لەهەڵوێستم بکات فەهم کراوبێت لەسەر حەقیقەتەکەی. خوای گەورە دەزانێت من نەفسی خۆمم بەلاوە گرنگ نەبووە، وە بەم کورت کردنەوەیە مەبەستم دەربازکردنی خۆم نەبووە.

بەڵام من ـکە پێویستە دان بەمەدا بنێم ـ هەوڵم ئەدا لە سەرەتاو پێش لە هەمو شتێکدا، بۆ پاراستنی کۆمەڵێك لەو لاوانەی کە لەم بزاڤەدا کاریان لەگەڵ دەکرد مبپارێزم بەو ڕێژەیەی کە لە تواناما هەبوو، چونکە بڕوام وابوو ئەم کۆمەڵە لاوە چاکترین کەسانێکن کە زەوی هەڵی گرتبن، لەم نەوەیەدا هەر هەمووی، وە توێشون بۆ ئیسلامو مرۆڤایەتی، حەرامە لەناو ببرێنو پەرتەوازە بکرێن، وەمن لە بەرامبەر خوای گەورەدا ـ بەرپرسیارم لەوەی ئەوەی کە لە تواناما هەیە بیبەخشم بۆ ڕزگارکردنیان، وە ئەو ڕونکردنەوە کورتە کە بە دوورودرێژی هەموو شتەکانی نەگرتبووە خۆ، ئەوە هەموو توانایەکی من بوو

[1] بڕوانە پێشەکی هەردوو بلاوکراوەنامەی (لماذا اعدمونی) 3ـ4.

لەم بارودۆخەدا بۆ ئاسانکاری لەسەریان. وە ئەم ئاسانکاریە منیش لەگەڵ ئەواندا دەگرێتەوە، بەڵام خوای گەورە دەزانێت کە خۆمم لە بیردانەبووە.

وەمن لەگەڵ یەکەم ووشەدا بە تەواوی بەرپرسیارێتیم گرتە ئەستۆ، وە وتم: کاتی ئەوە هاتووە کە مرۆڤی موسڵمان سەری پێشکەش بکات لە نرخی ڕاگەیاندنی هەبوونی بزاڤێکی ئیسلامییەو، ڕێکخستنێکی ئاشکرا نەکراودا، کە لە بنەڕەتدا لەسەر ئەو بناغەیە دروست بوو کە بنکەیەك بوو بۆ بونیادنانی پرۆگرامی ئیسلامی، ئەو هۆکارانەی هەرچیەك بێت کە بەکاری دەهێنێت بۆ ئەمە. ئەمەش لە دابو نەریتی پرۆگرامە زەمینیەکاندا تاوانێکە شایستەی لە سێدارەدانە.

پێویستە لەم پێشەکیە کورتەدا ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە پێشکەشکردنی ڕوونکردنەوەی یەکەمم بە کورتی سەبارەت بەم لایەنە، ئەوە ئەرکی خۆم بووە وەك موسڵمانێك، چونکە دیلی موسڵمان بۆی نیە ئاماژە بەو سەربازانەی ئیسلام بکات کە لە داوی ئەوەوەن، وە نابێت سەربازانی ئیسلام و عەوراتیان دەربخات تا لە توانایدا هەبێت.

من بە تێگەیشتنی ئیسلامی خۆم ئەرکی خۆمم بەجێگەیاند، تیایدا هەڵسوکەوتم لەگەڵ خوادا کردووە، بە چاوپۆشین لە تێڕوانینی دەستوورو دەزگا مرۆییەکان.

بەڵام ئێستە من، دوای ئەوەی ڕوونم کردەوە کە ئەم لاوانە دانیان بە درێژەی هەموو ڕۆڵە تایبەتیو گشتیەکاندا ناوە، من بە هیچ شتێك ئاماژەیان بۆ ناکەم، بەڕاستی نارەحەتی لەسەر دڵم ڕەوایەوە، لە باسکردنی هەموو شتێکدا، لەگەڵ هەوڵدان بۆ ڕێککردنی، ڕێککردنێکی زەمەنی بە پێی توانا)[1].

## وتەی کۆتایی بۆ ڕاپۆرتی دووەم

سەید بە وتەیەکی کۆتایی ڕاپۆرتەکەی تەواو کرد، کە تایبەتی کردبوو بە بۆچوونی خۆی بۆ پەیوەندی نێوان حکومەتو نێوان برایانی موسڵمان لە چەند خاڵێکی دیاریکراوی کورتدا:

1ـ ئەو توندوتیژیەی لەساڵی 1954 هەڵسوکەوتی پێکرا لەگەڵ برایاندا بە تەنها ئەوان، ئەوەلەسەر بناغەی ڕووداوی (ئەلمەنشیە) بوو، کە بۆیان هەڵبەسترا بوو، ئەوە بوو ئەو توندوتیژیە کوشتنو برینو ئاوارەکردنو تێکدانی خانووی گرتبووە خۆ.

ئەم توندوتیژیە بیرۆکەی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیکردنی لە ڕێگەی هێزەوەو دروست کرد ئەگەر هاتوو دەستدرێژیەکە دووبارە بوویەوە. ئەگەر ئێمە بمانزانیایە کە ڕاپێچکردنەکە تەنها ڕاپێچکردنەو بەس، وە بە دادگاکردنێکی دادپەروەرانە کۆتای دێت، لەگەڵ سزای قانونیدا ـ تەنانەت لەسەر بنچینەی یاسا مرۆییە کارپێکراوەکانیش ـ ئەوا هیچ کەس لە برایان بیری لە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی نەدەکردەوە لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە.

من دەزانم کە لێرەداو ئێستە دان نان بەم ڕاستیەدا هیچ بەهایەکی کرداری نیە، بەڵام ئەم دانپیانانە ڕاستیەکە پێویستە لە دوا وشەکاندا تۆماری بکەم.

2ـ ئەوەی کە گومانی تیا نیە ئەوەیە، کە لێدانی بزووتنەوەی برایانی موسڵمان ـ وە بزوتنەوە ئیسلامیە هاوشێوەکان ـ لە ناوچەکەدا، ئامانجێکی زایۆنی و خاچپەرستیو ئیستیعمارییە. وە ئەوە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی لەناوبردنی بیروباوەڕو ئەخلاق لەناوچەکەدا، وە بە دڵنیاییەوە تواناو پلانی بەردەوام دەخرێتە کار بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە. وە ئەگەر بهاتایەو لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ برایانی موسڵماندا شێوازێکی تر بگیرایەتە بەر، جگە لەوەی کە ڕوویدا ـ چ لە ساڵی 1954 یان لەم جارەدا ـ ئەوا دەتوانرا پیلانە زایۆنیو خاچپەرستیو ئیستعیماریەکان لە ناوچەکەدا لە جیاتی لێدانو لەناوبردنی بزاڤی ئیسلامی لەناوبرایە.

[1] لماذا اعدموني 7- 8.

3ـ بە دوای لێدانی برایاندا لە ساڵی 1954 شەپۆلێك لە لێكهەڵوەشانەوەی ئەخلاقی و ئاراستەی بێباوەڕی بەدواداهات، وە بەم لێدانەی ئێستەبەهێزتر دەبێت، جگە لە خوا هیچ کەس مەوداکەی نازانێت.

جا ئەم داڕووخانە لەبەرژەوەندی کێیە؟ بەدڵنیاییەوە، کە لە بەرژەوەندی ئەم ولاتە نیە، تەنانەت لەبەرژەوەندەی ڕژێمی فەرمانڕەواش نیە.

ئەگەرچی گوێکانی ئێستە ئامادەی بیستنی ئەم قسانە نین، بەلام ئەرکی من گەیاندنیانە، لەگەڵ لابردنی لە ئەستۆی خۆم بە دەربڕینیان.

4ـ چەند جار بیستوومە: ئایا بە تەنها ئێوە موسڵمانن؟ ئایا کۆنگرەی ئیسلامیتان بەس نیە. وە بەرنامەی (نور علی نور) و مزگەوتەکان کە نوێژیان تێدا دەکرێت و ئەو خەڵکەی دەچن بۆ حەج بەستان نیە؟

پێویست دەکات ئەوە دەربڕم کە ئیسلام شتێکی گەورەترە لە هەموو ئەمانە. ئیسلام پرۆگرامی ژیانە بە تەواوی، ئەمەش بە پەروەردەو پێگەیاندنی لاوان نەبێت نایەتەدی، بە فەرمانڕەواکردنی شەریعەتی خوا نەبێت نایەتەدی. بزاڤی برایانی موسڵمان، سەرکەوتووترین ئەزموونە بۆ پەروەردەو پێگەیاندن، هەر هەڵەیەك لە ڕێگەدا نابێتە بیانووی لێدان و لەناوبردنی، بە تایبەتی ئەگەر هەڵەکە لەوەوە نەبوو، بەڵکو لەبەرەنجامی هەڵە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا ڕوویدا بوو.

من ویستم لە ساڵی 1952دا هەستم بە ئەزموونێکی بە وشێوەیە لە (**هيئة الشباب التحرير**)دا و ئاڕاستەکە لە سەرەتای کارەکەوە لەگەڵ مندا بوو، بەلام لە کۆتاییدا ئاراستەی (**جمعية الفلاح الامريكية**) سەرکەوت، و بەرژەوەندی خوازەکان پەرشو بلاوبوونەوە، ئەوانەی دەیانویست (**هيئة** التحرير) بەو شێوەیە بێت کە پێی هاتۆتە بوون، کە دژی هەموو ئەوانە بوو کە ئێمە سەبارەت بەو مەسەلەیە لەسەری ڕێکەوتبووین، ئیتر بزاڤی برایان مایەوە، ئەو بە تەنها هەستا بەم ئەرکە. ئیسلام بەرقەرار نابێتو نایەتەدی لە ولاتێکدا کە جووڵەی پەروەردەکردنی تێدا نەبێت، لە پاشاندا دروست بوونی یاسای ئیسلامی کە لە کۆتایدا حوکم بە شەریعەتی خوا بکات، ئەمانە لە کۆتایدا وتەکانی پیاوێکن کە ڕووی کردۆتە ڕەزامەندی خوا، ویژدانی خۆی پێ پاك دەکاتەوە و بانگەوازی پێ دەگەیەنێت تا کۆتا چرکە. والسلام علی من اتبع الهدی.

زیندانی جەنگی 22ی تشرینی یەکەمی 1965.[1]

## سەلاح نەسار لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەید قوتب دەکات

سەرۆکی نوێنەرایەتی ئەمنی دەوڵەت لەو ماوە تاریکە پڕ لە ستەمەی مێژووی میسردا سەلاح نەسار بوو، (تەنها بە گەشتنی یەکەم بەلاغ بۆ جێگری گشتی لە ڕۆژی 3ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1965 دا سەلاح نەساری سەرۆکی نوێنەرایەتی ئەمنی دەوڵەت نووسینگەکەی خۆی لە بینایەی سەرای نوێنەرایەتیەوە لە دادگای باب ئەلخلق گواستەوە بۆ ناو زیندانی جەنگی، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمە پێچەوانەی یاسای (الإجراءات الجنائية)یە. بەلام سەلاح نەسار بە تەنها بە دوای دەقی فێرعەوندا دەسوڕایەوە).[2]

سەلاح نەساری سەرۆکی نوێنەرایەتی خۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کەسایەتیە سەرکردە گرنگەکان لە ڕێکخستنی برایان گرتە ئەستۆ، لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ برایانی تردا سپارد بە یاریدەدەرەکانی لە کارپێسپێراوەکانی نوێنەرایەتی.

لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو کە خۆی لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەرکردەی ڕێکخستن سەید قوتبدا بکات. سەید بەندکراوی زیندانێکی تاکە کەسی بوو لە زیندانی جەنگی، لە کاتی ڕاپێچکردنیەوە لە 1965/8/9ەوە بۆ ماوەی سەد و سی ڕۆژ هاتنە دەرەوەی لەو زیندانەدا لێ قەدەغە کرا.

سەلاح نەسار، لە ئێوارەی ڕۆژی یەکشەمە 1965/12/19 لەگەڵ سەید دەستی بە لێکۆڵینەوەکەی کرد و، لێکۆلینەوە لەگەڵ سەید بۆ ماوەی سێ ڕۆژی دوایەك بەردەوام بوو:

[1] لماذا اعدموني 91ـ 94 بە کورتکراوە.

[2] الموتى يتكلمون 110.

یەکشەممە 1965/12/19 لە کاتژمێر شەش‌و نیوەی ئێوارە تا دەو نیو.[1]
دووشەممە 1965/12/20 لە کاتژمێر سێی ئێوارە تا یانزەی شەو.[2]
سێشەممە 1965/12/21 لە کاتژمێر یەکی ئێوارەوە.[3]

## چەند برگەیەك لە کۆنوسی لێکۆڵینەوەکە

سەید قوتب لە لێکۆڵینەوەدا بێپێچوپەناو ڕاستگۆو بوێرو ئازا بوو، وەڵامی پرسیارەکانی سەلاح نەساری بەوپەڕی ڕاستگۆیی‌و سەراحەت‌و بوێری‌و ئازایەتیەوە ئەدایەوە، بەبێ ترس‌و ترسنۆکی یان ساختەو درۆکردن، کە ئەمەش بە درێژایی ژیانی ڕەفتاری خۆی بووە لە هەڵوێستەکانیدا لەگەڵ خۆشەویستان‌و دوژمنانیدا –ڕەحمەتی خوای لێبێت–.

لێرەدا هەندێك برگە لە کۆنووسی لێکۆڵینەوەکە پێشکەش دەکەین، کە سامی جەوهەر بە ڕەحمەت بێت، لە کتێبەکەیدا (**الموتي يتكلمون**) تۆمارو بڵاوی کردۆتەوە.

کۆنووسی ڕۆژی یەکشەممە 1965/12/19 لە سەعات شەش‌و نیوی سەر لە ئێوارە لە زیندانی جەنگیدا کرایەوە.

**ئێمە:** سەلاح نەسار ـ سەرۆکی نوێنەرایەتی.

مستەفا ئەلعەسال ـ سکرتێری لێکۆڵینەوە

ئەوەبوو سەید قوتیان بەمەی خوارەوە بانگ کردو وتی:

**ناوم:** سەید قوتب ئیبراهیم

تەمەن: شەست ساڵ

نووسەر

لەدایکبوو لە ماڵێك لە مەڵبەندی ئاسیوت

دانیشتووی حەلوان: (44) شەقامی حەیدەر.

**پرسیاری یەکەم:** قسەت چیە لەوەدا کە دراوەتە پاڵت؟

سەید وەڵامێکی دووروودرێژی دایەوە کە زیاتر لە دە لاپەڕەی برد، تیایدا بە درێژی چیرۆکی خۆی لەگەڵ ڕێکخستنی نوێی برایاندا باس کرد.

**پرسیار:** ئایا خۆت نامەکانت لەناو زینداندا تەحریر دەکرد؟

**وەڵام:** بەڵێ، تەحریری هەندێك نامەم کرد تیایدا شیکردنەوەی هەندێ ڕاوبۆچوونی ئیسلامی هەبوو، فیکرەی بنچینەیی تیایدا بریتی بوو لە بنەماکانی عەقیدە، لەوانە: حاکمیەت لە بیروباوەڕەوەیە نەك بە تەنها لە ڕێکخستنەوە. . –وە ئەتوانم بڵێم– ئەو فیکرانەی کە لە نامەکاندا هەبوون فراوان بوون، بوونە بیرۆکەی کتێبی (**معالم في الطريق**)!

**پرسیار:** ئایا حەسەن ئەلهوزەیبی ئاگاداربوو بەسەر نامەکانتا پێش دەرچوونت لە زیندان؟

**وەڵام:** گومان دەبەم لە ڕێگەی ماڵەوەی بەسەریاندا ئاگادار بووبێت.

**پرسیار:** ئایا دوای دەرچوونت لە زیندان چاوت بە حەسەن ئەلهوزەیبی کەوت؟

**وەڵام:** بەڵێ، سێ جار لە ماڵی خۆماندا، جگە لە من‌و ئەو کەسی تر ئامادە نەبوو.

**پرسیار:** هەندێك لە تۆمەتباران دانیان بەوەدا ناوە، ئێستەش ئەوان حەسەن ئەلهوزەیبی بە ڕابەر دەزانن، ئەی ڕای تۆ چیە لەم بارەیەوە؟

---

[1] بڕوانە کۆنووزسی ئەو ڕۆژە کە (الموتى يتكلمون) 112 ـ 119.
[2] بڕوانە کۆنووسی لێکۆڵینەوە لە ڕۆژی دووەمدا: 120 ـ 131.
[3] بڕوانە کۆنووسی لێکۆڵینەوە لە ڕۆژی سێیەمدا: 131 ـ 146.

وەڵام: ڕاستی بارودۆخەکە بۆ کۆمەڵی برایانی موسڵمان ئەوەیە ئەوان هەستکردنێکی گشتی هەست بەوەدەکەن -دەری ببڕن یان دەری نەبڕن ـ کە ئەو بارودۆخەی پێش هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایان لە ئارادابوو ئێستەش هەر لە ئارادایە، ئەگەر چی هیچ شێوەیەکی جێبەجێکردن یان حەرەکی وەرنەگرتبێت، چاوەڕێ بۆ هەر بارودۆخێك ڕێگە بدات بە گەڕانەوەی کۆمەڵی برایان بۆ بوونی ئاشکرا، ئەمە هەستێکی دەروونی ناودڵەو لە دەرونیاندا هەیە، هەروەها لە دەروونی منیشدا بە شەخسی هەیە، لەوەی تیایدا تایبەتە بە ئەگەری گەڕانەوەی کۆمەڵەکە بۆ بوونی ئاشکرا، بەڵام لەگەڵ پرۆگرامی تایبەتی خۆمدا لە گێڕانەوەی پێگەیاندنی تاکی پەروەردەکراوو ڕۆشنبیردا. .

من خۆم بۆ حەسەن ئەلهوزەیبی وا دەبینم، کە ئەو تا ئێستەش خاوەنی بارودۆخە تایبەتیەکەی خۆیەتی وەك ڕابەر بۆ کۆمەڵ!

**پرسیار:** پاڵپشتی کردنی دارایی ئەم ڕێکخستنە لە دەرەوەیە؟ واتە لە برایان لە سعودیەو شوێنی ترەوە؟

وەڵام: بەڵێ لە دەرەوە بوو، بەڵام لە هەستی ئێمەدا ئیعتبارێکی گشتی هەیە، ئەویش ئەوەیە هەر برایەك لە هەر وڵاتێکدا بێت لەسەر بنچینەی بیروباوەڕو فیکرە پەیوەستە بە ئێمەوە، نەك لەسەر بنچینەی هەرێمگەرایی. . کاتێك ناوی **برایان** دەبرێت پرسیار ناکەین لە ڕەگەزەکانیان لە ڕووی هەرێمەوە!!

**پرسیار:** ئایا ئەو پەیوەندیەی بڕیاری هەبوونی دەدەیت لە نێو برایانی موسڵماندا بە ڕەگەزە جیاوازەکانیانەوە، لەگەڵ نیشتمانپەروەریدا دەگونجێت ؟

وەڵام: من وادەبینم پەیوەندی بیروباوەڕ گەورەترو دامەزراوترە لە پەیوەندی هاووڵاتی بوونی هەرێمایەتی، ئەم جیاوازی کردنە لە ناو موسڵماناندا لەسەر بنچینەی هەرێمایەتی کاریگەریەکە لە کاریگەریەکانی ئیستعماری خاچپەرستیو زایۆنی، پێویستە بڕوات و نەمێنێت!!

**پرسیار:** بەڵام بڕیارت داوە کە ئەو پەیوەندییەی لە ئاستی نیشتمانپەروەری بەرز دەکاتەوە بریتیە لە پەیوەندیکردن بە کۆمەڵی برایانی موسڵمانەوە، نەك ئیسلام؟

وەڵام: سیفەتی ئاشکرا لە برایاندا بریتیە لە سیفەتی ئیسلام ـ بە بیروباوەڕی من ـ!

**پرسیار:** ئایا جیاوازی دەبینی لە نێوان موسڵمانێکدا کە پەیوەندی کردبێت بە کۆمەڵی برایانەوە، لەگەڵ کەسێك کە پەیوەندی بەو کۆمەڵەیەوە نەبێت؟

وەڵام: ئەوەی برایان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە لە جێبەجێکردنی ئیسلامدا پرۆگرامێکی دیاریکراویان هەیە ، بەمە ئەوان لە دیدی مندا لە پێش ئەوانەوەن کە پرۆگرامێکی دیاریکراویان نیە.

**پرسیار:** ئایا بڕوات وایە هەرکەسێك پەیوەندی کردبێت بە کۆمەڵی برایانەوە، ئەوە لە پێناوی خوادا کاردەکاتو هیچ مەبەستێکی تری نیە ؟

وەڵام: من وای دەبینم کە **پەند** لە کۆمەڵدا، بە نەخشەکانی کۆمەڵو ئامانجەکانیو پرۆگرامەکانیەوەیەتی، ئەگەر تیایدا ئەندامانێك ببینرێن کە لە ئاستی کۆمەڵەکەدا نەبن، ئەو هەڵەکان لە خۆیانەوەیە.

**پرسیار:** کەواتە ئیتر جیاوازیکردن لە نێوان ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیەو موسڵمانان بە گشتیدا بۆچی، لە کاتێکدا ئەوانیش هەموویان خاوەنی عەقیدەو ئامانجو پرۆگرامن؟

وەڵام: جیاوازی لە ڕای مندا، جیاوازی تاکێك نیە بەسەر تاکێکی تردا، بە تەنها بەو پێیەی کە کۆمەڵەکە خاوەنی پرۆگرامە، هەر ئەندامێك تیایدا پەیوەستە بەو پرۆگرامەوە.

**پرسیار:** ئایا وادەبینی کە سەعید ڕەمەزانو کامیل شەریفو فەتحی هیلالو ئوسامە عەلامو عشماوی سلێمان ـ کە ڕاکردووەکانی کۆمەڵی برایانن ـ پشتگیری ئەندامانی ئەم ڕێکخستنە بەماڵو چەك دەکەن، بۆ سەرخستنی ئیسلام؟

وەڵام: داوای لێبوردن دەکەم لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە!

**پرسیار:** ڕێگە چیە بۆ گەشتنە ئامانجی کۆتایی، ئەو ئامانجە چیە بەو شێوەیەی ئێوە دەیبینن؟

**وەڵام:** ئەو ئامانجە کۆتاییەی لەسەری ڕێکەوتووین، ئەوەیە کە یاسای ئیسلامی بەرقەرار بێت، حوکم بە پڕۆگرامی خوا بکات، نەك بە یاسا وەزعیەکان، ڕێگەش بریتیە لە پەروەردەی ئیسلامی درێژخایەن لە چوارچێوەیەکی فراواندا!

**پرسیار:** ئایا ڕێکخستن نهێنی بوو یان ئاشکرا؟

**وەڵام:** نهێنی بوو.

**پرسیار:** مەبەست چیبوو لەوەدا کە نهێنی بوو ئەگەر ئامانج پەروەردەیەکی ئایینی ڕەوشتیە؟

**وەڵام:** ئێمە بڕوایەکمان هەیە، هەڵمان گۆزیوە لە هەموو ئەزموونەکانی ڕابردوو، لە شارەزاییمان بە نەخشە خاچپەرستیو زایۆنیو شیوعیەکان لە ناوچەکەدا بۆ دژایەتیکردنو ڕێگرتن لە هەر پەروەردەیەکی ئیسلامی حەرەکی، کە ئامانجی جێبەجێکردنی ئەم جۆرە ئامانجە بێت، لەگەڵ بەرقەرارکردنی فەرمانڕەوایی ئیسلامیدا!

**پرسیار:** ئایا ئێوە وا دەبینن کە بوونی ئوممەتی ئیسلامی(**الامة الاسلامية**) لە ماوەیەکی دوورو درێژەوە دابڕاوە، پێویستە بگێڕرێتەوە بۆ بوون؟

**وەڵام:** پێویستە لێکدانەوەی واتای (**الامة الاسلامية**) ئەوەی من مەبەستمە بکرێت، ئوممەتی ئیسلامی ئەوەیە کە شەریعەتی خواو پڕۆگرامەکەی فەرمانڕەوایی هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی تاكو کۆمەڵ، سیاسییو کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕەوشتی بکات، ئەو ئوممەتە بەم وەسفە ئێستە لە میسردا نیە، لە هیچ شوێنێکی تری زەویدا نیە! ئەگەر چی ئەمە ڕێناگرێ لە بوونی تاکە موسڵمانەکان، چونکە لەوەدا پەیوەندی بە تاکەوە هەیە فەرمانڕەوایی کردنە بۆعەقیدەو بۆ ڕەوشتی، لەوەشدا کە پەیوەندی بە ئوممەتەوە هەیە، فەرمانڕەوایی کردنە بۆ پڕۆگرامی ژیانی بە تەواوی!

**پرسیار:** ئایا وا دەبینی کە ڕژێمی فەرمانڕەوا لە وڵاتدا ڕژێمی نەفامیە؟

**وەڵام:** وادەبینم کە ڕژێمێکی نا ئیسلامیە!

**پرسیار:** ئایا وا دەبینێت کە کۆمەڵگای نەفامیو کۆمەڵگای نا ئیسلامی بونی هەبێت؟

**وەڵام:** نەخێر، من نابینم کە کۆمەڵگا نائیسلامیەکان هەبن، بەڵکو کۆمەڵگا یان نەفامیە یان ئیسلامی!

**پرسیار:** ڕات چیە لە ڕژێمی فەرمانڕەوا، لەسەر ئەم ڕووناکیەوە؟

**وەڵام:** من وای دەبینم ڕژێمێکی نەفامیە!

**پرسیار:** ئەمە واتای ئەوەیە تۆ گۆڕینی ڕژێمی فەرمانڕەوای دەسەڵاتدار بە پێویست دەزانیت؟

**وەڵام:** وا دەبینم لەدوای بەرقەرابوونی بناغەکانی دروستبوونی ڕژێمێکی ئیسلامی بگۆڕێت،!

**پرسیار:** واتای (**طاغوت**) چیە، لەوەدا کە بۆی چوویت؟

**وەڵام:** تاغوت لە بۆچوونی مندا: هەموو شەریعەتێکە جگە لە شەریعەتی خوا!

**پرسیار:** ئەی ڕات چیە لە نیشتمانپەوەری؟ ئایا دانی پیادەنێیت یا بەرەنگاری دەکەیت؟

**وەڵام:** ڕام ئەوەیە کە نیشتمانپەروەری پێویستە بریتی بێت لە عەقیدە نەك زەوی، پێویستە واتاکەی ئێستەی بگۆڕێت ـ کە هەرێم چێتیە ـ بۆ ئەم تێگەیشتنە فراوانە!

**پرسیار:** ئەی ڕات چیە لە نەتەوایەتی؟

**وەڵام:** ڕام تیایدا ئەوەیە کە ئەوە بەیداخێك بوو، کاتی مێژووییو جیهانی بەسەرچووە، جیهانی ئەمڕۆ ڕووەو پێکهاتە مەزهەبیەکان دەڕوات، کە لەسەر بناغەی فیکرەو عەقیدە دروست دەبێت، ئاڕاستە بۆ نەتەوایەتی ئیسلامی لەگەڵ سروشتی ئەم چەرخەی کە تیادا دەژین و، شێوازی بیرکردنەوەی هاوچەرخدا زیاتر دەگونجێت، وەك لە بیرۆکەی نەتەوەیی-بەتەنها -!. . . . . . . . . . . . . .

**پرسیار:** ئەی مانای دەستەواژەی (**الحاكمية لله**) چیە لە بیری تۆدا؟

**وەڵام:** ئەوەیە کە شەریعەتی خوا بناغەی یاسادانان بێت.

**پرسیار:** چ کاتێك بانگ دەکرێت بەم دەستەواژەیە ئەگەر بزانیت؟

وەڵام: ئەمە دەربڕینێکە من خۆم هەڵم گۆزیوە لە لێکۆڵینەوەمەوە بۆ ئیسلام.

**پرسیار:** ئایا نازانی ئەمە وتەیەکە خەوارج لە کۆندا وتوویانە، ئیمام عەلی دەربارەی وتوویەتی: **(كلمة الحق اريد بها باطل)**؟

**وەڵام:** من لەو مێژووەدا بیری جێگەکەیم ناکەوێتەوە ، من مەبەستم ئەوە نەبووە لە کاتێکدا بەکارم هێناوە، بەڵکو من مەبەستم ئەوەیە کە شەریعەتی خوا بریتی بێت لە بناغەی یاسادانان، بەو پێیە کە خوای گەورە ـ جل جلاله ـ بە زاتی خۆی دانابەزێت بۆ حوکم کردن، بەڵکو شەریعەتەکەی ناردووە تا حوکمی پێبکرێت، ئەوا حاکمیەتی خوای گەورە لە ڕێگەی فەرمانڕەوایی کردنی شەریعەتەکەیەوە دێتە دی، هەروەك دەقە قورئانیەکان بە دەربڕینەکانی ئەمە دەڵێت!

**پرسیار:** ئایا ئەم بیروبۆچوونانەت لە دانراوەکانی ئەبی ئەعلای مەودودیەوە نەگواستۆتەوە؟

**وەڵام:** من سودم لە کتێبەکانی ئەوو جگە لە کتێبەکانی ئەویش وەرگرتووە لە کاتی لێکۆڵینەوەمدا بۆ ئیسلام.

**پرسیار:** ئەی جیاوازیی چیە لە نێوان ئەوەی تۆ بانگی بۆ ئەوەی دەکەیتو ئەوەی مەودودی بانگی بۆ کردووە؟

**وەڵام:** جیاوازیی نیە.

**پرسیار:** ئەی مەبەست چیە لە چەکدارکردنی ڕێکخستنو مەشق پێکردنی ئەندامەکانی لەسەر ئیشوکاری سەربازی؟

**وەڵام:** بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی ئەگەر کرایە سەری.

**پرسیار:** ئەو دەستدرێژیە چیە کە مەبەستە؟ لە لایەن کێوە دەکرێت؟

**وەڵام:** وێنەی دەستدرێژیی لە بۆچوونی مندا بریتیە لە: ڕاپێچکردن بۆ ئەشکەنجەدانو کوشتن، ڕوودانی دەستدرێژیی جۆراوجۆر پێش لێکۆڵینەوەو فەرمان بەسەردا دەرکردن، هەروەك بە واقعی لە ساڵی 1954دا ڕوویدا.

**پرسیار:** ئایا لەمەوە واتێ دەگەم کە ئێوە بریاری ڕووبەڕوونەوەی هێزەکانی حکومەتتان داوە، لە کاتی دەرکەوتنی ڕێکخستنەکەتاندا؟

**وەڵام:** ئەو هێزو دەسەڵاتانەی پەیوەست نابن بە هیچ یاسایەکەوە، ئەوانە دەسەڵاتی ڕەسمی نین، ڕوبەڕوبونەوەیان بە ڕوبەڕوبونەوەی دەسەڵاتی ڕەسمی ناژمێرێت.

**پرسیار:** ئایا نازانیت کە لە دروستبوونی ئەم ڕێکخستنەدا سەرپێچی یاسایی تێدایە؟ خۆتو کۆمەڵەکەت ڕووبەڕووی چەکی حکومەت دەکاتەوە؟

**وەڵام:** دەزانم کە ئەوە پێچەوانەی یاسایە، بەڵام من پێویستی زۆرم پێیەتی، بەو ئیعتیبارەی کە هۆکارێکی سەرکەوتووە بۆ پەروەردەی ئیسلامی، ئەگەر چی یاساش یاساغی بکات!

**پرسیار:** جا چۆن سەرپێچی یاساوئەنجامدانی تاوان دەکرێتە هۆکاری پەروەردە؟ ئایا شەریعەتی ئیسلام بەمە ڕازیە؟ لەکاتێکدا دینی ڕەسمی دەوڵەت بریتیە لە ئیسلام؟

**وەڵام:** ئەگەر یاسا قەدەغەی بکات موسڵمان هەستێ بە ئەرکە ئاینیەکەی لە ڕێنمومایی کەسانی تردا، ئەوە عەیبو عاری یاسا خۆیەتی بە هۆی سەرپێچی کردنیەوە بۆ بنەمایەکی ئاینی!!

**پرسیار:** ئایا دەبینیت لە یاسا بەرقەرارەکاندا شتێکی تیا بێت موسڵمان قەدەغە بکات لەهەستانی بە ئەرکە ئاینیەکانیو ڕێنمومایی کردنی خەڵکی؟

**وەڵام:** من وا دەبینم کە لە بریاری تایبەت بە قەدەغەکردنی چالاکیی ئاشکرا لە کۆمەڵی برایانی موسڵماندا، کە ئەو ئەرکە ئایینیەکان جێبەجێ دەکات، سەرپێچیەکە بۆ فەرمانێك لە فەرمانەکانی ئایین.

**پرسیار:** ئەی هۆی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایانی موسڵمان چی بوو؟ ئایا بەهۆی ئەوەوەبووکەبە چالاکیی ئایینی هەڵدەسێت؟

**وەڵام:** من ئەوە پەسەند دەکەم!

**پرسیار:** ئەی ئەو بارودۆخە مێژوویە کە دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکە دەیزانێت ؟

وەڵام: من دەزانم کە کۆمەڵەکە بە بڕیارێکی حکومی هەڵوەشێنرایەوە، ئەو لایەنە نازانم کە بڕیارەکەی دەرکرد، دەقی ئەو یاسایەش نازانم کە بەسەریدا دەچەسپێ، من بڕوام وایە کە بە هۆی چالاکیی ئاینیەوە هەڵوەشێنرایەوە، بە هۆی ئەوەی کە بزاڤێکی ئیسلامی بوو، هێزە دژ بە ئیسلامیەکان خاوەنی قورسایین لە دیاری کردنی بارودۆخە جۆراوجۆرەکاندا، بە هۆی فڕوفێڵەکانیانەوە توانیان پێکدادان لە نێوان شۆڕش‌و کۆمەڵی برایاندا دروست بکەن.

**پرسیار:** بەڵام کۆمەڵی برایان بە هۆی ڕێکخستنە نهێنیە ئیرهابیەکەیەوە هەڵوەشێنرایەوە ؟

**وەڵام:** ئەوەی کە دەیزانم ئەوەیە کە کۆمەڵی برایان ڕێکخستنی نهێنی هەیە، لەسەر ئەوەی من دەیزانم ئەوە هۆی ڕاستەوخۆ نەبووە لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکەدا، بەڵکو هۆکەی بریتی بووە لە فڕوفێڵە دەرەکیەکان کە پیلانیان گێڕاوە، ئەمەش سەری کێشا بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە!

پرسیار: ئایا وا دەبینیت کە دەگونجێت دەوڵەت ڕێگە بدات بە دروستبوونی کۆمەڵەیەك کەخاوەنی ڕێکخستنێکی نهێنی چەکداربێت لەناو دەوڵەتدا ؟

وەڵام: بێگومان دەوڵەت ڕازی نابێت، بەڵام لەتوانادا بوو کە ئەم ڕێکخستنە نهێنیە بە ڕەزامەند بوون هەڵبوەشێنرایەتەوە، کۆمەڵەی برایان بهێڵرایەتەوە وەك بزاڤێکی ئاشکرا.

**پرسیار:** ئەی ئایا وادەبینی کە کۆمەڵی برایان بە تەنها ئەو هەستاوە بە ئیشو کارەکانی ئاینی ئیسلام بە گشتی، بە شێوەیەك ئەگەر دەوڵەت چالاکی لێ قەدەغە بکات ئەوە موسڵمانی قەدەغە کردووە لە هەستان بە ئەرکە ئاینیەکانی ؟

وەڵام: من وادەبینم کە بزاڤی برایانی موسڵمان سەرکەوتووترین ئەزموون بووە لە ماوەی چوار سەدەی دواییدا، لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا، لە ناوبردنی بە هۆی چەند هەڵەیەکی لاوەکیەوە کە من دەزانم ئەوانە هەڵەن، بێگومان لە ناوبردنی گەورەترین دەرفەتە لە جێبەجێکردنی ئەم دینەدا، لە پێناوی ئەمەدا من وام دەبینی کە جیاکردنەوەی جوڵە ئیسلامیەکەی لە مەسەلەی ڕێکخستنی نهێنی نەگونجاوە !

**پرسیار:** سەرکردەکانی ڕێکخستن دانیان بەوەدا ناوە کە وات تێگەیاندون کە ئەوان بریتین لە **(الامة المؤمنة)** لە نێوەندی کۆمەڵگایەکی نەفامیدا، هیچ پەیوەندیەك نایان بەستێـەوە بە دەوڵەت‌و کۆمەڵگاو بە ڕژێمی حوکمی دەسەڵاتدارەوە، ئەوان وەك ئوممەتێکی موسڵمان لەسەریانە کە خۆیان وا دابنێن لە حاڵەتی جەنگدان لەگەڵ دەوڵەتدا، بۆچی وڵاتت بۆ ناوناون بەوەی کە (دار الحرب)ە، بەپێی دەستەواژەی ئیسلامی، لە سەر ئەمە ئەوە بونیاد دەنرێ کە هەرکردارێکی کوشتن‌و کاولکاری نە زیانی هەیەو نە سزای لەسەرە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پاداشتی تێدایە ؟

**وەڵام:** لەم تێگەیشتنەدا هەڵەی زۆر هەیە، ئەوان:

یەکەم: تەنها نەوەیەکن، پەروەردە دەکرێن‌و پێ دەگەیەنرێن، تا لە ئاستی پێشەنگی بڕواداراندابن، ئەمە لە نێوان من‌و ئەواندا بە ڕوون‌و ئاشکرایی مەفهوم بووە.

دووەم: پەیوەندیی ئوممەتی مسوڵمانان بە (دار الحرب)و (دار السلام)ەوە، قسە کردن تیایدا وەك ئەحکامی نەزەری بووە، بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمەکان لەناو خۆیدا، نەك لەبەر ئەوەی لەم کاتەی ئێستەدا بەسەر یەکێکدا چەسپاوە، چونکە پێشتر دان بەوەدا نراوە کە بوونی ئوممەتی موسڵمان فەرمانێکە لە فەرمانەکانی داهاتوو، کەچالاکیی‌و جوڵەکان دەکەونە خزمەتی هێنانەدی ئەو فەرمانەوە.

ئەوانە ئەو تێگەیشتنانە بوون کە من دەمویست تێی بگەن! بەڵام ـ بە داخەوە ـ هەڵە لە من تێگەیشتن وەك ئێستە دەبینم!!

**پرسیار:** چۆن دەبێت ئەوان هەڵەیان کردبێت لە تێگەیشتندا، بە تایبەتی یەکێکیان دانی بەوەدا نا ـ عەلی عشماوی بوو ـ کە ئەو لە کاتی قسەکردندادەربارەی کوشتن، موناقەشەی کردویت لە کوشتنی مسوڵماناندا لەگەڵ وتنی (لا اله الا الله)دا، دەربارەی فەرموودەکان لەم بارەیەوە نەفی ئەوەت کردووە کە هەرکەسێك وتی (لا اله الا الله) کوشتنی حەرام بێت، تۆ ڕوخسەتت پێداون بە کوشتنی موسڵمان؟

وەڵام: من ئەم موناقەشەیەم بە بیر نایەت، ئەگەر روویدا بێت ئەوە بێگومان دەبێت لە حاڵەتی پارێزگاریی لە نەفسەدا بووبێت، لەم بارەدا دەستدرێژیکەر ئەو کە کەسەیە کە تاوانی دەکەوێتە سەر، نەك ئەوەی بەرپەرچ دەداتەوە!

پرسیار: ئەی ئەو مەرجانە چیە کە پێویستە هەبن بۆ پارێزگاری کردن لە موسڵمانان بەپێی شەرع، تا رێپێدراوبێت بۆ موسڵمان برا موسڵمانەکەی بکوژێت ؟

وەڵام: ئەگەر دەستدرێژی بکرێتە سەرم ـ یان هەوڵی دەستدرێژی بدرێت ـ لە کاتێکدا من هەڵدەستم بە کارێك کە زیانبەخش نیە، یانهەڵدەستم بە چالاکیەکی ئاسایی!

پرسیار: ئەی ئایا وا دەبینیت کە لە بەکارهێنانی فەرمانڕەوادا بۆ بڕیارە شەرعیو یاساییەکان دەستدرێژی هەبێت کە لەگەڵیدا رێگە بە کوشتنو گێرەشێوێنی بدرێت ؟

وەڵام: بەم بەربەستانەوە ـ بە بەرستی بەکارهێنانی بۆ بڕیارە شەرعیو یاسایەکانی ـ ڕەوا نیە، بەڵام لە دەستدرێژی کردنیدا لەدەرەوەی هەموو یاساکان، تا کەوێتە سنووری بڕیارە شەرعیو یاسایەکانیەوە!!

پرسیار: ئایا لە دروستبوونی رێکخستنێکی نهێنی چەکدار لە نێوان موسڵماناندا نابینیت شتێك هەبێت ببێتە هۆی ئاشوبە، کە ئاینی ئیسلامی نەیەوێتو دژایەتیشی بکات؟

وەڵام: بێگومان ئەبێتە هۆی ئاشوبە، بەڵام ئەوەی کە تاوانی ئاشووبەکەی دەکەوێتە سەر، ئەوەیە کە چالاکی ئاشکرا یاساغ دەکات، خەڵکیش ناچار دەبن پەنا بەرنە بەر چالاکی نهێنی، کە دەکرێت بە رێپێدانی چالاکی ئاشکرا رزگار بکرێت.

پرسیار: ئایا ئاینە ئیسلامیەکەت بەرگریت لێ ناکات لە ئاشووبەیەك لە پێش رووودانیدا، کە دوورکەویتەوە لە بەهێزکەرەکانی ئەو رووداوو ئاشووبەیە ؟

وەڵام: زەرورەتی هەستان بە ئەرکی دینی فەرزکراوە، بەڵام ئاشوبە گریمانەیە، لەسەرمە کە هەستم بە ئەرکی ئاینیم، ئەگەر گریمانەکە روویدا ـ واتە ئاشووبەکە ـ ئەوە تاوانەکەی لەسەر ئەوەیە کە ناچاری کردووم بۆ کارکردن بەنهێنی، نەك لەسەرمن.

پرسیار: ئەی ئەو دژایەتیە هەبوانە چیە لە نێوان رژێمی فەرمانڕەوای دەسەڵاتدارو ئەو رژێمەی کە تۆ دەیبینیو لە پێناویدا هەوڵ دەدەی؟

وەڵام: لە بارودۆخی ئێستەدا شەریعەتی خوا بناغەو بنچینەی یاسادانان نیە، پێویستە کە شەریعەتی ئیسلام بریتی بێت لە بناغەو بنچینەی یاسادانان، ئەمە ئەو دژایەتیە بنەڕەتیەیە لە ڕای مندا، کە لێوەی هەموو دژایەتیە لاوەکیەکان سەرهەڵدەدەن!

پرسیار: عەلی عشماوی دانی بەوەدا ناوە کە ئامانج لەوەدا کە تۆ دەیبینیت، وەلە هەستان بەو کارانە، بریتیە لە گۆڕینی فەرمانڕەوای دەسەڵاتدار لە رێگەی هێزەوەو رووخاندنی رژێمی فەرمانڕەوا لە وڵاتدا؟

وەڵام: من بەداخەوەم کە بڵێم، ئەمە بە تەواوی ئاراستەی من نیە، ئەوە نیە کە من بۆم شی کردۆتەوە!!

پرسیار: ئەی بۆچی لەگەڵ ڕاپێچکردنتدا دەسەڵاتدارانت ئاگادار نەکردەوە لە ئیشو کاری ئەم رێکخستنە ؟

وەڵام: ئیعتیباری یەکەم: بەردەوام لە هەستمدا ئەوە هەبوو کە ئەم لاوانە رووبەرووی کردارەکانی ئەشکەنجە لەناوبەرەکان نەکەمەوە، چاوەڕوان کردنم لەوەی کە ئەوان توانای جێبەجێکردنیان نیە، هۆکارێك بوو لە هۆکارەکانی تری ڕانەگەیاندنی، چونکە بڕوام وابوو کە ئەوان نادیارنو دەستدرێژی ناکرێتە سەریان، ئەوانیش بەرپەرچی دەستدرێژی نادەنەوە!

پرسیار: ئایا محەممەد قوتب ئاگاداری رێکخستنە نهێنیەکەتە ؟

وەڵام: نەخێر.

پرسیار: ئەی بۆچی پێت ڕانەگەیاندووە لەکاتێکدا لە نووسینەکانیدا هاوڕێبازی فیکرەکانتە ؟

وەڵام: من لە سروشتی محەممەد دەزانم، کە ئارەزووی لە تێکەڵبوونی هیچ کۆڕو کۆمەڵێك نیە! لە ڕوویەکی ترەوە: من بەردەوام سوروبووم لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك بە فەرمانی ئەم ڕێکخستنە نەزانێت، ئەگەر چی نزیکترین کەس بێت لێمەوە، بۆ تەسککردنەوەی بازنەی ئەوانەی بەمە دەزانن![1].

بەمە کۆتایی بەو بڕگانە دێنین کە لە مەحزەری لێکۆڵێۆنەوە هەڵمانبژاردووە بە شێوەیەك هەموو پرسیارەکانی سەلاح نەسارو وەڵامەکانی سەید قوتبمان نەهێناوە لەسەری، بەڵکو لەو پرسیارو وەڵامانەمان هەڵبژارد کە ئاماژە دەکەن بە کەسایەتی سەید لە لێکۆڵینەوەدا، وە ئەوەی کە بووەتە وەسفی لە ڕاستگۆییو بێ پێچ‌و پەنایی‌و بوێری‌و ئازایەتی‌و ڕوونی دا، ئەوە بوو ئەو زانیارییانەی کە دەیزانی، وە ئەو بیروبۆچوونانەی کە بەڕاستی دەزانین‌و بڕوای پێیان هەبوو دایە لێکۆڵەر سەلاح نەسار، ئەگەر چی پێچەوانەی تێگەیشتنی بەرپرسان بوو لە حکومەتدا.

پرسیارو وەڵامەکانمان بەبێ سەرنجی خۆمان گواستۆتەوە، سەرنجمان بۆ خوێنەرخۆی بەجێهێشتووە.

بەڵام ئامۆژگاری خوێنەر دەکەین بە وەستانێکی دووروودرێژ لە کاتی وەڵامدانەوەکانی سەید قوتبدا، چونکە لە هەندێکیاندا دیاریکردنی هەڵوێستی سەیدی تێدایە لە هەندێك بابەتی گومان لێکراو، ئاشکراکردنی بیروڕاکانیەتی لە بابەتە مەترسیدارەکاندا، لە پرۆگرامی بزاڤی ئیسلامیدا، لە تێڕوانینیدا بۆ بزافی برایانی موسڵمان، لە بۆچوونیدا بۆ بابەتەکانی حاکمیەت‌و نەفامی‌و تەکفیرکردن، کە ئەمانە کۆمەڵە بابەتێکن لە دوای شەهیدکردنی سەید قوتب جموجوڵی ئیسلامی سەرقاڵکرد، بە هۆی دەرکەوتنی لاوانێکەوە بە تێگەیشتنی هەڵەوە، کە دەیاندایە پاڵ سەید، لەگەڵ ئەوەدا کە وەڵامەکانی سەید دژی ئەمانە دەوەستێ!!

## دیمەنی حەوتەم: دادگایی کردنی سەید قوتب‌و شەهیدکردنی

### لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەیدو دادگایی کردنی

لە ڕۆژی سێشەممە 1965/12/21 لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەید کۆتایی هات، دادگایەکی تایبەت بۆ دادگاییکردنی سەیدو براکانی پێکهێنراو، دادگا کارەکانی لە 1966/4/9دا دەست پێ کرد.

واتە چوار مانگ زیاتر لە نێوان لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەیدو دادگایی کردنیدا هەیە. چەند ڕووداوێك لە پێش دادگایی کردنیەوە ڕوویدا، لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

*** شەمس بەدران، ڕەفعەت بەکر لە بەردەم خاڵێدا دەکوژێت.**

ڕەفعەت بەکر شافیع کوڕی نەفیسە قوتبی خوشکی سەید بوو، کە لەگەڵ عەزمی برایدا لە کارەساتەکەی برایانی ساڵی 1965دا لە پێشەوەی ڕاپێچکراوەکاندا بوو، سەید زۆر ڕەفعەت بەکری خۆش دەویست‌و خۆشەویسترین منداڵی خوشکەکەی بوو لە دڵیدا.

ڕەفعەت لە زیندانی جەنگیدا لە ئەنجامی سەختی ئەشکەنجەداندا شەهیدکرا، ئەم گەنجە ئیعترافی لەسەر سەیدی خاڵی نەکرد بەو شێوەیەی کە ستەمکاران دەیانویست تۆمەت‌و درۆی بۆ هەڵبەستن، چیرۆکی شەهیدکردنی ڕەفعەت بەکر دەگێڕینەوە بەو شێوەیەی یەکێك لەو کەسانە کە لە کاتی شەهیدکردنیدا ئامادەبووە گێڕاویەتیەوە، ئەویش ئەندازیار مستەفا ڕاغیبە، کە تۆمەتباربوو لە قەزیەی حسەین تۆفیقدا:

مستەفا ڕاغیب دەڵێت: بانگ کرام بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شەهید سەید قوتب. . لە پاش ئەوەی ئەشکەنجەیاندام شەهید سەید قوتبیان ئامادە کرد. . کردیانە ژوورەکەوە. . لە دوای ئەو لاوێك هاتە ژوورەوە، ئەشکەنجەدانی لاوەکە دەستی پێکرد،

[1] الموتي يتكلمون 111 ـ 146 بە هەڵبژاردن‌و کورت کردنەوە.

ئەویش هاواری دەکردو دەینالاّند، دەنگی بە ئاسماندا دەچوو. . پاشان وردە وردە بێدەنگ بوو. . تا بە تەواوی دەنگی نەما. . نازانم چی ڕوویدا. . بانگیان کردم. . شەمس بەدران هات بە دەمیەوە لە دەرگای ژوورەکەوە، لە بارێکی زۆر ترسناکدا، وە ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو. . - بۆ یەکەمجار پێچەوانەی عادەتی خۆی ـ لەسەر قەنەفە دای نیشاندم، پاشماوەی خوێنم لەسەر زەوی ژوورەکەدا بینی، لەگەڵ ڕاخەرێکی پێچراوەی لولکراو بەوشتەوەی کە تیایدا بوو!.

شەمس بەدران پێی وتم: حوکمی ئەم کوژراوە چیە کە لە ئەشکەنجەدا کوژراوە؟

وتم: ئایا پێیان وتویت کە من مفتیم؟!

وتی: ئەوە بەچی دادەنرێت؟!

وتم: ئەوە بەخوای خۆی گەشت. . خوای ئێمە ئاگادارە بەسەر دڵەکەیدا، کەس دڵەکان ناناسێت جگە لە خوا. .

پاشان زانیم کە ئەم لاوە کوڕی خوشکەکەی شەهید سەید قوتبە کە لە ئەشکەنجەداندا لەبەردەم خاڵێدا شەهید کراوە[1].

*** زەینەب غەزالی چوار هەواڵ دەربارەی سەید لە زینداندا دەگێڕێتەوە**

**یەکەم:** کاتێك زەینەب ڕۆیشت بۆ لای بەلوعەی ئاوەکان لە زیندانەکەدا، بە بەردەم ئەو ژووەردا تێپەڕی کە سەیدی تێدا بوو، ئەو ژوورە بە دەرگا دانەخرابوو لەبەر مەترسی باری تەندروستی سەید، لەبەر ئەوە بە تانیەکیان دابوو بە دەرگاکەیدا تا سەید کەس نەبینێتو کەسیش ئەو نەبینێت!

بەلاّم کاتێك زەینەب تێپەڕی، با سوچێکی بەتانییەکەی هەڵدایەوەو خوێنرێژەکان وایان زانی کە سەید خۆی سوچی بەتانیەکەی هەڵداوەتەوە تا زەینەب بزانێت کە لەو ژوورەدایە، ئیتر دەستیان کرد بە جنێو پێدانو نەفرین لێکردنی، پاشان سەفوەت ئەلڕوبی هاتو سەیدی وەستاند، دەستی کرد بە جنێوو قسەی ناشیرین ئاڕاستەکردنی، پاشان حەمزە ئەلبەسیونی هاتو ئەویش بە هەمان شێوەی کرد. پاش ئەوەی زەینەب لەسەر ئاوەکە گەڕایەوە گوێی لە دەنگی قامچیەکان بوو کە جەستەی سەیدیان دەکوتا. گوێی لە دەنگی سەید بوو کە ڕاستیەکانی بۆ خوێنرێژەکان شی دەکردەوە!

**دووەم:** لەبەر ترسناکی نەخۆشی سەید لە زینداندا، پزیشکی زیندانی جەنگی ـ ماجدە حمادە ـ ڕایگەیاندبوو کە پاسەوانەکان با واز لە سەید بهێنن تالە کاتی بانگکردنیدا بۆ مەکتەبی لێکۆڵینەوە بە ئیسراحەتی خۆی بڕوات!

بەلاّم حەمزە ئەلبەسیونی و سەفوەت ئەلڕوبی فەرمانیان کرد کە سەید بە پەلەو خێرا بهێنن! پاسەوانەکانیش پاڵیان بە سەیدەوە دەنا لە بەردەمیانەوە، بە قامچی لێیان دەدا، تا بە خێرایی بڕوات، لەو کاتەدا دڵتەنگی ڕووی تێکرد، پزیشکی زیندان بانگ کرا، کە ئەم کارەی ڕەد کردەوە، من لە ژووەکەی خۆمدا بووم گوێم لە گفتوگۆی نێوان پزیشكو پاسەوانەکانەوە بوو!

**سێیەم:** شەهید سەید قوتب خاوەنی دڵێکی گەورە بوو. . برایانی خۆش دەویستو بەزەیی پیایاندا دەهاتەوە. . سۆزی باوکایەتی بۆیان هەبوو. . لە کاتی دەرچوونماندا بۆ دادگایی کردن لە یەکەم ڕۆژدا، ئەمە ڕوویدا، کە ئێمەی ئەندامانی قەزیەی دووەمیان لەبەردەم نووسینگەکانی لێکۆڵینەوەدا ڕاوەستان، چاوەڕێی عەرەبانەکانمان دەکرد کە دەیان گواستینەوە بۆ دادگا، شەهید سەید قوتبیان ئامادە کردو لە ژووی نووسینگەکەدا دایان نیشانەوەو بینیم سەید قوتب کە دەڕوانێتە دەمو چاومانو لێمان ورد دەبێتەوە. . ئێمەی ناسیەوە، هەمووومان زەردەخەنەمان کرد بۆ شەهید سەید قوتب، دامەزراویو ئارامگرتنو توندوتۆڵیو ئەوەی کە دەرونی ئەو پێی ئاسودە بێت بۆمان دەربڕی. هیچ شتێك لە لایەن سەید قوتبەوە نەبوو تەنها ئەوە نەبێت گریا، دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، دەستی کرد بە دوعا کردن بۆمان.

**چوارەم:** کاتێك قەزیەی یەکەم درا بە دادگا، شەهید سەید قوتب کردی بە ئەرکی سەرشانی خۆی کە باسی ئەو ئەشکەنجەدانانە بکات کە ڕووبەڕووی برایان کراوەتەوە، ئەو دەیزانی دوای ئەو باسکردنە چی ڕووبەڕووی دەبێتەوە. . تاکو ئەگەر برایان قسەیان کرد دەربارەی ئەشکەنجەدان ڕووبەڕووی ئەشکەنجەدانی زیاتر نەبنەوە.

---

[1] مذابع الاخوان 114 ـ 115.

# بڕیارەکانی تۆمەتبارکردن بە گشتی

## فوئاد دەجەوی سەرۆکی دادگا

عەبدولناسر کۆمەڵە بڕیارێکی دەرکرد بە دروستکردنی دادگایەکی سەربازی بۆ دادگاییکردنی برایان، دادوەرەکانیان لە ئەفسەرە ستەمکارو زۆردارەکانی سوپابوون، دادگای یەکەم تایبەت کرا بە دادگایی کردنی تۆمەتباران لە دۆسیەی یەکەمدا، کە بریتیبوون لە سەرکردایەتی ڕێکخستنی برایان. . دادگاییەکە بە سەرۆکایەتی فەریقی یەکەم فوئاد دەجەوی بوو!

### فوئاد دەجەوی کێیە؟

فوئاد ئەفسەرێکی ستەماری تەڵەکەبازو خوێنڕێژو گەمژەو کەم ئەرزش بوو، خاوەنی هیچ ڕەوشتو ئەدەبو ئازایەتیەك نەبوو، ژیانی شەخسی سەرتاپا لادانو تاوان کردن بوو! دەجەوی لە جەنگدا لەبەردەم دوژمندا ترسنۆك بوو، ئەوە بوو لە کاتی هێرشە سیٚ قۆڵیەکەی ساڵی 1956دا دەجەویان دەستگیر کرد، پاشان لە ئێزگەکەیانەوە قسەی کرد، قسەی بە عەبدولناسر و میسر وت.[1]

ئەم دەجەویە ترسنۆکە لە دادگایی کردنی برایاند بویە پاڵەوانێکی ئازاو بە جەرگ، بوو بە دادوەرێك! داوەرێکی پاك لە دەرکردنی حوکم بەسەربرایاندا!!

دەجەوی لە دادگادا بە نەزانیو گەمژەیی، بە بیٚ عەقڵیو بێزراوی ناسرابوو، گاڵتەی بە تۆمەتباران دەکردو جنێوی پیٚ دەدان، قسەی ناشیرینی پێدەوتن! لە نموونەی سوکیو بێزراویو گەمژەیی ئەم کابرایە لەو دادگایەدا ئەوەبووکە لەگەڵ شەهید محەممەد یوسف هەواش کردی.

تەلعەت عەبدولعەزیم کە پارێزەی شەهید هەواش بوو بۆ بەرگریکردن لە هەواش وتی: هەواش بیروڕای سەبارەت بە سەید قوتب وایە، کە مامۆستایەکە چاوەکانی قورئان جێناهێڵن، سەید قوتب لە ڕووی ئاینیەوە سەرکەوتووەلە ئاینەکەیدا. . سەید قوتب لە زینداندا جێگەی ڕێزی هەمووان بوو.

دەجەوی ڕاماڵیو بە دەنگێکی بەرز بە پارێزەرەکەی وت: چۆن زانیت ئەی مامۆستا. . ڕێزی چی. . ئەوە تاوانبارێکە تاوانی ئەنجامداوە. . چۆن ڕێزی لیٚ دەگرن لە زینداندا؟.

پارێزەر بەرپەرچی دەداتەوە: بە هۆی ڕوکاری لە خواترسانیەوە.

دەجەوی پێی دەبڕێت: کیٚ پێی وتی، کە سەید ڕێز لێگیراوە لە زینداندا؟.

پارێزەر پاشەکشە دەکاتو دەڵێت: قەیناکا. . وازی لیٚ بێنە، دەگەڕێینەوە بۆ هەواش.[2]

زۆرێك شتی سووكو بیٚ ئەرزشو گاڵتەجاڕ لە دادگاییەکەی دەجەویدا ڕوویدا.

---

[1] مذبح الاخوان 115 - 117.

[2] البوابة السوداء، أحمد زائف: 223.

[3] الموتي يتكلمون 159.

**دەجەوی دادگایی سەید دەکات**

دادوەری ڕق لەدڵ فوئاد دەجەوی دەستی کرد بە دادگاییکردنی برا تۆمەتبارەکان لە قەزیەی یەکەمدا لە ڕۆژی شەممە 1966/4/9دا.

وتەی سەرۆکی نوێنەرایەتی ئاسایشی دەوڵەت سەلاح نەسار پێشکەشی کردو، تیایدا ئەندامانی سەرکردایەتی برایانی تۆمەتبارکرد بە تۆمەتە ناسراوەکان.

دادگایی کردنی یەکەمی سەید قوتب کە لە گەڵیدا دەست بە لێکۆڵینەوە کرا لە ڕۆژی سێشەممە 1966/4/12دا بوو.

لە گاڵتە جاڕیە گریانهێنەرەکانی دادگا، ئەوەبوو کە سەرۆکی نوێنەرایەتی ئەمنی وڵات سەلاح نەسارو بریکارەکانی نوێنەرایەتی زۆری نەخایاند دەستیان کرد بە ناوناتۆرەدانو گاڵتەکردن بە سەید وەك ناووناتۆرەی **(القطب الاغر)** و **(القطب اللامع)** و **(زعیم الأجرام)**.

هەروەها لە گاڵتەجاڕیە گریان هێنەرەکان ئەوەبوو سەلاح نەسار کاتێك چاوی کەوت بەو بەرزکراوەیەی دژی سەید بەرز کرابوویەوە ـ پێش دەستپێکردن بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەیدو دادگایی کردنی ـ ئەمەش لە ڕۆژی یەکشەممە 1966/4/10 دا بوو، تیایدا وتی:

پرسیارمان لە تۆمەتبار کرد دەربارەی ڕاوبۆچوونی سەبارەت بە سەعید ڕەمەزان، وتی: بمبورن لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە. ئەمەش مافێکی یاسایی خۆیەتی، بەڵام ئێمە سووربووین ڕای بزانین سەبارەت بە سەعید ڕەمەزان، ئەویش وتی: کە ناتوانێت دەربارەی بدوێ، چونکە ڕایەکی دیاریکراوی هەبوو تیایدا، پرسیارمان لێکرد لە بارەی بیروڕای لە محێدین هیلال، ڕەدی کردەوە. . ترسا. . چونکە سەید ترسنۆکە!!.

ڕۆژنامەی **(الأهرام)** چووە بە دوای گێڕانەوەکەدا بۆ ڕووداوەکە لە بەرواری 1966/4/11و نوسیویەتی: (لێرە سەرۆکی دادگا تێبینی ئەوەی کرد کە سەید قوتب قسە دەبڕسکێنێتو لە قەفەزی تۆمەتبار کردندا شتێك دەچرپێنێت بە گوێی تۆمەتبار یوسف هەواشدا کە بە تەنیشیەوە دانیشتووە، سەرۆکی دادگا فەریق دەجەوی لای بەلادا کردەوەو وتی: هێی. . ئەوە چیە. . بۆ بە ئاشکرا نایڵێیت؟ دانیشتنەکە ئاشکرایە!.

ئامادەبوان ئەوانەی سەیدیان نەبینیبوو بەئاگا هاتن، سەرۆکی دادگا دەرپەڕیو قسەکانی ئاڕاستەی سەید کرد: ئەوە چییە چاوم لێتە، قسە بۆ ئەوەی تەنیشت دەکەیت، لە جوڵەی دەمتەوە وا دەردەکەوێت کە دەڵێیت هیچ ڕووی نەداوە! هەر ئێستە گوێم لێبگرە. . لەبەر ئەوەی دانیشتنەکە ئاشکرایە، دەترسی قسەکان بگاتەوە سەعید ڕەمەزان، کە ئەو لە دەرەوەی وڵاتە. لەبەر ئەوەی ڕۆژنامە بینووسێت. . یەعنی تۆ دەمێنیتەوە، وەك ئەوەی سەرۆکی نوێنەرایەتی وتی: دەترسیت. . .

پاشان سەلاح نەساردەستی کرد بە تۆمەتبارکردنی سەید بە قسەکانی : سەید قوتب دەترسێت ئەگەر ڕای خۆی دەربڕێت. . ئەگەر ئەو ترسنۆك نیە، ئێستەو لەم کۆبوونەویەدا قسە دەکات. . ڕای خۆی دەڵێت سەبارەت سەعید ڕەمەزان)[1]

دادگا ئەحمەد موختارقوتبی مافناسیان دەست نیشان کرد بۆ بەرگریکردن لە سەید قوتب، هەندێکیان وا گومان دەبەن کە مافناس نزیکە لە سەید قوتبەوە، بەڵام هیچ لێوەی نزیك نیە، بەڵکو ئەو بەکرێگیراوێکی کۆن بوو لە بەکرێگیراوەکانی موخابەرات.[2]

---

[1] لماذا أعدم سید قطب وأخوانه: 10 ـ 12، لە ڕۆژنامەی (الأهرام)ەوە نەقڵ کراوە، ڕۆژی 1966/4/11.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو: 28.

## سەید قوتب بە سەیرکردنەکانی دەجەوی دەترسێنێت

سەید قوتب ئازاو چاونەترس بوو لە دادگادا، دەجەوی لێی دەترساو خۆی دەپاراست لەوەی چاوی بە چاوی بکەوێت!

یەکێك لە برایان بە ناوی مەمدوح ئەلدیری لەگەڵ سەید قوتب لە قەفەزی تۆمەتباریدا بوو، دەگێڕێتەوە (لەوێدا ڕوانینێکی زۆری دوولایەنە هەبوو لە نێوان شەهید سەید قوتبو لە نێوان دەجەوی دادوەری دادگادا، ڕوانینەکانی شەهید سەید قوتب ڕق و قینی دەجەوی هەڵدەساند، پەستی دەکرد، هەر هەڵسوکەوتێك لە دادگادا لە دەجەویەوە ڕووی بدایە، ڕوانینیکی سەید قوتب بۆ دەجەوی بەس بوو بۆ بەرپەرچ دانەوەی. شەهید سەید قوتب بە چاوێکی بێ ڕێزو سوکەوە دەیڕوانیە دەجەوی!

دەجەوی دەستی لەسەر گەردنی خۆی دانابوو، وەك ئەوەی بە سەید قوتب بڵێت: ئێمە لە سێدارەت دەدەین!)[1]

سەید لەبەردەم دەجەویدا قسەی دەکرد: (لەگەڵ ئەوەی بەساڵاچوو نەخۆش بوو، بەڵام ئەوەی بڕوای پێی هەبوایە بە دەجەوی دەوت. . دەربارەی ئەو ئەشکەنجەدانە وەحشیانەی کە ڕووبەڕووی تۆمەتباران بووبوویەوە سەی دەکرد. . سەید چاك ڕۆژی خۆی دەزانی. . دەیزانی کە ئەوان دەیکوژن. .)[2]

## ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ئیدانەی دادگاییەکە دەکات

کاتێك دادگایی کردنی سەید قوتبو براکانی دەستی پێکرد لە بەردەم دادگاکاندا، چاودێران دەیانزانی کە ئەو دادگاییانە چەندە سنووربەزاندنو لادانی تێدایە!

ئەم کارە دوو مافناسی عەرەبی هەراسان کرد، چوونە پێشەوە بۆ ئەوەی بچنە میسرو بەرگری لە سەید قوتبو براکانی بکەن، بەڵام حکومەت ڕێی پێنەدان: (دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان لەو ڕۆژەدا ڕێگەیان گرت لە ژمارەیەك مافناسی عەرەب، ئەوانەی لە سودانو مەغریبو ئوردنو جگە لەو وڵاتانەشەوە خۆیان بە خشی، بۆ بەرگری کردن لە تۆمەتبارەکان)[3]

ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، هەوڵیدا یەکێك لە ئەندامە مافناسەکانی بنێرێت تا بە سیفەتی چاودێر ئامادەی دادگاییەکان بێت، بەڵام حکومەتی میسری ڕەزامەندی نەنواند، لەبەر ئەوە ڕێکخراوی ناوبراو بەیانێکی بۆ ڕۆژنامەکانو ڕای گشتی لەبەرواری 1966/4/12دا بڵاوکردەوە، تیایدا ئیدانەی حکومەتی میسری کردبوو.

لەوەی کە لە بەیانەکەدا هاتبوو: بەڕێز (بیتەر ئارشەر) ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیو ئەندامی ئەنجومەنی تەنفیزی بەریتانی بۆ دەزگای جیهانی چاودێری زیندانیە سیاسیەکان، گەڕایەوە لە قاهیرە، کە بەکارێکی ئاگاداربوون هەستابوو دەربارەی دادگایی کردنی چلو سێ ئەندام لە کۆمەڵەی برایانی موسڵمان.

بەڕێز ئارشەر هەستا بەو ئەرکە بە سیفەتی ئەوەی چاودێرێکی ناڕەسمی دەزگای جیهانی چاودێری زیندانە سیاسیەکان بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی پێشتر دەزگاکە داوایەکی ڕەسمی پێشکەش کردبوو بۆ دەستخستنی ئاماژەکردنێکی مامۆستای مافناس (نیکولاس جاکوب) بەڵام ئەم داواکاریە لە لایەن ئەوەوە وەڵامی نەبوو تاکو ئێستاش.

بەڕێز ئارشەر ڕاپۆرتێکی پێشکەش کرد تیایدا ئەم خاڵانەی خستووەڕوو:

1ـ دادگاییەکانی برایانی موسڵمان یاسایەکی جیای بەسەردا سەپێنراوە، کە دوای ڕوودانی ڕاگوێزانەکان لەژێر کاریگەریەکی کۆنەپەرستانەدا دەرچووە.

2ـ ئەو دادگاییانەی دادگایی ڕاگوێزراوەکانی دەکرد لە برایانی موسڵمان سیفەتی دادگای سەربازیان وەرگرتبوو کە دەسەڵاتیان هیچ سنورێکی بۆ نەبوو.

---

[1] مذابح الأخوان في سجون ناصر: 117.

[2] البوابة السوداء: 222.

[3] الشهيد سيد قطب: يوسف العظيم: 59.

3ـ دادگاییە سەربازیەکان بەرپەرچی هەموو گوێگرتنێکی دەدایەوە بۆ وتەی تۆمەتبارەکان دەربارەی ئەو ئەشکەنجانەی چەشتبوویان، هەروەها بەرپەرچی بیستنی بەڵگەو شاهیدیشی دەدایەوە بۆ سەلماندنی ڕوودانی ئەو ئەشکەنجەدانانە.

4ـ مامۆستا سەید قوتبو هاوەڵەکانی لە برایانی موسڵمان، بێبەش کرابوون لە مافی یاساییو سروشتی خۆیان لە گرتنی مافناسەکاندا بۆ بەرگری کردن لە خۆیان.

5ـ دەسەڵاتە میسریەکان مافناسە سودانیەکانیان دوورخستەوە ئەوانەی کە چوبون بۆ قاهیرە بە مەبەستی بەرگریکردن لە برایانی موسڵمان، وە بەبی هیچ هۆیەك لە میسر دووریان خستنەوە.

6ـ دەسەڵاتە میسریەکان سەرپێچی بڕیارەکانی کۆنگرەی مافناسانی عەرەبیان کرد، کە سەندیکای مافناسان لە میسر تیایدا بەشداربوو، ڕەزامەندی نواند لەسەر بڕیاری کۆنگرە بەپێدانی ماف بە مافناسە عەرەبەکان لە هەڵگرتنی تۆمەت لەسەر تۆمەتبارە سیاسیەکان لەبەردەم قەزای میسریدا.

7ـ دەسەڵاتە میسریەکان لە دانیشتەکاندا ڕێگەیان لە ئامادەبوونی جەماوەرو ڕۆژنامەکان گرت، سانسۆریان خستە سەر هەواڵەکانی دادگاییەکانو دانیشتەکان.

8ـ دەزگای لێبوردنی نێودەوڵەتی دەسەڵاتە میسریەکانی ئاگادار کردەوە لە زەرورەتی دانانی دادگایی کردنی دادپەروەردانە، وەك سووربوونێك لەسەر پاراستنی ناوبانگی قەزای میسری!!

دەربارەی خاڵی سێیەم لەو حەوت خاڵە، ڕێکخراوی لێبوردن ئەوەی لە بەیانێکدا دەربڕیبووکە: (تۆمەتباران سووربوون لەسەر ئەوەی ئەشکەنجە لە دژیان بەکار هاتووە، بەمەبەستی دانپیانان و زانیاری لێوەرگرتن، ئەم تۆمەتبارکردنە ئاراستەی دەسەڵاتدارانی تەحقیق کرایەوە لە لایەن سەید قوتبەوە -کە تۆمەتباری سەرەکیە لە قەزیەی ئێستادا- بەڵام سەرۆکی دادگا بە خێرایی دەستپێشخەری کرد بۆ بێدەنگ کردنی تۆمەتبار، چونکە نەیدەویست لەسەیدەوە بەڵگەکان لەسەر ئەم بابەتە ببیستێ، وای ڕائەگەیاند کە تۆمەتباران درۆ دەکەن)[1]

## سەید قوتب پاڵەوانێك لە دادگای کورتەبنەکاندا

### چەند برگەیەك لە دادگاییەکە!

سەید قوتب پاڵەوان بوولە دادگای کورتەبنەکاندا! ئەم لە کاتێکدا لە قەفەزی تۆمەتبارکردندا بوو پاڵەوانو بڵند بوو، وەلە کاتێکدا فەریقی یەکەم دەجەویو ئەوانەی لەگەڵیدابوون هەموویان باوەقورەت بوون، سەید پاڵەوان بوو ئەگەرچی لەتەواوی هەمووهێزوتواناماددیەکان دورخرابویەوە، بەڵام بەهێزبوو بە خوای گەورەوە، بەرزو بڵندبوو بە ئیمانەکەیەوە.

لە کاتێکدا دەجەوی خاوەنی هەموو تواناو هێزێکی ماددی بوو، خاوەنی پلەو حوکمو دەسەڵات بوو، بەڵام لەبەردەمی سەیدقوتبدا باوەقۆرەتێك بوو، چونکە پەیوەندی لەگەڵ خودای پادشای هەموو بوونو بەخشەری هەمووهێزو تواناکاندا پچڕاندبوو.

هەروەك چۆن لەبەردەم سەلاح نەساردا لە لێکۆڵینەوەدا ڕاستگۆو بێ پێچو پەناو ئازاو بوێرو سەربەرزو بەخشندە بوو، بە هەمان شێوە لەبەردەم داگای دەجەویدا وەستایەوە!

لێرەدا چەند وێنەیەك لە دادگاییکردنی سەید پێشکەش دەکەین، کە دەجەوی پرسیاری ئاراستە دەکاتو ئەویش وەڵامی لەسەر دەداتەوە.

دادگاییەکە لە ڕۆژی سێشەممە 1966/4/12دا دەستی پێکرد، هەر کەسێك سەید قوتب بناسێت. . پاشان بینیبێتی لە قەفەزی تۆمەتبارکردندا، وای دەزانی ـ دڵنیادەبوو ـ کە بە لایەنی کەمەوە تەمەنی دە ساڵ زیادی کردووە ئەویش لەبەرەنجامی ئەو ئەشکەنجەو سزادانانەوە کە چەشتبووی!!

تەنها بە بەستنی کۆڕەکە، دادوەری یەکەم **دەجەوی** بە دەنگە بەرزەکەی هاواری کرد: سەید قوتب ئیبراهیم!

---

[1] بڕوانە دەقی بەیانی ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی لە کتێبی (لماذا أعدم سید قطب وأخوانه) 35 ـ 41.

سەید لە قەفەزەکەداو لە نێوان برا تۆمەتبارە گیراوەکاندا ڕاوەستا. . پاشان لە قەفەزەکە چووە دەرەوە، لەبەردەم مێزەکەدا ڕاوەستا.

**دەجەوی:** بە درێژی زانیاریەکانت لە بارەی ڕێکخستن و پەیوەندی خۆت پێوەی باس بکە. .

**سەید:** من. .

**دەجەوی:** -کەمێك قیزاندی- لەبەر ئەوە منو تۆ مەترو نیوێك لە نێوانماندایەو گوێم لە دەنگت نیە. . من دەمەوێت هەموو گوێیان لە دەنگت بێت. . ئەی سەید قوتب. . ئەی قوتب. .

**سەید:** بەپێی توانا هەوڵ دەدەم. . پەیوەندی ڕاستەقینەم بە ڕێکخستنەوە دەگەڕێتەوە بۆ پاش دەرچوونم لە زیندانو. .

**دەجەوی:** نەخێر. . ئیتر بوەستە. . تۆ دەڵێیت پەیوەندی ڕاستەقینەم. . واتە پەیوەندیەکی ناڕاستەقینەشت هەیە. . یوسف هەواشی بریکارو جێگرو جێنشینت دانی پیاناوە کە حەمیدەی خوشکت لە بارەی ڕێکخستنەوە ئاگاداری کردوویتەوە، کاتێك تۆ لە زیندان بوویت!

**سەید:** پرسیار لە یوسف هەواش دەکرێت لەم بارەیەوە!!

**دەجەوی:** هیچ شتێکی لێ ناپرسرێت. . من هەموو وتەکانی ئەو دەڵێمەوە!

**سەید:** من زانیم کە گەنجانێك هەن نووسینەکانم دەخوێننەوە. .

**دەجەوی:** پەیوەندیت بەم گەنجانەوە چی بوو؟ وەڵام بدەرەوە ئیتر دەی کاکی برا؟

**سەید:** حەمیدە ئاگاداری کردمەوە کە حاجی زەینەب ئەلغەزالی دەڵێت: چەند گەنجێك هەیە نووسینەکانت دەخوێننەوەو حەز لە زیاتریش دەکەن، جا ئایا هیچ ڕێگرێ هەیە لەوەی ئەم گەنجانە کتێبی **(معالم في الطريق)** بخوێننەوە پێش لە چاپدانی ؟

**دەجەوی:** کێ بوو ڕەشنووسەکانی کتێبەکەی دەبرد ؟ حەمیدە ؟!

**سەید:** نازانم.

**دەجەوی:** -بە گاڵتەپێکردنێکەوە- ئایا حەمیدە گەیشتۆتە پلەی مامۆستایەتیو دەتوانێت لە کتێبەکەوە شت وەربگرێت ؟

**سەید:** -بە تواناوە- ئەو لەزۆربەی خوێندەواران باشتر تێی دەگات!

**دەجەوی:** ئەمە کاتێك تۆ لە زینداندایت ساڵی (63)ز ؟

**سەید:** ئەمە هەموو پەیوەندیی نێوان منو ئەو گەنجانە بوو، کە من لە زینداندا بووم!

**دەجەوی:** گەنجەکان. . گەنجەکان. . هیچ شتێك سوودی نییە بۆت! ئایا کە لە زینداندا بوویت نەتدەزانی ئەو گەنجانەی حەز دەکەن نوسینەکانت بخوێننەوە چەکدار بوون ؟

**سەید:** نەمزانیوە تەنها ئەوە نەبێت کە گەنجانێکی موسڵمانن!

**دەجەوی:** عەبدولفەتاح ئیمساعیل مۆڵەتی لە کێ وەرگرت بۆ ئەوەی سەردانت بکات؟

**سەید:** مۆڵەتی لە محەممەد قوتب وەرگرت. . پێی وت کە ئەوخوازیاری زیاترە.

**دەجەوی:** -بە خوێن ساردییەکەوە- خوازیاری چیە؟

**سەید:** -بە سەرسوڕمانەوە -خوازیاری زانستە. . نەك ژن!

**دەجەوی:** ئێ لە پاشدا. .

**سەید:** محەممەد قوتب داوای لێ کردم چاوم بە حاجی عەبدولفەتاح بکەوێت. . زەینەب ئەلغەزالیش لایەنی وتەکەی گرت. .

**دەجەوی:** واتە بە واستە چاویان پێت کەوت. . واسیتەی محەممەدو پاکانەی زەینەب!

**سەید:** من زۆر ڕوونم لە دەربڕینمدا!!

**دەجەوی:** -بە حەزرەوە-. . مانای چیە؟ گوایە تۆ وا دەزانیت من نارێك تێدەگەم؟

**سەید:** نەخێر. . هەرگیز. .

**دەجەوی:** ئەی عەبدولفەتاح و عەشماوی لە کوێ چاویان پێت کەوت؟

**سەید:** لە یادم نیە. .

**دەجەوی:** گرنگ نیە بیێتەوە یادت یان نا. . ئێمە چاوپێکەوتنی ئەو پێنجەمان لا گرنکە کە ئەندامن!

**سەید:** ئەندامی چی؟

**دەجەوی:** سەرکردایەتی ئەی براکەم. .

**سەید:** وەك ناویان دەبەیت!!

گفتوگۆیەك لە نێوان سەیدو دەجەوی دا ئەنجامدرا لەسەر ڕێکخستنی ئیخوانییەو، لەسەر ئەوەی کاتێك سەید لە زیندان دەرچوو چۆن کۆکردنەوەی پێکردن، وە بینی ئەو برایانە دەیانەوێت تۆڵەی براشەهیدەکانی ساڵی 1954 بسێنن، بەلاّم سەید بۆی ڕوونکردنەوە کە مەترسیەکانی ئەم کارە لە سوودەکانی زیاترە، سەید لەو کارە لایدان بەرەو پرۆگرامی پەروەردەیی بردنی.

**سەید:** دەستم کرد بە تێگەیاندنی هەموویان کە تۆڵە سەندنەوە ئامانجێکی بچووکە. .

**دەجەوی:** ئەی ئامانجە گەورەکە کامەیە؟

**سەید:** ئامانجە گەورەکە بریتیە لە: پێکهێنانی نەوەیەك لە گەنجانی موسڵمانی تێگەیشتوو لە دینەکەی. . هۆشیار لە کاروباری کۆمەڵگە، تاوەکو ببێتە تۆوی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان. .

**دەجەوی:** ئەی دەسەلاّت؟

**سەید:** دەسەلاّت. . بە ڕای من و، وەك تێم گەیاندوونو وەك ئەوەی لە بڕوامدایە. . گۆڕان لە بنکەوە دێت، نەك لە لوتکەوە. . بنکەش پێکهێنانی نەوە گەشە کردووەکانە. .

**دەجەوی:** -بە زمانێکی گاڵتەجارییەوە- ڕات وایە لە بنکەوە دەست پێدەکات تاوەکو بگاتە چی. . بگاتە لوتکە، یان بۆ نیوەی ڕێگەکە. . تۆ وێستگەی هەستانت باس کردووە، هێشتا وێستگەی گەیشتن ماوە. .

**سەید:** بە ڕاستی ئەوان دەسەلاّتی ئیسلامیان لێ پێکدێت.

**دەجەوی:** واتە دەسەلاّت دەگرنە دەست!

**سەید:** من دان بە بیرو ڕایەکدا دەنێم کە بۆ مێژوو تۆمار دەکرێت!!

**دەجەوی:** ڕای تۆ هیچ مەبەست نیە لای ئێمە. . من دەمەوێت بزانم چیت پێ وتن. . ئەوە من (25) خولەکە لە (4) دێڕدام، ئامادەشم چوار ڕۆژ لەگەڵتدا دابنیشم. . بەلاّم، واتە ئامادەکاریی لە بنکەوە دەستپێدەکات تاوەکو بگاتە دەسەلاّت ؟

**سەید:** ئەمە دەربڕینی بەرێزتە ؟

**دەجەوی:** باشە، ئەی بە دەربڕینی تۆ چیە ؟

**سەید:**-بە داکۆکیو سووربوونەوە- پێکهێنانی نەوەیەکی موسڵمان، کە بە شێوەیەکی سروشتی دەسەلاّتی ئیسلامی لێ پەیدا دەبێت!

**دەجەوی:** بەلاّم لە یادت نەچێت کە تۆ چوویت گەشتیت بە کۆڕپەکە. . کە بریتیە لە ڕێکخستن. . ئامادەبوو لەگەڵ خۆبەخشیندا بۆ تۆڵە سەندنەوە.

**سەید:** وتیان ئێمە ئەم بۆچوونە نوێیەمان پەسەند کردووە. . بەلاّم چەند کۆمەڵێکی تر هەیە لە پشتیانەوە، هێشتا لەسەر بۆچوونە کۆنەکەن، پێویستیان بە بۆچوونە نوێیەکە هەیە، تاوەکو عەقڵیەتیان بگۆڕێت!

**دەجەوی:** -کە هەستی کرد سەید قوتب وەختە ئەم خولەی لێ بەرێتەوە- تۆ دەتەوێت لە چوارچێوەی دەعواکە بمانبەیتە دەرەوە!! هیچ یەکێك لە کەسانی سەرکردایەتی ڕێکخستن خۆی بە تەنها پەیوەندیی پێوە نەکردیت ؟

**سەید:** عەلی عشماوی!

**دەجەوی:** جا چی پێ وتیت؟

**سەید:** لە بارەی چەکەوەکە لە سعودیەوە بە ڕێی سوداندا دێت، ئەم چەکانەش خۆی –عشماوی–چەند ساڵێکە داوای کردووەو پاشتر باسەکەی بیرچۆتەوە، تاوەکو نامەیەکی بۆ هاتبوو کە چەکەکان بە فیعلی بارکراونو بەم زوانە دەگەن!

**دەجەوی:** ئەم چەکانە بۆچی دێن؟

**سەید:** بەڕێزت داوام لی٘دەکەیت ئەوە بلێم کە پێی وتم؟

**دەجەوی:** ئەو داوای ئەو چەکانەی بۆچی کردبوو لە سعودیە؟

**سەید:** لەسەر بناغەی مەبەستەکانی ڕێکخستنی پێشوو!

**دەجەوی:** واتە پێش ئەوەی تۆ سەرکردایەتی ڕێکخستن بگریتە ئەستۆ؟

**سەید:** من وتەکانیم بەلاوە گرنگە!

**دەجەوی:** –بێزاری بەڕوییەوە دەرکەوت، چونکە ناتوانێت بە مەبەستەکەی بگات– ئەمە ڕووی نەداوە. . دەتەوێت بخۆیت و بتخۆم لەمشتومڕدا!

**سەید:** –بە گاڵتەپێکردنێکەوە– پێویست ناکات!!

**دەجەوی:** تۆ وتت کە ئەوەی ڕووی داوە بە دەق دەیڵێیت. . پاشتر ئەم بەشەت شاردەوە. . یان بیرت چووەوە. . ئێستاش وا بەشێکی تر لە بارەی چەکداریو زانیاریتەوە دەربارەی دەخەیتەڕوو.

**سەید:** دەکرایە گەر بەڕێزت وازت بهێنایە تا تەواوم دەکرد، ئەوابێنیاز دەبوویت لەوەی پرسیارم لێبکەیت!!

دەجەوی ئەم تێوە ژەنەینە زیرەکانەیەی سەید قوتبی قووتدا، کە بەردەوام پێی دەبڕی!

پاش گفتوگۆیەکی نێوان سەیدو دەجەوی لە بارەی ئەو چەکەوە کە عەلی عشماوی وتبووی لە سوودانەوە هاتووە، **دەجەوی وتی:** کەواتە ئەی سەید. . ئەی قوتب. . واتە تۆ نەخشەکێش و دانەری ڕاو بۆچوونیشیت لە دابینکردنی ئاسایشی ڕێکخستنداو، هەروەها لە هاتنی چەك لە دەرەوە. . و. .

**سەید:** بەڵام. .

**دەجەوی:** پێم مەبڕە. . کاتێك بە عشماویت وت چەکەکە وەرگرە. . بۆچی بوو؟

**سەید:** بۆ مەبەستی دابینکردنی ئاسایشی ڕێکخستن بوو. .

**دەجەوی:** –بە دڵخۆشییەوە– تەواو بووین مامە سەید!

**سەید:** ڕێم دەدەیت وەڵامەکەم تەواو بکەم؟

**دەجەوی:** وەڵامەکەت چیە؟

**سەید:** بەڕێزت دەڵێی تەواو بوویت. . من بەلامەوە گرنگ بوو ڕێکخستن بەبێ چەك بچەسپێت!

**دەجەوی:** من نامەوێت پێشبڕکێی ڕووداوەکان بکەم. . ئەو سەرنگوم کردنانە بە چەك، یان بە تۆپو بە خنکاندن، یان بە بوتڵی گاز دەبێت!

**سەید:** وەڵام بدەمەوە؟!

**دەجەوی:** بەڵێ وەڵام بدەرەوە. . ئەی چی. . بڵێ ئەی سەید، ئەی قوتب. . سەرنگوم کردن بە چەك یان بەبێ چەك، بڵێ؟

**سەید:** کاتێك سەرنگوم کردن لە ئاراد بێت، بە چەك دەبێت، بەڵام بە ڕاستیو جدی بیری لێنەکرایەوە!!

گفتوگۆی نێوان سەیدو دەجەوی گەشتە ئەوەی سەرکردایەتی برایان بخرێتە سەر شانی عەبدولعەزیز عەلی و فەرید عەبدولخالق، پێش سەید قوتب.

**دەجەوی** پرسیاری لێکرد لە ژمارەی برایان لەو کاتەدا: ژمارەکە چەندە؟

**سەید:** ژمارەی ئەوانەی لەگەڵیان بوون. .

**دەجەوی:** واتە ژمارەی ئەندامانی ڕێکخستن. . نەك ئەوانەی لەگەڵیان بوون!

**سەید:** جیاوازیی نیە!

**دەجەوی:** -بەتوڕەییەوە-بەخۆت بڵێ جیاوازیی نیە. . نەك بە من!

**سەید:** -ڕووی تێناکات وتەکەی تەواو دەکات-و. . هەر پێنجیان کۆبوونەوە. .

**دەجەوی:** ئەو پێنجە چین؟ سیفەتیان چیە؟

**سەید:** سەرکردایەتی ڕێکخستنیان دەکرد. .

**دەجەوی:** واتە لەگەڵ سەرکردایەتی ڕێکخستندا، یان سەرکردایەتی ڕاستەقینە بوون وەك لە لێکۆڵینەوەدا وتبووت. . نەجاتمان بدە براکەم. .

**سەید:** جیاوازیان نیە لە لام. .

کاتێك لە دارایی ڕێکخستن دوان، سەید تێبینی چەند زیاد کردنێکی کرد کە دادگا زیادی کردبوو بۆ وتەکانی!

**دەجەوی:** تۆ لە لاپەڕە (125)دا وتووتە کە پاش ئەوەی تۆ سەرکردایەتی ڕێکخستنت دەکرد بودجە تایبەتەکان بۆ پاراستنی ڕێکخستن بوون.

**سەید:** - بە نارەزاییەوە پرسیار دەکات - بۆچی بوون؟

**دەجەوی:** لە مەبەستەکانی ڕێکخستندا خەرج دەکرا. . یاخود خەرج دەکرا لە پۆشاکەکانی( شیکۆرێك) دا -شیکۆرێك شیکترین‌و کەشخەترین فرۆشگەکانی جلوبەرگ بوو لە قاهیرەدا-!

**سەید:** هەموو ئەمانە زانیاری نوێن!

پاشتر باسیان لە چەند پێشنیارێك کرد بۆ سەرنگومکردنی هەندێ لە سەرکردەکانی ڕژێم، کە پێشکەش بە لیژنە سەرکردایەتیە پێنج کەسیەکە کرابوو:

**سەید:** پێموتن بەسە. .-ناوە پیشاندراوەکان- ئەمە بەسەرکەوتن دەژمێرێت.

**دەجەوی:** ئێمەش دەڵێین. . تاوەکو ئێرە بەسە!

**سەید:** نەخێر، ئەمە وەك (**لاتقربوا الصلاة**)ەکەی لێ دێت!! منیش پرسیارم لێکردن دەربارەی تواناکان، ئەوانیش وتیان: هیچمان لە توانادا نیە! پاشتر پێشنیارەکە تەنها بوو بە وتە، هیچ جێبەجێکردنێکی لە پشتەوە نەبوو!

**دەجەوی:** کاتێك پرسیار لە عشماوی کرا، وتی: تۆ ناوی بەڕێوەبەری نوسینگەی مشیرو بەڕێوەبەری پۆلیسی جەنگیت زیاد کردووە!

**سەید:** من دان بەڕاستیدا دەنێم!

**دەجەوی:** ئەی ئایا عشماوی دان بە درۆدا دەنێت؟!

**سەید:** تەنها چەند پێشنیارێك بوو، ئەرکی جێبەجێکردنی پێ نەدرا، هەر کەسێکیش پێشنیار دەکات پێشنیار دەکات!!

**دەجەوی:** ژمارەی ئەندامانی ڕێکخستن چەندە؟

**سەید:** وتیان: ڕیزی یەکەم نزیکەی (70)، کەواتە ژمارەکە دەکاتە (200) یان (300)، ئەمەش بەخەملاندن!

**دەجەوی:** تەواوە ئەی سەید. . بەڵام خەملاندن چۆنە؟

سەید: ئەگەر (5)ساڵیان هەبێت لە کارکردن‌و پەروەردەکردنی ئەنداماندا، ئەوا کۆی (70) کەس لە (5) ساڵدا نزیکەی (300)کەس بەرهەم دێنێت

**دەجەوی:** ئەم ژماردنە چۆنە؟

**سەید:** من خۆم لە وەزارەتی پەروەردە چاودێری لێکۆڵینەوەی هونەری بووم، لای ئێمە لە مرۆڤدا پێنج کەس هەیە سەرکەوتووە، پێنجیش لەژێر ئاستدان. . -سەید ئەمەی بە ئینگلیزی دەربڕی-!!

**دەجەوی:** ـبە گاڵتەپێکردنەوە- ئەڵێی خەریکە بە ئینگلیزی قسە دەکەیت. . ئەی سەید، ئێمە خەڵکێکی موسڵمانین. . بە عەرەبی قسەم لەگەڵ بکە ئەی سەید!

**سەید:** ئامارەکان لەسەر بنچینەی ئەوەی 40٪ کەمتر مامناوەندن، 20٪ سەرکەوتوون، 20٪ لەژێر ئاستدان!

**دەجەوی:** جا ئایا بۆچی خۆت هیلاك دەکەیت. . بۆچی پرسیارێکی ئاشکراو روونت نەکرد لە بارەی ژمارەی ئەندامانەوە؟

عەلی عشماویش وتی: خۆی پێی راگەیاندویت کە ریزی یەکەم (70)و رێکخستنیش (200) کەسن، تۆش وتووتە ئەوان لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە هەستیان بە سەرکردایەتی تۆکردووە.

**سەید:** ـبە نارەزاییەوە- من وام وتووە؟

پاشان لە بارەی مەشقی رێکخستنی برایانەوە لەسەر وەرزشو چەك دوان!

**دەجەوی:** مەبەست چیە لە مەشقکردن لەسەر چەك؟

**سەید:** ـتێبینی ئەوەی کردکە دەجەوی پرسیارەکانی بە بێزاریەوە دەکات!-دەخوازم بە کەمێك خۆراگریەوە گوێ بۆ هەندێ لەدرێژەی باسەکە بگریتو. . سنگتان تەنگ نەبێت. .

**دەجەوی:** سنگم تەنگ نابێتو ئامادەم تاکو بەیانی گوێ بگرم.

**سەید:** ئێمە رێکەوتین لەسەر گۆرینی رێکخستن بۆ رێکخستنێکی ئیسلامی پەروەردەیی، بە بۆچوونی ئێمەش. .

**دەجەوی:** ـپێی دەبرێت-بۆ چوونی ئێمە. . کێ دەگرێتەوە؟

**سەید:** منو پێنج کەسەکەی ئەندامانی سەرکردایەتی، بریارماندا رێکخستنەکە پێویستە بمێنێتەوە بۆ پێگەیاندنی گەورەترین ژمارە لە لاوانی رۆشنبیر. . بەڵام چالاکی کۆمەڵەکە قەدەغەکرابوو. پێویستیشە بە نهێنی بمێنێتەوە، تاوەکو مەترسی روونەکاتە بوونی. . کاتێکیش هەستمان بە مەترسی کرد لەسەر رێکخستن کە ئاشکرا ببێت، وەمەترسی لە ئازاردانی ئەندامانی لە زیندانی جەنگیو قەلاکە، کە ساڵی 1954 و1965روویدا، پێشمان وانەبوو کە دادگا دەست دەکات بە لەسێدارەکانی. .

**دەجەوی:** ـهەموو هۆشی لەدەست دەداو پێی دەبرێت- تۆ درۆزنیت لەوەدا کە دەیڵێیت. . ئەمە ئەو ژەهرانەیە کە دەیرێژیت بەسەر کەسانی دەوروپشتا. .

**سەید:** ـبەبێ پەست بوون-رێکخستن مەشق لەسەر چەك دەکات بۆ بەرگری کردن لە خۆی!

**دەجەوی:** تۆ نەغمەی وتەکانت هەمووی بەم جۆرەیە. .

**سەید:** ئێمە. .

**دەجەوی:** ـبە توڕەییەوە- قسە نەکەیت تاوەکو وتەکانم تەواو دەکەم. . من لە چاخانە لەگەڵتدا دانەنیشتووم. . تۆ دەڵێیت مەشقی چەك بۆ بەرگی کردنە لە رێکخستن.

**سەید:** ـبە گلەییەوە- بۆ پەیمانی سنگ فراوانیت پێدام!

**دەجەوی:** بەڵام لە دەرەوەی بابەتەکە مەدوێ!

گفتوگۆیان گواستەوە بۆ ئاگاداربوونی رابەری گشتی حەسەن هوزەیبی لە رێکخستنی ئیخوانیی نوێ، دەجەوی دەستی کرد بە پرسیارکردنی سەیر لە سەید، سەید تێگەیشت کە دەجەوی ـ بە گێلی خۆی ـ لە لێکۆڵینەوەکەدا بە وتەکانی خۆی گفتوگۆی لەگەڵ ناکات، بەڵکو بە وتەکانی تاوانبارێکی ترگفتوگۆی لەگەڵ دەکات!

**دەجەوی:** تۆ وتت رابەر رازی بوو. . رێکخستنیش لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە هەستی بە سەرکردایەتیت دەکرد!

**سەید:** ـبە برواوە- دەترسم ئەمانە وتەی کەسێکی ترین!

**دەجەوی:** -بەرپەرچدەداتەوە- بەڵێ براکەم؟؟ نەخێر. . من بە وردی قسە دەکەم ئەی سەید قوتب. . پارێزەرەکەشت ئامادەیە، خۆ ئەگەر وتی ئەم وتانە بونیان نیە ئەوا دووریان دەخەینەوە. . تۆ بۆمات بوویت؟

دەجەوی کاغەزەکانی بەردەستی دەپشکنێت. . ڕاستی تێبینیەکەی سەید قوتبی بۆ دەردەکەوێت، کە بە وتەکانی تاوانبارێکی تر گفتوگۆی لەگەڵ دەکات!

**دەجەوی:** درێژەی زیاترت لەلایە لە بارەی ڕێکخستنەوە ئەی سەید؟

**سەید:** -بە بێزارییەوە- درێژەم لا نیە!

**دەجەوی:** تۆ فەرمانت داوە بە مەشقی چەند کۆمەڵێکی گیان بەخش؟

**سەید:** چەند کۆمەڵێکی وەرزشی.

**دەجەوی:** چیت وتووە لە بارەی کۆمەڵگەی هاوچەرخەوە ئەی سەید قوتب. . بەڵا نەکەی هەموو (**معالم في الطريق**)م بۆ باس بکەیت!

**سەید:** **معالم فی الطریق** لە کوێیە ؟ نە لەگەڵ منەو. . نە لەگەڵ خەڵك!!

**دەجەوی:** تۆ ماندوو بویت. . واتە با ڕێگەت بدەم پشوویەك بدەیت، یان دەتوانیت چارەکە کاژمێرێکی تر بەرگەمان بگریت.

**سەید:** باشتر وایە پشوو بدەم.

دەجەوی دانیشتنەکەی وەستاند بۆ پشوودان، پاش نیوکاتژمێر دەستی پێکردەوە!

**دەجەوی:** عەلی عشماوی دانی بەوەدا ناوە کە پاش خستنە ڕووی بابەتی سەرنگوم کردنەکان بە ناوەکانیانەوە، سەید قوتب لەسەری ڕازی بووەو وتووشیەتی ئەو دەیەوێت لە بەڕێوەبەری پۆلیسی جەنگیو بەڕێوەبەری نووسینگەی موشیر بدرێت!

**سەید:** عەلی عشماوی یەکێکە لە پێنج کەس!

**دەجەوی:** ئەوە ڕوویدا بوو؟

**سەید:** نەخێر. . ڕووینەداوە!

**دەجەوی:** ئەی ئەوەی ڕوویدا هەر ڕازیی بوونت بوو لەسەر سەرنگومکردنەکانو ناوەکانت زیاد نەکرد ؟

**سەید:** کارەکە لەوێدا کۆتایی پێهات کە تواناکان دەستەبەرنین بۆ جێبەجێکردنی ئەم پێشنیارانە!

**دەجەوی:** عەلی عشماوی دانی بەوەشدا ناوە، کە کۆمەڵەکە بە سەید قوتبیان وتووە ڕێکخستن نزیکەی (200)ئەندامو، پارە نزیکەی (4) هەزار جونیە و، چەکیش چەند ڕەشاشو دەمانچەیەکن!!

**سەید:** ئایا تەنها بە خۆمی وت یان لەبەردەم کەسانی تریشدا؟

**دەجەوی:** وەك یەکە. . ئەگەر تەنها بە خۆتی وتبێت درۆ دەکاتو ئەگەر لەبەردەم کۆمەڵەکەشدا بێت ڕاستەو دانی پیا دەنێیت؟

**سەید:** بەڵێ!

**دەجەوی:** عشماوی دانی پیاناوە کە تۆ پێت وتوون: پێویستە نەخشەکانمان هێرشیی بێتو پەنا نەبەینە بەر بەرگری، چونکە ئێمە گەر پەنا بۆ بەرگری بەرین ئەوا شکست دەخۆین. . کەواتە نەخشەکەت بریتیە لە هێرش. . هەرچەندە ئەمە هیچ لە دەعواکە ناگۆڕێت، چ تۆ بەرگریکەر بوویت یان هێرش بەر. . ئەمە پاڵپشتی ئەو وتەیەی عشماوی دەکات کە تۆ پێت وتوون: پێویستە سێ تەوژم ڕێکخەین. . ئەگەر دووەم شکستی خوارد سێهەم بەدوایدا دێت. . تەوژمەکانیش تەنها لە هێرشدا دەبن، باسیش کراوە لە ئامادەییەکانی نەخشەکەو ڕێککاریی هێرشەکە، ئەمە ڕوویدا ئەی سەید قوتب؟

**سەید:** ئەم وتانە بەم شێوەیە ڕووینەداوە!

**دەجەوی:** واتە بە شێوەیەکی تر ڕوویداوە؟

**سەید:** وتەکان تەنها ئەوەبوو کە. .

**دەجەوی:** -بەقیژاندنەوە- وەڵامی پرسیارەکە بدەرەوە؟

**سەید:** ڕووینەداوە!!

**دەجەوی:** دیارە عشماوی هەرگیز ناتوانێت خەڵك تێبگەیەنێت. . چونکە ئەو بە ڕەزامەندیەوە وتوویەتی کە تۆ ئەی سەید قوتب پێت وتوون: پێویستە چالاك ببنەوە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانمان بە هێز، لەگەڵ ڕژێمدا بکەوینە پێکدادان لە هەر کاتێکدا بێت لە کاتژمێری سفردا. . براکەت عەلی عشماوی وای وتووە. . وتووشیەتی ئێوە چەند ئامانجێکتان هەیە. . تۆش تاوەکو ئێستا ئەمانە ناڵێیت.

**سەید:** بەرگری لە خۆکردن!

**دەجەوی:** هەموو وتەکانیش لە بارەی هێرشو ڕێککاری تەورژمەکانو جێبەجێکردنیشیان کاتێك تۆ خۆت ڕەگەزی دەستپێشخەری دیاری دەکەیت؟

**سەید:** ڕێم دەدەیت بە وشەیەك!

**دەجەوی:** ئەگەر پێویست دەکات، بە مامۆستای پارێزەری بڵێ. . بەم شێوەیە دەجەوی کۆتایی بە دادگایی کردنی سەید هێنا، بەوەی کە ڕێی لێگرت لە وتنی وشەکەی، چونکە وتەکانی عەلی عشماوی بە درۆدەخستەوە. دەجەوی بڕیاریشی دا بەو سزادانە سامناکەی کە ڕوبەڕوی برایان کرایەوە، ئەوانیش وتەکانیان لەژێرئەشکەنجەدانا وتووە!

دەجەوی بەردەوام بوو لەسەر گفتوگۆ لەگەڵ تۆمەتبارانی ئیخوان بۆ ماوەی نزیکەی مانگێك، لە ڕۆژی 1966/5/18وە کۆتایی پێهێنانی کێشەکەی ڕاگەیاند تاکو حوکمیان بەسەردا بدرێت. .

ئەو ڕۆژەش ڕێکەوتی ڕۆژی گەڕانەوەی سەرۆك وەزیرانی ڕوسیا (الکسی کوسینجین) بوو لە قاهیرەوە. .

## سەید قوتب چاوەڕوان دەکات حوکمی بەسەردابدرێت

چوار مانگ بەسەر کۆتایی هاتنی دادگایی کردنەکەی سەیددا تێپەڕی، تیایدا سەید چاوەڕوانی دەکرد حوکمی بەسەردا بدرێت، لە ڕاستیدا سەید دەیزانی بەچی حوکمی بەسەردا دەدەن، دەیزانی کە ئەو حوکمە لە سێدارەدانە. لەبەر ئەوە چاوڕێی لە سێدارەدانی دەکرد، مامۆستا ئیبراهیم ئەلیسری لە گۆڤاری (الشهاب)دا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لێرەدا پێویستە ئەو دەمامکە لەسەر قسەیەکی سەید ـ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ لاببرێت کە بە نهێنیی بە یەکێك لە براکانی وتووە بە چەند هەفتەیەك پێش ڕاپێچکردنی. . وتەکەشی دەربارەی زایۆنیەتی جیهانییو مەترسی لەسەر جیهان بە گشتیو موسڵمانان بە تایبەتی بووە. . سەید دەڵێت: هەڵوێستەم کرد لەسەر ئاستی دەستیوەردانی زایۆنیەتو مەترسیەکەی، پاش لێکۆڵینەوەو ماندووبوون بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، جا ئەگەرجولەکەش بیان زانیایە کە من پەیم بەمە بردووە ئەوە دەبوایە هەر بکوژرامایە!)[1]

---

[1] گۆڤاری (الشهاب) ئەیلولی 1971، لاپەڕە (3)ساڵی پێنجەم.

### ئەحمەد ڕائف لە سەیدەوە دەگێڕێتەوە

دوای کۆتایی هاتن بە دادگایی کردنی سەیدو، لە پێش حوکم دان بە سەریدا، ئەحمەد ڕائف لە زینداندا چاوی بە سەید کەوت، ئەم چاوپێکەوتنەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (جارێکیان، لەگەڵ هەندێك هاوەڵدا بردمیان بۆ ئامادەکردنی خواردن لە چێشتخانەو لە ڕێگەدا هەل ڕەخسا بۆ قسەکردن لەگەڵ سەید قوتب. .

ـ لە کۆی قسەکانماندا ـ پێم وت: چاوەڕێی چی دەکەیت؟

ئەو پیاوە بەزەردەخەنەیەکی پڕ لە متمانەوە، هەڵقولاّو لە سنگێکی هێمنی دڵنیاو ئارامەوە پێی وتم: (**أنتظر الوفود علی ربي**) چاوەڕوانی نمایندەیی دەکەم بۆ لای پەروەردگارم. هەموو ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد ئەوەبوو، بەلاّم ئەوەی لە دادگادا دەیوت، ئەوە مەبەستی بوو بەو وتانە شتێك بۆ مێژوو بلێت. . )[1]

بە ڕاستی سەید چاوەڕوانی هەنگاونان بوو بۆ خزمەتی پەروەردگارەکەی، چونکە ئەو هەستی دەکرد کە ئەو ئەرکەی لەسەر شانی بوو بە جێی گەیاند، ئەو خیانەتی لە ئەمانەت نەکردو وازی لە دینو بانگەواز نەهێنا. . بەڵکو تا کۆتا چرکە بانگەوازەکەی گەیاند. .

سەید دەیزانی کە ئەو قەومە –حکومەت- ئەم جارە ئەمیان دەوێت. ئەم وتەیەی خۆی لێ دەگێڕنەوە: (بەڕاستی من زانیم کە ئەمجارە حکومەت سەری منی دەوێت، من بۆ ئەوە پەشیمان نیم، بە ئەسەفیش نیم بۆ لە دنیادەرچونم، بەڵکو من بەختەوەرم بۆ مردن لە پێناوی بانگەوازەکەدا، مێژوونووسان لە داهاتوودا بڕیاری ئەوە دەدەن کە کێ لەسەر حەق بووە، برایان یاخود ڕژێمی فەرمانڕەوا!)[2]

سەید ئەوەی دەزانی، چونکە هەر خۆیەتی کە لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: (ئەوە ئێستە کاتی ئەوە هاتووە مرۆڤی موسڵمان سەری ببەخشێت لە نرخی ڕاگەیاندنی بوونی بزاڤێکی ئیسلامیدا)[3]

وتەی شاعیر بەڕاست دەردەچێت لە سەید قوتبدا کە دەڵێت:

**لعمرك اني اری مصرعي ــــــ ولكن اغذ اليه الخطا**

**لعمرك هذا ممات الرجال ــــــ فمن رام موتا شريفا فذا**

### کەمالەدین حسێن پشتگیری لە سەید دەکات

دادگاییە پڕ لە ستەمەکەی دەجەوی و ئەشکەنجە ترسناکەکانی خوێنڕێژەکان چاودێرانی ڕووداوەکانی هەژاند، زۆربەشیان لەبەر سەلامەتی خۆیان بێدەنگیان هەڵبژارد.

لەوانەی کە دادگاییەکان کاری تێکردو هەژاندی، بەڕێز کەمالەدین حسەین بوو، کە ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆڕشو وەزیری پێشووی پەروەردەو فێرکردنو جێگری پێشووی سەرەك کۆمار بووە!

نامەیەکی نارد بۆ سەرۆك عەبدولناسرو وێنەیەکی لێ نارد بۆ عەبدولحەکیم عامر بەو سیفەتەی کە بەرپرس بوو لە دەزگای لێکۆڵینەوەی تاوانکاری سەربازی ئەوبووکە هەستابوو بە ڕاپێچکردنو ئەشکەنجەدانی برایان.

ئەمەش دەقی نامەکەی کەمالەدین حسەینە بۆ عەبدولناسر:

بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕێز جەمال عەبدولناسر ـ سەرۆك کۆمار

لە کەمالەدین حسینەوە. .

السلام عليكم ورحمه الله وبركاته. . لە پاشاندا. .

---

[1] البوابة السوداء: 223.

[2] الشهيد سيد قوطب: 56.

[3] لماذا أعدموني: 7.

خێرو چاکەم تێدا نیە ئەگەر پێت نەڵێم. لە خوا بترسە. .

(وَمَن يتَقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجا)

(وَمَن يتَقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ منْ أَمْرِهِ يُسْراً)

(وَمَن يتَقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْراً)

لە خوا بترسە. .

خوای گەورە بە پێغەمبەرە نازدارەکەی خۆی فەرموو: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ).

لەخوا بترسە. .

لەوانە مەبە کە خوای گەورە بەرامبەریان دەفەرموێت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ).

لەخوا بترسە. .

خوای گەورە فەرمانی پێکردووە بە پێغەمبەر و ئیمانداران. . پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) فەرمانی پێکردووە بە هاوەڵە ئیماندارەکانی. . خەلیفەو پێشەوایان بە یەکتریو بە والیەکانیانو بەموسڵمانان. . موسڵمانان وتویانە بە خەلیفەکانو پێشەوایانو والیەکان. . وتویانە بەیەکتریش.

لەخوا بترسە. .

ئەو نەوەیە وتوویەتی کە خوای گەورە ڕێزی پێ بەخشیوە بەم ئایەتە: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ. . ).

وە سڵاو لەسەر ئەو کەسەی کەشوێنی هیدایەت دەکەوێت[1].

نامەکە گەیشتە عەبدولناسر، عەبدولحەکیم و عەبدولناسر لە خوا نەترسان، بەڵکو عەبدولناسر ژیریو بیروهۆشی لەدەستداو کەمالەدین حسەینی جێگری پێشووی ڕاپێچی زیندان کرد!

عەبدولناسر لە خوای خۆی نەترسا، بەڵکو فەرمانی کرد بە لە سێدارەدانی سەید قوتب!!

## دوو نامەی ئیمانیی مەزنی سەید قوتب

لەم ماوەیەدا کە سەید تیایدا چاوەڕوانی حوکمی لە سێدارەدانی دەکرد، لە بارێکی ئیمانی مەزندا دەژیا، لە لوتکەی بەختەوەریو دڵئارامیدا بوو، لە لوتکەی متمانەو ڕازیبوندا بوو. . سەرەڕای سەختی ئەو ژیانە مادییەی کە تیایدا دەژیا، کە بریتی بوو لەکەشو هەوای زیندانی جەنگیو ئەشکەنجەدانو زیندانەکان!

حاڵەتە ئیمانیە مەزنە پڕ لە ڕەزامەندیەکەی لە دوو نامەی ئیمانی مەزندا دەردەکەوێت کە سەید لە ماوەی چاوەڕوانیەکەیدا بۆ حوکمی لە سێدارەکان ناردبووی بۆ هاوڕێ ئەدیبە سعودیەکەی مامۆستا ئەحمەد عەبدولغەفور عەتار.

مامۆستا عەتار دەربارەی چۆنیەتی گەشتنی نامەکانی سەیدبەدەستی دەڵێت: لە دوای دادگایی کردنەکەیدا کار گەشتە ئەوەی کاریگەری سەید قوتب فراوان بوو تاکارکردە سەر پاسەوانە توندوتیژەکانی!

لەسەیدەوە دوو نامەم پێ گەشت لە مانگی سەفەری 1386ك، حوزەیرانی 1966ز، بە هۆی ئەفسەرێکەوە لە موخابەراتی عەبدولناسر پێم گەشت، کە پەیوەندیدار بوو بەو پاسەوانانەوە. .[2]

مامۆستا عەتار دەقی هەردوو نامەکەی سەیدی بە دەستو خەتی سەیدخۆی بە (زەنگۆگراف) لە ژمارە دووی گۆڤاری (**كلمة الحق**)دا کە لە مەککە دەری دەکرد بڵاوکردەوە، دواتر لە ژمارە چوارو کۆتایی هەمان گۆڤاردا بۆ جاری دووەمو سێیەم

[1] الموتي يتكلمون: 196 ـ 197.

[2] گۆڤاری (كلمة الحق) ساڵی یەکەم، ژمارە دوو: 40.

بڵاوی کردنەوە. . مامۆستا عەتار هەواڵە شەخسیەکانی تۆمار کردووە کە لە دونامەکەدانو پەیوەندی بە کەسانی نزیکەوە هەبوو لە سەیدەوە، تیایدا وەسێتی بۆ عەتار کردبوو کە چاك بێت لەگەڵیان، ئەمەش دەقی هەردوو نامەکەیە:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

برام ئەحمەد:

سلاوو ڕەحمەتو بەرەکاتی خوات لەسەر بێت، پاشان:

بە ڕاستی لە دوای ئەم ماوە دووردرێژەوە خۆشحاڵبووم بە نامەکەت. . ئەگەر من خەمبار بووم بەوەی بە سەرت هات لێرەو لەوێ، لەگەڵ ئەوەداکە دەزانم تۆ پیاوێکی بڕوات بە خۆت هەیە، تۆ دەتوانیت خۆت خۆت بونیاد بنێیت جارێكو جارێکی تر ـ بە کۆمەکی خوا ـ هەروەك چۆن بونیادت نا ، ئەم بەربەستە کتوپڕیانە لە توانات کەم ناکاتەوە، مەحرومت ناکات لە ئارامی دڵکەت، لە دامەزراوی هەنگاوەکانت. .

پێم خۆشە زیاترت بۆبنوسم. .

بەڵام دەمبینی کە من لە عەقیدەو ئیماندا چاکترم لە هەر کاتێکی ڕابردوو ، لە ڕوونی ئەم عەقیدەیەو ئەم ئیمانە لە دەروونمدا. . لە ڕوونی هەستکردنو بۆچوونمدا بۆ ئەم کارەو بۆ داخوازیەکانی. . ڕوونی ئامانجو هۆکارو ڕێگاو مەبەست. . هەموو ئەمانە چاکەیەکی زۆری جوانە، زۆرترە لە هەموو ئەوەی لە نرخیدا من پێشکەشم کردووە، لە پشوودانو تەندروستیم . سوپاس بۆ خوا. من ئومێدەوارم بمێنمەوە لەسەر پەیوەندیکردن بە تۆوە، لەم ڕێگەیەوە، کە خوای گەورە دوای ونبونێکی دووردرێژ بۆی کردینەوە. . .

بەڵام نامەی دووەم، ئەوەیان گرنگترو مەزنترو سەرسوڕهێنەرترە لە نامەی یەکەم:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

برام ئەحمەد:

سلاوو ڕەحمەتی خوات لێ بێ. . پاشان. .

کوڕەکەم پێی ڕاگەیاندم. . کە ئەو وەك وەسێتم بۆ کردبوو بە ناوی منەوە بۆی نووسیبوویت، تۆش وەڵامت داوەتەوە، بەوەی من لە تۆدا بینیومە لە دەروون ئارامیی. . ئاساییە سوپاست بکەم؟ بڕواشم وایە گرنگتر لەوەی سوپاست بکەم، ئەوەیە دڵنیات بکەم لە خۆم، کە من لەو حاڵەمدام کە دەیزانیت. .

بە ڕاستی خوام دۆزیەوە، بە شێوەیەك کە هەرگیز لەوەو پێش نەم دۆزیبووەوە، بەڕاستی پرۆگرامەکەیو ڕێگەکەیم ناسی، بە شێوەیەك کە هەرگیز لەوەو پێش نەم ناسیبوو. . بەڕاستی دڵئارام بووم بۆ لای چاودێریەکەی، متمانەم کرد بە بەڵێنەکەی بۆ ئیمانداران، بە شێوەیەك کە هەرگیز لەوەوپێش وا دڵئارام نەبووم. . من دوای ئەمانە لەسەر ئەوەی بەڵێنی پێدام سەرم بەرزە و بۆ جگە لە خوا داینانەوێنم، خوای گەورە ئەوەی بیەوێت دەیکات. . خوای گەورە زاڵە بەسەر فرمانیدا، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. . [1]

## دەجەوی حوکمەکانی عەبدولناسر دەردەبڕێت

دوای چوارمانگ لە دادگایی کردنی سەید قوتبو براکانی، لە ڕۆژی یەکشەممە 1966/8/21دا فەریقی یەکەم فوئاد دەجەوی حوکمەکانی بەسەر هەر چلو سێ تۆمەتبارەکەدا لە قەزیەی ڕێکخستنی برایاندا دەرکرد. .

بەڵکو دەڵێین: دەجەوی ئەو حوکمانەی دەربڕی کە عەبدولناسر دەری کردبوون بەسەر سەید قوتبو براکانیدا.

ئەگەر بمانەوێ وردتر بڵێین: دەجەوی ئەو حومانەی دەربڕی کە دوژمنانی ئیسلام ـ لە زایونیەتو خاچپەرستانو بێباوەڕان ـ دەریان کردبوو بەسەر سەیدو براکانیدا!

حوکمەکانیشی زۆر سەختو ستەمکارانەو توندو تیژبوون، بە شێوەیەك هیچ یەکێکیان لێی دەرباز نەبوون!

---

[1] هەمان سەرچاوە: 40.

حوكمیدا بەسەر حەوت كەسیاندا بە لەسێدارەدان، بەسەر بیستو پێنج كەسیاندا بە زیندانی هەتا هەتایی، بەسەر یانزە كەسیاندا بە زیندان لە پانزە ساڵەوە تا دە ساڵ، ئەوانەی حوكمی لە سێدارەدانیان بەسەردا سەپێنرا سەركردەكانی ڕێكخستنی برایان بوون كە بریتیبوون لە: سەید قوتب، محەممەد یوسف هەواش، عەبدولفەتاح ئیسماعیل، سەبری عەرەفە، ئەحمەد عەبدولمەجید، مەجدی عەبدولعەزیز، عەلی عشماوی[1]

بەڵام عەلی عشماوی ئەو كەسایەتیە گومان لێكراوە نامۆیە حكومەت دوای ماوەیەكی كەم ئازادی كرد، كاری بۆ ئاسان كرد تا سەفەر بكات بۆ ئەمەریكاو ئێستە لەوێ دەژی!

ئەحمەدو مەجدی و سەبری، ئەوانیش حوكمەكەیان ئاسانتر كرا بۆ زیندانی هەتا هەتایی، بەڵام سەید قوتبو عەبدولفەتاح هەواش، حوكمی لە سێدارەدانیان بەسەردا جێبەجێ كراو لە سێدارە دران.

## مەمدوح ئەلدێری چۆنیەتی ڕاگەیاندنی حوكمی لەسێدارەدان بەسەید دەگێڕێتەوە

هەركاتێك دادگا بیویستایە حوكمە سەپێنراوەكانی سەر برایان دەربڕێ، هەموویانی دەخستە ناو قەفەزی تاوانباركردنەوە، ئەو كەسەی كە دەیانویست حوكمی تایبەتی خۆی بدەن بە گوێیدا، لە قەفەزی تۆمەتباركردن دەریان دەهێنا بۆ ژورێكی تایبەت بە تەنیشتی قەفەزەكەوە، حوكمەكەی خۆی دەبیستو پاشان دەیان گێڕایەوە بۆ لای براكانی. .

مەمدوح ئەلدێری كە یەكێك بوو لە برا حوكم بەسەردا دراوەكان. . دەگێڕێتەوە كە چۆن حوكمی لە سێدارەدانیان دا بە گوێی سەید قوتبداو دەڵێت:

ڕۆژی دەربڕینی حوكمەكان هەموومانیان لە ناو ئۆتۆمبێلێكی بەرگری مەدەنیدا برد، هەموومانیان خستە ناو قەفەزەوە، لە هەمان ژووردا ئەندازیارێكی تێدا بوو كە هەڵدەستا بە تۆماركردنی حوكمەكان لەو ژوورەدا كە بە تەنیشتی ئەو ژوورەوە بوو كە قەفەزەكەی تێدا بوو. . مامۆستا سەیدیان بانگ كرد. . بردیانە ژوورەكەی تەنیشتیو لەوێ حوكمەكەیان بۆ دەربڕی. . بینیمان ئەو ئەندازیارە كەحوكمەكان تۆمار دەكات دەگری. . ئیتر زانیمان كە حوكمەكەی سەید لە سێدارەدانە!

مەمدوح ئەمەش دەڵێت: گوێم لێبوو كاتێ سەید حوكمەكەی خۆی درا بە گوێدا، وتی: الحمد لله.[2]

## زەینەب غەزالی دواسەردانی سەید بۆ لای حەمیدەی خوشكی دەگێڕێتەوە

زەینەب غەزالی ـ كە لەگەڵ حەمیدەدا لە یەك زینداندا بوون ـ هەواڵی دواسەردانی سەید دەگێڕێتەوە بۆ لای خوشكە زیندانیەكەی —حەمیدە– لە زینداندا:

(پاش دەركردنی حوكمەكان بە پێنج ڕۆژ، درا لە دەرگای زیندانەكەو كرایەوە، سەید قوتبی برامان هاتە ژوورەوە، سەفوەت ئەلڕوبی وئەفسەرێكی ئەركانی جەنگی زیندانی لەگەڵ بوو پێیان دەوت ئیبراهیم. .

ئەفسەرەكە ڕۆشتو سەفوەتو بەڕێز سەید قوتب مانەوە. .

وتم: سڵاوت لێبێت ئەی سەیدی برا، ئەمە شتێكی كتوپڕی دڵخۆشكەرە، بەلامانەوە زۆر بەنرخە، ئەمە چەند چركەیەكە لە ڕەزامەندی خوا كە لەگەڵماندا دابنیشی!

سەید دانیشتو دەستی كرد بە قسەكردن دەربارەی ئەجەلو وادەكانی، ئەوەی كە هەمووی بە دەستی خوایەو هیچ كەس دەسەڵاتی تیایدا نیە جگە لە خوا. . فەرمانی پێكردین بە ڕازی بوونو تەسلیم بوون، وتەكانی دەربارەی ڕەزایەت بوو بە قەزای خواو، بە نهێنی هەندێ وشەی نهێنیشی بە من وت.

---

[1] الموتى يتكلمون: 194 ـ 195.

[2] مذابح الاخوان: 118.

لێرەدا سەفوەت ئەلڕوبی تورە بوو، ڕقی هەستاو چاوپێکەوتنەکەی کۆتایی پێهێنا، پیشەوای شەهیدیش بۆ ئێمەی ڕوانی و وتی: ئەوەی لەسەرمانە، ئەوەیە خۆمان ڕابێنین لەسەر ئارامگرتن. . پاشان ڕۆشت. . ).[1]

## مەلیك فەیسەڵ واسیتە دەكات تا سەید قوتب لە سێدارە نەدرێت

حوكمدان بەسەر سەید قوتبو هەردوو براكەی ـ محەمەد یوسف هەواشو عەبدولفەتاح ئیسماعیل ـ زۆرێك لە ناڕەزاییو خۆپیشاندانی هێنایە كایەوە، لەگەڵ حەملەی دژایەتی كردنو ناڕەزایی دەربڕین لە ژمارەیەك لە وڵاتە عەرەبیو ئیسلامیەكاندا!

ژمارەیەك لە برایانی موسڵمان لە وڵاتە عەرەبییەكاندا پەیوەندیان كرد بە ژمارەیەك لە بەرپرسانەوە تا واسیتە بكەن لای عەبدولناسر بۆ سوك كردنی حوكمی لەسێدارەدان لەسەر سەیدقوتب.

لەوانە كە واسیتەیان كرد لای عەبدولناسر، مەلیك فەیسەڵی كوڕی عەبدولعەزیز بوو.

ئەحمەد ڕائف لەو كتێبەیدا كە لەم دواییەدا بە چاپ گەیەنرا (سراديب الشيطان) چیرۆكی مەلیك فەیسەل لەگەڵ عەبدولناسردا دەگێڕێتەوە كە وەریگرتووە لە یەكێك لە وەزیرەكانی لای عەبدولناسرەوە:

ئەحمەد ڕائف لە ژێر ناونیشانی (فەیسەڵ شەفاعەت بۆ سەید قوتب دەكات) دەڵێت: چیرۆكێكم بیركەوتەوە كە لەم دواییەدا یەكێك لە وەزیرەكانی سەردەمی عەبدولناسر بۆی گێڕامەوە ،چیرۆكەكەش لە كاتی لە سێدارەدانی شەهید سەید قوتبدا بوو، ئەم وەزیرە دادەنیشێت لەگەڵ عەبدولناسردا بۆ مشتومڕی هەندێك ئیشو كاری ئابووری. لەم دانیشتنەدا ئەنوەر ساداتو حسەین ئەلشافیعی ئامادە دەبن.

سامی شەرەف هاتە ژوورەوە، كاغەزێكی بە دەستەوە بوو، هەوڵیدا بچرپێنی بە گوێی عەبدولناسردا، ئەویش دەنگی بەرزكردەوەو بە توندی وتی:

ـ چیە؟ چی تیایە؟

سامی شەرەف بە ترسو لەرزەوە وتی:

ـ ئەی گەورەی من! ئەمە بروسكەیە كە لە مەلیك فەیسەڵەوە، تكاو ڕجای زۆر دەكات كە سەید قوتب لەسێدارەنەدرێت.

تووڕەییو بێزاریەك بە دەموچاوی عەبدولناسرەوە دەركەوتو وتی:

ـ من نازانم منداڵانی وڵاتەكان بۆ هێندە گرنگی بە سەید ئەدەن؟

سامی شەرەف بە لەرزۆكی وەستابوو، عەبدولناسر نەڕاندی بەسەریدا. .

ـ بڕۆ دەرەوە!

سامی شەرەف بە پەلە شوێنەكەی جێ هێشت

جارێكی تر عەبدولناسر وەستاندیەوەو پێی وت:

ـ گوێ بگرە. .

ـ گەورەم. .

عەبدولناسر كەمێك بیری كردەوەو بڕیاریدا، خوا بیكوژێت چ بڕیارێك بوو، پاشان خوا بیكوژێت چۆن بڕیارێكی دا، پاشان پشتی هەڵكردو خۆی بە گەورە گرت، وتی:

ـ بەیانی زۆر بەزوویی لە سێدارەی بدەن، لە پاش لە سێدارەدانی بروسكەكەی فەیسەڵم بۆ بهێنەرەوە! پاشان بروسكەیەكی داوای لێبوردنی بۆ بنووسە. .

وە لە ئەهرامدا لە دوو دێڕدا دەنووسرێت (تم الاعدام). .

---

[1] ايام في حياتي: 182.

لای کردەوە بەلای دوو نەفەرەکەوە ـ دوو جێگرەکەی ـ بە پێکەنینەو گاڵتەجاڕیەکەوە وتی: وانیە. . ئەی چی؟
ئەوانیش بەشداریان لە پێکەنینەکەدا کرد و سامی چوویە دەرەوە.
سەید قوتب لەگەڵ بەرەبەیاندا لە سێدارە درا. . لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا تەعزیەی بۆ دانرا. .
ئەحمەد ڕائف بەردەوام دەبێت لە سەر چیرۆکەکەی:
منیش قورگم وشکبوو، پرسیارم لە وەزیرەکە کرد:
ـ ئەی تۆ چیت وت؟
وتی: تۆ عەبدولناسر ناناسی. . هیچ کەسێك نیە بتوانێت مشتومڕی لەگەڵ بکات. . هەقت چیە بە نارەزایی دەربڕین لەسەر حوکمەکەی. .
ـ منیش بە سەرسوڕمانەوە پرسیارم لێکردەوە:
ـ ئەی لە دوای جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدان، ئایا هیچ یەکێك لە وەزیرەکان پەژارەو نارەزاییان دەرنەبڕی؟
ـ وتی: دوای جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدانی شەهید سەید قوتب، هەر وەزیرێك هەوڵی ئەوەی ئەدا لەوەوە وشەیەك بگەیەنرێتە سەرۆك کە بەڵگە بێت لەسەر خۆشحاڵبوونی، پاشان ئەحمەد رائف کاریگەری هەواڵی لە سێدارەدان لەسەر فەیسەڵ دەگێڕێتەوە.
بیری حاجی ساڵح ئوزجانم کەوتەوە کاتێك پێی وتم:
ـ چوومە لای مەلیك فەیسەڵ بە ڕەحمەت بێت، کاتێك سەید قوتب لە سێدارە درابوو، تا ئەوکاتە من ئەم هەواڵەم نەبیستبوو بینیم زۆر خەمبارەو فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارەوە.
سەرم سوڕماو حەپەسام پرسیارم لێ کرد، پێی وتم:
ـ خوای گەورە پاداشتت گەورەترکات لە شەهید سەید قوتب دا، ئەمڕۆ ئەو بەدیداری خوای خۆی گەشت!
ـ منیش بە پەشۆکاویەوە وتم: **إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ**
مەلیك فەیسەڵ وتی:
نامەم بۆ ناردن واسیتەم کرد بۆ لای کە بە زیندوویی ئازادی بکات، هەرچیەکی دەوێت لەسەری داوا بکات، بەڵام ئەمە ویستی خوایە، بۆ هەموو ئەجەلێك نووسراوێك هەیە، دەبێت ئەم نەتەوەیە شەهیدی هەبێت.
تا ئێستەش لەگەڵ ئەحمەد ڕائفداین لە چیرۆکەکەیدا، ئەوەتە کاریگەری ئاگاداربوونی زیندانیەکان لە هەواڵی شەهیدکردنی سەید قوتب دەگێڕێتەوەو دەڵێت:
پەیمانداوە بە یادکردنەوە بۆ ئەو ڕۆژەی تیایدا هەواڵی لە سێدارەدانی شەهیدمان پێ گەشت، کە ئێمە لەو ڕۆژەدا لە زیندانی ئەبی زەعبەلی سیاسیی بووین، قسەکردن حەرامو قەدەغە بوو، ترسو بیم باڵی کێشابوو بەسەر زیندانو بەندیخانەکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا یەکەم نوێژی جەماعەت لە ئەبی زەعبەل ئەنجامدرا. . ئەویش نوێژی شێوان بوو. . ئیمام ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَاناً فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِين**) (المائدة: 27). ئیتر زیندانەکە پڕبوو لەناڵەی گریان!. . )[1]

---

[1] سراديب الشيطان: 149 ـ 152.

## حەمیدە قوتب موساوەماتی شەوی لەسێدارەدان دەگێڕێتەوە!

مساوەماتی زۆر لەگەڵ سەید قوتبدا کرا، تا واز لە بانگەوازەکەی بهێنێتو پشت لە کارەکەی هەڵکاتو لەگەڵ خوای گەورە پەیوەندی بپچڕێت و خۆی دابڕێت لە ڕێکخستنی نوێی برایان، داوای لێکرا تەنها دێڕێك یان ڕستەیەك بۆ سەرۆك عەبدولناسر بنووسێت ، داوای ایبوردنی لێبکات تا بەزەیی پیایدا بێتەوە، ئەوکاتە لە زیندانەکەی دەردەچێت وحوکمی لە سێدارەدانەکەی هەڵدەوەشێتەوە، دونیای بۆ والاّ دەکرێت، هەرچیەکی دەوێت لە پلەو پایەو شوێنو پیشەو سەروەتو سامان بیبات بە ئارەزووی خۆی. .

ئەم مساوەمات کردنە درێژەی کێشا، تا کۆتا شەوی ژیانی، خوێنرێژان حەمیدەی خوشکی سەیدیان بەکارهێنا بۆ فشار خستنە سەری تا وەلاّمیان بداتەوە، با گوێ بگرین لە حەمیدە مساوەماتی شەوی لە سێدارەدانمان بۆ بگێڕێتەوە: (حەمزە ئەلبەسیونی ـ بەڕێوەبەری زیندانی جەنگی ـ بانگی کردم بۆ نووسینگەکەی، حوکمی لە سێدارەدانو ئیمزا لەسەرکردنەکەی نیشاندام.

پاشان پێی وتم: حکومەت ئامادەیە ئەم حوکمە سووك بکات، ئەگەر براکەم وەلاّمیان بداتەوە بۆئەوەی لێی داوا دەکەن!

پێی وتم: تیاچونی براکەم نەك بە تەنها بۆ تۆ بەڵکو زیانێکە بۆ میسر بە گشتی، من وای بۆ ناچم دوای چەند کاتژمێرێك ئەم کەسە لە دەست بدەین، ئێمە دەمانەوێت ڕزگاری بکەین لە لەسێدارەدان بەهەر جۆرو بە هەر هۆکارێك بێت.

چەند وشەیەکە کە بیڵێت. ڕزگاری دەکات لە حوکمی لە سێدارەدان، هیچ کەسێك ناتوانێت کاری تێبکات تۆ نەبێت، بە تەنها تۆ ڕاسپێراوی کە ئەوانەی پێ بڵێیت کەمن ڕاسپێراوم پێی بڵێم، بەلاّم هیچ کەس لە تۆ چاکتر نیە کە ئەم فەرمانەی پێ بگەیەنێت، چەند وشەیەکە دەیڵێت، ئیتر هەموو شت کۆتایی پێ دێت! **دەمانەوێت بڵێت: ئـەم بزاڤە -برایانی موسڵمان- پەیوەندیدارە بە لایەنێکەوە، دوای ئەوە قەزیەکە تایبەت بە تۆ کۆتایی دێت، بەلاّم ئەو بە لێبوردنێکی تەندروستی ئازاد دەکرێت!** منیش بە حەمزەم وت: بەلاّم تۆ دەزانی ـ هەروەك چۆن عەبدولناسریش دەزانێ ـ کە ئەم بزاڤە بە هیچ لایەنێك لە لایەنەکانەوە پەیوەندیدار نیە! حەمزە ئەلبەسیونی وتی: من دەزانم، هەمووشمان دەزانین کە ئێوە تاکە لایەنن لە میسردا کاردەکەن لە پێناوی عەقیدەدا، ئێمە دەزانین کە ئێوە چاکترین خەڵکن لە ولاّتەکەدا، بەلاّم ئێمە دەمانەوی سەید قوتب لە لەسێدارەدان ڕزگار بکەین!

پاشان سەیری سەفوەت ئەلڕوبی کردو پێی وت: بیبەرەوە بۆ لای براکەی.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای براکەم، سلاّوم لێکرد، ئەوەی ئەوان لێیان دەویست پێم ڕاگەیاند، ئەویش بۆی ڕوانیم، تا کاریگەری ئەوە ببینێ لەسەر دەمو چاوی من، وەك ئەوەی پێم بڵێت ئایا تۆ داوای ئەمە دەکەیت یان ئەوان؟ توانیم بە ئاماژە تێی بگەیەنم کە ئەوان. لێرەدا بۆی ڕوانیمەوەو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بوایە دەم گوت، هیچ هێزێك لەسەر زەویدا نەیدەتوانی ڕێگەم لێ بگرێت لە گوتنی! بەلاّم ڕووی نەداوە، من هەرگیز درۆ ناکەم!!

سەفوەت پرسیاری لێ کرد: یەعنی ئەوەبیرورِاتە؟

سەید وەلاّمیدایەوە: بەڵێ!

سەفوەت جێی هێشتینو وتی: بە گشتی تۆزێك لەگەڵ یەك دانیشن!

منیش چیرۆکەکەم لە سەرەتاوە لە براکەم گەیاند: پێم وت: حەمزە بانگی کردوم لە سێدارەدانەکەی پێ نیشانداوم، داوای لێکردووم کە ئەم داوایە لە تۆ بکەم!

لێی پرسیم: ئەی خوشکم تۆ ڕازیت بەمە؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئەوانە توانای سودو زیان گەیاندنیان بە خۆیان نیە، تەمەنەکان بە دەستی خوایە، ئەوان توانای حوکم کردنیان لە ژیانی منداڵ نیە ، ناتوانن تەمەنەکان درێژ بکەنەوە، ناتوانن کورتیشی بکەنەوە، هەموو ئەمانە بە دەستی خوایە. . خوای گەورە بە هەموو شتێکیان ئاگادارە)[]

ئەوە کۆتا یەکتر بینین بوو لە نێوان حەمیدەی موجاهیدەو برا شەهیدەکەیدا!!

## وتەکانی سەید کە لە بەرزیو بڵندیدا بەسەر فشارو نارەحەتیەکاندا وتویەتی

چەند دەستەواژەیەك گێڕراونەتەوەو دراونەتە پاڵ سەید قوتب، کە ئەو لەو بارودۆخەدا دەری بڕیون ـ بارودۆخی مساوەمات و فشارو تەماع خستنە بەردەم ـ ئەو بەو وتانەی بەرپەرچی هەموو ئەو هەوڵانەی داوەتەوە کە لەگەڵیدا دراوە بۆ پێ هەڵخلیسکاندن و لەقکردنی هەڵوێستەکەی و واز پێهێنانی لە بانگەوازەکەی!

یەکێك لە براکانی پرسیاری لێ کرد: بۆچی تەواو ڕاشکاوانە قسەت دەکرد لە دادگادا لەکاتێکدا دەتتوانی گەردنی خۆت بپارێزی؟ وتی: **چونکە لە عەقیدەدا پێچ لێدان ڕەوا نیە، سەرکردە بۆی نیە کە بە ڕوخسەت کار بکات!.**

کاتێك حوکمی لە سێدارەدانەکەی بیست وتی: **سوپاس بۆ خوا بە ڕاستی پانزە ساڵ کارم کرد بۆ بەدەستهێنانی شەهیدی.**

لە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ حەمیدەی خوشکی پێی وت: ئەگەر باوکی ڕابەر (حەسەن ئەلهوزەیبی )ت بینی سەلامی منی پێ بگەیەنە، پێی بڵێ: **سەید بەرگەی قورسترین شتی گرت کە مرۆڤ بەرگەی بگرێت، تا کەمترین خراپەی پێوە نەنیشێت.**

کاتێك داوای لێ کرا داوای لێبوردن بکات لە بەرامبەر ئازادکرنیدا، وتی: **داوای لێبوردن ناکەم لەوەی کارم لەگەڵ خوادا کردووە!**

کاتێك داوای نووسینی چەند وشەیەکیان لێکرد تا عەبدولناسر ڕەحمی پێ بکات، وتی: **ئەو پەنجە شایەتومانەی کە لە نوێژدا شایەتی تاك و تەنهایی بۆ خوا دەدات، ڕەفزی ئەوە دەکات کە تەنها پیتێك بنوسێت حوکمی ستەمکاری پێ بچەسپێ.**

لە بەرپەرچدانەوەی ئەو داواکاریەدا وتی: **بۆچی داوای ڕەحم پێکردن بکەم؟ ئەگەر بە ڕەوا زیندان کراوم ئەوە حوکمی ڕەوام پێ ڕەوایە! ئەگەر بە ناڕەوا زیندانی کراوم، ئەوە من گەورەترم لەوەی داوای ڕەحم پێکردن لە ناڕەوا بکەم!!**[].

لەم دەربڕینانەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە خوای گەورە چۆن سەیدی تا کۆتا چرکە لە ژیانیدا لەسەر حەق دامەزراوو چەسپاو کردووە، بە شێوەیەك ئەم وتەیەی خوای بەسەردا دەچەسپێت کە دەفەرموێت: (**مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً**) (الأحزاب: 23).

هەروەك لە بەرزبوونەوەیدا بەسەر هەموو مساوەماتەکاندا ئەم ئایەتە دەیگێڕێتەوە: (**وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتفْتَرِيَ عَلَينا غَيْرَهُ وَإِذاً لاَّتَّخَذُوكَ خَلِيلاً* وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً* إِذاً لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيراً**) (الإسراء: 73 ـ75).

هەر لەسەر بەرزبوونەوەی بەسەر مساوەماتەکان و، دامەزراوی لەسەر حەق، وتەی شاعیری موجاهید جەمال فەوزی بەرەحمەت بێت بەسەردا دەچەسپێ کە لە دیوانی (**الصبر والثبات**)دا دەربارەی شەهیدی حەق دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **باع الحياة رخيصة** | **لله يرجو اجرها** |
| **حتى طوته سجونهم** | **دهرا وفي ظلماتها** |
| **كم ساوموه لكي يحيد** | **عن العهود باسرها** |

---

[] أيام في حياتي: 183 ـ 184.

[] لماذا اعدم سيد قگب واخوانه: 2.

| | |
|---|---|
| ولكي يخون كتائبا | باعوا النفوس لربها |
| ولكي يشوه ماأضاء | الكون من صفحاتها |
| ولكي يكون صنيعة | الشيطان بين صفوفها |
| وأبى الكريم مباهج | الدنيا وطلق امرها |
| ورأى السجون معاقل | الاحرار رغم قيودها |
| وأصر أن يعلي نداء | الحق في جنباتها |
| فقضى السنين العشر | عملاقا كشم جبالها |
| وطوته جدران السجون | لكي يرى اهوالها |
| كم فرقته سياطهم | وتلقفه كلابها |
| حتى ارتفته شهادة | ليكون من ابرارها |
| وهناك يلقى ربه | ويطل من عليائها.[1] |

## عەبدولموتەعال ئەلجەبوری دەربارەی شەوی لە سێدارەدان دەدوێت

عەبدولموتەعال دەگێڕێتەوە کە حکومەت زۆر پەلەی کرد لە لەسێدارەدانی سەید قوتبو براکانیدا: (ئەوەی تەمەنی لە شەست ساڵ زیاتر بێت، حوکمی لەسێدارەدانی بۆ سوك دەکرێت بۆ هەتا هەتایی، بەڵام مەسەلەکە مەسەلەی یاسا نەبوو. .

ئێمە لە شەوێك لە شەوەکان لە زیندان نوستبووین، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو حەزەی کەمرۆڤ بۆ دەستخستنی زۆرترین زانیاری هەیەتی، هەندێك لە براکانمان لە درزی زیندانەکانەوە دەیانڕەوانی. . بینیان هەندێك لە پاسەوانانی زیندان خۆیان پڕچەك کردووە، هەر دوو شەهید محەممەد هەواش و عەبدولفەتاح ئیسماعیلیان لەدوای ڕاگەیاندنی حوکمی لەسێدارەدان بە سەریاندا ئامادە کرد ، لەو زیندانە بچوکەوە کە تیایدا گۆشەگیرو دابڕاویان کردبوون هێنایانن تا ئەو جلو بەرگانەی کە لە زیندانی گەورەی جەنگیی پێشوودا لەبەریاندا بوو هەڵیبگرن لەگەڵ خۆیان.

کتوپڕ چاومان کەوت بەسەر لەسێدارەداندا بەبێ هیچ ئیجرائاتێکی باو، تەنانەت بەبێ پەتی تازەی لەسێدارەدان، بەبێ هیچ شتێك لە ئیجرائاتی ڕۆتینی.

بۆ نموونە: لە لائیحەی زیندانەکاندا،یاسایەك هەبوو کە بڕیاری دەدا بە کێشانی حوکم بەسەردا دراوەکەو گرتنی لێدانی دڵو فشاری خوێنەکەی، هەروەها ئامادەکردنی کەسو کاریو پێدانی هەل پێی تاوەسێتی خۆی بنووسێتو حەزو ئارەزووەکانی لە دنیادا جێبەجێ بکات. . هەموو ئەم ئیجرائاتانە جێبەجێ نەکران، چونکە مەسەلەکە کردەوەیەکی چەتەیی بوو، کە مەبەستی ڕزگاربوون بوو لە پیاوان!!)[2]

[1] دیوانی (الصبر والثبات): 34 ـ 36.

[2] لماذا اغتيل الشهيد حسن البنا، عبدالمتعال الجبوري: 109 ـ 110.

## زەردەخەنەی خۆشحاڵی سەیدقوتب بە شەهیدبوون

لە شەوی جێبەجێکردنی حوکمی لە سێدارەدان بەسەر سەیدو براکانیدا، هەرسێ براکە لە زیندانی جەنگیەوە گوێزرانەوە بۆ زنیدانی (الاستئناف) تا لە سێدارەبدرێن. تەلەفزیۆن لە هەواڵەکانی سەر لە ئێوارەی ڕۆژی یەکشەممەیدا 1966/8/28 وێنەیەکی سەید قوتبو هەردوو براکەی بلاودەکردەوە لەکاتی دەرچوونیان لە زیندانی جەنگی بۆ لای ئۆتۆمبێلەکە بۆ زیندانی ئیستئناف.

ئێمە ـ لە کاتێکدا سەیری هەواڵەکانی تەلەفزیۆنمان دەکرد ـ سەید قوتبمان بینی کە لە دەرەوە بوو، ڕێك ڕاوەستابوو، سەربەرز بوو، ناوچاوی ڕوون بوو، شادی پەخش دەکردەوە، دەستی درێژدەکرد بۆ هەموو سەربازو پاسەوانێکی بەردەم زیندانی جەنگی و سەلامی لێ دەکردنو تەوقەی لەگەڵ دەکردن، بە زەردەخەنەیەکی هیوا بەخشەوە خواحافیزی لێ دەکردن!! پاشان سەید قوتبمان بینی کە سواری ئۆتۆمبێلێکی سوپا بوو، زەردەخەنەی هیوا بەخش هەموو دەموچاوی گرتبووەوە، دەستی بەرز کردبوویەوە بۆ ماڵئاوایی سەربازو پاسەوانە ڕاوەستاوەکان و سلاو لێکردنیان، کاتێك ئۆتۆمبێلەکە دەستی بە ڕۆشتن کرد، سەید قوتب سەیرێکی ڕاسوەتاوەکانی کرد بە تەنیشتی پەنجەرەی ئۆتۆمبێلەکەوە، زەردەخەنە هیوا بەخشەکەی هەروەك خۆی بوو، وێنەی ئەم زەردەخەنەیە گیراو لە ڕۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە، لە هەموو ئەو نووسراوانەدا بلاو دەکرایەوە کە سەبارەت بە شەهید سەید قوتب دەدوان، وەلەو گۆڤارانەدا کە بە بۆنەی شەهیکردنیەوە قسەیان دەکرد. .

ئەم زەردەخەنە سیحراویە واتای زۆر دەبەخشێ، زۆر شت دەگەیەنێت، بەڵگەیە لەسەر زۆرشت، سەید قوتب لە میانەی ئەو زەردەخەنەیەوە زۆر شتی وتووە، هەموو کەسێك کە وتەی سەیدی بوێت بۆ نەوەکانی داهاتوو لە ئەستۆی گرتووە! ئەوە زەردەخەنەی خۆشحاڵیو ڕەزامەندیە، زەردەخەنەی سەرکەوتنو بردنەوەیە. .

وەك ئەوەی سەید بەرەو مردن نەڕوات، بەڵکو بەرەو بوك بڕوات، لە ڕاستیدا هەر بەرەو بوك ڕۆیشتووە لە بەهەشتەکانی خێرو خۆشیدا. . بە پشتیوانی خوا. .

شاعیریش ڕاستی وتووە لەم زەردەخەنەی سەید قوتبدا کە دەڵێت:

**یا شهیدا رفع الله به　　　جبهة الحق على طول المدي**

**سوف تبقى في الحنايا علما　　　حاديا للركب رمزا للفدى**

**ما نسينا أنت قد علمتنا　　　بسمة المؤمن في وجه الردى**[1].

## سامی جەوهەر ساتەکانی لە سێدارەدان دەگێڕێتەوە

چرکەکانی کۆتایی تەمەنی شەهید سەید قوتب جێ دێڵین بۆ ڕۆژنامەنووس سامی جەوهەر، کە ئامادەی لەسێدارەدانەکە بووەو شاهیدە لەسەری. .

دەڵێت: (. . گشت سەرۆکەکانی تەحریر لە ڕۆنامەکاندا پەیوەندی تەلەفۆنییان پێ گەشت لە مەکتەبی سامی شەرەف سکرتێری سەرۆك عەبدولناسر بۆ زانیایەکانەوە. . سامی شەرەف مۆڵەتی بە بلاوکردنەوەی هەواڵێك دا لە لاپەڕە (یەکی) ڕۆژنامەکاندا کە لە بەیانی ڕۆژی دووشەمە 29ی ئابدا، واتە ڕۆژی دووەم ـ بەبێ ناونیشانی سەرنجڕاکێش، لەسەر یەك ستون. . ئەمەش دەقی ئەو هەواڵەیە : **سەرلەبەیانی ئەمڕۆ حوکمی لە سێدارەدان لەسەر هەریەك لە سەید قوتب، عەبدولفەتاح ئیسماعیل، محەممەد یوسف هەواش، سەرکردەکانی ڕێکخستنی ئیرهابی برایانی موسڵمان جێبەجێکرا!**

سەرۆك جەمال عەبدولناسر بڕیارێکی دەرکرد بە سوککردنی سزای لەسێدارەکان سەبارەت چوارکەسی تریان لەبەر کەمی تەمەنیان و گۆڕی بەحوکمی هەتا هەتایی لەگەڵ ئیشی قورسدا!.

[1] لماذا اعدم سيد قطب واخوانه: 3.

دابەزاندنی هەواڵەکە لەسەر ڕۆژنامەکان لە نیوەشەودا بوو. . لەبەر ئەوە ڕۆژنامەی **(الأخبار)** نەیتوانی لە چاپی یەکەمیدا بڵاوی بکاتەوە، هەروەها ڕۆژنامەی **(الجمهورية)**ش، بەڵام **(الأهرام)** توانی بڵاوی بکاتەوە!

ئاشکرایە کە لە سەرەتای کاتژمێر پێنجی سەرلەبەیانییەوە ڕۆژنامەکان دەگەشتنە دەستی زۆربەی خوێنەران. بڵاوکردنەوەی هەواڵەکەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە سێدارەدانەکە پێش کاتژمێر پێنج ئەنجامدراوە.

کۆمەڵێك پەیوەندیم کرد تا وادەی جێبەجێکردنی حوکمەکە بزانم بۆ ئەوەی ئامادەبم، چونکە هەمیشە لە حوکمی لە سێدارەداندا ڕێگە ئەدرا بە ئامادەبوونی ڕۆژنامەنووسانو وێنەگران، بەڵام دەزگای ئاسایش هیچ بیرۆکەیەکی لانەبوو دەربارەی وادەکەی. جیا لە پۆلیسی فریاکەوتن کە داواکاریەکیان پێگەیشتبوو کە دوو ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن لە کاتژمێر یەکونیوی شەودا بنێرن بۆ باڵەخانەی فیرقەی ئاسایش لە **(الدراسة)** بۆ کارێکی نهێنی، چووم بۆ ماڵی دەجەوی کە حوکمی لەسێدارەدانی جێبەجێ دەکرد، وەبۆ ماڵی هەردوو یاریدەدەرەکەی. ئەو وەڵامەی لە هەرسێ ماڵەکەوە وەرمگرت، ئەوەبوو کە ئۆتۆمبێلێك لە تەواوی نیوەی شەودا هاتووەو لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی بۆ کارێك.

دڵنیابووم کە لەسێدارەدان پێش هاتنی بەیانی ئەنجام ئەدرێ. . لە بەرەبەیاندا. . لەگەڵ ئەوەدا کەوا باوبووە لە سێدارەدان لە کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانیدا ئەنجام بدرێ!! پاشان ڕووم کردە باڵەخانەی زیندانی (ئیستئناف) لە ـ باب ئەلخەلق ـ کە بەردەوام لەوێ کردەی لەسێدارەدانەکان جێبەجێ دەکرا.

بە چواردەوری باڵەخانەی زیندانەکەدا کەوتم بەسەر کۆمەڵێك نرکەو ناڵەدا ، کە تیشکی ڕووناککەرەوەی لەسەر بوو، لە هەمان کاتدا گۆڕەپانی باب ئەلخەلق تەواو تاریك بوو، دام لە دەرگای زیندانەکە. . هاوڕێ وێنەگرەکەم -عەبدە خەلیل-م لەگەڵدا بوو. . پاسەوانی دەرگاوان تاقێکی بچوکی کردەوە، داوام لێکرد بە نوێنەری بریکاری بگەیەنێت کە حەزدەکەم ئامادەی جێبەجێکردنەکە بم.

پاسەوانەکە تـــاقە تەسکەکەی بەکراوەیی جێ هێشت. .

لەو تاقەوە کۆمەڵێك لە سەربازی دێوەزمەم بینی کە ڕیزبووبوون لە فینادا، چەکیان هەڵگرتبوو!! پاسەوانەکە پاش چەند خولەکێك گەڕایەوەو تاقەکەی داخستو وەڵامی داواکاریەکەی نەدامەوە. . بێ دەنگیەکی ترسناك باڵی کێشا بەسەر ئەو ناوچەیەدا!!

لە کاتژمێر چوارو چارەکی سەرلەبەیانی تەواودا. . دەرگای زیندانەکە کرایەوە. . سەیارەیەکی ڕەش هاتە دەرەوە کە تایبەت بوو بە گواستنەوەی مردووەکان بۆ توێکاری. . لە ڕێگەی گۆڕستانی ئیمام شافعیەوە دەرچوو، کۆمەڵێك ئۆتۆمبێلی لاسلکی پێشی کەوتبوونو هەندێکی تریش لە دواوەی بوون، لەگەڵ کۆمەڵێك ماتۆڕسواردا. . پێش ئەوەی دەرگا دابخرێتەوە لاوێکی باڵا بەرز هاتە دەرەوە پرسیاری لێکردم منیش بەرەو ڕووی ڕۆشتم. . بەهەموو ناسکیەکەوە وتی:

ـ جەنابت بووی داوات کردبوو ئامادەی لەسێدارەدان بیت. . بەداخەوە ئاگاداریان نەکردم کە حەزبەئامادەبوون دەکەین تەنها ئێستە نەبێت. . تەواو، هەموو شت تەواو بوو. . ئۆتۆمبێل لاشەکانی بردن تا بیان شارنەوە. .

لێم پرسی: لەکوێ؟

ـ بە هەمان هێمنیەوە وتی: ئاسایی لەسەر قەبران!

هەستم کرد کە نایەوێت هیچ شتێکی تر ئاشکرا بکات. . )[1].

[1] الموتى يتكلون: 197 ـ 199.

## سەید قوتب شەهیدی زیندوو کۆچی دوایی کرد تا بژی!

**لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە 13 جماد الاولی 1386 بەرامبەر 1966/8/29 سەید قوتبو هەردوو براکەی ـ عەبدولفەتاح ئیسماعیلو محەممەد یوسف هەواش پێشخران بۆ بەردەم پەتی سێدارە، بە هەنگاوی دامەزراوو پتەوەوە!**

کازیوە بەسەر دیمەنی سێ پاڵەوانی شەهیدا هەناسەیدا، کە جەستەکانیان هەڵواسرابوون بە پەتی سێدارەوە، بەڵام ڕۆحەکانیان بە ئاسمانی بەرزەوە پەیوەست بوون. . فریشتەی ئاسمان هاتە خوارەوە لەگەڵ خۆیدا بردنی، ئەو گیانە پاکانەیان لە گەشتێکدا بۆ جیهانی نەمری برد. . بڕواداران‌و شەهیدەکان ڕیزیان بەست بۆ سڵاوکردن لەو کەژاوە پیرۆزە. . حۆریەکان ڕازێنرانەوە بۆ پێشوازی مێردەکانیان. . بەهەشت ڕازێنرایەوە بۆ وەفدە تازەکان! بەربەست دانرا لەسەر کۆتا لاپەڕە لە ژیانی پێشەوای شەهید لەم دونیا براوەیەدا. . تا لە لای خوای گەورە ژیانی ڕاستەقینەی دەست پێبکات لە بەهەشتی هەتاهەتاییدا **ـ انشاء الله ـ.**

بەم کۆتاییە مەزنە بۆ ژیانی شەهید سەید قوتب، فەزڵی خوامان بۆ دەرکەوێت لە سەری کە ڕێزی لێنا بە شەهید بوون ـ بەئومێدی خوا ـ.

خەڵکی دەژین‌و دەمردن، بەڵام شەهیدەکان دەژین‌و دەژین!

خەڵکی دەژین تا بمرن، بەڵام شەهیدەکان دەمرن تا بژین.

بەڕاستی سەید قوتب بە شەهیدی وەفاتی کرد، تا ژیانی شەهیدانە بباتە سەر **ـ انشاء الله ـ.**

بەم پێیە دروستە کە ناوی(شەهیدی زیندووی) لێبنرێت!

بەڕاستی سەید شەهیدی زیندووە، بە واتایەکی مەزن بۆ شەهادەت‌و بۆ ژیان!!

واتای نزیك بۆ شەهید فراوانترو گەورەترە لەمە.

شەهید خوای گەورە هەڵی دەبژێرێت، دەستنیشانی دەکات، دەیکاتە شەهید، ئەویش شایەتی پێشکەش دەکات بە خوای گەورە.

سەید قوتبی شەهید لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا **(وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء)** (آل عمران: 140)، دەفەرموێت: (ئەوە دەربڕینێکی سەیرە بۆ واتایەکی قوڵ، بە ڕاستی شەهیدەکان هەڵبژێراون.

خوای گەورە لەناو تێکۆشەراندا هەڵیان دەبژێرێ، هەڵیان دەبژێرێ بۆ خۆی ـ جل جلاله ـ کەواتە نە زەرەرە نە زیانە کەشەهید بیت لە پێناوی خوادا، بەڵکو ئەوە هەڵبژاردن‌و پاڵاوتنە، ڕێزلێنان‌و تایبەتمەندکردنە. . ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە تایبەتی کردوون و شەهادەتی پێ بەخشیون، تا پاکیان بکاتەوە بۆ خۆی ـ جل جلاله ـ تایبەتمەندیان بکات بە نزیکبوونەوە لە خۆیەوە. .

پاشان ئەوانەی شەهیدن خوای گەورە هەڵیان دەبژێرێ، دەیانکات بە شاهید لەسەر ئەو حەقەی کە ناردوویەتی بۆ خەڵکی، دەیانکات بە شاهیدو ئەوانیش شەهادەت جێبەجێ دەکەن، جێبەجێکردنێك کە گومانی تیا نیە، ڕەخنەی لەسەر نیە، مشتومڕی بەچواردەوردا نیە، جێبەجێی دەکەن و بە تێکۆشانیان تا دەمرن لە پێناوی سەقامگیرکردنی ئەم حەقەدا دەیگەیەنن، سەقامگیرکردنی لە دونیای خەڵکدا. . )[1]

ئای چەندە جوانە تەفسیرەکەی سەید بۆ واتای (شەهید) لە وەڵامی پرسیاری ئەفسەرەکەدا کە پرسیاری لێکرد!!

[1] الظلال 1: 481.

مەمدوح ئەلدیری دەگێڕێتەوە کە لە کاتی دادگایی کردنی سەید قوتبدا لەو کاتەدا مەمدوح‌و براکانی تری لە ناو قەفەزی تۆمەتبارکردندا بوون، یەکێك لە ئەفسەرەکان لێی نزیك دەبێتەوەو دەربارەی واتای شەهید پرسیاری لێدەکات، سەیدیش بەم وتەیەی وەڵامی دەداتەوە:

(شەهید: واتە ئەو کەسەی شاهیدی داوە کە شەریعەتی خوا لەلای بەنرخ‌و بە بەهایەخترە لە ژیانی خۆی!)[1]

بەڵام ژیانی شەهید، کە قورئان لێی ئاگادارمان دەکات: (**وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ** (البقرة: 154).

سەید قوتب شەهیدی زیندوو، دەربارەی ئەوە دەڵێت: (کۆمەڵێك کوژراو هەن کە لە مەیدانی جەنگدا شەهید دەکرێن. . شەهید لەپێناوی خوادا، کوژراوانێکی بەڕێزو خۆشەویست. . کوژراوانێکی میهرەبان‌و پاك‌و بێگەرد. . ئا ئەوانە لە پێناوی خوادا دەکوژرێن مردوو نین، ئەوانە زیندوون، ڕەوا نیە دەربارەیان بوترێت: مردوون.

ڕەوا نیە بە مردوو دابنرێن نە لە هەست‌و نە لە ویژداندا، نابێت بەلێوو بەدەم دەربارەیان بوترێن کە مردوون، ئەوانە بە شاهیدی خوای گەورە، ئەوانە بێگومان زیندوون. . ئەوانە لە ڕوکاری دەرەوە کوژراون، بەو پێیەی کە چاو بینیونی، بەڵام ڕاستی مردن‌و ڕاستی ژیان ئەو ڕوانینە ڕووکەشیە دیارە دیاری ناکات‌و بڕیاری لەسەر نادات. .

سیفەتی یەکەمی ژیان بریتیە لە: کارایی‌و گەشەکردن‌و بەردەوامی، سیفەتی یەکەمی مردن بریتیە لە: سەلبیەت‌و وەستان‌و دابڕان. . ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا دەکوژرێن کارایەتیان لەسەرخستنی حەقدایە، ئەو حەقەی لە پێناویدا کوژراون، کاراییەکی کاریگەر. . ئەو فیکرەیەی لە پێناویدا کوژراون خوێنەکانیان درێژ دەکاتەوەو مەودای پێدەدات، کاریگەربوونی ئەوانەی کە ماون لە دوای ئەمانەوە بە شەهیدبوونی ئەمانە بەهێزتر دەبێت، زیاتر درێژ دەبێتەوە. . ئەوانە بەردەوام ڕەگەزێکی کارای پاڵنەری کاریگەرن لە چۆنیەتی ژیان‌و ئاراستەکردنیدا. . ئائەمەیە سیفەتی یەکەمی ژیان. . شەهیدان بەم پێودانگە واقعیە زیندوون لە دونیای خەڵکیدا)[2]

ئەمە دەربارەی ژیانی شەهید لە دونیای خەڵکیدا، بەڵام دەربارەی ژیانی لە لای خوای گەورەو لە بەهەشتدا. . ئومێدەوارین کە سەید قوتب لەوێدا بژی، تیایدا پشت ئەبەستین بە فەرموودەیەکی دروستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) کە ئیمامی موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) دەربارەی شەهید فەرموویەتی:

((**أرواحهم في جوف طير خضر، لها قناديل معلقة بالعرش. تسرح في الجنة حيث شاءت، ثم تاوى الى تلك القناديل. فاطلع عليهم ربهم اطلاعة، فقال: هل تشتهون شيئا؟ فقالوا: أي شئ نشتهي؟ ونحن نسح من الجنة حيث شئنا، ففعل ذلك بهم ثلاث مرات، فلما رأوا انهم لن يتركوا من أن يسألوا، قالوا: يارب، نريد ان ترد أرواحنا في أجسادنا حتى نقتل في سبيلك مرة اخرى. فلما رأى ان ليس لهم حاجة، تركوا**))[3].

## به شەهیدبوونی بیروباوەڕەکانی ژیان

شەهید سەید قوتب بە شەهیدبوونی ژیانی ڕاستەقینەی بەدەست خست، ئەو (شەهیدی زیندووە) لە لای خوا ـ **انشاء الله** ـ هەروەها بە شەهیدبوونی بیروباوەڕەکانی ژیان، زیندووبوونەوە، بڕوادارانێکی بانگخواز لە واقیع‌و ژیان‌و تێکۆشانی خۆیاندا بەرجەستەیان کرد.

سەید بەڕەحمەت بێت دەربارەی هێزی وشەو نەمری‌و زیندوێتی وشە دەڵێت: (هەموو وشەیەك ناتوانێت بگاتە دڵی کەسانی تر، بیبزوێنێ‌و کۆی بکاتەوەو پاڵی پێوە بنێت. . ئەوانە کۆمەڵە وشەیەکن کە دەبنە دڵۆپی خوێن، چونکە دەرژێنە دڵی مرۆڤێکی زیندوو، هەر وشەیك ژیابێت، ئەوە چووەتە ناو دڵی مرۆڤەوە!).

---

[1] مذابح الاخوان في سجون ناصر: 118.

[2] الظلال 1: 143.

[3] صحيح مسلم: 33 كتاب الامامرة. ژمارەی فەرموودە (1887).

خاوەن پێنووسەکان دەتوانن زۆر شت بکەن، بەڵام بە تەنها یەك مەرج. . ئەویش ئەوەیە کە خۆیان بمرن تا بیروڕاکانیان بژین، دەبێت لە گۆشتو خوێنیان خواردنی بیروڕاکانیان بدەن، دەبێت ئەوەی بە حەقی دەزانن بیڵێن، خوێنیشیان ببەخشن لە پێناوی وشەی حەق دا!!

بیروڕاکانو وشەکانمان بەردەوام جەستەیەکی مردوون، تا ئەوکاتەی دەمرین لە پێناویانداو بەخوێنمان ئاویان دەدەین، ئەوکاتە گیانیان دەچێت بە بەرداو دەژین لە نێو زیندووەکاندا).[1]

خوای گەورە میهرەبانی خۆی ببخەشێت بە پێشەوای شەهیدو بیریارو سەرکردەو بانگخوازی تێکۆشەر سەید قوتب، خوای گەورە هەوڵو تێکۆشانەکەی لێ وەربگرێت، بە پشتیوانی خوا ئەو وتەیەی خوای گەورەی بەسەردا دەچەسپێت کە دەفەرموێت:

(وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) (آل عمران: 169). واتە: وا حساب مەکەن ئەوانەی لە پێناوی خوادا کوژراون مردوون، بەڵکو ئەوانە زیندوونو لە لایەن پەروەردگاریانەوە ڕزقو ڕۆزی دەدرێن.

هەروەها وتەی شاعیر:

علو في الحياة وفي الممات          لحق تلك احدى المكرومات.

واتە: لە ژیاندا بەرزیو لە مردندا بەرزی، بە ڕاستی ئەوە یەکێکە لە ڕێزلێنانەکان.

[1] دراسات اسلامية: 139.

## ڕوکارو سیفەتو تایبە تمەندیە دەروونیەکانی سەید

کارەکە جیّ دیّلّین بۆ سەید تا دەربارەی دەروونی خۆی بۆمان بدویّ و، خۆی ئەم ویّنە شیکاریەمان پیّشکەش بکات،دیارە کە شارەزاترین کەسیش بە دەرون خاوەن دەروونەکە خۆیەتی. . (دەرونم خیّر ویستیّکی خۆشەویستپەروەرە، سۆز هەموو لایەنەکانی داپۆشیوە. . ـ ئەگەر بتوانیّت –ئەیەویّت زەردەخەنە بکات بۆ هەموو شتیّك، هەموو شتیّك زەردەخەنەی بۆ بکات ـ دەرونم عاشقی ڕەزامەندیو ئارامیە، لە هەموو لایەکەوە هەستی پیّدەکات، لە هەموو دیاردەیەك لە دیاردەکانی ژیاندا. دەخوازیّت ژیان سادەو ئارام بوایە، لاریو چەمانەوەی تیّدا نەبوایە! سروشتی ئەم دەرونە دژ بە واقیع دەوەستیّو پیایدا دەکیّشیّ، گەرم دەبیّتو ئازار دەچەژیّتو نارەزایی دەردەبریّت، هەندیّ جار تورە دەبیّتو هەندیّ جار هەلّدەچیّت، هەندیّ جار گالّتە دەکاتو هەرەشە بە تۆلّە سەندنەوە دەکات. . بەلاّم ئەم دەرونە لەگەلّ ئەمەدا لە توندترین کاتەکانی تورەبوونو هەلّچوونو گالّتە کردندا پاریّزگاری لە چاکیّتیو سۆزو خۆشەویستیەکەی دەکات. .

ئەو دەرونە دەخوازیّت کە تورە نەبیّت، ڕۆژیّك لە ڕۆژان هەلّنەچیّت. . . تا ئەوکاتەی ئەو هەلّویّستە کۆتایی پیّدیّت، سۆزو خۆشەویستیەکەی بۆ گەراوەتەوە، ئەویش گەراوەتەوەو دەکۆلّیّتەوە لە ڕووکارەکانی سۆزو خۆشەویستی، لیّکۆلّینەوەو بەدواداچوونی ماندویەکی زیادەویست!)[1]

ئەمە فەلسەفەی شاعیرەکەمانە لە بنەرەتدا. . واتە ئەگەر چی لای زۆریّك لە خەلّکی وادەرکەوتووە کە دەروونی زۆر نارەزایی دەردەبریّت، بەردەوام دلّ ئیّشاوە، راهاتووە لەسەر تورەیی، ئەوە بەرەنجامی کارلیّکە لە نیّوان ژیان بە هەموو نارەحەتیو رەنگەکانیەوە، لەگەلّ ئەم دەروونەدا، کە لە ئارامی خۆیدا ئەترسیّ بیّبەش بیّت لە ئومیّدو هیواکانیدا، ئەوە دەبیّتە هۆی دروستبوونی نارەزایی دەربرین.

ئەم خۆشەویستیەی دلّی شاعیرەکەمانی داگیر کردووە، تەسك نەبووەتەوە لەسەر خۆشەویستی ئافرەت، خۆشەویستی هاوڕیّیان، من کاتیّك وتوومە بەراستی دەرونەکەی خۆشەویستی پەروەرە بە تەنها ئەوەم مەبەست نەبووە، بەلّکو مەبەستم بۆ واتایەکی گشتگیرتر بوو، کە واتای خۆشەویستی گشتیە، کە دەرونەکان ئاوەدان دەکاتەوە، جیّگەیەکی تیا ناهیّلّیّتەوە بۆ ڕەق و قین. . وای لیّ دەکات بەردەوام ئامادە بیّت بۆ هەموو کۆبوونەوەو سۆزیّك، بۆ وەرگرتنی هەموو ڕوکاریّك لە ڕووکارەکانی ژیان بە جۆریّك لە رازی بوونو نەرمو نیانی. .

ئەو ئاوات دەخوازیّت کە خۆشەویستیو سۆز هەموو گەردونی بگرتایەتەوە، هەروەها هەموو شتیّکی بگرتایەتەوە لە گەردووندا بە سۆزو خۆشەویستی، کە لە نیّوانیاندا بە سۆزویو ڕەحم بەیەککردنو خۆشەویستی هەبوایە. .

## گرنگترین ڕوکارو سیفەتو تایبە تمەندیەکانی سەید قوتب

ئەو نووسەرانەی دەربارەی سەید قوتب نوسیویانە، هاتوون گرنگترین ڕووکارەکانی کەسایەتی سەیدیان ئاماژە پیّکردووە، بە بەلّگەو نموونەوە لەسەر ئەو ڕوکارانە لە ژیانی سەید قوتب و لە بەرهەمە ئەدەبیو فیکریەکانیدا دوواون،لیّرەدا گرنگترین ئەو تایبە تمەندیانە دیّنین کە ئەوان باسیان کردوون:

**محەممەد عەلی قوتب** لە کتیّبەکەیدا دەربارەی سەید بەم شیّوەیە باسی گرنگترین ڕوکارەکانی سەیدی کردووە:

1ـ ڕۆچوون –قولّی-.

2ـ زیّندویّتیی.

3ـ گشتگیری.

---

[1] گۆڤاری (الاسبوع) بەرگی سیّهەم: ژمارە سیو حەوت. 1934/8/8، ل 11.

4ـ شۆڕشگێڕی.[1]

ماموٚستا زەین ئەلعابیدەین ئەلڕوکابی لە سەرەتای پەنجاکاندا ژمارەیەك لە بابەتەکانی سەیدی کۆکردەوە کە لە گۆڤارەکاندا بلاوی کردبوونەوە، ناوی نا (معرکتنا مع الیهود)، پێشەکیەکی بۆ داناوە لەو پێشەکیەدا گرنگترین ڕووکارەکانی سەیدو تایبەتمەندیەکانی فیکری سەیدی تێدا باس کردبوو، لەوتایبەتمەندیانەی باسی کردبوو:

1ـ پاکێتی

2ـ بەعیززەتی

3ـ گۆشە نیگا ڕونی[2]

ماموٚستا **عەبدولباقی محەمەد حسەین** چوار سیفەتی داناوە بۆ فیکری سەید قوتب، کە بریتین لە:

1ـ گشتگیری

2ـ قولّیو ڕۆچوون

3ـ ڕوونی

4ـ ڕاستگۆیی.[3]

**دکتۆر عەبدوڵلاّ ئەلخەباس** ئەم تایبەتمەندیانەی بۆتۆماری کردووە:

1ـ وردیو ڕوونی.

2ـ درێژکردنەوەو دوبارەکردنەوە.

3ـ هەلّچوون.

4ـ شیکردنەوە.

5ـ توندیو تیژیو بوێری.

6ـ گالّتەجاڕی.[4]

لە کۆتایدا لەگەلّ ماموٚستا یوسف ئەلعەزمداین تا لە کتێبەکەیدا تایبەتمەندی بەرهەمە فیکریەکانو تایبەتمەندیەکانی سەید تۆمار بکەین بەو شێوەیەی خۆی پوختەی کردووە.

ماموٚستا **یوسف ئەلعەزم** بیست تایبەتمەندی ئاشکرای بۆ بەرهەمە فیکریەکانی سەید تۆمار کردووە کە ئەمانەن:

1ـ چڕو پڕی.

2ـ گشتگیری.

3ـ بڕوابوون بە فیکرەو ڕاستگۆیی لە دەربڕیندا.

4ـ ڕۆچوونو قولّی.

5ـ نەمریو ئایندەیی.

6ـ ئیسلام بریتیە لە ژیان.

7ـ جیاوازی کردن لە نێوان ئیسلامو گۆشەگیریدا.

8ـ بانگەواز بۆ هێنانەدی ژیانی ئیسلامی.

9ـ خستنەڕووی ئیجابیات دوور لەبەرگریکردنو تۆمەتبارکردن.

10ـ دەرخستنی ڕوکەشیی شارستانیەتی مادی.

---

[1] بڕوانە (سەید قوتب)ی محمد علی قطب 23 ـ 76.

[2] پێشەکی (معركتنا مع اليهود): 5 ـ 7.

[3] بڕوانە (سيد قوقط حياته وادبه) عبدالباقي محمد حسين: 317 ـ 333.

[4] بڕوانە (سيد قطب الاديب الناقد): 222 ـ 224.

11ـ بێ وێنەیی ئیسلامو جیاکردنەوەی.
12ـ ئاسۆڕونیو پاراوی.
13ـ هێزو تەحەددا کردن.
14ـ پێگەشتنی دڵەکانو تێگەیشتن لەلای تایبەتو گشتی خەڵکی.
15ـ تموحی نەتەوەو ئومێدی لاوازەکان.
16ـ خاوەن قوتابخانەیەکی بێ وێنە لە فیکرو شێوازدا.
17ـ پێشەواو سەرکردەی جوڵەو بانگخوازی ڕێکخستن.
18ـ ڕووکردنە بەرهەمەکانی بە تینوێتیو ئارەزوومەندیو شەوقەوە.
19ـ گواستنەوەی بەرهەمەکانیو تەرجەمەکردنی بۆ زۆرێك لە زمانەکانو نەتەوە جیاجیاکان.
20ـ ئاسۆ فراوانیو وردبینی[1]

ئەو دوو سیفەتەشمان لەبیر ناچێت کە **دکتۆر تەها حسێن** تۆماری کرد بۆ سەید قوتبو لە ئاهەنگی ڕێزلێنانی سەید قوتبدا لە یانەی ئەفەسەران ڕای گەیاند کە بریتین لە:

1ـ میسالیەتی میسالی.
2ـ ڕکەبەرایەتی یان سەرسەختی

**مامۆستا محەمەد قوتب** لە کتێبی (**سید قطب**: الشهید الحی)دا ئەم سیفەتو تایبەتمەندیانەی سەید باس دەکات:

1ـ ڕاستگۆیی
2ـ جدیەت
3ـ بزواوی
4ـ متمانە بەخۆبوونو توندوتۆڵی
5ـ بەغیرەتی
6ـ ئازایەتی
7ـ بەخشندەیی
8ـ بێ فیزی
9ـ پاکێتی
10ـ بەرزبوونەوە بە ئیمان[2]

---

[1] بڕوانە (رائد الفكر الاسلامي المعاصر) يوسف العظم: 193 ـ 201.
[2] سيد الشهيد الحي: 176 ـ 189.

## گرۆبەندێ هەواڵ کەبەڵگەن لەسەر سیفەتە بەرزەکانی سەید قوتب

کۆی سیفەتەکانی و ڕووکارەکانی شەخصیەتی وتایبەتمەندیەفیکریەکانی سەید کە لە وتەی نووسەرو لێکۆڵەرەوەکانەوە هێنابومان، پێویست بەوە ناکات بەڵگەی ڕاستیان بۆ بهێنینەوە لە ژیانی سەیددا، پێویست بە نموونە ناکەن لە ژیاننامەکەیدا بە هۆی ئەو هەموو نموونە زیندوانەی کە لەژیانیدا بینیمانن، ئەوەی ئەم کتێبەمانی خوێندبێتەوە ئاگاداربێت بەسەر ئەو شتانەی تیایدا تۆمارمان کردووە دەربارەی ژیانە ئەدەبیو ئیسلامیەکەی، دەربارەی موچەخۆریو ژیانی ئاساییو گشتیو تایبەتی سەید لە ناوکۆمەڵگاو لە زینداندا، نموونەی زۆری بەردەست دەکەوێت لەسەر هەر سیفەتێك لەو سیفەتانەی باس کران، کە لێرەدا پێویست بە باسکردن ناکات و، تۆش لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا پێیان ئاشنا بوویت!

بەڵام من لێرەدا ئەم چەپکە هەواڵە پێشکەش دەکەم کە لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا باسم نەکردوون و تایبەتن بە سەید قوتبەوە ، بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان تێدایە لەسەر سیفەتەکانی سەیدو تایبەتمەندیەکانی.

### ❋ بەخشینی ئەساسی ماڵەکەی بە هاوڕێیەکی کە دەیویست ژن بهێنێت!

لە ساڵی1979 دا بە مامۆستا ئەحمەد عەبدولغەفور عەتار گەشتم لە ماڵەکەی خۆیدا لە مەککەی پیرۆز ئەم ڕووداوەی دەربارەی بەخشندەییو دڵفراوانی سەید قوتب -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت- بۆ گێڕامەوە.

مامۆستا عەتار سەردانی سەیدی زۆر دەکردلە ماڵی خۆیدا لە حەلوان ـ ئەمەش لە ساڵی چلەکاندا ـ دەڵێت کە ئەساسی ژووری میوانەکەی زۆر سادە بوو بە هۆی کەمدەستیەوە کە نەیتوانیوە ئەساسی چاکتر بکرێت. . ڕۆژێکیان مامۆستا عەتار سەردانی دەکاتەوە دەبینێت ژووری میوان ئەساسێکی جوانو تازەی لێیە، بەمە دڵخۆش دەبێت!

پاشان دوای چەند ڕۆژێك سەردانی دەکاتەوە دەبینێت ئەساسە کۆنەکان لە ژووی میوان دانراونەتەوە، سەری سوڕما لەوەی کە بینی، بۆیە زۆری کرد لە سەید تا بزانێت قەنەفە تازەکان چییان بەسەر هاتووە، لەبەر زۆر داکۆکی کردنی، سەید ناچار بوو هەواڵەکەی پێ بڵێ کە قەنەفە تازەکانی فرۆشتووە، پارەکەی بەخشیوە بەیەکێك لە براکانی ـ مەبەست برای دینیە نەك دایكو باوکی ـ تا مەسروفاتی ژنهێنانی پێ تەواو بکات!!

### ❋ بەخشینی (بەدلە)کەی بە قوتابیەکی زانکۆ:

مامۆستا عەلی عەبدولعەزیز حسەین لە گوتاری (شاهد شهید)دا کە لە گۆڤاری (المجتمع)دا بلاوی کردۆتەوەو، دەربارەی کوڕەکەیخۆی دەگێڕێتەوە کاتێك کە قوتابی بووە لە کۆلێژی (دار العلوم) و لەو کاتەدا سەید قوتب وانەبێژ بووە لەوێ ـ دەشێت دوای گەڕانەوەی بووبێت لە ئەمەریکا ـ (ڕۆژێکیان کوڕەکەم بۆی گێڕامەوە، کاتێك قوتابی بووە لە کۆلێژی دارالعلوم، برای شەهیدمان مامۆستای وانەی ئەدەبی عەرەبی بوو لەوێ، مامۆستا لە سەرەتای ساڵدا دەبینێت ئەم قوتابیە بە بەدلەیەکی کۆنەوە هاتووە بۆ زانکۆ ـ جیا لە هاوەڵە قوتابیەکانی کە بە بەرگی نوێوە هاتبوون ـ چونکە هەموو قوتابیەك بە جلوبەرگی نوێوە لەو ڕۆژەدا دەهاتنو دەچوون. . لە کتوپڕێکدا کوڕەکەم بانگکرا بۆ ژوورەکەی مامۆستا سەید قوتب، کاتێك چووە ژوورەوە مامۆستا بەدلە تازەکەی خۆی داکەندو داوای لێکرد کە ئەو لەبەری بکات، مامۆستاش بەدلە کۆنەکەی ئەو هەڵبگرێت بۆ خۆی. . بەبێ وتوێژێکی زۆر ئەوەی ویستی ڕوویدا! کوڕەکەی من گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەجلوبەرگێکی جیا لەوەی کە پێوەی ڕۆیشتبووە دەرەوە، تاکو موفاجەئەکە بەو جلوبەرگە نوێیە بۆ خێزانەکە زیاتر بێت !)[1]

### ❋ سەید زۆر مەزنتر بووە لە سەروەتو سامان ئەگەر چی زۆر پێویستی پێی هەبووبێت:

مامۆستا ئەحمەد عەبدولغەفارعەتار ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خۆی بە چاوی خۆی بینیویەتیو لەگەڵیدا ژیاوە، کە زیاتر لە خەیاڵەوە نزیکە.

---

[1] گۆڤاری (المجتمع) ژمارە 832: بەرواری 1987/9/1.

دەڵێت: (ڕۆژێکیان سەید قوتب بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم، داوای لێکردم کە بەزوویی بگەمە ماڵیان، ـ بە شەرمێکەوە ـ داوای لێکردم کە چەند (دە) جونەیهێکی بە قەرز بۆ ببەم ـ لە سییەوە تا نەوەد ـ تا دەرمانی پێ بکرێت، چونکە نەخۆش بوو، پارەی نەبوو دەرمانی پێبکرێت!!

منیش بە پەلە ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، برە پارە داواکراوەکەشم لەگەڵ خۆم برد، کاتێك چوومە ژووری بەخێرهاتنەوە، دیمەنێکی سەیرم بینی، سوێند بە خوا واقم وڕما لەوەی کە بینیم! لە ژوورەکەدا کارمەندێکی دیبلۆماسی لە باڵوێزخانەی وڵاتێکی عەرەبی خاوەن نەوتەوە دانیشتبوو، لەبەردەمیدا جانتایەکی پڕ لە پارەی جۆراو جۆری دانابوو کە کۆی هەمووی دەگەشتە چەند هەزار جونەیهێك!!

ئەوکارمەندە زۆر بە گەرمیو تکاو ڕجاو داکۆکی لێکردنەوە داوای لە سەید دەکرد کە جانتا پارەکەی لێ وەربگرێت، بە هەموو ئەو پارانەوە کە تیایدا بوو، ئەوە دیاریەکە لە دەوڵەتەکەیەوە بۆ ئەو، چونکە پلەو پایەو بەرپرسیاری سەید دەزانێت، دەیەوێت سەید بەهۆی ئەو پارەیەوە ناڕەحەتیەکانی ژیانی چارەسەر بکات، پشتگیری مەسروفاتە ئەدەبیو فیکریەکانی پێ بکات، لەوکاتەدا سەید سەرگەرمی دەرکردنی گۆڤارێکی ئەدەبیو فیکری ئیسلامیی بوو ـ کە دەشێت **العالم العربي** یان **الفكر الجديد** ـ بوو بێت.

منیش ڕوانیم بۆ سەید قوتب کە نەخۆش بوو دانیشتبوو، بینیم خەمو خەفەت بەدەمو چاویەوە دیارە. .

پاشان سەید بە دامەزراویەوە دیاری پیاوەکەی ڕەد کردەوە، توڕەییو توندی بە ناوچاویەوە دەرکەوت، لە کاتێکدا پێی دەوت: من خۆمو فیکرەم نافرۆشم بە سەروەتو سامانی دنیا، ماڵەکەت بگێڕەرەوە بۆ ناو جانتاکەت!!

پاشان سەید لای بەلای مندا کردەوەو پێی وتم: ئایا ئەوەی داوام لێ کردبووی ئامادەت کردووە؟ منیش پێم وت: بەڵێ، برە پارەکەم دایە، لە کاتێکدا لەوپەڕی سەرسوڕمانو هەڵچوونو واق وڕماندا بووم!

کاتێك دیبلۆماتەکە چیرۆکی ئەم برە پارەیەی زانی، کە سەید لەو ڕۆژەدا بێ پارەو نەدار بووەو نرخی داوو دەرمانی نەبووە، لەگەڵ ئەوەدا بەسەر هەزارەها جونەیهدا سەرکەوت و، وەرینەگرت و گێڕایەوە لەکاتێکدا زۆر پێویستی بە هەندێك لەو پارەیەهەبوو، بە پەشۆکاویو سەرسوڕمانەوە چووە دەرەوە!!).

ئەم ڕووداوە تۆمار دەکەم و بەبێ تەعلیق دەیگێڕمەوە، بە دیاری پێشکەشی دەکەم بەوانەی ژیانو فیکرو بۆچوونە حەرەکیو هەڵوێستە جیهادیەکانی سەید بە هەڵەو ڕەخنە لێگرتنو تۆمەتبارکردنو خۆ لێ گێل کردنەوە دەخوێننەوە. . لەگەڵ ئەوەدا خۆیان لە سامان بەفیڕۆدانێکی ئاشکرادا دەژین، دەژینوهەڵپەیانە بە دوای سەروەتو ساماندا، چەندین پەیوەندیی گومان لێکراو دەبەستن، چەندەها پەیوەندی گوماناوی دەکەن، دەستیان درێژ دەکەن بۆ ئێرەو ئەوێ!! پێیان دەڵێم: بەسە ئەی ئەو کەسانە! ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی نرخی خۆی دەزانێو لە سنوردا دەوەستێ!! ئێوە چینو لە کوێدان لە چاو ئەو پێشەواو زاهیدو دڵسۆزو شەهیدەدا ؟!!

**❊ مامۆستا نەدەویو یوسف ئەلعەزم دەربارەی (سەیدو وتاربێژی) دەگێڕنەوە:**

سەید قوتب زۆر خاوەن بەهرەو لێهاتن بوو لە هونەری **وتاردان** و **کارکردنە سەرگوێگران**، چ لە وتارە ئەدەبیو ڕەخنە سازیەکاندا کە پێشکەشی دەکردن لە بنکەو شوێنە ئەدەبیەکاندا، یان لە وتارە ئیسلامیەکانیدا کە دوای ڕووکردنە ئاڕاستە ئیسلامیەکەی پێشکەشی دەکردن.

مامۆستا ئەبولحەسەن ئەلنەدەوی ـ لە ساڵی 1951دا سەردانی میسری کردوە ولە قاهیرە ئامادەی وتارێکی سەید قوتب بووە، تیایدا دەربارەی فەرەنسا و، دەربارەی تاوانەکانی لە وڵاتانی مەغریبی عەرەبیداو، بەکرێگیراوەکانی لە میسرو جیهانی عەرەبیدا دواوە.

نەدەوی بەشێك لە کاریگەری ئەو وتارە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (سەید قوتب وتەیەکی بە بۆنەی ئاهەنگی ئیدانەکردنی دەستدرێژی فەرەنسا بۆ سەر مەغریبی عەرەبی لەساڵی 1951 دا خوێندەوە، کە ئاڕاستە بوو بۆ کۆیلەکانی فەرەنسا. .

وتەکە وتەیەکی ئەدەبی بوو، تیایدا سوکایەتی بەو کۆیلانە دەکرد کە بەیانیانو ئێواران تەسبیحات دەکەن بە سوپاسگوزاری فەرەنسا.

-ئامادەبوان- بە هوتاف کێشانی توندو چەپڵە لێدانی گەرم وتارەکەیان بەسەید دەبڕی. . )[1]

**هەروەها مامۆستا یوسف ئەلعەزم ڕێبازو شێوازی قسەکردنی سەید قوتب لە وتارەکانیدا دەگێڕێتەوە،** لە کاتێکدا گوێبیستی زۆرێك لە وتارەکانی بووە لە قاهیرە: (قسەکردنی شەهید ـ بەڕەحمەت بێت ـ لە کاتێکدا ڕووبەڕووی جمهورەکەی دەبووەوە، بە هێمنی دەستی پێدەکرد، بەڵام بە متمانەداریەوە، ساکار بوو بەڵام لە قوڵیدا، دەربڕینی زۆر خۆشبوو، بەڵام دور لە قسەی بازاڕیو توانا بەفێرۆدان، مامۆستا هێرشی دەکردە سەر دوژمنەکانی، دادەباریە سەر لادراوەکان لە ڕاستی، بەڵام لە ئەدەبێکی پاك وگوفتارێکی ناوازەدا، ئەوشێوازەی کەمامۆستاکەمانی پێوەناسراوە، ئەوەی هەستمان پێکردووە، توانا بەهێزەکەیەتی لە هێرشکردنە سەر فەرمانڕەوای ستەمکارو، دەرخستنی سەرشۆڕیەکانیەتی بەشێوەیەك جەماوەر بهەژێنێت، لە جەماوەردا هەستی ناڕەزایی و تووڕەیی لەسەرکەشی دەبزواند. . بەبێ ئەوەی ڕەخنەیەك لە قسەکەر بگرێت لەسەر جنێودانو قسەی ناشیرین، یان دەرچوون لە سنووری زەوقو لیاقەت، ئەوانەی گوێیان دەگرت بۆ سەید قوتبی مامۆستامان (بەڕەحمەت بێت) لە کاتێکدا لەسەر قادرمەکانی زانکۆ یان لە دارئەلعلوم قسەی دەکرد، یان لە بنکەی گشتیی برایانی موسڵمان لە قاهیرە، یان لە چاوپێکەوتنو کۆنگرەکاندا هەموویان کۆدەنگبوون لەسەر ئەوەی ئەو پیاوە بەڵگەی بەهێزی لەلایە، شێوازی زانستیانەو لۆژیکی هەیە، لەرەلەری دەنگی کاریگەرو تەعبیرداره، دڵەکان دەگرێت، زاڵ دەبێت بەسەر بیسەردا)[2]

### ❋ سەید خاوەنی لێکدانەوەی سیاسی بەرزە!

سەید قوتب لێکدانەوەی سیاسی بەرزو ڕاستی هەیە، کە بەرەنجامی زیرەکیو هۆشیاریو لێهاتوویی و، بەرەنجامی فیراسەی ئیمانی و، کێشانەی قورئانی و، پشتگیری خواییە!

بۆ نموونە لە لێکدانەوەکانی دەربارەی ئەمەریکاو ڕوونکردنەوەی ئەوەی لەسەر ئەمەریکایەو ئەوەی بۆ ئەمەریکایە، ئەم وتەیەیەتی، کە لە نامەکەیدا بۆ عەباس خزر نووسیویەتی: (ئەمەریکا دەشێت ببێتە(وەرشەی جیهان)و بە چاکترین شێوە ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، بەڵام ئەوەی هەموو جیهان بێتە ئەمەریکا، ئەوە کارەساتێکی مرۆییە بە هەموو دڵنیاییەکەوە).

هەروەها لە یەکێك لە وتەکانیدا ـ لە نامەیەکیدا بۆ مامۆستا محەممەد جەبری هاوڕێی ـ دەڵێت: (بەڕاستی ئەمەریکا بریتییە لە گەورەترین درۆی هەڵبەستراو کە جیهان ناسیبێتی!).

دەتوانین سوود لە ئەمەریکا ببینین بە تەنها لە گەشتە زانستیەکاندا: میکانیكو کارەباو کیمیاو لەو جۆرە. . بەڵام لە کاتێکدا بمانەوێ سوود لە ئەمەریکا ببینین لە لێکۆڵینەوە نەزەریەکاندا ـ لەوانە شێوازی وانە وتنەوە ـ وادادەنێم کە ئێمە هەڵە دەکەین هەڵەیەکی گەورە، دەڕۆینو ملدەنێین لەگەڵ شێوازی ئەمەریکی لە ڕاگەیاندندا! بەڵام ئەوانەی قسە دەکەن دەربارەی ئەمەریکا وەك چۆن دەربارەی حەوت سەرسوڕهێنەرەکەی دنیا قسە دەکەن، ئەوە ئەوانە لە پشت ئەم گەورەکردنو پیاهەڵدانەوە هەوڵی بەدەستخستنی نرخێکی نوێ بۆ خۆیان دەدەن!

سەید سەرنجێکی سیاسی ئیمانی مەزن تۆمار دەکات، کە ڕەوداوە سیاسیە پاش هاتووەکان ڕاستی ئەمە دەسەلمێنن، ئەمەریکای ئێستە بریتیە لە بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا، سەرکردایەتی مرۆڤایەتی لەم ڕۆژگارەدا چۆتە ژێر سێبەری ئەمەریکاوە. . ئەبێت بەرئەنجامی سەرکردایەتی ئەمەریکا بۆ جیهان چی بێت؟

وەڵامەکە هەر کەسێك کە ئاگاداربێت بەسەر ڕووداوە ناوخۆیی و جیهانیەکاندا، کە ئەمەریکا پلانی بۆ دادەڕێژێت، یاخود ڕۆڵی ڕاستەوخۆی هەیە تیایدا دەیزانێت!

کاتێك ئەم بەرچاوڕوونیە ڕاستو پڕاوپڕەی سەید دەخوێنێتەوە ئەم واتایە دەردەهێنین: (من بەردەوام هەست بە زەرەرمەندی ئەم گەلە دەکەم کە موعجیزات لە جیهانی پیشەسازییو زانستو لێکۆڵینەوەدا دروست دەکات، بەڵام دەستمایەی نەبێت لە

---

[1] مذكرات سائح الاوسط، مامۆستا نەدەوی: 121.

[2] سيد قطب: يوسف العظم: 233 ـ 234.

بەها مرۆییەکانی تردا!! من زۆر بەزەییم بە مرۆڤایەتیدا دێتەوە کە سەرکردایەتی خۆی بسپێرێت بە ئەم گەلە، لە کاتێکدا ئەم گەلە هەژارو نەدارە بە هەرهەمووئەوبەها مرۆییانە!! ). بەڵام سەبارەت بە رۆڵی ئەمەریکا لە جیهانی عەرەبیداو سازدانی رووداوەکان تیایدا بەپێی بەرژەوەندیەکانی، هەروەهاسەبارەت بەدروستکردنی سەرکردەو پیاوە گەورەکانی خۆی، بەرێز حافزئەلشەیخ سەرۆکی یەکێتیی قوتابیانی زانکۆی خەرتوم و ئەندام لە (**جبهة المیثاق الوطني**)دا، کە ئێستە لە سەرکردەکانی (**الجبهة الوطنیة الاسلامیة**)یە کە حەسەن ئەلتورابی سەرۆکایەتی دەکات دەڵێت.

حافزئەلشەیخ هات بۆ لای سەید قوتبو لە ماڵی خۆی لە حەلوان سەردانی کرد، پیرۆزبایی لێکرد بە هۆی ئازادکردنیەوە، لە ریزی ئەو قسانەی کە بۆ حافزئەلشەیخ ی کرد: (شیوعیەت ناتوانێت لە رێگەی دیموکراتیەوە سەرکەوێت، چونکە رەگ و ریشەی لە سوداندا نیە، بەڵام مەترسی لەوەدایە شیوعیەکان پەنا ببەنە بەر رژێمێکی فەرمانرەوایی شیوعی بەزەبری هێز، مەترسی لە سوپادایە!، تەنانەت ئەگەر سوپاش سەرکەوتوو بوو لە هەستان بە کودەتاداو، شیوعیەکان گەشتنە دەسەڵات و، سیستمی خۆیان چەسپاند، ئەوە بەو شێوەیەش هەر زۆر بەردەوام نابێت! چونکە ئەمریکیەکان سورن لەسەر ئەوەی لە رۆژهەڵاتی عەرەبیدا دەسەڵاتێکی شیوعی دروست نەبێت. . ئەوان دەست رۆیشتوترن لەم ناوچەیەدا.

پاشان نموونەی بە سوریا هێنایەوەو وتی: زۆری نەمابوو سوریا ببێت بە شیوعی، یەکێتیو یەکبونیان بۆ رێك خست، لەگەڵ ئەوەدا ئەو یەکبوونە لەگەڵ پلانی زایونیزمدا لە ناوچەی عەرەبیدا نەدەگونجا!! یەکێتیی نێوان میسرو سوریا بۆ مەبەستێکی دیاریکراو رێکخرا کە لەناوبردنی شیوعیەت بوو، بە ئەنجامدانی مەبەستەکە یەکێتیەکەش کۆتایی پێهات.

پاشان وتی: مەترسی راستەقینە، بریتیە لە مەترسی زایۆنیەتو ئەمریکیەکان، چونکە ئەوانن دەسەڵاتیان فراوان دەکەن بەسەر ناوچەی رۆژهەڵاتدا. )[1]

لە قوڵترین لێکدانەوە سیاسیەکانی سەید قوتب بۆ قەزیەی فەلەستین، ئەوەیە کە یەکێك لە برا فەلەستینیەکان گێراویەتیەوە، لە کاتێکدا رەزامەندی نوێنرا بەرامبەر دروستکردنی رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی و دەستنیشان کردنی ئەحمەدئەلشەقیری بە سەرۆکی ئەو رێکخراوە.

ئەو برا فەلەستینیە بۆ گۆڤاری (**الغرباء**) کە لە لەندەن دەردەچێت دەگێرێتەوە کەسەید پێی وتووە : رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی بزماری کۆتاییە لە تابوتی تەرمی قەزیەی فەلەستیندا!!

عەرەب کە رێکخراوەکەیان دروست کرد، لە پێناوی رزگارکردنی فەلەستین نیە لە جوولەکە ـ وەك لە رووکەشدا وا دەردەکەوێت ـ بەڵکو بۆ دانوستانە لەگەل جوولەکەو جەنگ وەستاندنە لەگەڵیان، ئەنجامدانی چارەسەرێکی ئاشتیانەیە لەگەڵیان، ئیمزاکردن لەسەر بەڵگەنامەی رێکەوتن لەگەڵ جوولەکە، دەست هەڵگرتنە لە زۆربەی زەویەکانی فەلەستین بۆیان!!

شارەزایان و چاودێرانی قەزیەی فەلەستین و رۆڵی رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی لە چارەسەری ئاشتیانە لەگەل جوولەکە لەم رۆژگارەدا، ، بە ئاشکرا راستی ئەم لێکدانەوەو شیکردنەوە سیاسیە قوڵەی سەید قوتب دەبینن، لە کاتێکدا رووداوەکان لە دوای چارەکە سەدەیەکەوە دێنو راستی قسەکەی سەید دەسەلمێنن!!

نهێنی لە راستیو دروستی لێکدانەوە سیاسیەکانی سەید قوتدا بریتیە لە تێروانینی بۆ رووداوەکانی جیهان بە گشتیو رووداوە ناوچەییو ناوخۆییەکان لەسەر رووناکی راستیە قورئانیەکانەوە، هەروەها کێشانەیان بە کێشانەیەکی قورئانی ورد، هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوەی لە چوار دەورەیدایە لەسەر بنچینەی سوننەتە خواییەکان کە قورئان روونی کردونەتەوە!

---

[1] الشهید سید قطب: 91 ـ 92، وەرگێراوە لە گۆڤاری (المیثاق الاسلامي لە سودان کە حافظ الشیخ بۆی دەدوێ) ژمارە: 324، 1966/9/16.

## بەرهەمە فیکری و ئەدەبییەکانی سەید قوتب

سەید قوتب بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر عەودالْو تامەزرۆی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو خوێندنەوە بوو، هەر لە منداڵێیەوە تا لاوێتیو تا پیربوونی، خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە هەموو کاتەکانی داگیر کردبوو، هەموو هیوایەتو ساتەکانی گرتبووەوە، لە سەرەتادا ڕووی کردە بابەتە ئەدەبیو ڕەخنەییەکان لە جیهانی ئەدەبو ڕەخنەو هۆنراوەدا لەرێگەی بابەتو چامەو چیرۆكو کۆڕو وتارخوێندنەوەوە، بەرهەمەکانی لەم قۆناغەدا بەرهەمێکی ئەدەبی ڕەخنەیی بووە، هەروەك لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەدا ڕونمان کردەوە. . پاشان ڕووی کردە لێکۆڵینەوەی ئیسلامی، لە بوارە ئیسلامیەکاندا گەڕاو خوێندیەوە، بەرهەمەکانی لەم قۆناغەدا بەرهەمی ئیسلامی بوون هەروەك لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەدا ڕوونمان کردەوە. .

بەرهەمە هەمە جۆرەکانیشی زۆر چڕو پڕن، بەرهەمە ئەدەبیە چڕەکانی نزیکەی بیست ساڵی خایاندووە، لە ساڵی 1925ەوە تا ساڵی 1945، کە زۆربەیان لە شێوەی بابەتدا بوونو لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردونەتەوە.

بەڵام بەرهەمە ئیسلامیەکانی ئەوانیش نزیکەی بیست ساڵ درێژەی هەبووە لە ساڵی 1945 بۆ ساڵی 1965، کە هەندێکیان بابەت بوون لە گۆڤارەکاندا، هەروەك لە بابەتە ئیسلامیەکانی کە لە گۆڤارەکانی (**الرسالة، الدعوة، الاشتراكية، المسلمون**. . هتد)دا دەردەکەوێت، هەندێکیشیان لە شێوەی کتێبو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا بڵاوکراونەتەوە.

سەید دەربارەی خوێندنەوەی خۆی دەڵێت: (ئەو مرۆڤێك بوو چل ساڵی ڕەبەق ژیا خوێندیەوە، پیشەی یەکەمی تیایدا خوێندنەوەو شارەزابوون بوو لە بەشە جیاجیاکانی مەعریفەی مرۆییدا، ئەوە لە تایبەتمەندی ئەو نەبوو، لە هیوایەتەکانیشی نەبوو. . پاشان گەڕایەوە بۆ سەرچاوەکانی عەقیدەو بیرو بۆچوونەکانی، بینی هەموو ئەوەی خوێندویەتیەوە زۆر کەمە لەتەنیشت ئەودەستمایە مەزنو زۆرەدا،ئەو(سەیدقوتب) پەشیمان نیە لەوەی چل ساڵ لە تەمەنی تێدا بەسەر بردووە، چونکە تیایدا حەقیقەتی نەفامی ناسی کە چەندە لادراوە، چەندە بێ ئەرزشە، چەندە باوە قورەتو نزمە، چەندە فشەڵو فاڵو بێ ناوەڕۆکە، چەندە لە خۆباییو پڕوپاگەندە چییە. . )[1]

ڕۆژانە لە لێکۆڵینەوەو شارەزابووندا چەند کاتژمێرێکی بەسەر دەبرد: (کۆی ئەو کاتژمێرانەی تیایدا دەیخوێندەوە لە ڕۆژێکدا، دە کاتژمێر بوو، وەك ئاستێکی نزم بۆ لێکۆڵینەوەو شارەزا بوون).[2]

هەروەها لە ڕووی پەلەنەکردنو تۆکمەکردنی لێکۆڵینەوەکانیەوە بە ڕاستی سەید لێکۆڵەر بوو، زۆر لە سەرخۆو بە ئارام بووە، لە لێکۆڵینەوەو دیراساتەکانیدا پەلەی تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکانی نەبووە، هەڵی نەپروزکاندوون، بەڵکو وەك دەڵێن: خستونیەتیە سەر ئاگرێکی هێواش تا بە تەواوی پێ بگەن!!

وەك خۆی دەڵێت: کە نزیکەی دە ساڵ سەرگەمی بابەت کۆکردنەوەو سەرنج وەرگرتن بووە بۆ تەواوکردنی لێکۆڵینەوەیەك.[3]

هەروەها بۆ ئامادەکردنی باسەکانی پەیوەندی دەکرد بە هەموو ئەو کەسانەوە کە بیزانیایە زانیاری سوودمەندیان لایەو بابەتەکەی دەوڵەمەند دەکەن، ئاگادارمان دەکاتەوە لەو برە وزەو توانایەی سەرفی کردووە لە پێناوی نووسینی بابەتێکی بەپێزدا لە خوێندنەوەی کتێبو گەڕان بە دوای سەرچاوەدا، وەك دەڵێت: (ئەو توانای سەرف دەکرد ـ بۆ ئەوەی شتێکی بەنرخ

---

[1] معالم في الطريق: 175 - 176.

[2] الشهيد سيد قطب: 27.

[3] گۆڤاری الاسبوع، بەرگی دووەم/ ژمارە: 45، لاپەڕە (9).

بلێت ـ زیاتر لەو وزەو توانایەی لە هەر هونەرێکی تر لە هونەرە ئەدەبییەکاندا سەرفی دەکرد. نووسینی بابەتێك بەلای کەمەوە واجبی دەکرد لەسەری کە یەك کتێب بخوێنێتەوە، یان دە کتێب یان لە هەندێ جاردا بیست کتێب!. . )[1]

هەندێ جار بۆ بابەتێکی گرنگ شێوازێکی تایبەتی دەگرتە بەر تا زۆرترین سەرچاوەو زانیاری دەست کەوێت کە پێ ناچێت هیچ نووسەرێکی تر بەو شێوەیەی کردبێت، ئەویش بریتیی بووە لە بڵاوکردنەوەی بانگەواز بۆ ئەدەبیانی ولاتانی عەرەبی کە فلانە بابەتم بە دەستەوەیەو پێویتسم بە شتی تازە هەیەو منیش دەستم ناگاتە هەموو ئەو تازانە، لەبەر ئەوە هاوکاریتان جێگەی ڕێزە، لە ڕێگەی پۆستەوە نرخی ئەو بابەت یان کتێبەی ئەناردەوە بۆ ئەو کەسەی ڕەوانەی کردبوو بۆی، بە تایبەتی ئەم کارەی بۆ نووسینی هەردوو لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی (شعر الشباب) و (**القصة الحديثة**) ئەنجامدا.

کاتێکیش ڕووی کردە لێکۆڵینەوەو دیراساتی قورئانیو ئیسلامی، لەسەر ڕێبازە هۆشیارو هێمنو ئارامەکەی لە لێکۆڵینەوەو شارەزابوون و ئاگاداربووندا مایەوە، نزیکەی چارەکەسەدەیەك لەگەڵ قورئاندا ژیا، لە 1940 تا 1965، بە سەرنجدانو تێفکرانو لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەو شارەزابوونەوە.

بیستو پێنج ساڵ هاتوچۆو گەشتی کرد بەناو باخە چڕوپڕەکانی مەعریفەو زانیاریە قورئانیەکاندا پاشان دەستی بە نووسین کرد، بەڵگەیەکی تر لەسەر بەئارامیو پەلەنەکردنی لە باسو لێکۆڵینەوە ئیسلامیەکانیدا ئەو ماوە دوورو درێژە بوو کە بەسەری بردو دەیکۆڵیەوە بۆ ئامادەکردنی کتێبی(خصائص التصور الاسلامی) کە زیاتر لە دە ساڵی بەسەر برد لە بەدواداچووندا، ئەوەبوو لە سەرەتای پەنجاکاندا دەستی پێکرد، بەلام لە ساڵی 1962دا کتێبەکەی دەرکرد، بەڵام کتێبی (**نحو مجتمع** اسلامی) لە سەرەتای پەنجاکانەوە دەستی بە ئامادەکردنی کرد، ساڵی 1966 شەهیدا کرا هێشتا باسەکەی تەواو نەکردبوو!!

## سەید قوتب ڕابەرە لە باسە ئەدەبیو ڕەخنەییەکاندا

سەید باسەکانی لە بابەتە ئەدەبی ڕەخنەییەکاندا دەست پێکردو ژمارەیەکی زۆر بابەتو کتێبی لە ئەدەبو ڕەخنە و پەخشان و شیعر و چیرۆك و شیکردنەوەدا نووسی. . لەم هونەرانەدا بەرهەمێکی چڕوپڕی هەیە کەخۆی دەبینێتەوە لەو هەموو بابەتەدا کە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردونەتەوە.

سەید بەردەوام لە باسە ئەدەبیەکانیدا گەشەی دەکرد تا گەشتە ئاستی ڕابەرایەتیو لوتکە، بە ڕاستی ئەدیبو شاعیرو نووسەرو شیکەرەوەو ڕەخنەگربوو، لە پێشەنگی ئەدیبو ڕەخنەگرەکاندا بوو، سەرەتای کاری ئەدەبیو ڕەخنەگریەکەی لە قوتابخانە ئەدەبیەکەی عەقادەوە بوو، پشتگیری عەقادی دەکرد دژ بە مستەفا ئەلرافعی.

بەڵام لە قوتابخانەکەی عەقاددا بەردەوام نەبوو، بەڵکو وردە وردە لێی دەرچوو، بویە دژی، لە نیوەی چلەکاندا بە تەواوی لە قوتابخانەکەی عەقاد دەرچوو، سەربەخۆیی وەرگرت بە تێگەشتنێکی نوێ لە ئەدەبو ڕەخنەدا.

تا سەرەنجام لە بواری ئەدەبو ڕەخنەدا گەشتە پلەی ڕابەرایەتی، بووبەخاوەن قوتابخانەیەکی سەربەخۆ، کە دەتوانین ناوی بنێین قوتابخانەی وێنەو سێبەر (**الصور والظلال**)، کە ئەم قوتابخانەیە بەرئەنجامی لێکدانی چاکەکانی هەردوو قوتابخانەکەی عەقادو ڕافعی بوو بە خۆدوورگرتن لە کەموکورتی وخاڵە لاوازەکانیان.

سەید وازی لە لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکانی هێنا ـ دوای ئەوەی تیایدا گەشتە ڕابەرایەتی ـ تا جەولەیەکی نوێ دەست پێ بکات، بوارێکی نوێ بگرێتە بەر، ئەوە بوو سەرلەنوێ لە سفرەوە دەستی پێکردەوە، بەردەوام گەشەی تیا دەکرد تا لەو بوارەشدا گەشتە لوتکەو ڕابەرایەتی، ئەوەبوو بوویە پێشەنگ لە باسە ئیسلامیەکاندا، یاسای قوتابخانە ئەدەبیو نەقدییەکەی ـ قوتابخانەی وێنەو سێبەر ـ لە هەردوو کتێبی (**التصوير الفني في القرآن**) و (**النقد الأدبي اصوله ومناهجه**) بەرجەستە کراوە.

---

[1] گۆڤاری (الرسالة): ژمارە (595) لاپەڕە (1045).

## به هه‌مان شێوه پێشه‌نگ‌و ڕابه‌ره له‌ باسه‌ ئیسلامیه‌کاندا

سه‌ید سه‌ره‌تای باسه‌ ئیسلامیه‌کانی له‌ میانه‌ی لێکۆڵینه‌وه‌ ئێستاتیکیه‌کانیه‌وه‌ بۆ قورئان ده‌ست پێکرد، که‌ په‌یوه‌ندی هه‌یه‌ به‌ قوتابخانه‌ ئه‌ده‌بیه‌که‌یه‌وه‌ (وێنه‌و سێبه‌ر)، پاشان له‌م لێکۆڵینه‌وانه‌دا گه‌شه‌ی کردو، به‌ ته‌نیشتی لایه‌نه‌ فیکریه‌ ئیسلامیه‌ گشتیه‌که‌یه‌و به‌ره‌و پێش ڕۆشت. . پاشان به‌رده‌وام گه‌شه‌ی کرد تا گه‌شته‌ ڕابه‌رایه‌تی‌و پێشه‌نگی!

سه‌ید قوتب پێشه‌نگ و ڕابه‌ره‌ له‌ لێکۆڵینه‌وه‌ی هونه‌ری جوانیی به‌یانیی قورئانیدا، له‌ میانه‌ی هه‌ردوو کتێبه‌که‌ی (**التصوير الفني في القران**) و (**مشاهد القيامة في القران**) ه‌وه‌ ، پێشه‌نگ‌و ڕابه‌ره‌ له‌ دیراساتی ئیسلامی گشتیدا، له‌ میانه‌ی (**العدالة الاجتماعية في الاسلام**)، و (**السلام العالمي والاسلام**) ه‌وه‌، پێشه‌نگ‌و ڕابه‌ره‌ له‌ دیراساتی ئیسلامیی حه‌ره‌کیدا، له‌ میانه‌ی ((**في ظلال القران**)) و ((**المستقبل لهذا الدين**)) و ((**معالم في الطريق**))ه‌وه‌.

## گرنگی چاپکردن و بڵاوکردنه‌وه‌ی سه‌رجه‌م به‌رهه‌مه‌کانی

### ڕه‌دکردنه‌وه‌ی بانگه‌شه‌ی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی به‌رهه‌مه‌ ئه‌ده‌بیه‌کانی پێشووی

### ئایا سه‌ید وازی له‌ کتێبه‌کانی پێشووی هێناوه‌؟

**دژایه‌تی کردنی کتێب‌و بیروبۆچوونه‌کانی سه‌ید له‌ لایه‌ن سته‌مکارانه‌وه‌**

دوای دووه‌م کاره‌سات که‌ به‌سه‌ریدا هات و بوویه‌ هۆی شه‌هید کردنی، سته‌مکاران له‌ میسردا ویستیان ناوی سه‌ید قوتب له‌ جیهانی باس‌و لێکۆڵینه‌وه‌و فیکردا بسڕنه‌وه‌، هه‌موو کتێب‌و بیروبۆچوونه‌کانی له‌ سێداره‌ بده‌ن و هه‌موو پاشماوه‌و به‌رهه‌مه‌ ئه‌ده‌بی‌و فیکریه‌کانی له‌ناو به‌رن.

مامۆستا عه‌بدولباقی محه‌مه‌د حسه‌ین به‌ بۆنه‌ی سه‌رقاڵبوونی به‌به‌رهه‌مه‌کانیه‌وه‌ له‌ نامه‌یه‌کی ماسته‌ردا ئاماژه‌ به‌م جه‌نگه‌فیکریه‌ ده‌کات که‌ سته‌مکاران کردیانه‌ سه‌ر دانراوه‌کان‌و بیروبۆچوونه‌کانی سه‌ید قوتب، له‌ چاوپێکه‌وتێنکدا ئاماژه‌که‌شی ده‌رده‌بڕێت که‌ له‌گه‌ڵ په‌یامنێری گۆڤاری (المسلمون)دا ئه‌نجامی داوه‌ له‌ ساڵی 1982.

مامۆستا عه‌بدولباقی ده‌ڵێت: له‌ به‌رواری 1965/10/2داو له‌ وتارێکی نهێنی دا که‌به‌ژماره‌ (202) ده‌رچوو فه‌رمان ده‌رچوو به‌ قه‌ده‌غه‌کردنی کتێبه‌کانی سه‌ید قوتب [1]، ئه‌و وتاره‌ هه‌موو کتێب‌و دانراوه‌کانی سه‌یدی قه‌ده‌غه‌ کردبوو، به‌سه‌ر سه‌رجه‌م کتێبخانه‌و خانه‌کانی چاپ‌و بڵاوکردنه‌وه‌دا گشتگیرکرابوو، که‌ هه‌رچیه‌کیان لایه‌ له‌ کتێب‌و دانراوه‌کانی سه‌ید ده‌بێت له‌ سێداره‌ی بده‌ن، هه‌رکه‌سێك پارێزگاری له‌ مانه‌وه‌ی ته‌نها نوسراوێکی بکات داده‌نرێت به‌ ڕه‌واج پێده‌ری بیروبۆچوونه‌کانی سه‌ید دژ به‌ ده‌وڵه‌ت، هه‌ڵگرتنی یه‌کێك له‌و کتێبانه‌ تاوانێکه‌ خاوه‌نه‌که‌ی ڕووبه‌ڕووی سوکایه‌تی پێکردن ده‌کاته‌وه‌. . ).

هه‌موو کتێبه‌کانی سه‌ید له‌سه‌ر داوای ئه‌م وتاره‌ نهێنیه‌ ـ له‌ کتێبخانه‌ گشتیه‌کاندا کۆکرانه‌وه‌و له‌ناو بران، هه‌روه‌ها ئه‌م کتێبانه‌ له‌ کتێبخانه‌ زانستیه‌کانی سه‌ر به‌ زانکۆکانیشدا کۆکرانه‌وه‌و خرانه‌ سندوقه‌وه‌و له‌ زیندانی ئه‌لقه‌لعه‌دا هه‌ڵگیران، عه‌بدولباقی ئاماژه‌ به‌ به‌شێك له‌ چه‌رمه‌سه‌ریه‌کانی ده‌کات له‌ کاتێکدا بۆ ئاماده‌کردنی نامه‌که‌ی ده‌گه‌ڕێت به‌ دوای به‌رهه‌مه‌کانی سه‌یدا. . (له‌ کاتێکدا پرسیاری کرد ده‌رباره‌ی کتێبه‌کانی سه‌ید له‌ (دار الكتب المصرية)، وتیان ئه‌و کتێبانه‌ کۆکراونه‌ته‌وه‌و خراونه‌ته‌ سندوقی گه‌وره‌وه‌و پاشان نێراون بۆ زیندانی ئه‌لقه‌لعه‌ که‌ نوێنه‌رایه‌تی سه‌ربازی لێیه‌.

---

[1] سيد قطبى يوسف العظم: 318 ـ 319.

عەبدولباقی زۆر سەردانی زیندانی قەلعەی کرد بۆ ئاگاداربوون بەسەر ئەو دانراوانەدا بەڵام بێ سوود بوو. . لە دوایین جاردا، هەواڵیان پێدا کە ئەو سندوقەیان دۆزیوەتەوە، بەڵام دانراوەی سەید قوتبیان تێدا نەدۆزیوەتەوە، جگە لە کەمێکی دڕێنراو نەبێت، ئەویش ئەوەبووە کە لە چنگی موخابەرات ماوەتەوە. . )[1]

سەیر ئەوەیە کە مامۆستای لێکۆڵەر دانراوەکانی سەید قوتبی نەدیتەوە لە کتێبخانەی (زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرەدا نەبێت، سەرەتا لە دیوانی (**الشاطئ المجهول**)وە، تاکۆتایی و دوا کتێبی کە (**معالم في الطريق**)بوو[2]

وا دەردەکەوێت کتێبخانەی زانکۆی ئەمریکی بەر ئەو گشتگیریەی وتارە نهێنیەکە نەکەوتبێت، چونکە سەر بە زانکۆی ئەمریکی بوو، نەك سەر بە میسر!!

شتێکی تر کە بەڵگەیە لەسەر دژایەتی کردنی ستەمکاران بۆ کتێبەکانی سەید قوتب، هەواڵێکە **محەممەد** قوتب بۆمان دەگێڕێتەوە، منیش لە پێشەکی کتێبەکەمدا (**مدخل الى ظلال القران**) هێناومەو بۆ هەمان بۆنە جارێکی تر دەیگێڕمەوە:

بەڕێز عەبدولحەمید جەودەت ئەلسەحار شەریك بوو لەگەڵ سەید قوتب لە نووسینی زنجیرە چیرۆکێك بۆ منالآن، کە چیرۆکی ئاییىنی بوون، ئەم زنجیرەیە لە بازاڕدا تەواو بوو وا پێویستی دەکرد جارێکی تر چاپ بکرێتەوە. . بۆ ئەمە عەبدولحەمید جەودەت ڕۆشت بۆ لای شەمس بەدران کە لەو کاتەدا بە فیعلی فەرمان ڕەوای میسر بوو، تا ڕەزامەندی لێ وەربگرێت بۆ دووبارە چاپ کردنەوەی، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ناڕەحەتی سەیدا لە زینداندا زۆر قورستر بوو لە ساڵی 1965، شەمس بەدرانیش ڕەزامەندی نواند بە لە چاپدانەوەی بەو مەرجەی لەسەر کتێبەکانی ئەو زینجیرەیە ناوی سەیدقوتب بکوژێنرێتەوەو نەمێنێ، کە هاوبەشی عەبدولحەمید بووە لە دانانیدا!!

عەبدولحەمید ئەم مەرجەی پێ سەیر بوو، بە بەدرانی وت: لەوە ئەچێت ئێوە سووربن لەسەر سڕینەوەی ناوی سەید قوتب و بیروبۆچوونەکانی ؟! جگە لەمە بەدران هیچی نەوت: بەڵێ! ئێمە لەسەر ئەمەو سورین و زۆر جددین لەسەر بەئەنجامگەیاندنی!!)[3]

بەم شێوەیە ستەمکاران هەوڵی لەناوبردنی سەرجەم دانراوەکانی سەید قوتبیان داوەو، لەو پێناوەشدا هەموو توانای خۆیان خستۆتە کارو هەموو ڕێگەو شێوازێکیان بەکار هێناوە، بەڵام ئەنجامی بەچی گەشت، دوای زیاتر لە سی ساڵ بەسەر قسەکەی شەمس بەدراندا ئایا ئەوانە لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو بوون؟ ئایا کتێبو دانراوو بیروبۆچوونەکانی سەیدیان لە سێدارەدا وەك چۆن جەستەکەیان لە سێدارەدا؟

بێگومان هەر چاودێرو بەئاگایەك، بە ڕوونی فەزڵی خوا بەسەر سەیدەوە دەبینێ، کە چۆن شەهیدبوونی پێ بەخشی، چۆن قبوڵو کاریگەربوونی بۆ کتێبەکانیو بیروڕاکانی نووسی. . لە کاتێکدا ستەمکارانو خوێنڕیژان لە هاوشێوەکانی عەبدولناسرو شەمس بەدران ڕۆشتن، لە گۆڕنران بە نەفرین کراویو خراپ باسکردنەوە، جار بۆ جار کلکی شکست خواردن ڕادەکێشن، کتێبە ئیسلامیەکانی سەیدی پێشەنگیش بڵاوەی کرد بە وڵاتی موسڵمانانندا، تەنانەت گەشتە ماڵی هەموو موسڵمانێکو بازاڕی جیهانی ئیسلامی پڕکردەوە.

---

[1] گۆڤاری المسلمون: ژمارە 11 بەرواری 1982/2/8، لاپەڕە 12.
[2] سيد قطب: عبدالباقي: 116.
[3] مدخل الى الظلال: صلاح عبدالقادر الخالدي: 7 ـ 8.

# بــەرهــەمــەكــانــی ســێ بــەشــن

**دەتوانین بەرهەمە ئەدەبیو فیكریەكانی سەید بكەین بە سێ بەشەوە:**

**یەكەم: بابەتەكانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا**

بابەتەكانی سەید لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا زۆرو جۆراو جۆرن بوون: ئەوەی سەید لە هونەری ئەدەبدا بەرهەمی هێناوە، زیاتر نییە لەوەی كە لە هونەری بابەتدا بەرهەمی هێناوە[1].

بابەتەكانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا نزیكەی سی ساڵی خایاند ـ لە ساڵی 1924ەوە تا 1954، لە زۆر گۆڤاردا نووسی، بە حزبیو ئیسلامییو ئەدەبیو سیاسیو كۆمەڵایەتیەوە، ئەمەمان لە پێشەوە باس كردووە لە كاتی ناوهێنانی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی كە سەید تیایاندا نووسیویەتی، ئەم بابەتانە پێویستیان بە كەسێك هەیە كۆیان بكاتەوەو ڕێكیان بخاتو بە چاپیان بگەیەنێت، لەسەر بنچینەی بابەتەكانی ڕیزیان بكات، ڕێكسازی بكات لە نێوانیانداو بڵاویان بكاتەوە بەسەر ئەدیبو ڕۆشنبیراندا، چونكە هەموو ڕۆشنبیرێك ناتوانێت دەستی بگاتە ئەو هەموو گۆڤارە كۆنانەو بابەتەكانی سەیدیان تێدا بدۆزێتەوە!

سەید قوتب هەندێك لە بابەتەكانی كۆكردۆتەوەو لە دوو توێی كتێبدا چاپی كردووە.

سەید هەندێ لە بابەتە ڕەخنەییەكانی كۆكردۆتەوەو لە كتێبی (كتب و شخصيات)دا بڵاوی كردونەتەوە. . هەندێك لە ئەندێشەكانی لە كتێبی (**الاطياف الاربعة**)دا بە هاوبەشی لەگەڵ براكانیدا كۆكردۆتەوە، وەك ئەوەی بیەوێت دەرگا لەسەر لێكۆڵەرەوەكان بكاتەوەو، بانگیان بكات بۆ كۆكردنەوەی بابەتەكانی سەیدو دەرهێنانی. .

**لیستی دكتۆر ئەلخەباس بۆ بابەتو چامەكانی سەید**

مامۆستایانی لێكۆڵەر توانیویانە هەندێك لە بابەتەكانی سەید كۆبكەنەوەو لیستێكی (بیبلیۆغرافیا)ی هونەری بۆ ئامادە بكەن، لەو مامۆستایانە دكتۆر عەبدوڵلائەلخەباسە كە لیستی بابەتەكانی كۆكردۆتەوە لە پاشكۆی كتێبەكەی (**سيد قطب الاديب الناقد**)دا كە نامەی ماستەری پێ وەرگرت لە ئەدەبدا لە كۆلێژی ئادابی زانكۆی ئەردەن لە ساڵی 1982 بڵاوی كردۆتەوە.

لیستەكەی دوكتۆر ئەلخەباس چاكو بەنرخو سودبەخشومەزنەو زیاتر لە هەشتا لاپەڕە دەبێت، بە شێوەیەك تەنها ئەو لیستەی شایەنی ئەوەیە بكرێتە نامەیەكی تایبەت، دكتۆر لیستەكەی كردووە بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەكەم:** ئەوەیە كە ئێمە بەلامانەوە گرنگە كە تایبەتی كردووە بە پاشماوەكانی سەیدو بەرهەمە ئەدەبیو فیكریەكانیەوە، ئەم بەشە دانراوو چاپكراوەكانی سەیدو ئەو باسانەی كە بڵاونەكراونەتەوەو ئەو نامانەی دوای شەهیدبوونی دەركەوتن، یان لە كتێبو بابەتەكانی لابرا بوون، دەگرێتەوە. . هەروەها ئەوانەش دەگرێتەوە كە سەید بڵاوی كردونەتەوە لە هۆنراوەو بابەت لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا، لەگەڵ ئەو پێشەكیانەی بۆ هەندێك كتێبی نووسیوە.

**بەشی دووەم:** تایبەتی كردووە بۆ ئەو نووسراوانەی نووسەرەكان دەربارەی سەید نووسیویانە لە كتێبە چاپكراوەكانو نامە زانكۆییەكانو ئەو بابەتانەی دەربارەی سەید یان فیكرەكەی نوسراون.

عەبدوڵلا ئەلخەباس لیستی ئەو بابەتانەی توانیویەتی دەستی پێی بگات، بڵاوی كردۆتەوە، دان بەوەشدا دەنێت كە نەیتوانیوە دەستی بگاتە هەموو بابەتەكانی، هەموو ئەو گۆڤارانەشی دەست نەكەوتووە كە شتی بۆ سەید بڵاوكردۆتەوە یان لە سەری نووسیوە.

بەڵێنی داوە لە داهاتوودا هۆنراوەكانی سەید لە كتێبێكداو، بابەتەكانی لە كتێبێكی تردا بڵاو بكاتەوە. . ئێمە چاوەڕوانین! ژمارەی ئەو چامانەی پێڕست كراونو ڕیزكراون لە لیستەكەیدا گەشتۆتە هەشتاو هەشت چامە.

---

[1] سيد قطب: عبدالباقي: 264.

لە کاتێکدا ژمارەی بابەتەکانی گەشتونەتە سێ سەدو چواردە بابەت. .

هەروەها عەبدولباقی محەمەد حسەین لیستێکی تایبەتی کردەوە بۆ بابەتو چامەکانی سەید، کە ئەمەشیان هەر بۆ دەستهێنانی نامەی ماستەر بوو لە کۆلێژی (دار العلوم)ی زانکۆی قاهیرە. بە ناونیشانی (**سید قطب حیاته وادبه**)، توانی نامەی ماستەری پێ وەرگرێ لە ساڵی 1982دا، لە لیستەکەی عەبدولباقیدا کۆی چامە شیعریو بابەتەکانی سەید دەگاتە چوارسەدو پەنجاو پێنج چامەو بابەت، واتە چەنجا چامەو بابەت زیاتر لەوەی دکتۆر ئەلخەباس تۆماری کردبوو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی عەبدولباقی زیاتر ئاگاداربووە بەسەر گۆڤارەکانداو بەردەستی کەوتوون، چونکە خۆی لە قاهیرە بووەو توانیویەتی بە ئاسانی سەردانی خانەکانی کتێب بکات لەوێ. . عەبدولباقی ڕەچاوی مێژووی نووسینەکانی بەپێی دەرچوونی گۆڤارو ڕۆژنامەکان کردووە، هەروەها عەبدولباقیش نەیتوانیوە هەموو ئەوەی سەید بڵاوی کردونەتەوە کۆیان بکاتەوەو ئاگادار نەبووە بەسەر هەموویاندا.

هەروەها ئەمیش پەیمانی داوە هەموو بابەتەکانی کۆبکاتەوەو لە لێکۆڵینەوەیەکی داهاتوودا بڵاویان بکاتەوە. . ئێمەش چاوەڕوانین. .

پێمان خۆشە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دوای شەهیدکردنی سەید، گۆڤارە ئەدەبیو ئیسلامیەکان هەستان بە بڵاوکردنەوەی هەندێك لەو بابەتانەی بەبۆنەی یادی شەهیدکردنیەوە نووسرابوون، منیش هەستاوم بە کۆکردنەوەی ئەو بابەتانەی سەید دەربارەی ئەمەریکا نووسیویەتی، ڕێکم خستوون، بەلێکۆڵینەوە ئامادەباشیم بۆ کردووە، سوپاس بۆ خوا لە کتێبێکدا بڵاوم کردونەتەوە بە ناونیشانی (**أمريكا من الداخل بمنظار سيد قطب**).!!

### دووەم: کتێبە چاپکراوەکانی

لەمەودوا هەڵدەستین بە ڕێکخستنی کتێبەکانی سەید بە پێی دەرچوونیان لە چاپی یەکەمیاندا، ئێمە وا دەبینین پێویستە لەسەر هەرکەسێك بیەوێت ئاگادار بێت بەسەر بەرەوپێشچوونی فیکری سەیددا، وە بەسەر ڕووکاری ئەم پێشکەوتنەدا، پێویستە هەموو کتێبە چاپکراوەکانی لەسەر بنەمای مێژووی دەرچوونیان ڕیز بکات.

هەمووڵا دەزانین کە سەید بە فیکرو ڕاو بۆچوونەکانی خۆیدا دەچووەوە، بڕیارەکانی نوێ دەکردەوە لەسەر بنەمای زانیاریە نوێکانی کەلەمیانەی باسە زانستیە بەردەوامەکانیەوە دەستی دەکەوت، جا ئەگەر ڕێککردنی کتێبەکانی شارەزا نەبینو لەسەر بنەمای دەرچوونیان ڕیزیان نەکەین ئەوا ڕاوبۆچوونێك دەدەینە پاڵ سەید کە پاشتر وازی لێهێناوە، بەمەش ستەمی لێ دەکەین، دەکرێت ڕایەکی هەبوو بێت، لە کتێبێکیدا تۆماری کردبێت، دواتر هەڵەی ڕاکەی بۆ دەرکەوتووەو لە کتێبێکی دوای ئەوەدا وازی لەو ڕایە هێناوەو بە هەڵەی داوەتە قەڵەم، لەبەر ئەوە پێویستە کتێبە پێشینەو دواینەکانی هەرهەمووی بناسین! پێشتریش مامۆستایوسف ئەلعەزم وەسیەتی بۆ هەموو بڵاوکەرەوەیەك کردبوو کە دەیەوێت کتێبەکانی سەید بڵاو بکاتەوە، چاپی یەکەمی ئەو کتێبە بنووسێت کە بڵاوی دەکاتەوە، کە ئەویش ئەو چاپەیە لە ژیانی سەیدخۆیدا چاپکراوە، بە هەمان شێوە لێکۆڵەرەوانیش کە ناوی کتێبە چاپکراوەکانی سەید دەهێنن، پێویستەبەپێی مێژووی دەرچوونیان ڕیزیان بکەن.

## دواکەوتنی سەید لە بڵاوکردنەوەی کتێب

سەید لە دانانو بڵاوکردنەوەی کتێب دواکەوت، بە شێوەیەك نزیکەی بیست ساڵی تەمەنی ئەدەبی بەسەر برد تەنها بابەتو چامەی دەنووسیو، پاش ئەوەی لە فیکریدا هەستی بە پێگەشتنی تەواو کرد دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی کتێب، سەید بە دکتۆر ئەحمەد ئەمین دەڵێت: (بە ڕاستی من مورید بووم ـ بە هەموو واتایەکی وشەی مورید ـ بۆ پیاوێك لە نەوەی ئێوە، بە دڵنیاییەوە دەیناسن (واتە عەقاد)، من هاوڕێ یان خۆشەویست بووم لەگەڵ کەسەکانی نەوەی ئێوە، بە هەمان شێوە بە ڕاستی بەبێ‌جیاوازی دەربارەی هەمووتان نووسیم، ڕاوبۆچوونەکانتانم شیکردەوە، کتێبەکانتانم خستە ڕوو، کردارەکانتانم لێك دایەوە، بەپێی ئەو توانایەی کە هەمبوو. .

پاشان ڕۆڵی من هات. . ڕۆڵم هاتە پێشەوە لەوەی کتێب بڵاوبکەمەوە، دوای ئەوەی کە من بابەتو باسو چامەم بڵاودەکردەوە، بە ڕاستی ڕۆڵی من لە بڵاوکردنەوەی کتێبدا درەنگ هات، چونکە من ئەوەم هەڵبژارد کە بەبێ پرس نەچمە سەرمینبەر، چاوڕەوانی بکەم لە بڵاوکردنەوەی کتێبە تۆمارکراوەکاندا تا هێندێك هەست بە پێگەشتنی ڕاستەقینە دەکەم، کە ڕێم پێبدات لە بازاڕی بڵاوکراوەکاندا دەربکەوم).[1]

سەید لە ساڵی 1945دا بڕیاری بڵاوکردنەوەی کتێبی دا، کە لەو کاتەدا تەمەنی چل ساڵان بوو.

لە ماوەی پێنج ساڵدا، لە ساڵی 1945 تا 1950 سیانزە کتێبو نامەی دەرکرد، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بڕشتی پێنووسەکەیو چڕوپڕی بەرهەمەکانی، وا پێ دەچێت کە گەورە ئەدیبان دەروونیان نارەحەت بوو بێت بەرامبەر ئەم بڵاوکراوانەی سەیدو، حەسودییان پێ بردبێت لەسەر ئەو بەرهەمە چڕوپڕانەی کە بە قەرزیان نەداوە هیچ دەست خۆشیەکیان لێ نەکردووە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەم بەرهەمە ئەدەبیو فیکریانەی سەیدیان پشتگوێ خستووە، چاوی خۆیان لێ نوقاندووە.

ئەم هەڵوێستە لە لایەن گەورە ئەدیبانەوە کاریگەری لەسەر دەروونی سەید بەجێ هێشت. لەم ڕووەوە بە دوکتۆر ئەحمەدئەمین دەڵێت:(کامەیە هەڵوێستی مامۆستاکەم عەقاد، کامەیە هەڵوێستی نەوەکەتان هەر هەمووی؟ ئەی کامەیە هەڵوێستی نەوەی پیران؟ نەك تەنها لەم کتێبەدا (**التصوير الفني في القران**) بەڵکو لەو دە کتێبەی کە تا ئێستە بڵاوم کردونەتەوە).[2]

## کتێبەکانی تەنها بیستو شەش کتێبن

ئەو کتێبانەی سەید نووسیونیو ئامادەو بڵاوی کردوونەتەوە تەنها (26) کتێبن، (25) کتێبیان لە ژیانی خۆیدا چاپ کراونو بیستو شەشەمینیان بە بیست ساڵ دوای شەهید کردنی چاپ کرا، کە (**مقومات التصور الاسلامي**)یە، لوتکەی کتێبەکانی (**في ظلال القران**)ە، کە لە (30) بەشدا دەریکردووە، هەربەشێکی لە کتێبێکی تایبەتیدا، وەك ئەوەی (**ظلال**) تەنها یەك کتێب نەبێت، بەڵکو سی کتێب بێت!

کتێبە چاپکراوەکانی دووبەشن:

**بەشی یەکەم:** کتێبە ئەدەبیەکانی، کە سیانزە کتێبن.

**بەشی دووەم:** کتێبە ئیسلامیەکان، بە هەمان شێوە سیانزە کتێبن.

**ئەمەش لیستی کتێبە چاپکراوەکانیەتی بە پێی مێژووی چاپی یەکەمیان:**

**1ـ مهمة الشاعر في الحياة وشعر الجيل الحاضر:**

وەك لە پێشەکیەکەیدا دەردەکەوێت لەساڵی 1933 چاپ کراوە.

**2ـ الشاطئ المجهول:**

---

[1] گۆڤاری الثقافة ساڵی سیانزەهەم: ژمارە 662 بەرواری 1951/12/10، لاپەڕە (8).

[2] هەمان سەرچاوە: لاپەڕە (8).

دیوانێکی شیعری چاپ کراوی سەیدە، هەروەها کۆتا دیوانیەتی، چونکە دواتر هیچ دیوانێکی چاپ نەکراوە، وەك خۆی ڕایگەیاندووە کە لە ژێر چاپدایە!!

سەید خۆی پێشەکی بۆ ئەم دیوانەی نووسیوە، تیایدا ڕەخنەی لە هەندێك لەچامەکانی خۆی گرتووەو، لەسەری نووسیون، هەندی چامەی تریشی تێدا نرخاندووە.[1]

بە ڕاستی شتێکی جوانە کە سەید قوتبی (ڕەخنەگر) ڕەخنە لە سەید قوتبی (شاعیر) بگرێت.

### 3ـ نقد كتاب مستقبل الثقافة في مصر:

دکتۆر تەها حسەین ساڵی 1938 کتێبێکی دەرکرد بە ناونیشانی (**مستقبل الثقافة في مصر**) ئەم کتێبە مشتومڕێکی زۆری بە چواردەوردا دروست بوو، چونکە تەها حسەین لە کتێبەکەیدا داوای ئەوەی کردبوو کە میسر ببێتە بەشێك لە جیهانی ڕۆژئاوا، هەروەها داوای وەرگرتنی ژیاری ڕۆژئاواو رۆشنبیری ڕۆژئاوای کردبوو بە تاڵو شیرینو چاكو خراپییەوە.

ئەدیبو بیریارەکان هەستان بە ڕەخنەگرتنی ئەم کتێبە، هەندێکیان پێیان باش بوو، هەندێکیان بەرپەرچیان دایەوەو پڕوپوچی بانگەشەکەیان ئاشکرا کرد.

سەید قوتب لە پێشەنگی ئەو کەسانەدا بوو کە ڕەخنەی لەم کتێبە گرت ولە ساڵی 1939دا کتێبەکەی بە چاپ گەیاند.

### 4ـ التصوير الفني في القران:

یەکەم کتێبی ئیسلامی سەید بوو، کە لە مانگی نیسانی 1945دا لە (دار المعارف) لە میسر دەرچوو.

لە بنەڕەتدا ئەم کتێبە دوو بابەت بوو کە سەید لە گۆڤاری (**المقتطف**)دا بڵاوی کردبوونەوە، دەربارەی (**التصوير الفني في القران**) ساڵی 1939.

سەید ئەم کتێبەی داناوە بە بناغەی پڕۆژە زانستیو ئەدەبیەکەی، کە ناوی نابوو (**مكتبة القران الجديدة**) کە دەیویست لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی بەیانیی بۆ قورئانی پیرۆز لە میانەی ئەو کتێبخانەیەوە پێشکەش بکات.

زاناو توێژەرە لێکۆڵەرەکان ئەم کتێبە بە ئاشکراکردنو دەرخستن ئەدەنە قەڵەم نەك بە دانراو، هەروەها دایان ناوە بە (کلیلێك) کە خوای گەورە بە خشی بە سەید، توانی بە هۆیەوە دەرگای گەوهەرو جوانی فراوانی قورئان بکاتەوە.

**5ـ الاطياف الاربعة:** ئەم کتێبە لە لایەن (**لجنة النشر للجامعين**)ەوە دەرچوو، کتێبخانەی میسر ساڵی 1945 چاپی کرد، لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا حەمیدەو **محەمەد**و ئامینە لەگەڵ سەید بەشداریان کردووە.

### 6ـ طفل من القرية:

بە هەمان شێوە ئەمەشیان لە لایەن (**لجنة النشر للجامعين**)ەوە لە ساڵی 1946دا بڵاوکرایەوە.

### 7ـ المدينة المسحورة:

چیرۆکێکی خەیاڵیە لە چیرۆکەکانی (**الف ليلة وليلة**)ەوە وەری گرتووە، (دار المعارف) لە میانەی زینجیرەی (اقرا)دا ساڵی 1946 بڵاوی کردۆتەوە.

### 8ـ كتب و شخصيات:

ئەمە سێیەم کتێبە کە لە ساڵی 1946دا بڵاوی بکاتەوە، کە لە پێش ئەم (**طفل من القرية**) و (**المدينة المسحورة**)ی لە هەمان ساڵدا بڵاو کردەوە.

### 9ـ أشواك:

[1] سيد قطب: الخباص، 130 ـ 135.

بریتیە لە چیرۆکی خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە، سەید لە دەرونی خۆیدا لەگەڵ دەسگیرانەکەیدا تیایدا ژیاوە، ئێمەش لە پێشەوە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە باسی (ئافرەت لە ژیانی سەیدا) لێی دواین. سەید ئەم کتێبەی لە مانگی ئایاری 1947دا لە (دار سعد) لە قاهیرە دەرکرد.

**10ـ مشاهد القيامة في القران:**

سەید ئەم کتێبەی لە نیسانی ساڵی 1947 لە (دار سعد) لە قاهیرە دەرکرد، ئەمە دووەم کتێبی بوو لە (**مكتبة القران الجديدة**) کە دەیویست دەری بکات.

**11ـ روضة الطفل:**

زنجیرە چیرۆکێك بوو بۆ منالاَن کە بە هاوبەشی لەگەڵ ئەمینەسەعید و یوسف موراد دەریان کرد. لەم باخچەیە تەنها دوو بەشیان دەرکرد:

یەکەم: أرنب والكنز.

دووەم: كتكت المدهش

هەردوو بەشەکە (دار المعارف)ی میسری ساڵی 1947 چاپی کرد.

**12ـ القصص الديني للاطفال:**

ساڵی 1947 لەگەڵ عەبدولحەمید جەودەت ئەلسەحار زنجیرەی یەکەمی لەم زنجیرانە دەرکرد کە کتێبخانەی (سعد) لە قاهیرە چاپی کرد.

**13ـ الجديد في اللغة العربية:**

**14ـ الجديد في المحفوظات:**

ئەمانە دوو کتێبی مەنهەجی بوون، بۆ قوتابیانی قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریف، کە لەگەڵ بەرپرسانی دانانی پرۆگرامەکانی خوێندن لەوەزارەتی مەعاریف دەریان کرد، ئەم کتێبە دان پیانراو بوو، لە قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریفدا دەخوێنرا ، تەنانەت تا کارەساتی یەکەمی سەید لەساڵی 1954و دادگایی کردنو دەرکردنی حوکمی لە سێدارەدانی، ئەم کتێبە وەك یەکێك لە پرۆگرامەکانی خوێندن هەڵنەوەشێنرانەوە تا ساڵی 1965 کەکارەساتی دووەم بەسەر سەیدقوتبداهات.

**15ـ النقد الادبي: اصوله ومناهجه:**

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی 1948 دەری کرد چوارەمو کۆتا کتێبی نەقدی سەید بوو.

**16ـ العدالة الاجتماعية في الاسلام:**

سەید پێش سەفەرەکەی بۆ ئەمەریکا ساڵی 1948 لە دانانی ئەم کتێبەی لێ بوویەوەو ئەرکی بە چاپگەیاندنی سپارد بە محەمەد قوتبی برای، لە مانگی نیسانی ساڵی 1948دا کەوتە بازاڕەوە، ئەمە یەکەم دانراوی سەید بوو لە فیکری ئیسلامیدا .

**17ـ معركة الاسلام والرأسمالية:**

سەید بۆ ماوەی دوو ساڵ لە نووسینو چاپکردن دابڕا، لە ساڵی 1948 تا 1950 کە لەو ماوەیەدا لە ئەمەریکا بوو، پاشان کە گەڕایەوە بۆ میسر، دەبینێ بارودۆخی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسی بەرەو خراپی دەڕوات، بینی کە سەرمایەدارەکانو داگیرکەران وکۆشكو بازرگانانی جەنگ بەرپرسیارن لەم بارودۆخە، کتێبی (**معركة الأسلام والراسمالية**)ی دانا، کە (**دار الكتاب العربي**) لە مانگی شوباتی 1951دا دەری کرد.

**18ـ السلام العالمي والاسلام:**

دوای چەند مانگێك لە کتێبی (**معركة الاسلام والراسمالية**) سەید بە کتێبێکی تری شۆڕشگێڕانەی ئیعلامی دەرکەوت کە بریتیبوو لە (**السلام العالمي والاسلام**) کە بە هەمان شێوە (**دار الكتاب العربي**) لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1951 بلاَوی کردەوە.

### 19ـ في ظلال القران:

له دیارترین دانراوەکانی سەید قوتبە، تەفسیرێکی تەواوی قورئانە، لە دووتوێی (30) بەشدا دەری کردووە، هەر بەشەی تایبەت بە جوزئێك لە قورئان، تیایدا ڕاوبۆچوونو ئەفکارەکانی تۆمار کردووە، هەروەها تیایدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ئیسلامو بانگەوازو جوڵەو ڕووبەڕووبوونەوەو گۆڕین خستۆتە ڕوو.

**(في ظلال القرآن ) بە چوار قۆناغدا تێپەڕی:**

**قۆناغی یەکەم:** دوای ئەوەی سەعید ڕەمەزان گۆڤاری (المسلمون)ی لە کۆتایی ساڵی 1951دا دەرکرد، داوای لە سەید قوتب کرد کە بە بابەتی بەردەوام بەشداری تیادا بکات، ئەوەی هەڵبژارد کە لە تەفسیری قورئانەوە دەست بە نووسین بکات لە ژێر ناونیشانێکی نوێی وروژێنەردا کە بریتیبوو لە **(في ظلال القران)**، واتە لە ژێر سێبەری قورئاندا، یەکەم ئەڵقەی **(الظلال)** لە ژمارە سێی گۆڤاری (المسلمون)دا بلاۆکرایەوە، کە لە مانگی شوباتی ساڵی 1952دا دەرچوو، گۆڤارەکە بەردەوام زنجیرەکانی **(الظلال)**ی لە ژمارەکانی داهاتوویدا بەدوای یەکدا بلاۆدەکردەوە، ئەوەبوو حەوت ئەڵقەی لێ بلاۆکردەوەو ئەڵقەی حەوتەم لە ئایەتی (103)ی سورەتی **(البقرة)**دا وەستا.

**قۆناغی دووەم: (ظلال)** پێش زیندانی کردنی سەید:

لە کۆتایی ئەڵقەی حەوتەمی **(ظلال)** لە گۆڤاری **(المسلمون)**دا سەید ڕایگەیاند کە لە ئەڵقەی داهاتووی گۆڤارەکەوە بلاۆکردنەوەی تەفسیرەکەی ڕادەگرێتو لە جێگەی ئەودا باسێکی نوێ بلاۆدەکاتەوە، ئەویش **(نحو مجتمع إسلامی)** بوو.

سەبارەت بە **(الظلال)** ڕایگەیاندکە لەکتێبی سەربەخۆدا دەردەکەوێت، بەپێی ژمارەی جوزئەکانی قورئان هەموو جوزئێك لە قورئان لە جوزئێك لە **(الظلال)**دا، لە هەموو دوو مانگێکدا جوزئێکی دەردەچێت.

بەشی یەکەمی لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1952دا دەرچوو لە لایەن **(دار الأحیاء الکتب العربیة)** لە قاهیرەچاپکرا، سەید بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر کە دابوی بە خوێنەران، هەموو دوومانگێك جوزئێکی دەردەکرد، کە تیایدا تەفسیری جوزئێك لە قورئانی کردبوو.

لە ماوەی نێوان تشیرینی یەکەمی ساڵی 1952 تا کانونی دووەمی ساڵی 1954 شانزە بەشی لێ دەرکرد.

**قۆناغی سێیەم:** سەید قوتب **(الظلال)** لە زینداندا تەواو دەکات، سەید درایە دادگاو پاشان بە پانزە ساڵ زیندانی حوکمی بەسەردا درا، لە ماوەی یەکەمی زیندانی کردنیدا هیچ بەشێکی تازەی **(الظلال)**ی دەرنەکرد، بە هۆی ئەو ئەشکەنجە قورسو ناڕەحەتانەی کە تووشی هات. . بەلاّم پاش ئەوەی لە زیندانی تورڕە جێگیر بوو ئەشکەنجەدانی ڕاوەستا، خرایە نەخۆشخانەی زیندانەوە بە هۆی نەخۆشیە زۆرە جۆراو جۆرەکانیەوە، لەزینداندا ڕوویکردە تەواوکردنی **(الظلال)**، خوای گەورە لەزینداندانووسینی بۆ سەید ئاسانکرد، لەگەڵ ئەوەدا کە لائیحەی زیندان نووسینی قەدەغە کردبوو لە ناو زینداناو، ڕێگەی بە زیندانی نەدەدا کە هۆکارەکانی نووسینی لەلابێت، سزای ئەدا ئەگەر لەلای ببینرایە، بەلاّم خوای گەورە بۆسەیدی ئاسانکرد، ئەو ئاسانکارییەش ئەوەبوو کە سەید گرێبەستی کردبوو لەگەڵ چاپخانەی **(دار أحیاء الکتب العربي)**دا لەسەر نووسینی تەفسیری قورئان بە تەواوەتی. . پاش ئەوەی حکومەت لە ناو زینداندا لێی قەدەغە کرد، چاپخانەکە سکالاّنامەیەکی دژ بە حکومەت بەرز کردەوە، تیایدا داوای هەزارەها جونەیهی دەکرد وەك قەرەبووکردنەوە بۆ ئەو زیانەی لێی کەوتووە بە هۆی وەستانی سەید قوتبەوە لە نووسینی تەفسیرەکەی بە بۆنەی حکومەتەوە، حکومەت لە جیاتی پێدانی ئەو بڕە پارەیە ئەوەی هەڵبژارد کە ڕێگە بە سەید بدات دەست بە نووسین بکاتەوە.

عەبدولناسر پڕوپاگەندەی ئەوەی بۆ زانا پاکستانیەکان کرد کە سەید قوتب زیندانی نیە بەڵکو ئازادە ئەمەش بە بەڵگەی چاپکردنی **(الظلال)** لە قاهیرە، ئیتر کارمەندانی حکومەتی میسری لە دەرەوەی ولاّت هەمان وەلاّمی عەبدولناسریان ئەدایەوە ئەگەر پرسیاریان لێ بکرایە دەربارەی سەید کە ئایا ئازادە یان زیندانیە.

حکومەت شێخ **محەممەد** غەزالی دانا بە چاودێری ئایینی بەسەر **(الظلال)**ەوە، تا ئاگادار بێت بەسەریدا پێش دەرچوونی لە چاپخانە، غەزالی ڕێگەیدا بە چاپکردنی هەموو بەشەکانو مەلزەمەکانی **(الظلال)** لە چاپی یەکەمیدا، هیچ بەشێکی لێ لانەبرد جگە لە بە دواداچونێکی سەید لە سەر سورەتی **(البروج)**، کە دواتر لە بەشێکی **(معالم في الطريق)**دا بە ناونیشانی **(هذا هو الطريق)** بڵاوی کردەوە، بەم شێوەیە سەید قوتب لە کۆتایی پەنجاکانداو لە تاریکی زینداندا تەفسیرە بەنرخەکەی **(في الظلال القرآن)** تەواو کرد.

**قۆناغی چوارەم: چاپە پوختەکراوەکەی (الظلال):**

تەفسیری سەید لە چاپی یەکەمی **(الظلال)**دا تێ نەدەپەڕی لەوەی تۆمارکردنی بۆچونەجۆراو جۆرەکانی خۆی بێت لەسەر ئایەتەکانو دەرخستنی ئەو جوانیو هونەرەی کە تیایاندایە، خستنە ڕووی هەندێك لەو پەیڕەوو بیروباوەڕو پرۆگرامانەی کە لە خۆی گرتبوو.

بەڵام لە زیندانی کرندنیدا ژیانی لەگەڵ قورئاندا زۆری خایاند، بیرکردنەوە لە ڕووداوە یەك لەدوایەکەکان، نارەحەتیە دوایەکەکان، کە بەسەر ئەم و برایانی موسڵماندا هات، لێکدانەوەی بۆ نهێنی ئەم ڕووداوانەو، تێڕوانینی لە پۆڕۆگرامی بزاڤی ئیسلامی لە بانگەوازو پەروەردەو ئیسلاحو جیهادو گۆڕیندا.

لە بەرەنجامی ئەم بیرکردنەوەقوڵانەوە خوای گەورە ڕێنومایی کرد بۆ دەرك کردنی کلیلی حەرەکی کە بەهۆیەوە دەرگای خەزێنەی دوڕومرواری حەرەکی قورئانی کردەوە، توانی پرۆگرامێکی حەرەکی لە بانگەوازو جوڵەدا بدۆزێتەوە، لەگەڵ دەرخستنی سروشتی حەرەکی قورئانی پیرۆز!

سەید کاتێك گەشتە ئەم ئاستە کەتەفسیری سێ جوزئەکەی کۆتایی دەکرد، لەو جوزئانەدا هەندێك لە تێگەیشتنە حەرەکیە تازەکانی تۆمار کرد، ئەمەش وەك وتمان لە کۆتایی پەنجاکاندابوو.

لەبەر ئەوە وا پێویستی کرد کە جارێکی تر تەفسیری قورئان بکاتەوە لەسەر بناغەی ئەو پرۆگرامە حەرەکیە نوێیە، سەرلەنوێ **(الظلال)** بنوسێتەوە تا ئەو واتایانەی تێدا تۆمار بکاتو بیچەسپێنێ.

بەم شێوەیە چاپی پوختەکراوی **(الظلال)** هاتە پێشەوە، کە بەشی یەکەمی لە سەرەتای ساڵی 1960دا لە لایەن **(دار الحياء الكتب العربية)**ەوە دەرچوو، سەید قوتب لە **(الظلال)**دا دادەنرێت بە نوێکەرەوە لە جیهانی تەفسیردا، بە هۆی زیادکردنی ئەو واتاو بیروباوەڕە حەرەکیو پەروەردەییانەوە کە زیادی کرد لە تەفسیرەکانی پێش خۆی، هەروەها سەید لە **(الظلال)**دا دادەنرێت بە دامەزرێنەی قوتابخانەیەکی نوێ لە تەفسیردا، کە ئەویش (قوتابخانەی تەفسیری حەرەکی)یە.

سەید لە چاپە پاڵفتەکراوەکەیدا (10) جوزئی یەکەمی لەسەر ڕوناکی پرۆگرامە حەرەکییە نوێکەی لە تێگەشتنی قورئانو تەفسیرکردنیدا نووسی، ، بە شێوەیەك کە هەڵوێستەو لێکدانەوەکانی لەسەر ئایەتەکان قوڵترو فراوانترو درێژتر بوو، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان بە قەزیەی: عەقیدەو بانگەوازو جوڵەو جیهادو یاسادانانو نەفامیەوە هەبوو.

کاتێك بە لێبوردێنکی تەندروستی لە ساڵی 1964دا لە زیندان ئازادکرا بەردەوام بوو لەسەر نووسینی جوزئەکانی ترو، جوزئەکانی یانزدەو دوانزدەو سیانزەی بڵاوکردەوە.

بەمەش گەشتە کۆتایی جوزئی سیانزە کە بە سورەتی (ابراهیم) کۆتایی دێت، سەید دەیویستو مەبەستی بوو کەنووسینی جوزئەکانی تریش تەواو بکات لە چواردەوە تا بیستو حەوت لەسەر بناغەی پرۆگرامە حەرەکیەکەی لە تەفسیردا.

بەڵام خوێنرێژانو ستەمکاران پەلەیان کرد لە دەستگیرکردنەوەو پاشان دادگایی کردنو دواتر لە سێدارەدانیدا پێش ئەوەی ئاواتەکەی بهێنێتە دی!.

ئەمە زۆر بە کورتی چیرۆکی تەفسیری (**الظلال**)ە لە ژیانی سەید قوتبدا، (**الظلال**) لەبەر گرنگیەکەی وەرگێڕراوەتە سەر زۆرێك لە زمانەکان وەك: ئینگلیزیو فەرەنسیو فارسیو تورکیو ئوردیو ئەندەنوسیو. . هتد، (**الظلال**) بڵاوترین کتێبی ئیسلامیە لەم سەردەمەدا!!

**20ـ دراسات اسلامية:**

سەید ئەم کتێبەی لەساڵی 1953دا دەرکرد، کتێبخانەی لیژنەی لاوانی موسڵمان بۆی بڵاوکردەوە، کتێبەکە لە سی‌و پێنج بابەتی ئیسلامی پێکهاتووە، کە سەید لە گۆڤارە ئەدەبیو ئیسلامیەکاندا لە پێش شۆڕش هەروەها ڕاستەوخۆ لە دوای شۆڕشدا بڵاوی کردونەتەوە، وەك گۆڤارەکانی: (**الرسالة، الدعوة، الاشتراكية**. . ).

**21ـ هذا الدين:**

سەید ئەم کتێبەی لە زینداندا دەرکرد، (**دار القلم**) لە قاهیرە لە ساڵی 1960دا بۆی چاپ کرد.

**22ـ المستقبل لهذا الذين:**

ڕاستەوخۆ دوا بەدوای (**هذا الدين**) کتێبی (**المستقبل لهذا الذين**)ی دەرکرد، کتێبخانەی (وهبە) لە قاهیرە بۆی بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە تەواوکەری (**هذا الدين**)ەو تیایدا سەید ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە پاشەڕۆژ بۆ ئەم دینەیە، لاوانی برایانی موسڵمانی دڵنیا کردۆتەوە کە دواڕۆژ بۆ ئەوانو بانگەوازو ئیسلامەکەیانە.

**23ـ خصائص التصور الاسلامي:**

سەید ئەم کتێبەی تایبەت کردووە بە سروشتو تایبەتمەندیەکانی عەقیدەی ئیسلامی، پێشتر لە ژێر ناونیشانی (**فكرة الاسلام عن الله والكون والحياة والانسان**)دا ڕای گەیاند، لە پاشدا ئەو ناونیشانەی گۆڕی بە (**خصائص التصور الاسلامي**)، لە ساڵی 1962دا (**دار احياء الكتب العربية**) بۆی چاپکرد، لە ژێر ناونیشانی (**خصائص التصور الاسلامي ومقوماته**) بەڵام لە کتێبەکەدا تەنها دەربارەی (**خصائص**)ەکان دوابوو، سەبارەت بە (مقومات) کتێبێکی تری بۆ تەرخان کردووە کە دواتر دەرچوو.

**24ـ الاسلام ومشكلات الحظارة:**

ئەم کتێبەش لە هەمان ساڵدا 1962، بە هەمان شێوە لە لایەن (**دار الأحياء الكتب العربية**)ەوە بە چاپ گەیەنرا.

ئەمە دواهەمین کتێبە لە ژیانی سەید قوتب خۆیدا دەرچوویێت، کە کتێبخانەی (وهبە) ساڵی 1964 بۆی بڵاوکردەوە.

سەید ئەم کتێبەی نوسی تا ڕوونکردنەوەیەك بێت بۆ پرۆگرامی کارکردنی بزاڤی ئیسلامی، ڕوونکردنەوەیەك بێت بۆ مەشخەڵەکانی ڕێگا لە بانگەوازکردندا بۆ لای خوا، بناغەی کتێبەکە چەند بەشێکە سەید لە زیندانی توڕڕەدا نووسیویەتی، پاشان بە هۆی حەمیدەی خوشکیو زەینەب غەزالیەوە کە لە دەرەوەی زیندان کاری دەکرد توانیویەتی بیگەیەنێتە ڕێکخستنی نوێی برایان، پاشان سەید لە زیندان دەرچوو، ئیترخۆی سەرپەرشتی سەرکردایەتی دەکرد.

**26ـ مقومات التصور الاسلامي:**

بەشی دووەمی کتێبی (**خصائص التصور الاسلامي**)یەو تەواوکەری ئەو کتێبەیە، تەواوکەری بابەتەکانیەتی، هەردوو کتێبەکە لە عەقیدەو تایبەتمەندییو خاڵە بەهێزەکانی عەقیدەی ئیسلامی دەدوێن، ئەمە یەکەم کتێبە کە بیست ساڵ دوای شەهیدکردنی خاوەنەکەی چاپ بکرێت، چاپی یەکەمی لە لایەن (دار الشروق)ەوە ساڵی 1968 بڵاوکرایەوەو محەمەد قوتب لەپێشەکی ئەم کتێبەدا دەڵێت:

(ئەم کتێبە لەو ماوەیەی بۆمان دانابوو زۆر دواکەوت، زۆربەی خەڵکی بە تەمای بوون، -بەتایبەتی-ئەوانەی کە ئاگاداربوون بەسەر بوونی دەستنووسەکەیدا. . تا خوای گەورە ویستی وابوو دەرچێت، لەو چرکەیەدا کەخوا ـ جل جلاله ـ

بڕیاریدا بۆ دەرچوونی، برای شەهید لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە زینداندابوو، لەپێش جێبەجێکردنی فەرمانی لەسێدارەدانی لە لایەن خوێنڕێژانەوە لە نووسینی ئەم کتێبە لێ بوویەوە).

## ئەوەی سەید لە پڕۆگرامی لێکۆڵینەوەدا پێی گەشت

لێرەداو لە کۆتایی وتەکانمدا دەمەوێت هەڵوێستەیەك بکەم تا ڕونی بکەمەوە سەید لە پڕۆگرامەکانی باسو لێکۆڵینەوەدا گەشتۆتە چی ؟ سەید زیاد لە چل ساڵی تەمەنی لە باسو لێکۆڵینەوەو نووسینو شارەزابوونو مەعریفەو ڕۆشنبیریدا بەسەربرد، چەندین قۆناغی جیاوازی پلەبەپلەی بڕی لە باسو نووسینەکانیدا.

ئەوەبوو ژیانی زانستی وەك لێکۆڵەرەوەیەك لە جیهانی ئەدەبو شیعرو ڕەخنەدا دەست پێکرد، پاشان بوو بە لێکۆڵەر لە لێکۆڵینەوەی دەرخستنی جوانیی هونەری (ئێستاتیکای) قورئانی پیرۆزدا، پاشان بوو بە لێکۆڵەر لە فیکری ئیسلامی گشتیدا، دواتر بوو لە لێکۆڵەر لە فیکری ئیسلامی حەرەکی کرداری و گۆڕانکاریدا!!

لە زۆر شوێنی (**الظلال**)دا ئاماژەی بە پڕۆگرامەکەی کردووە لە مامەڵەی حەرەکی لەگەڵ قورئاندا، لە تێگەیشتنو تەفسیرکردنیدا، هەروەها لە پێشەکی (**خصائص التصور الاسلامي**)دا ئاماژەی پێکردۆتەوە لە ژێر ناونیشانی (**كلمة في المنهج**)دا.[1]

پێم باشە لەگەڵ خوێنەردا پێکەوەئەوە بزانین کەلە پێشەکی (مقومات)دا سەید خۆی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە پڕۆگرامی ئەو لە باسو لێکۆڵینەوەدا چیەو گەشتۆتە کوێ؟

سەید لە کتێبەکەیدا تەنها مەعریفەیەکی عەقڵی ناوێت، هەروەها ڕۆشنبیریەکی عەقڵی نەزەری ناوێت، بەڵکو ئەوەی لە خوێنەر دەوێت کە بە هۆی کتێبەکەیەوە بچێتە مەیدانی جوڵەیەکی کرداری واقیعیەوە، جوڵە لەناو کۆمەڵگادا بۆ بنیادنانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی لە بنچینەوە:

(. . لێرەدا ئەو گرنگیە زۆرەمان بۆ دەردەکەوێت کە پەیوەستی دەکەین بە ڕونکردنەوەی (خصائص التصور الاسلامی ومقوماته)، ئەوە گرنگیەکە سەرچاوەی گرتووە لە بە ئامانج گرتنی گۆڕانکاریەکی سەرتاسەری ڕەسەن بۆ ژیانی مرۆڤایەتی. . بەو پێیە کەدروستکردنی واقعێکی نوێی بەرزو پیرۆزو ڕێزدارو نوێکراوە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی پێویستە بیروبۆچوونێکی نوێی لە پێشەوە بێت، کە ڕازاوە بێت بەم سیفەتانە، ـ سوپاس بۆ خوا ـ ئێمە پێویستمان بەوە نیە ئەمڕۆ ئەو بیروبۆچوونە دروست بکەین، بەڵکو خوای گەورە دایناوە، بەڵام ئێمە پێویستمان بە هەڵگۆزینی بەهێزکەرەکانی ئەو بیروبۆچوونە هەیە، لەویژدانی کۆمەڵێکی ئیمانداردا لەم سەرزەویەدا، وە گۆڕینی بۆ جوڵەیەکی ئیجابی پاڵنەر، نەك بۆ مەعریفەیەکی ڕۆشنبیری ساردو سڕ!

سروشتی ئەم ئاینە، ڕەفزی کەڵەکەکردنی زانیاری سارودو سڕ دەکات لە بەفرگەی مێشکە بەستووەکاندا!!

(مەعریفە) لەم ئاینەدا یەکسەر دەگۆڕرێت بۆ (جوڵە) ئەگینا ئەوە ڕەگەزی ئەم ئاینە نیە!

ئێمە ئامانجمان نیە ـ وەك چەند جار وتوومانە ـ بۆ زیادکردن لە چوارچێوەی ڕۆشنبیری ئاینی بەستوودا! نەخێر! بە ڕاستی ئێمە دەمانەوێت ئەو بۆشاییە فراوانە دەرخەین لە نێوان بیروبۆچوونی ئیسلامی بۆ ژیانو لە نێوان سەرجەم بۆچوونە نەفامیەکانی تردا کە ئەمڕۆ سەر زەویان داگیر کردووە. . ئەمەش بۆ دەرخستنی ئەو بۆشاییە زۆرەی نێوان واقعی ئیسلامی ویستراو، لەگەڵ هەموو واقعەکانی تری ئەمڕۆی مرۆڤایەتی. . تاکو لەسەر بنەمای ئەم ئاشکراییە ڕەهایە هەموو

[1] مقومات التصور الاسلامي: 5.
[2] بڕوانە خصائص: 5 ـ 25.

بیرکردنەوەیەك بونیاد بنرێت  بۆسەرلەنوی کردنەوەی دامەزراندنی واقعێکی مرۆڤایەتی لەسەر پرۆگرامێکی پیرۆزو ڕاست).[1]

(پرۆگرامەکەمان هەوڵ دەدات کە دەقی قورئانی بکاتە بنچینەو بڕیار لەسەر ڕاستیەکان بدات، کە باسی لێوە دێتە ئاراوە، دەربڕینە مرۆییەکانی ئێمە بکاتە هۆکارێکی یاریدەدەر بە تەنها، کە دەقە قورئانیەکان وا لیٚ بکات خەڵکی لێی تیٚ بگەن ـ بەپێی توانا ـ ئێمە لە کۆتاییدا ئەمانەوێت پەیوەندی لە نێوان خوێنەری ئەم باسەو لە نێوان قورئان خۆیدا دروست بکەین.
دەمانەوێت خوێنەر ڕاببێت خۆی مامەڵە لەگەڵ قورئاندا بکات، مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆ. دەمانەوێت خوێنەر هەست بکات ـ هەروەك ئێمە هەست دەکەین ـ کە لەم قورئانەدا دەوڵەمەندییەکی تەواوی هەمەلایەنە هەیە، لە هەموو ڕاستیەك لە ڕاستیەکانی بوونی بنەڕەتیدا. . لە دوای قورئانەوە هیچ شتێکی تر نیە جگە لە باسە زانستیە کرداریە موجەڕەدەکان، کە فەرمانە تەجریبیەکانو جێبەجیٚ کردنە کرداریەکانیان دەگرێتەوە!
لەبەر ئەوە پێویستە خوێنەری ئەم باسە لەسەر دەقە قورئانیەکان دیراسە بکات بەو پێیەی کە قورئان بنەڕەتو بنجینەیە. . )
بەم شێوەیە لەم کتێبەوە ئاشنا دەبین بەوەی سەید پێی گەشتووە، لە جیهانی باسو لێکۆڵینەوەداو لەسەر تێڕوانین بۆ قورئان و، پڕۆگرامی لە مامەڵەکردن لەگەڵ قورئاندا، ڕێبازی لە هەڵگۆزینو ئیلهام وەرگرتن لە دەقەکانیەوە، ئامانجی لە دیراساتە قورئانیەکانیدا کە لە کۆتایی تەمەنیدا پێشکەشی کردن، بیٚ پایان ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێت. .

## نهێنی نامیلکە سەر بەخۆکانی سەید قوتب

دوای شەهید کردنی سەیدو، بازاڕ پەیداکردنی کتێبەکانیو زیادبوونی داوای خەڵکی لەسەر بەرهەمەکانی، وەنەمانی کتێبە چاپکراوەکانی لە بازاڕەکاندا بە ماوەیەکی کەم، دوای هەموو ئەمانە هەندێك لە چاپخانەو بڵاوکرەوەکان چاپکردنو بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی سەیدیان کردە هۆکارێکی بازرگانیو بژێویو دەستخستنی پولو پارە، تا وایلێهات بە بیٚ هیچ مافێك بۆ (وەرەسە)کەی کتێبەکانی چاپ دەکرانەوە!
هەندێکی تریش بیریان کردەوە لە بڵاوکردنەوەی نامیلکەکانی سەید بەناوی خۆیەوە تا بڵاوببێتەوە، بیرکردنەوە بازرگانیەکەیان ڕێنومایی کردن بۆ گەڕان بە دوای بابەتەکانیدا لە گۆڤارەکاندا کە بە ناوی ئەوەوە نووسراوە، بۆ دەرهێنانیان و بڵاوکردنەوەیان لە دوتوێی نامیلکەی سەربەخۆدا بە ناوی سەیدەوە، ئەمە جگە لەوەی بە ناونیشانی نوێوە دەیانکردە نامیلکەو بڵاویان دەکردەوە!
کەوتنە بازاڕی ئەم نامیلکانە شتێکی کتوپڕ بوو بۆ خوێنەران، واگومانیان دەبرد کە ئەوانە کتێبی تایبەتینو سەید خۆی بەو شێوەیە نووسیونی، بۆیە بەگەرمی دەچوون بە دەمیەوەو دەیان کڕین، سوربوون لەسەر دەستخستنو خوێندنەوەیان!
بەم هۆیەوە کتێبخانەی سەید قوتب کتێبی زۆری تێدا کەڵەکە بووە کە لە بیری خەڵکیدا هەموو ئەمانە کتێبی سەربەخۆبوون، ئیتر ژمارەی کتێبەکانی زیادیان کرد لەو (26) کتێبەی کە ئێمە ناومان بردنو پێشتر ناساندمان بە خوێنەر!
لێرەدا بە پێویستی دەزانم ڕاستی ئەو نامیلکانە بخەینە ڕوو لەگەڵ سەرچاوەی یەکەمیان کە لێوەی وەرگیراون، تا ڕاستیە زانستیەکان لە ناو ئارەزووە بازرگانیەکاندا بۆ قازانجێکی نامەشروع ون نەبن!

### 1ـ افراج الروح:

[1] مقومات: 24 ـ 25، بە کورت کراوەیی.

کۆمەڵێك بیرۆکەو تێبینیو بیروبۆچوونی تایبەتی سەید هەبوون، لە کاتێکدا کە لەئەمریکا بوو لە نێوان ساڵی 1948 بۆ 1950، پاشان لە چەند نامەیەکی برایانەی شەخسیدا تۆماری کردنو ناردنیەوە بۆ براو خوشكو هاوڕێکانی لە میسرو ولاتە عەرەبیەکانو فەرەنساو ئینگلتەرە، دوای گەڕانەوەی لە ئەمەریکا هەندێك لەو نامانەی لە گۆڤارەکاندا بلاوکردەوە.

### 2ـ نحو مجتمع اسلامي:

ئەمەش ئەو زنجیرە باسانە بوون سەید دوای ئەوەی لە ئەڵقەکانی **(في ظلال)** وەستا دەیناردن بۆ گۆڤاری (المسلمون)، دەستی کرد بە نووسینو ناردنیان بۆ هەمان گۆڤارو ئەویش لە ژێر ناونیشانی **(نحو مجتمع اسلامي)**دا لە دوانزە ژمارەی ئەو گۆڤارەدا بلاوی کردەوە، سەید پێش شەهید کردنی ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە بە پێی توانای بەدەستیەوەیە باسێکی گەورەو گرانو دوورودرێژ ئامادە بکات لەسەر **(ملامح المجتمع الاسلامي وخصائصه)** لە ژێر ناونیشانی **(نحو مجتمع اسلامي)**دا. بەڵام سەید لە ساڵی 1966دا شەهید کراو ئەو کتێبەی بلاونەکردەوە، وا دەردەکەوێت کە بنەماکانی ئەو باسە لە لایەن دەسەڵاتی ستەمکارەوە لەناو برابێت.

لە دوای شەهیدکردنی سەید بازرگانەکان پێشبڕکێی بلاوکردنەوەی کتێبەکانی سەیدیان دەکرد بە ئامانجی بازرگانی پێوە کردن، هەروەك چۆن پێشبڕکێیان بوو لە بە نامیلکەکردنی بابەتەکانیدا کە لە گۆڤارەکاندا بلاوی کردبوونەوە!

کتێبخانەی (الاقصى) لە عەممان لەم پێشبڕکێ بازرگانیەدا بەشداری کردو ئەو بابەتانەی پێشووی سەیدی هێنا کە لە گۆڤاری (المسلمون)دا بلاوی کردبووەوە کردی بە کتێبێكو بە ناونیشانی (نحو مجتمع اسلامى) لە ساڵی 1969دا بلاوی کردەوە.

### 3ـ في التأريخ فكرة ومنهاج:

سەید لە گۆڤاری (المسلمون)دا بابەتێکی لە دوو ئەڵقەدا بە ناونیشانی (فى التاريخ فكره ومنهاج) لە ژمارە یەكو دووی ساڵی یەکەمی گۆڤارەکەدالە ساڵی 1951 بلاوکردەوە، لە دوای شەهید کردنی (دار السعوديه للنشر) هەستا بە وەرگرتنی ئەم دوو بابەتە لە گۆڤاری (المسلمون)، پاشان لەگەڵ دوو بابەتی تری سەید دەربارەی **(التصور الاسلامي والادب)** لە کتێبێکدا بلاوی کردەوە لە ژێر ئەو ناوەی سەرەوەدا بەبێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەی بابەتەکانی بکات.

### 4ـ معركتنا مع اليهود:

کۆمەڵە بابەتێك بوو لە سەرەتای پەنجاکاندا لە گۆڤاری (الدعوه)دا بلاوی کردنەوە، ئەم بابەتانە مامۆستا (زەین ئەلعابدین ئەلرکابی) کۆی کردنەوەو پێشەکیەکی بۆ نووسینو **(الدار السعودية للنشر)** بلاوی کردنەوە، بەڵام مامۆستا زەین ئەلعابدین کارێکی چاکی کرد بەوەی لە کاتی کۆکردنەوەی بابەتەکانیدا لە سەرەتای هەر بابەتێکیدا ئاماژە بەو سەرچاوە دەکات کە لێوەی وەری گرتووە.

### 5ـ تفسير سورة الشورى:

**(دار السعودية للنشر)** تەفسیری سورەتی (شورا)ی لە **(في ظلال القران)** دابڕیوەو لە کتێبێکی سەربەخۆدا بلاوی کردۆتەوە.

### 6ـ تفسير آيات الربا:

(دار السعوديه) هەمان کار کە بەکتێبەکەی پێشووی کرد بەم کتێبەشی کردووە، هاتووە لە تەفسیری **(الظلال)**دا تەفسیری ئایەتەکانی (ربا)ی لە هەردوو سورەتی **(البقرة)**و **(آل عمران)**دا دەرهێناوەو لە دوو تویێی کتێبێکدا بلاوی کردۆتەوە.

### 7ـ الجهاد في سبيل الله:

نامیلکەیەکە **(الاتحاد الاسلامي للمنظات الطلابية)** ساڵی 1969 بلاوی کردۆتەوە، کە بەرهەمی سێ ناوداری مەیدانی فیکرو بانگەوازە کە بریتین لە: حەسەن بەناو سەیدقوتب و ئەبوئەعلای مەودودی.

بەشی سەید لە کتێبەکەدا بەشی (الجهاد فى سبيل الله)یە کە لە کتێبی (المعالم)دا بلاوی کردۆتەوە.

**8ـ سيناء بين أطماع الاستعماريين والصهيونيين:**

ناميلكەيەكە برايانی موسڵمان ساڵی 1967 بڵاویان كردۆتەوە، تیایدا ئەو مەترسیانەیان ڕوون كردۆتەوە كە ڕووبەڕووی سینا دەبێتەوە، وتەی (حەسەن بەناو سەیدقوتبو كامیل شەریف)ی تێدا تۆمار كراوە، بەشی سەید لەم ناميلكەيەدا بابەتێكە لە گۆڤاری (**الرسالة**) لە ساڵی 1952دا بڵاوی كردۆتەوە، بە ناونیشانی (**الى النائمين في العالم الاسلامي**) كە دواتر كردویەتی بە بەشێك لە كتێبی (**دراسات اسلامية**).

**9ـ لحن الكفاح:**

كۆمەڵێك لە بازرگانەكان ڕوویان كردە (**الظلال**)، هەندێك لاپەڕەیان لێ جیاكردەوەو لە ناميلكەو چەند نامەیەكی سەربەخۆدا بڵاویان كردەوە، ناونیشانی جۆراو جۆریان لە لایەن خۆیانەوە بۆ دانان، خوێنەریش وا دەزانێت ئەوانە كتێبی سەید قوتبن لەو نامانە:

- **قصة الدعوة.**
- **الى المتثاقلين عن الجهاد.**
- **رسالة الصلاة.**
- **استعلاء الايمان ومعالم الطريق الى الله.**

نازانم ئەگەر ڕەوا بێت تەفسیری (**في ظلال**) بەش بەش بكرێتو هەر بەشەی بكرێتە ناميلكەيەك یان نامەیەكی سەربەخۆو ناوێكی بۆ دابنرێت، دەبێت دانراوەكانی سەید ژمارەیان بگاتە چەند كتێب؟!

ئەمەش چەواشەكردنی خوێنەرە لە ڕاستی ئەو كتێبانەی سەید نووسیونی لەگەڵ ئەو بابەتانەی كە لە گۆڤارەكاندا بڵاوی كردونەتەوە.

**سێیەم: ئەو باسانەی كە بڵاونەكراونەتەوە**

سەید زۆرجار لە باسێكەوە دەچوو بۆ باسێكی تر، كاتی واهەبوو لە باسێكدا دەگەشتە كۆتاییو تەواوكردن، لەو كاتەدا باسێكی نوێی بە بیردا دەهات، كە ئەوەی بە گرنگتر دەزانی لەو باسەی لە ژێر دەستیدا بوو، لەبەر ئەوە باسی یەكەمی واز لێدەهێنا كە لە تەواوبووندا بوو، دەستی دەكرد بە نووسینی باسی دووەم. . وە بەم شێوەیە!

نازانم ئەمە چاكەیەكە بۆ سەید تۆماربكرێت، یان خاڵێكە لەسەری دەگیرێت؟! هەركەس لێكۆڵینەوەی بەرهەمەكانی سەید بكاتو ئاگاداربێت بە سەر بابەتەكانی لە گۆڤارەكاندا دەبینێت لە زۆر جێگەدا ئاماژەی بەوە كردووە كە فلانە بابەتو لێكۆڵینەوەی بەدەستەوەیە لە نیەتیدایە تەواوی بكاتو بڵاوی بكاتەوە، لەو باسانەی كە ئاماژەی پێكردوونو قەدەر مۆڵەتی نەداوە تەواویان بكاتو بڵاویان بكاتەوە، تیایدا زۆرێك لە بەرهەمەكانی لە ناوچوونو نەماون، دوای نەهامەتیوكارەساتی یەكەمو دووەمی لەگەڵ ستەمكاراندا ئەم باسانەن:

**1ـ مهمة الشعر في الحياة:**

باسێكی گەورە بوو لە نیەتیدا بوو بینووسێ، كتێبەكەی لە ژێر ئەو ناونیشانەدا كردبووە پێشەكیەكی ئەم باسەی[1]

**2ـ دراسة عن شوقي:**

**3ـ المراهقة أخطارها وعلاجها:**

كتێبێك بوو دەربارەی پەروەردەكردنو گرفتەكانی لاوان، دەربارەی دەڵێت: (من لە سەر قەراغی دەركردنی كتێبێكم دەربارەی **هەرزەكاری: مەترسیو چارەسەرەكەی**)[2]

ئەمەش دەلالەت لەوە دەكات كە باسەكەی نیوە ئامادە بووەو لەبەر دەستیدا بووە.

---

[1] مهمة الشاعر في الحياة: 7.

[2] گۆڤاری (الأسبوع) ژمارە: 45، لاپەڕە 9.

**4ـ المرأة لغز بسيط:**

باسێك بوو لە ماوەی دە ساڵدا هەستا بە ئامادەكردنی، ناوەڕۆكی باسەكەی لە چەند ئەڵقەیەك لە گۆڤاری (الاسبوع)داله ساڵی 1943دا بلاوكردەوە.

**5ـ المرأة في قصص توفيق الحكيم:**

بەڵێنیدا ئەم باسە بنوسێت، ئەمەی لە گۆڤاری (الاسبوع)دا ڕاگەیاند.

**6ـ أصداء الزمن:**

دیوانێكی شیعر بوو، دوای (**الشاطئ المجهول**) پێشكەشی كردبوو بە چاپخانە بۆ چاپ كردن، بەڵێنیدابوو لە سەرەتای ساڵی 1937دا چاپی بكات، بەڵام لە دوا ساتدا لێی كشایەوە.

**7ـ الكأس المسمومة:**

دیوانی سێیەمی بوو كە ڕایگەیاند بلاوكردنەوەی نزیكبووەتەوە، بەڵام بلاونەبوویەوە.

**8ـ قافلة الرقيق:**

دیوانی چوارەمی بوو كە ئاشكرای كردبوو.

**9ـ حلم الفجر:**

دیوانی پێنجەمی بوو، سەرەنجامی ئەمیش وەك دیوانەكانی پێشووی لێهات.

**10ـ القطط الضالة:**

چیرۆكێكی وێنەدار بوو ڕایگەیاند كە لە ژێر چاپدایە.

**11ـ من أعماق الوادي:**

چیرۆكێكی تر بوو، ڕایگەیاند كە دیلی (تەحریرە).

**12ـ المذاهب الفنية المعاصرة:**

باسێكی نەقدی بوو لە زنجیرە باسە ڕەخنەییەكانی ڕایگەیاند كە لەژێر چاپدایە، لە شوێنێكی تردا بە ناوی (**المدارس الادبية المعاصرة**) ئاماژەی بۆ كردووە.

**13ـ الصور والظلال في الشعر العربي:**

باسێكی تر بوو لە باسە ڕەخنەییەكانی.

**14ـ القصة في الديب العربي:**

باسێكی رەخنەییە ڕایگەیاند كە لە ژێر چاپدایە.

**15ـ شعراء الشباب:**

لە جێگەیەكی تردا بە (**الشعر المعاصر**) ئاماژەی پێكردووە.

**16ـ القصة الحديثة:**

باسێكی تری ڕەخنەییە.

**17ـ عرابي المفترى عليه:**

باسێك بوو ئاماژەی كردبوو بۆ لێكۆڵینەوە لە سەركردەی شۆڕش ئەحمەد عەرابیو ژیاننامەكەیو بەرپەرچدانەوەی ئەو شتانەی بۆی هەڵبەسترابوو.

**18ـ الشريف الرضي:**

ئامادەی كردبوو بۆ لێكۆڵینەوە لە (الشريف الرضي)و ژیاننامەكەی.

**19ـ القصة بين التوراة والقرآن**

20ـ النماذج الانسانية في القرآن

21ـ المنطق الوجداني في القرآن

22ـ أساليب العرض الفني في القرآن

ئاماژەی بەم چوار باسە کردووە لە کۆتایی کتێبیی (کتب وشخصیات)دا.

23ـ لحظات مع الخالدين

24ـ أمريكا التي رأيت

25ـ معالم في الطريق: المحجوبة الثانية

26ـ في ظلال السيرة

27ـ في موكب الايمان

28ـ أوليات في هذا الدين

29ـ تصويبات في الفكر الاسلامي المعاصر

30ـ نحو مجتمع اسلامي

31ـ هذا القرآن:

سەید ناوی هەموو ئەم باسانەی هێناوە لە لیستی کتێبەکانیدا کە لە کۆتایی جوزئی سیانزە لە (**الظلال**)دا تۆماری کردووەو، لە چاپە پوختەکراوەکەیدا کە لە ساڵی 1964 دەرچووە، بەڵام ستەمکاران بنەمای ئەم باسانەیان لە ناوبردو ئێستە هیچ شتێکیان لێ نەماوەتەوە!!

## کـــــۆتـــــایـــــی

بەمە کۆتایی بەوە دێت کەخوای گەورە بۆ ئێمەی بڕیاردابوو، لە هەوڵو زانیاری دەربارەی ژیانی پێشەنگی شەهید سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت).

ئەم دیراسەو لێکۆڵینەوەیەمان دەربارەی تێکۆشەری شەهید، بەیارمەتی خوای گەورەو ویستودەسەڵاتی ئەو(جل جلاله) تەواو کرد، بەم شێوەیە:

لە پێشەکیەكو سێ بەش پێکهات:

پێشەکی: دەربارەی گەورەبوونی سەید قوتب: تیایدا باسم دەربارەی گوندەکەی، ڕەچەڵەکی، خێزانەکەی کردووە.

بەشی یەکەم: دەربارەی سەید قوتب لە ڕێگەی ژیانی ئەدەبیدا: تیایدا لەسەر (دە) دیمەن وەستاوم، ژیانی لە گوندەکەیدا، خوێندنی لە قاهیرە، پیشەی لە وەزارەتی مەعاریف، بابەتەکانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، پەیوەندیەکانی بە ئەدەبیو بیریارەکانەوە، سەید قوتبو عەبباس مەحمود عەقاد، جەنگە ئەدەبیو ڕەخنەگریەکانی، ناردنی بۆ ئەمەریکا، لەگەڵ سەید قوتب لە گەشتی ونبوونیدا، ئافرەت لە ژیانی سەید قوتبدا.

بەشی دووەمی: دەربارەی ڕێبازی ژیانە ئیسلامییەکەیەتی.

تیایدا باسی ئەو گواستنەوە دوورەم کرد کە خوای گەورە سەیدی تیا گواستەوە بۆ جیهانی بڕواو پابەندبوونو بانگەوازو تێکۆشان، پاشان هەر سێ قۆناغە ئیسلامیەکەی ژیانیم ڕوون کردەوە.

لەسەر حەوت دیمەنی ژیانی ئیسلامیی سەید وەستام: سەید قوتب لەگەل برایانی موسڵماندا، نارەحەتی یەکەمی سەید قوتب لە زینداندا، سەرکردایەتی کردنی ڕێکخستنی نوێی برایان، نارەحەتی دووەمی ساڵی 1965، پاشان دادگاییکردنو شەهید کردنی.

بەشی سێیەم: سیفەتو پاشماوەو بەرهەمەکانی سەید قوتب.

تیایدا دواوم دەربارەی گرنگترین ئەو سیفەتانەی کە لێکۆڵەرەوەکانی کەسایەتیو فیکری سەید تێبینیان کردووە، هەندێك هەواڵم هێناوە لەسەر ڕاستی ئەو سیفەتانە، بەڵام پاشماوەکەی –بەرهەمەکانی- تیایدا باسی گرنگی بڵاوکردنەوەیانم کردووە، بەتایبەتی بابەتەکانی لە گۆڤارو ڕۆنامەکاندا، بەرپەرچی ئەوانەم داوەتەوە کەوا دەزانن سەید قوتب لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا وازی لە کۆمەڵێك لە کتێبە پێشووەکانی هێناوە.

پاشان کتێبە چاپکراوەکانیم ناساندووە، بە پێی دەرچوونیان ڕیزم کردوون، ڕاستی ئەو نامیلکانەشم خستۆتە ڕوو کە سەربەخۆ دەرکراون، ئاماژەم بەو باسانەش کردووە کە بڵاونەکراونەتەوە. .

ئومێدەوارم توانیبێتم وێنەیەکی ڕوونم بۆ پێشەنگی شەهید سەید قوتب لە سەرجەم قۆناغەکانی ژیانیدا پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز کردبێت، ، ئەوانیش ئاشنابووبن بە شێوازو ڕێگای ژیانی، کە نزیکەی شەست ساڵ دەبێت.

بە ڕاستی ژیانی هەمووی توندوتۆڵی بووە، بەتوندوتۆڵی وهیممەت بەرزیو پاکیەوە ژیانی بەسەربرد، ژیانی هەمووی بەخشین بوو، ئای چەندی بەخشی لەژیانیدا ؟ چەندی پێشکەش کرد ؟ چ لە جیهانی ئەدەب، یان لە جیهانی فیکر، یان لە جیهانی بانگەوازو تێکۆشاندا ؟؟

بە ڕاستی پیشەنگ بوو، پێشەنگەکان بەردەوام لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کەمن، پێشەنگ بوو لە جیهانی ئەدەبو ڕەخنەدا، بویە پیشەنگ لە جیهانی فیکری ئیسلامیدا، پاشان بوو بە پێشەنگ لە بانگەوازو ڕووبەڕووبوونەوەو جیهادا، لە کۆتاییدا ژیانی بە پایان گەیاند بە پێشەنگی لە دامەزراویو شەهادەتدا، بە ڕاستی پشکێکی کرداری و واقعیی مەزنی هەبوو لە ناوەکەیدا، ئەوەبوو ناوەکەی لەگەڵ ژیانەکەیدا پڕاوپڕی یەکتر بوون، ئەمەش لە تەقدیری خوای گەورەو میهرەبانەوە بوو، ئەو سەید قوتب بوو.

بە ڕاستی هەموو ژیانی بە گەورەیی ژیا، لە هەموو قۆناغەکانیدا، هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان زەلیلو ترسنۆكو بێزارو فەرامۆشکراو نەبوو. کە ژیانی دونیای جێهێشت گەورەو بەرزو سەربەرز بوو. . هەر ئەوە کە لە سرودی (براکەم)دا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **أخي فامض لاتلتف للوراء** | **طريقك قد خضبته الدماء** |
| **ولا تلتفت ها هنا او هناك** | **ولا تطلع لغير السناء.** |

بە ڕاستی ژیانێکی درەوشاوەی بەرزی بەسەربرد، بەڕاستی جەمسەر **(قطب)**بوو، زۆرێك قوتابیو لێکۆڵەر لە چواردەوریدا سەرسام بوون پێی، جەمسەر بوو لە ئەدەبو ڕەخنەدا، جەمسەر بوو لە فیکرو هۆشیاریدا، گرنگتر لەمانە جەمسەر بوو لە بانگەوازو جوڵەو جیهادو گیان بەخشیندا !!

بە ڕاستی فەزڵی خوای گەورە بەسەریەوە گەورە بوو، نیعمەتی خوای گەورە لەسەری چڕو پڕ بوو، منەتو بەخشندەییو فەزڵی هەمە لایەنەی خوای بەسەرەوە بوو. . فەزڵی سەرەتاو کۆتایی هەر بۆ خوایە، لەوەی کە سەید قوتب پێیگەشتو پیایدا تێپەڕی لە ژیانی ئیسلامەتی، ئەگەر خوای گەورە نەبوایە ئەم هەڵوێستانەی نەدەبوو، ئەگەرخوای گەورە نەبوایە ئەم بەرهەمانەی نەدەبوو، ئەگەر خوای گەورە نەبوایە ژیانی لەسەر ئەم دونیایەدا بەو کۆتاییە مەزنو پڕشکۆیە نەدەهات کە هەموو موسڵمانێکی ڕاستگۆ ئاواتی بۆ دەخوازێت. . خوای گەورە ڕاستگۆیی تێدا بینی، لەبەر ئەوە بە شەهیدبوون ڕێزی لێنا، کە سەیدخۆی زۆر هەوڵی بۆئەدا، ئەوەبوو لە زینداندا بەرەو ڕووی هات.

سەرکەوتنی سەید لە ژیانی ئیسلامیدا، پیشکەشکردنی هەموو ئەوەی پێشکەشی کرد، هەر هەموو شاهیدی شانازییو سەربەرزین بۆ ئیسلامی مەزن، ئەو ئیسلامەی کە باڵادەست و بە توانایە لە گۆڕینی پیاواندا لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، دروستکردنەوەیان بە شێوازێکی نوێ، بە کەسایەتیەکی نوێوە، بە ڕاستی خەڵکی وەك کانزا وان چاکترینیان لە نەفامیدا، چاکترینیانە لە ئیسلامەتیدا ئەگەر تێبگەن. .

سەید لە چاکترین کانزاکان بوو لە ژیانی یەکەمیدا ـ کە دەتوانین بە جاهیلی وەسفی بکەین ـ وە چاکیەکەی زیاتر بوو لە ژیانە ئیسلامیە پڕ لە شکۆکەیدا !

وتەی شاعیر ڕاست دەردەچێت بۆ سەید کە دەڵێت:

**واذا كانت النفوس عظاما تعبت في مرادها الاجساد**

هەروەها وتەی شاعیرێکی ترکە دەڵێت:

**علو في الحيات وفي الممات لحق تلك احدى المكرومات**

زۆرهەوڵمدا کە ئەم باسە شایستە بێت بە کەسایەتی سەید قوتبو ژیانو فیکرەکەی، ڕاستگۆیانە بێت لە پێشکەشکردنی ئەم کەسایەتیەدا بە خوێنەری بەڕێز، بۆ نەوەکانی داهاتوو، ئەو نەوەیەی کە دەگەڕێت بە دوای زانیارییەکداکەبە هۆیەوە ئاشنا ببێت بە کەسایەتی سەید قوتب!

ئەگەر سەرکەوتوو بووبم لە هێنانەدی ئەمەدا، ئەوە بە تەنها فەزڵی خوایە، سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەو، ئەگەر سەرکەوتوو نەبووبم یان کەمتەرخەم بووبم ئەوە داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم، پەنا ئەگرم بە خوا لە فیتنەی گوفتارو فیتنەی کردار.

سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە هۆی نیعمەتەکانیەوە هەموو شتێکی چاك ئەنجام دەدرێت، درودو سلاو لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر، نێراوی نەخوێندەوار(درودی خوای لەسەربێت)، لەسەر گیانی کەسو کارو هاوڕێیانی.

## لەکـــۆتـایی کـــۆتـــاییدا

منیش وەك وەرگێڕی ئەم کتێبە بەنرخە زۆر سوپاسی خوای گەورەو میهرەبان دەکەم کە خستیە دڵمەوەو یارمەتی دام هەستم بە وەرگێڕانو ئامادەکردنی ئەم کتێبە بە زمانی شیرینی کوردیو پێشکەش کردنی بە خوێنەری خۆشەویستی کورد تا ئەوانیش زیاتر شارەزابن لە ژیانی ئەم کەڵە شاعیرو ئەیبو بیریارو پێشەنگو تێکۆشەرو شەهیدە مەزنەی سەدەی بیست، هەموو ئەم کارەم لەگەڵ سلاواتێکدا پێشکەش دەکەم بە خۆشەویستو سەروەرم پێغەمبەری خواو دڵسۆزی مرۆڤایەتی حەرزەتی محەممەد (درودی خوای لەسەربێت) داواکارم خوای گەورە لە کەمو کوڕییەکانم ببورێت، چونکە بە ڕاستی بە توانایەکی کەمەوە هەستاوم بەم کارە، داواکارم لێم قبوڵ بکاتو کارێکی بەرپەرچدراوە نەبێت.

کۆتایی

1999/3/21

## سەرچاوەکان

1ـ الاخوان المسلمون: د. ريتشارد ميشل، وەرگێڕانی: د. محمود أبو السعود، چاپی یەکەم 1979.

2ـ الاخوان المسلمون: رؤية من الداخل. أحداث صنعت التأريخ: محمود عبدالحليم. دار الدعوة، چاپی یەکەم 1979.

3ـ اسرار حركة الضباط الاحرار والاخوان المسلمون: حسين محمد احمد حموده، چاپی دووەم 1987.

4ـ الاصابة في تمييز الصحابة: ابن حجر العسقلاني.

5ـ أضواء على (معالم في الطريق) سالم البهنساوي، چاپی یەکەم 1985.

6ـ الاطياف الاربعة: سيد قطب واخوانه، چاپی دووەم.

7ـ أمريكا من الداخل: بمنظار سيد قطب: د. صلاح عبدالفتاح الخالدى، چاپی یەکەم 1985.

8ـ أيام من حياتى: زينب الغزالى.

9ـ البوابة السوداء: صفحات من تاريخ الاخوان المسلمون: أحمد رائف، چاپی چوارەم 1988.

10ـ التصوير الفني في القران: سيد قوطب.

11ـ حقيقة الخلاف بين (الاخوان المسلمين) وعبد الناصر: محمد حامد ابو النصر دەیگێڕێتەوە، چاپی ساڵی 1987.

12ـ خصائص الادب العربي في مواجهة نظريات النقد الادبي الحديث: أنور الجندي، چاپی یەکەم 1975.

13ـ خصائص التصور الاسلامي: سيد قطب.

14ـ الخطط المقريزية (المواعظ والاعتبار بذكر الخط والاثار): أحمد علي المقريزية.

15ـ دراسات اسلامية: سيد قطب.

16ـ دراسات عن القصيمي: د. صلاح الدين المنجد، چاپی دووەم 1972.

17ـ ذكريات: الحلة الخامسة: على الطنطاوي، چاپی یەکەم 1987.

18ـ ذكريات لا مذكرات: عمر التلمساني 1985.

19ـ رائد الفكر الاسلامي المعاصر: الشهيد سيد قطب: يوسف العظم، چاپی یەکەم 1980.

20ـ رحلة الضياء للاعلان العربي المعاصر: يوسف العظم.

21ـ رسائل الى الشهيد: أمينة القطب ـ چاپی یەکەم 1980.

22ـ سخريات صغيرة: محمد قطب، چاپی یەکەم 1947.

23ـ سراديب الشيطان: صفحات من تاريخ الاخوان المسلمين: أحمد رائف. چاپی یەکەم 1989.

24ـ السلام العالمي والاسلام: سيد قطب.

25ـ سيد قطب الاديب الناقد: د. عبدالله عوض الخباص، چاپی یەکەم 1983.

26ـ سيد قطب أو ثورة الفكر الاسلامي: محمد على قطب، چاپی دووەم 1975.

27ـ سيد قطب: حياته وادبه: عبدالباقي محمد حسين، چاپی یەکەم 1986.

28ـ سيد قطب: خلاصة حياته، في الحركة. النقدي الموجه اليه: محمد توفيق البركات.

29ـ سيد قطب الشهيد الحي: د. صلاح عبدالفتاح الخالدي، چاپی یەکەم 1981.

30ـ سيد قطب من القرية الى المشنقة: عادل حمودة، چاپی یەکەم 1987.

31ـ الشاطئ المجهول: سيد قطب.

32ـ الشهيد سيد قطب: کۆمەڵێ لە هاوەڵانی شەهید سەید قوتب.

33ـ الصبر والثبات: جمال فوزى 1978.

34ـ صحيح مسلم: بە سەرپەرشتی محمد فؤاد عبدالباقى 1983.

35ـ صفحات من التأريخ ـ حصاد العمر ـ صلاح شادى، چاپی یەکەم 1981.
36ـ طفل من القرية: سيد قطب.
37ـ العدالة الاجتماعية في الاسلام: سيد قطب. 1974.
38ـ عندما غابت الشمس: عبدالحليم خفاجي، چاپی یەکەم 1979.
39ـ في تيار الحياة: أمينة قطب.
40ـ في ظلال القران: سيد قطب (6 بەرگ)، چاپی سێهەم 1977.
41ـ في ظلال القران: سيد قطب (8 بەرگ)، چاپی حەوتەم 1971.
42ـ الظلال القران في الميزان، د. صلاح عبدالفتاح الخالدى، چاپی یەکەم 1986.
43ـ كتب وشخصيات: سيد قطب.
44ـ لماذا اعدم سيد قطب واخوانه؟
45ـ لماذا اعدموني؟ سيد قطب.
46ـ لماذا اغتيل الشهيد حسن البنا؟ عبدالمتعال الجبري، چاپی یەکەم 1977.
47ـ مدخل الى الظلال القران: د. صلاح عبدالفتاح الخالدى 1986.
48ـ المدينة المسحورة: سيد قطب.
49ـ مذابح الاخوان في سجون ناصر: (2 بەرگ) چاپی ساڵی 1986.
50ـ مذبحة الاخوان في لمان طرة: جابر رزق، چاپی دووەم 1975.
51ـ مذكرات سائح في الشرق الاوسط، ابو الحسن الندوي، چاپی دووەم 1975.
52ـ مذكرات عبدالمنعم عبدالرؤوف "ارغمت فاروق على التنازل عن العرش" عبدالمنعم عبدالرؤوف چاپی یەکەم 1988.
53ـ المساجلات والعمارك الادبية في مجال الفكر والتأريخ والحضارة: أنور الجندي.
54ـ مشاهد القيامة في القران: سيد قطب.
55ـ معالم في الطريق: سيد قطب.
56ـ معركة الاسلام والراسمالية: سيد قطب، چاپی چوارەم، ساڵی 1969.
57ـ معركتنا مع اليهود: سيد قطب، چاپی دووەم ساڵی 1978.
58ـ مفاتيح للتعامل مع القران: د. صلاح عبدالفتاح، چاپی یەکەم 1985.
59ـ مقومات التصور الاسلامي: سيد قطب، چاپی یەکەم 1986.
60ـ منهج الفن الاسلامي: محمد قطب.
61ـ مهمة الشاعر في الحياة: سيد قطب.
62ـ الموتي يتكلمون: سامي جوهر، چاپی دووەم 1977.
63ـ نظرية التصور الفني عند سيد قطب: د. صلاح عبدالفتاح الخالدى، چاپی یەکەم 1983.
64ـ النقد الادبي: اصوله ومناهجه: سيد قطب.
65ـ نقد الكتاب مستقبل الثقافة في المصر: سيد قطب، چاپی دووەم 1969.
66ـ وسائل الاعلام المطبوعة في عودة الاخوان المسلمين: محمد فتحي شعير، چاپی یەکەم 1985.
67ـ يوميات الشهيد: محمد يوّف الهواش. چاپی یەکەم 1978.

**ناوەڕۆك**


پێشەكی چاپی دووەم ........................................ 3
پێشەكی چاپی یەكەم ........................................ 7
پێشەكی نووسەر ........................................ 11
سەید قوتب لە چەند دێڕێكدا ........................................ 19
بەروارەكان لە ژیانی سەید قوتبدا ........................................ 22
گەشەكردنی سەید قوتب ........................................ 26
خێــزانـــەكـــەی ........................................ 28
باوكی سەید قوتب ........................................ 29
گرنگیپێدانە سیاسییەكانی باوكی سەید ........................................ 30
گرنگیپێدانە ئیسلامیەكانی باوكی سەید ........................................ 31
دایكی سەید قوتب ........................................ 32
خوشك وبراكانی سەید قوتب ........................................ 34
بینایی سەید لە محەممەد قوتبی برایدا ........................................ 38
**بەشی یەكەم: لەگەڵ سەید قوتب لە ڕێبازی ژیانە ئەدەبیەكەیدا ............ 39**
ژیانی سەید لە گوندەكەیدا ........................................ 41
ڕۆشنبیری سەیدو كتێبخانەكەی لە گوندەكەدا ........................................ 43
سەید خەڵكی ڕۆشنبیر دەكاتو بەشداری لە شۆڕشدا دەكات ........................................ 44
سەید دەچێت بۆ قاهیرە ........................................ 45
خوێندنی لە قاهیرە ........................................ 45
پیشەی سەید لە وەزارەتی مەعاریفدا ........................................ 48
بابەتەكانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا ........................................ 51
لەو گۆڤارانەی تیایدا دەینووسی ........................................ 53
پەیوەندی سەید بە ئەدیبو بیریارەكانەوە ........................................ 56
ناردنی سەید قوتب بۆ ئەمریكا ........................................ 59
چالاكیەكانی پێش ناردنی بۆ ئەمریكا ........................................ 59
نهێنی ئەركی سەید لە ئەمریكا ! ........................................ 61
گەشتەكەی ........................................ 62
هەوڵەكان بۆ ئیحتیواكردنی سەید ........................................ 65
گەڕانەوەی لە ئەمریكا ........................................ 69
لەگەل سەید لە گەشتی ونبووونید ........................................ 70
ماوەی زەمەنی ونبونی سەید قوتب ........................................ 72
هۆیەكانی ونبوونی سەید قوتب ........................................ 73
ونبوونی سەید فیكری بوو نەك ڕەوشتی ........................................ 75
ئافرەت لە ژیانی سەید قوتبدا ........................................ 80
خۆشەویستی یەكەمی لە گوندەكەدا ........................................ 81
خۆشەویسی دووەمی لە قاهیرە ........................................ 82

ئازارچەشتنی سەیدو خۆشەویستەکەی پێکەوە ........................... 83
لە کۆتاییدا دەستنیشانکردنەکەی هەڵوەشاندەوە ........................ 85
کۆتا هەوڵی ژنهێنانی ................................................. 86
**بەشی دووەم: لەگەڵ سەید قوتب لە کەرنەڤاڵی ژیانە ئیسلامیەکەیدا ......... 89**
هەنگاوێکی دوور بەرەو جیهانی ئیمانو دڵنیایی ............................. 91
نهێنیەکە لە سروشتی ئەم ئاینەدایە ...................................... 92
گواستنەوەکە پلە بە پلە بوو ............................................. 94
ژیانی ئیمانیی سەید لە سێبەری قورئاندا .................................. 96
سەید لە (ظلال)دا دان بە ونبوونە فیکریەکەیدا دەنێت ...................... 97
قۆناغە ئیسلامیەکانی ژیانی سەید قوتب ................................... 100
پەیوەندیە سیاسییە ڕابردووەکانی ......................................... 100
قۆناغە ئیسلامیەکانی ژیانی سەید ......................................... 103
قۆناغی یەکەم: قۆناغی ئیسلامیاتی هونەری ئەدەبی ........................ 104
پرۆژەی کتێبخانەی قورئانی نوێ ........................................... 106
قۆناغی دووەم: ئیسلامیاتی گشتی ......................................... 109
العدالة الاجتماعية في الاسلام ........................................... 109
گۆڤاری الفكر الجديد ..................................................... 111
بابەتەکانی لە گۆڤارە ئیسلاحیەکاندا ..................................... 112
قوتابخانەکانی خەشم و قین ............................................... 113
قۆناغی سێیەم : قۆناغی ئیسلامیاتی حەرەکی ................................ 116
سەید پێشەنگی فیکریی بزاڤی ئیسلامیە ..................................... 116
هەندێك لە کارەکانی سەید لەم قۆناغەدا ................................... 119
حەوت دیمەن لە ژیانە ئیسلامیەکەی سەیدقوتب ............................. 122
دیمەنی یەکەم: سەید قوتب لەگەڵ پیاوانی شۆڕشدا .......................... 122
پلانی ئیخوانی پێشوەخت بۆ شۆڕش ......................................... 122
عەبدولناسر دەست بەسەر نهێنیەکانی ڕێکخستنی برایاندادەگرێت .............. 126
عەبدولناسر لە ڕێگەیەکی نوێوە پەیوەندی بە سەرکردایەتی برایانەوە دەکاتەوە ........................................................ 128
عەبدولناسر پەیمانەکەی لەگەڵ برایاندا ئەشکێنێ ........................... 129
سەید قوتب و پیاوانی شۆڕش .............................................. 132
هەوڵەکانی سەید قوتب لە زەمینەسازیدا بۆ شۆڕش ............................ 132
کاریگەری سەید لەسەر ئەفسەرانی سوپا، یان کاریگەربوونی ئەفسەرانی سوپا بە سەید ................................................................ 136
سەید لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕش لەپێش هەڵگیرسانیدا ........................ 136
سەید لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕش لەپاش هەڵگیرسانیدا ........................ 139
محەممەد قوتب پەیوەندیەکەیانی سەید بە پیاوانی شۆڕشەوە دەگێڕێتەوە ........ 141
ئاهەنگی ڕێزلێنانی سەید قوتب لەلایەن پیاوانی شۆڕشەوە ..................... 142

سەیدو دەزگای تەحریر ........................................................ 146
سەید هەوڵی ڕێکخستنی نێوان عەبدولناسرو برایانی موسڵماندا دەدات ...... 149
سەید لە پیاوانی شۆڕش جیائەبێتەوەو لا ئەدات بەلای برایاندا ............... 151
دیمەنی دووەم: سەید قوتب لە ڕێگەیدا بەرەو برایانی موسڵمان ........... 153
هەڵەکان لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندیەکانی سەید بە بریانەوە ............... 153
سەید پێش ئاراستە ئیخوانیەکەی چاکسازێکی ئیسلامیی بوو ............. 155
ئایا سەید بۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی ئیسلامی کاری کردووە؟ .......... 155
سەید کتێبی (العدالة الاجتماعیة)ی پێشکەش بە لاوانی برایان نەکردووە...... 157
لە ئەمریکا دوو ڕووداو سەید لەبرایان نزیك دەکاتەوە ................... 161
بەکرێگیراوەکانی ئەمریکا لە میسر دژایەتی برایان دەکەن ............... 165
سەید لەگەڵ برایاندا دوو جۆر پەیوەندی هەیە ......................... 167
دیمەنی سێیەم: سەیدقوتب لەگەڵ برایانی موسڵماندا ..................... 168
پەیوەندی کردنی بە برایانەوە لە سەرەتای ساڵی (1953)دا ............... 168
حەسەن ئەلهوزەیبی وەڵامی سەیدقوتب دەداتەوە ....................... 170
دیمەنەکانی سەرسامبوونی سەید بە حەسەن بەنا و برایانەوە ............ 174
پەیوەندی کردنی سەید بە برایانەوە لە کاتێکدایە برایان ڕوویەڕووی ئازار و ئەشکەنجەی ترسناك دەبنەوە............................................ 177
لە کارە ئیخوانیەکانی سەید قوتب ............................................180
کورتی ماوە تەنزیمیەکەی لەگەڵ برایاندا ................................... 182
تۆمەتباکردنی سەید بەو کارانەی پێی هەڵنەستاوە! ........................ 185
سەید پشتگیری لە هوزەیبی دەکات لە دژی هەندێك لە برا سەرپێچیکارەکان . 189
دیمەنی چوارەم: یەکەم ناهەمواریەکانی سەید قوتب لە زینداندا(1954 ـ 1964)................................................................ 192
دەستگیرکرنی یەکەمجاری سەید لە سەرەتای ساڵی 1954دا ............... 192
دەستگیرکرنەوەی سەید بۆ جاری دووەم لە تشرینی یەکەمی 1954دا .... 193
لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەید قوتب ............................................ 195
سەید کاریگەری ئەشکەنجەدان لە سەر لاشەی نیشانی دادوەران دەدات ..... 196
دادگاییە نهێنیەکەی و حوکمدان بە سەریدا ................................ 198
سەید لە زیندانی لیمان تووڕە ............................................. 200
سەید هەوڵدانێکی جەمال ڕەبیع دەگێڕێتەوە بۆ ڕزگارکردنی برایان لە زیندان . 201
حسەین حەمودە و جەمال ڕەبیع گێڕانەوەکەی سەید پشتڕاست دەکەنەوە ... 203
سەید کورتەی قەسابخانەکەی برایان لە زیندانی تووڕە دەخاتە ڕوو ...........206
گێڕانەوەکەی سەید بۆهەمان قەسابخانە .................................. 208
سەید هەوڵی چارەسەر ئەدات بۆ کرنەوەی گرێی ڕووداوی ئەلمەنشیە ...... 210
سەید لە نەخۆشخانەی زیندانی تووڕەدا .................................. 213
لە نەخۆشیەکانی سەید قوتب ............................................. 215
کەسایەتی سەید لە زیندانەکەیدا .......................................... 219

